54

ساڵیادی ڕۆژی کەلار



# یادی کەلار

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار

ژمارە (٨)ـی ئابی ٢٠٢٤

خاوەنی ئیمتیاز: شەهاب حاجی ئەحمەد

سەرنووسەر: سەباح عەلی جاف

کاروباری هونەری: زاری

# ناوەڕۆک

## یادی کەسایەتییەکان



## پرسی جینۆساید و ئەنفال



## ڕاپۆرت و بەدواداچوون



## ووتار و بۆچوون

# سەروتار



شەهاب حاجی ئەحمەد

قائیمقامی کەلار

## کەلار، شارێکی زیندوو و بەرەو گەشەکردنێکی خێرا

کەلار لە ڕووی مێژووی کۆنەوە، خاوەن گەلێك شوێنەواری دێرینە، ئەمەیش گەواهی بۆ ئاوەدانی لە ڕابردوودا دەدەن، لە مێژووی نوێیشدا سەرباری ئەوەی شارێکی نوێیە، بەڵام توانییەتی مێژوویەکی درەوشاوە بۆ خۆی تومار بکات و نەخشی لە ڕووداوەکاندا هەبووە و کەلاری کۆن وەك جێگایەکی ئاوەدان لە ڕابردوو و گەڕەکێکی دێرینی قەزاکە لە ئێستادا لەو ڕووەوە خاوەن دیرۆکێکی پڕ شانازی و پڕ بایەخە، لەو مێژووەوە بە پلە بەندی شاری کەلار قۆناغ بە قۆناغ هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوە، بەتایبەت لە پاش ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ەوە، شارەکە تا ئەمڕۆ هەنگاوی خێرای لە هەموو بوارەکان بەرەو پێشکەوتنی زیاتر ناوە و ئومێدی شارێکی گەشەکردوو و زیندووی لە داهاتوودا لێدەکرێت.

سەرباری قەیرانی دارایی و کێشەی جۆراوجۆر لەم ساڵانەی ڕابردوودا لە ناوچەکە کە بووەتە هۆی ڕاگرتنی زۆربەی پرۆژەکان لە شارەکە لەسێکتەرە جیاوەزەکاندا، بەڵام قەیرانەکان نەبوونەتە هۆی ئەوەی کە ڕێگری تەواوەتی لە گەشەکردن و جموجۆڵی ئاوەدانکردنەوە و تەواوکردنی بەشێك لە پرۆژە تەواو نەکراوەکاندا بکەن، ئەوەیش لە ئەنجامی ئەوەی کە لە ڕووی ئابورییەوە شارەکە زۆر لە مقەوماتی زاتی تێدا بووە، وەك ئەوەی کە زەوییەکانی لە بواری

نیشتەجێبوون و بازرگانی و وەبەرهێنان لە چاو شارەکانی تر لە ڕووی بەهاو نرخەوە دوو بەرامبەر و زیاتریش بوون، ئەمەیش بووەتە پاڵپشتیەکی دارایی زۆر باش بۆ بەرەو پێشچوونی بەشێکی زۆر لە پرۆژەکانی ئاوەدانکردنەوە لە کەلاردا، بەراورد بە ساڵانی ڕابردوو گرنگی زۆر دراوەتە پرۆژەکانی بواری پیشەسازی لەجۆری گەورە و مام ناوەند و بچووك، بە جۆرێك ژمارەکە بەردەوام لە هەڵشکاندایە و لە ئێستادا نزیکەی (٥٠٠) کارگەی جۆراوجۆر هەن، هەروەها لە بواری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییدا چەندین پرۆژەی وەبەرهێنان خراوەتە خزمەتی ناوچەکە و کوردستانەوە، لە وێنەی پرۆژەی گاوداری و کێڵگەی بەخێوکردنی پەلەوەر کە بۆ ناوچەکانی تری عێراقیش سودی لێ وەردەگیرێت، شارەکە لە ڕووی خزمەتگوزاریی شەقام و ڕێگاوبانەوە بەرەو پێشچوونی باشی بەخۆیەوە بینیوە، ئەمە جگە لە دروستکردنی بازاڕێکی مۆدێرن لە سەنتەری کەلاردا.

لە بواری پرۆژەکانی نیشتەجێبووندا، شارەکە هەنگاوی خێرایی بەرەوە پێشەوە ناوە، بەتایبەت لەم ساڵانەی دوایدا، بیست هەزار یەکەی نیشتەجێبوون لەبواری جێبەجێکردن و بەشێکی تریش لە وەرگرتنی مۆڵەتدان بۆ دروستکردن، لە بواری گەشتوگوزاریشدا کەلار لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێتە شوێنێکی گەشتیاری مودێرن، ئەویش پاش ئەوەی لە کەناری ڕوباری سیروان لە پێنج زۆندا لە گردەگۆزینەوە تاوەکو بەردەسور پرۆژەکانی بواری گەشتیاری و بازرگانی ...هتد لەو ڕووەوە کارکردن دەستی پێکردووە و لە ئێستادا دوو لەو پرۆژانە لە دوو زۆندا بەگەڕ خراون.

لە بواری ڕۆشنبیری و پەروەردەدا، شارەکە بەرەو پێشچوونی باشی بەخۆییەوە بینووە، بەتایبەت لە بواری کەرتی تایبەتدا، ژمارەیەك قوتابخانە و پەیمانگا، خزمەت دەکەن، لە ئایندەیشدا بڕیارە زانکۆی تایبەتیش بهێنرێتە ناوچەکە، ئەمانەیش دەبنە خاڵێکی گرنگ لە زۆر بواردا، بەتایبەت لە ڕووی ئابورییەوە بۆ ناوچەی گەرمیان بەکەڵکە و سەرمایەگوزاری لەو ڕووەوە بەرەو پێشەوە دەچێت.

سـەرباری ئەو خاڵە گەشانەی لەسەرەوە بە كورتی ئاماژەم پێدا، بەڵام كەلار كۆمەڵێك گرفت و كێشەی هەیە، بەشێكیان هەنوكەیین، بەڵام ژمارەیەك كێشەی گەورەی هەیە و پێویستی بە پلانی ستراتیجی و چارەسەری دوور مەودا هەیە، لەوانە: لە داهاتوودا شارەكە ڕووبەڕووی كێشەی كەمئاوی دەبێتەوە، بۆ ئەوەیش پێویستە بەنداوی بەردەسوور بخرێتە بواری جێبەجێكردنەوە و بەشێوەیەكی خێرا كار لەو پرۆژەیەدا بكرێت، سەرباری كاركردن لە ڕێگای دوو سایدی كەلار- دەربەندیخان، بەڵام بۆ ئەوەی كێشە لە مێژینەیەكەی سنوری گەرمیان «خراپی ڕێگاوبانەكان» چارەسەر ببێت، پێویستە پرۆژەكە بەتەواوی جێبەجێ بكرێت تاوەكو سلێمانی و كاركردن تێیدا نەوەستێت، لە بواری تەندروستیشدا سنورەكە كێشەی زۆری هەیە، لەوانە تەواو كردنی نەخۆشخانەی سەد قەرەوێڵەیەكە و دروستكردنی ژمارەیەك نەخۆشخانە، بەتایبەت لەبواری نەخۆشخانەی بوژانەوەی دڵ و چاودێری وورددا، هەروەها ساڵانە لە وەرزی باران بارینда بەشێك لە شارەكە ڕووبەڕووی مەترسی لافاو دەبێتەوە، بۆ ئەوەی ئەم مەترسییە كەم ببێتەوە یاخود ڕوو نەدات، پێویستە ئەو بەربەستانەی لە دەوروبەری كەلاردا بەتایبەت لە سەرووی كەلار لە گوندەكانی سەید خەلیل و گۆبانەوە دروست كراون كە بە (ساترەی خۆڵەكە) ناسراوە، تۆكمە تر بكرێن بەشێوازێكی ئەندازیاریی و مۆدێرن نۆژەن بكرێنەوە.

بەندە، پاش ئەوەی لە (١٠ی ئایاری ٢٠١٥)، وەك قائیمقامی قەزای كەلار دەست بەكار بووم، سەرباری ڕاپەڕاندنی كاروباری ڕۆژانەی هاوڵاتیان، بواری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیرییهان فەرامۆش نەكردووە، هەربۆیە بە پرس و ڕاوێژ بە كۆمەڵێك لە خەڵكی نوخبەی ڕۆشنبیر، بیرمان لە چالاكی ساڵیادی بەقەزاكردن و یادكردنەوەی ئەو ڕۆژە كردەوە كە هاوكاتی ٢٨ی شوباتی ١٩٧٠یە، «لە ڕابردوودا لەو ڕووەوە لە بڵاوكراوەی (یادی كەلار)دا ئەو بابەتەمان باسكردووە»، بەڵام ئەوەی دەمەوێت لێرەدا تیشكی بخەمە سەر، دەركردنی بڵاوكراوەی (یادی كەلار)ە، خۆشبەختانە تا ئێستا بەم ژمارەییەوە، (هەشت) ژمارەمان لێدەركردووە، بڵاوكراوەكە بووەتە سەرچاوەیەكی گرنگ لە بوارە جۆربەجۆرەكاندا، بەتایبەت بۆ مێژووی كەلار و ناوچەی گەرمیان، توانراوە

زۆر بابەتــی نــویێ و بەکەڵك بخاتــە بەربــاس، دەرکردنی بڵاوکراوەی یــادی کەلار یەکێــك لەو دەســکەوتانەی مــاوەی کارکردنی ئێمە بــووە لــە قائیمقامیەتی کەلار کــە جێگای شــانازیمانە، بەهیوام لــە دوای ئێمەیــش، ئەو کەســەی وەك قائیمقامی شــارەکە دەســت بەکار دەبێت، هــاوکار بێت بۆ دەرچــوون و بڵاوکردنــەوەی (یادی کەلار) و لە دەرچوون نەوەســتێت، ســاڵانە لەگــەڵ چالاکی بۆ یــادی ڕۆژی کەلار چــاپ و بڵاوبکرێتــەوە، لێرەدا بە پێویســتی دەزانم، سوپاســی هەموو ئەو کەســانە بکەم کە ســاڵانە لە چالاکییەکانی ڕۆژی کــەلاردا ماندوو بــوون، بەتایبەت لیژنەی باڵای یادەکــە، هەروەها ســوپاس بۆ هەمــوو ئــەو قەڵەمانەی لە (یــادی کەلار)دا بابەتیــان بڵاوکردوەتــەوە و کاریان لە دەرکردن و سەرپەرشــتی کردنیــدا کردووە و شــەونخونیان پێوە بینیوە، ســوپاس بۆ هەریەک لە مامۆســتایانی بەڕێز (مســتەفا ســەعید عەلی، ئەحمەد محەمەد)، لە ژمارەکانی پێشــوودا ئەرکی سەرپەرشــتیکردنی بڵاوکراوەکەیان گرتەئەســتۆ، بەڵام لەم ژمارەیــەدا بەهۆی ســەرقاڵبوونیان بە ئەرکی تایبەتی خۆیان نەیانتوانی بەو کارە هەســتن، بەڕاوێژکردن ئەرکی سەرپەرشــتیکردنی ئەم ژمارەیەمان خســتە ئەســتۆی مامۆســتا ســەباح عەلــی جاف، سوپاســیش بۆ هەمــوو ئەو کەس و لایــەن و دامــودەزگای حکومــی و ڕێکخــراو و کۆمپانیاکان کــە لــە ڕووی مــاددی و مەعنەوییــەوە هــاوکاری چالاکییەکانی یــادی کەلار و بڵاوکراوەکــە بوون.

لە کۆتاییدا بەهیوام کەلار هەمیشــە ئاوەدان و بەرەوپێشــەوە بچێت و لە ســاڵانی داهاتــوودا ئــەم قەزایــە بکرێتە پارێزگایــەك لە هەرێمــی کوردســتاندا، وەك چۆن لە هەمــوو چالاکییەکانی ڕۆژی کــەلاردا وەك پێشــنیار و داواکاری، بەپێوســتمان زانیــووە «کەلار بکرێتــە ناوەندی پارێــزگای گەرمیان»، ئەوەیــش وەك قەرەبوویەك بۆ خەڵکە بــەش مەینەتێکەی کــە قوربانی زۆریــان لە ڕابــردوودا داوە.

# کاریگەری بنەما جوگرافییەکان لە سەر پرسی جێندەر لە شاری کەلار

## لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای جێندەر




پ. د. ئیبراهیم قاسم پاڵانی

کۆلێجی پەروەردە- زانکۆی گەرمیان

بەیان عەبدوڵڵا عەزیز

کۆلێجی پەروەردە- زانکۆی گەرمیان



**پوختە:**

مەسەلە ڕەگەزییەکان کە تەوەرێکی سەرەکی گفتوگۆی زانستە کۆمەڵایەتییەکان پێکدەهێنێت , لەنێویاندا جوگرافیای مرۆیی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە گرنگی بەم لایەنە دەدات و بووە بە یەکێک لە بوارەکانی لێکۆڵینەوە .

ئەم توێژینەوە لە ڕوانگەی جوگرافییەوە کاریگەری بنەما جوگرافیاییەکان لەسەر پرسی جێندەر لە شاری کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیان لە هەرێمی کوردستانی عێراق شرۆڤە دەکات و تیشک دەخاتە سەر پرسیارە بنەڕەتیەکانی کاریگەری فاکتەرە جوگرافیاییەکان لەسەر پرسەکانی ژنان لە شارەکەدا، بۆ ئەم مەبەستە توخمە سروشتی و مرۆییەکان لە توانای بەشداری کردنی ژن لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بە لە بەرچاوگرتنی ڕەوتی مێژوویی- جوگرافی بەپشت بەستن بە پارادایمی جێندەری و پەیوەندی بە بەرهەمهێنانی شوێنەوە بۆ شیکردنەوەی کاریگەرییەکانی ژینگە لەسەر بنیاتنانی ڕەگەزی دەکۆڵێتەوە، لەبەرئەوەی زاراوەی جۆری کۆمەڵایەتی (Gender) کە باس لە ڕفتارەکانی (نێر- مێ) دەکات بەهۆی کاریگەرییە جوگرافیایەکانەوە بنیات نراوە و تارادەیەکی زۆر کاریگەری ڕەگەز (Sex)ی لەسەرە .



**کلیلی وشە** (جێندەر، شوێن، جوگرافیای کۆمەڵایەتی، شاری کەلار)

## پێشەکی:

جوگرافیایی ژنان وەک لقێک لە ئاراستە نوێیەکان لە لێکۆڵینەوەی جوگرافیدا بایەخ دەدات بە خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان جۆری کۆمەڵایەتی (جێندەر) و شوێنی جوگرافی بە ئامانجی دەرخستن و کاریگەری ڕەگەزە جوگرافیەکان لەسەر پاشکۆیەتی ژن، هەروەها جەختکردنە سەر دروستکراوە کۆمەڵاییەتیەکان وەکو کلتور و داب و نەریت و ئایین و زمان و کاریگەریان لەسەر دۆزی ژن کە شوێن بەرهەمی دێنێت، چونکە ئەگەر سەرەنج بدەین لە مێژوودا زۆرجار ئافرەت وەک مرۆڤ سەیرنەکراوە یان بە شوم و بەد و خراپ و پلە دوو ناوزەد کراوە، بەڵام پرسی جێندەری مێ لە ئێستادا ئەو گوزەرەیە کە بەشێکی گەورە لە گفتوگۆ هاوچەرخەکان پێکدێنێت و وتنی جۆراوجۆری لەسەر دێتە گۆڕێ، کە لە هەر کۆمەڵگایەکدا بەشێوازێکی جیاواز ڕادە و گرنگی خۆی نواندووە و بووە بە یەکێک لە پرسە جیهانیەکان، گفتوگۆ لەسەر ژن وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی لە دامەزراوەکان، بەشداری کردن و بەڕێوەبردن، سیاسەت ، دیموکراتیەت و کایەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤە، لەبەرئەوەی لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی دونیادا لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و زانستیەوە ژنان هاوپێگەی پیاوانیان نیە، لە کاتێکدا لەسەرەتای دەستپێکی ژیانی کۆمەڵایەتی ئامادەی هەبووە ، بەڵام بەپێی سەردەم و کات و شوێن سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و پلەی پاشکۆیەتی وەرگرتووە، لە دنیای ئەمڕۆدا بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و پێشکەوتن و تەکنەلۆجیا و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و جیهانگیرییەوە کە بێگومان تێکەڵبوونێکیان دروستکردووە لە نێوان کلتور و نەتەوەکاندا و کاریگەری لەسەر مەسەلە ڕەگەزییەکان بەجێهێشتووە، وایکردووە جارێکی تر ململانێی جێندەری بەفۆرمێکی نوێوە دەربکەوێت و ڕەنگدانەوەی بەسەر یەکە کۆمەڵایەتیەکانەوە هەبێت.

## گرنگی توێژینەوە:

گرنگی ئەم توێژینەوەیە تێگەیشتنە لە پەیوەندی نێوان ڕەگەز و پێکهاتە ژینگەییەکان و ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگایانەی کە کاریگەریان لەسەر مەسەلە جێندەرییەکان هەیە، لەڕێگەی خوێندنی شوێنی کۆمەڵگاوە، هەوڵێدانێکە بۆ شیکردنەوەی شێوازی بنیاتنانی ڕەگەزی لەڕێگەی پرۆسەی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەست بە ژینگە، بە ئامانجی تێگەیشتن لەوەی کە چۆن ژینگە و گۆڕانە ژینگەیەکان کاریگەریان لەسەر بنیادی کۆمەڵایەتی گروپە جێندەرییەکان (ژن و پیاو) هەیە، واتە بایەخ دەدات بە تێگەیشتن لەو ڕێگایانەی کە چۆن ژنانیش وەکو پیاوان بتوانن لە کۆمەڵگادا بوونیان هەبێت، لەبەرئەوەی هەرچەندە ژنانیش ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵگان، بەڵام توانای دەست ڕاگەیشتن و بەشداریکردنیان سنوردارە، بەهۆی مێینە بوون و کۆت و بەندە کۆمەڵایەتییەکانەوە.

## کێشەی توێژینەوە:

هەستکردن بە کێشە و دیاری کردنی گرفتی توێژینەوە مەرجێکی سەرەکییە لە هەر توێژینەوەیەکی زانستیدا و بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت , بەوەی کە سەرەتا و دەستپێکی بابەتەکانی دیکەی توێژینەوەکەی بەدوادا دێت.

لێرەوە کێشەی توێژینەوە بەچەند پرسیارێک دەخەینەڕوو:

١-ئایا ڕەگەزەکانی ژینگەی سروشتی کاریگەرییان هەیە لەسەر مەسەلە جێندەرییەکان لە شاری کەلار؟

٢-ئایا پرۆسە کۆمەڵایەتیەکان ڕۆڵیان هەیە لەسەر بەشداری کردنی ژنان لە سێکتەرە کۆمەڵایەتیەکاندا لە ناوچەی توێژینەوە؟

٣-ئایا تایبەتمەندییە ئابوورییەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر پێگەی ئافرەت لە شارەکەدا؟

٤- ئایا پرسی جێندەر و بەشداری کردنی ژنان لەکاری سیاسیدا پەیوەندی هەیە بە ڕەوشی سیاسی ناوچەکەوە؟

## گریمانەی توێژینەوە:

١- ڕەگەزەکانی جوگرافیایی سروشتی کاریگەرییان هەیە لەسەر مەسەلە جێندەرییەکان لە شاری کەلار .

٢- بەشداری کردنی ژن و پرسی جێندەری مێ پەیوەندی بەتایبەتمەندییە کۆمەڵایەتی و کلتورییەکانەوە هەیە لە شاری کەلار.

٣- بابەتی جێندەر لە ناوچەی توێژینەوە پەیوەندی بە تایبەتمەندییە ئابوورییەکانی شارەکەوە هەیە .

٤- ڕەوش و بارودۆخی سیاسی ناوچەی لێکۆڵینەوە کە بەشێکە لە ناوچەی سیاسی هەرێمی کوردستان کاریگەری لەسەر کێشە جێندەرییەکان هەیە .

## ئامانجی توێژینەوە:

هەموو توێژینەوەیەکی زانستی ئامانجی تایبەتی خۆی هەیە کە توێژەر لە میانەی توێژینەوەکەی دا هەوڵی بەدیهێنانی دەدات، ئەم توێژینەوەیەش ئامانجی سەرەکی شیکردنەوەیەکی جوگرافیاییە بۆ پرسی جێندەر و مێ و ڕوونکردنەوە و گەیشتن بەو هۆکارانەی کاریگەریان لەسەر بابەتی بەشداری کردنی ژنان هەیە وەکو هۆکارە سروشتی و کۆمەڵایەتی و کلتوری وئایینی و ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان کە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا بیان خەینەڕوو:

١- شیکردنەوەی ئەو فاکتەرانەی کاریگەرییان لەسەر پرسی جێندر هەیە لە ڕووی جوگرافییەوە لە ناوچەی توێژینەوە .

٢- خستنەڕووی پەیوەندی نێوان گۆڕانی کۆمەڵایەتی و کاریگەری لەسەر پێگەی ڕەگەزی مێینە لە کۆمەڵگەی دانیشتوانی شاری کەلاردا.

٣- شیکردنەوەی بەشداری کردنی ئافرەتان لە سێ بواری سەرەکی کەبریتین لە: بواری کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی لە شاری کەلار.

## تەوەری یەکەم/ هۆکارە سروشتییەکان:

ژینگەی سروشتی بریتییە لە کۆمەڵێک خەسڵەت و کارتێکەری دەرەکی کە کاریگەری لەسەر مرۆڤ دروست دەکەن[1]، کۆمەڵگای مرۆییش لە چوارچێوەی سیستەمێکی ژینگەی سروشتییدا دروست بووە، دەتوانرێت وەک یەکێک لە پێکهاتەکانی ژینگە دابنرێت، کە دواجار ئەم بوونەوەرە هۆشمەند و خاوەن پێداویستیە بە چەندین شێوە لەگەڵ ئەو چوارچێوە سروشتیەی کە تێیدا دەژی دەکەوێتە پەیوەندییەوە[2]، مەبەست لە ژینگەی سروشتی کە مرۆڤی تێدا دەژی، خەسڵەتە سروشتی و فیزیکییەکانی ژینگە دەگرێتەوە، وەک دیاردەکانی (کەش و هەوا، بەرز و نزمی ڕووی زەوی، جیۆلۆجی، پێکهاتەی خاک و ئاو)، بەهۆی ئەو کاریگەرییە گرنگانەی ئەم فاکتەرانە لەسەر چالاکیە مرۆییەکان دەیگێڕن ڕۆڵی لە پرسە جێندەرییەکاندا پڕ بایەخ کردووە، ژینگەی سروشتی کاریگەری لەسەر پێگەی ژنان هەیە لە بینای کۆمەڵایەتییدا، چونکە تێبینی دەکرێت ئەگەر پشکی کاری ژن لە کاری پیاوان کەمتربێت، ئەوا پێگەی کۆمەڵایەتی کەم دەبێتەوە، وەک لە ژینگەی کشتوکاڵی و ئاژەڵداریدا، کە ژنان بەشداریکردنی کەمیان هەیە و پیاوان هەست بە ئەنجامدانی کارەکانیان دەکەن[3]، لێرەدا کاریگەری خەسڵەتە سروشتییەکان لەسەر پرسی جێندەر لە ناوچەی توێژینەوە دەخەینە ڕوو.

### ١/ شوێن و پێگە:

شوێنی جوگرافی یەکێکە لە گرنگترین ڕەگەزەکانی جوگرافیای سروشتی، کە بیرجر(Burger) بەدڵی جوگرافیا ناوی دەبات[4]، کە بەرپرسە لە جۆری کەش و ئاو و هەوا و ژیانی ڕووەک و ئاژەڵی، هەروەها پەیوەندی بە دابەشبوونی دانیشتوان و ڕەنگ و شێوە و

---

[1] Joseph Holden, An Introductin to Physical Geography and the Environment, fourth edation, UK, ٢٠١٧,p٢٩٠.

[1] ایان ج. سیمونز، البیئة والانسان عبر العصور، ترجمة: السید محمد عثمان، عالم المعرفة، العدد(٢٢٢)، الکویت،١٩٩٧، ص٧١.

[2] لویس اسکندر، الانسان والبیئة، مطبوعات مکتبة النهضة المصریة، القاهرة، ١٩٣٦، ص١٣.

[3] جمال حمدان، جغرافیة المدن، الطبعة الثانیة، عالم الکتب، القاهرة، ١٩٧٧، ص٢٧٦.

ڕەفتار و هەڵسوکەوت و پیشە و خواستەکانی مرۆڤەوە هەیە [١]، مرۆڤ لە شوێندا دەژی و شوێن لە ژیان و بوونی مرۆیدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە ڕووبەرێکە بۆ ئەنجامدانی کار و چالاکییەکانی و جێگەیەکە تێیدا شوناسی خۆی لە میانەی پرۆسەیەکی مانادارادا دروست دەکات، بەم شێوەیە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی ناسینی ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژی، خۆیشی بناسێت[٢]، لەبەر گرنگی ئەم فاکتەرە لە مێژەوە بایەخ بە پەیوەندی نێوان شوێن و جێندەر دراوە، بە بڕوای دافن سپین (Daphne Spain-١٩٩٢) ڕێکخستن و ئامادەکارییە شوێنییەکان جیاوازییەکانی نێوان دۆخی ژن و پیاو دووپات دەکەنەوە، ئەو شوێنانەی کە جیاکاری ڕەگەزی تێدایە، دەستگەیشتنی ژنان بە مەعریفە کەم دەکاتەوە لەلایەن پیاوانەوە بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی پیاو، هەندێک لە فێمێنیستەکان دەڵێن ژنان هەوڵدەدەن کەمترین شوێن لە فەزای گشتیدا داگیر بکەن، بەهۆی باری پێکهاتەی جەستە و پێگە کۆمەڵایەتییەکەیانەوە [٣]، لەم ڕوانگەیەوە شوێنی شاری کەلار لەڕووی جوگرافییەوە کەوتووەتە ناوچەی نیمچە شاخاوییەوە لە ناوچەی بان و گردەکان لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستان لەنێوان بازنەی پانی (٠٨" ٣٦' ٣٤°-٢٤" ٣٦' ٣٤°) پلەی باکوور و هێڵی درێژی (١٥" ٦٧' ٤٥°-٥٠" ٢١' ٤٥°) پلەی ڕۆژهەڵات، لە نەخشەی (١) ڕوون دەبێتەوە شارەکە لەسەر ڕووبەرێکی تەخت بنیات نراوە کە جیاوازی ڕووی زەویەکەی دەگاتە (٢٠٠-٢٩٠) م لە ئاستی ڕووی دەریاوە، ئەمەش هیچ سەختی و لێژیەکی تێدا نیە کە ئاستەنگی سروشتی بێت لە دروست کردنی دامەزراوەکان و فراوانبوون و کشانی ئاوەدانی لە قۆناغەکانی داهاتووی شارەکەدا.

بەمەبەست لە (پێگە) ئاماژەیە بە تایبەتمەندییە سروشتیەکانی ئەو ناوچەیە یان ئەو ڕووبەرەی کە شاری لەسەر بنیات نراوە، وەک (ڕووی زەوی، بەرزونزمی، پێکهاتەی جیۆلۆجی،

---

[٤] الدکتورعبدلله عطوي، جغرافیةالسکان، الطبعةالاولی، المطبعة والنشر دار النهضة العربیة، لبنان- بیروت،٢٠٠١، ص٤٤.

[٥] ڕێبوار سیوەیلی، دیاردەی ناسینی شوێن و شوناس (خوێندنەوەیەکی دیاردەناسانە بۆ شاری سلێمانی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی تاران، ٢٠١٥، ل٢٠.

[٣] ریتشارد پیت، الفکر الجغرافي الحدیث، ترجمة: عاطف معتمد و آخرون، الطبعة الأولی، المرکز القومی للترجمة، ٢٠١٨، ص٥٤٦.

کەش و هەوا، خاک، دەرامەتی ئاو و ڕووەکی سروشتی) , ئەم توخمە سروشتییانە ئەو کارە دیاری دەکات کە نیشنگە مرۆییەکان ئەنجامی دەدات[١]، ناوچەی لێکۆڵینەوە پێگەیەکی زۆر گرنگی هەیە، بەهۆی پێکهاتە جیۆلۆجیەکەیەوە کە دەوڵەمەندە بە نەوت، وەک کێڵگەی نەوتی حەسیرە لە باکوری ڕۆژئاوای، هەروەها لەبەر ئەوەی کەوتووەتە سەر هێڵی سەرەکی ئۆتۆمبیلی (سلێمانی —کەلار —بەعقوبە -بەغداد)، لە لایەکی تریشەوە لە ڕێگەی هێڵی کفرییەوە دەبەسترێتەوە بە کەرکوکەوە، لە ڕێگەی خاڵی پەروێزخانیشەوە کە نزیکەی (٣٥)کم لە ناوەندی شارەکەوە دوورە، کەلار دەبەستێتەوە بە شاری قەسری شیرین لە وڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران، وە لە شاری بەغدادی پایتەختی عێراقیش (١٨٠)کم دوورە، وای کردووە پێگە و هەڵکەوتەی وەکو دەرگایەکی بازرگانی بێت لە نێوان وڵاتانی عێراق و ئێران و هەرێمی کوردستان کە ئابووریەکی گەورەی بۆ شارەکە فەراهەمکردووە، بەم شێوەیە شوێن و پێگە کاریگەری گەورەی هەبووە لە سەر گەشە و فراوانبوونی ناوچەی توێژینەوە بە پێی قۆناغە مێژووییەکان، بەڵام کاریگەری لەسەر پرسی جێندەر جیاوازی هەیە لە نێوان ئێستا و ڕابردوودا، بەو پێیەی کەلار لە کۆندا ناوچەیەکی کشتوکاڵی بووە و بەشی زۆری خەڵکەکەی بەکاری کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییەوە خەریکبوون[٢]، ژنان و ئافرەتانی خێزان هاوکاری پیاوەکان بوون لە کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداریدا، بەڵام ئەم کارەی ئافرەتان هیچ کرێ و هەقدەستێکی نەبووە، بەڵکو پیاوان کۆنترۆڵی سەرجەم کەرتە تایبەت و گشتیەکانیان کردووە، بەم شێوەیە بەشداریکردن و دەرکەوتنی ئافرەتان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا تا ڕۆژگاری بەقەزابوونی شارەکە بە مەرسوومی کۆماری ژمارە (١٥٩)لە (٢٨-٢-١٩٧٠) زۆر کەم بووە , ئەمەش بەهۆی بارە کۆمەڵایەتی و کلتوری و ڕامیارییەکانی ناوچەکەوە کە ڕێگربووە لە بەردەم دەرکەوتن و بەشداری کردنی ئافرەتان، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا شوێن و پێگە هاوشان لەگەڵ ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی تر ڕۆڵی گەورەی هەیە لەسەر پرسی جێندەر و ڕاکێشانی ژنان و کچان بۆ

---

[٢]علی سالم الشواورة، جغرافیة المدن، الطبعة الأولى، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، عمان، ٢٠١٢، ص١٧٠.

[٢] صباح علی سلێمان، کەلار(١٩٢٧-١٩٧٥) لێکۆڵینەوەیەک لە بارودۆخی سیاسی و کارگێڕی و ڕۆشنبیری، نامەی ماستەر(بڵاونەکراوە)، زانکۆی صەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٢١، ل٢٥-١٢٣.

کارکردنیان لە دامەزراوە حوکمی و ناحوکمی و بازاری کار و شەقام و شوێنە گشتیەکان، بەتایبەتی لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ و ڕووخانی ڕژێمی پێشووی عێراق و کردنەوەی دەرگای بازرگانی بەڕووی شارەکەدا لە نێوان وڵاتانی عێراق و ئێران و هەرێمی کوردستان کە پێش ڕووخانی ڕژێمی پێشووی عێراق سەرجەم ئەو ڕێگایانە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە داخرابوون و هاتوچۆکردن لێیانەوە قەدەغەبو، هەروەها قۆناغێکی تری گرنگ لە دەرکەوتنی ئافرەتان دەگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵی ٢٠١٤ بەهۆی گەشەسەندنی ئاستی پەروەردە و ڕۆشنبیری و زۆربوونی دەرچوانی زانکۆ و پەیمانگاکان و دانەمەزراندنیان و دواکەوتن و تێکچوونی سیستەمی مووچەی مووچەخۆرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، بوو بەهۆی ئەوەی کە ژمارەیەکی بەرچاو لە کچان و ژنان ڕوو لە کەرتە ئابوورییە جۆراوجۆرەکانی شارەکە بکەن بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئابووری سەربەخۆ.

نەخشەی (١) ، شوێن و پێگەی شاری کەلار بەگوێرەی عێراق و هەرێمی کوردستان



سەرچاوە: ١- حکومەتی هەرێمی کوردستان، بەڕێوەبەرایەتی گشتی شارەوانییەکانی گەرمیان، سەرۆکایەتی شارەوانی کەلار، بەشی (GIS)، نەخشەی بنەڕەتی شاری کەلار، بڵاونەکراوە، ٢٠٢٠.

٢- هاشم یاسین، سەردار محمد، هۆشیار محمد، ئەتلەسی هەرێمی کوردستانی عێراق و جیهان، چ ١، چاپخانەی تێنوش، ٢٠٠٩.

٣- بەکارهێنانی بەرنامەی (Arc Map GIS ١٠.٨.١).

## ٢/ لە گرنگترین ڕەگەزە سروشتییەکانی تر:

ئەگەرچی لێکۆڵینەوە لەسەر جوگرافیای جێندەر جەخت لە چوارچێوە فیکریی و بیردۆزی و ئامارییەکان دەکاتەوە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلە ڕەگەزییەکان، بەڵام توخمە سروشتییەکانی لەبیرنەکردووە کەپەیوەندیان بە تایبەتمەندییە شوێنییەکانەوە هەیە لە لەنیشینگە مرۆییەکاندا، بۆیە ئەم توێژینەوە بەشێوەیەکی کورت تیشک دەخاتە سەر چوار توخمی سەرەکی ڕۆڵیان لە پرسە جێندەرییەکان دا وەک (بەرزونزمی، کەش و هەوا، ئاو و خاک) هەیە.

شێوەکانی ڕووی زەوی لە گرنگترین خەسڵەتە سروشتیەکانە، لەبەرئەوەی یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی کە مرۆڤ ڕۆڵی لە دروستبوونیدا نییە، بەڵکو بەهۆی جووڵەی تەکتۆنی و چەمانەوە و شکان و قڵیشانی چینەکانی زەوی و کردارەکانی کەشکاری و ڕاماڵین و نیشتەنییەکانەوە دروست بووە، کە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە کۆبوونەوەی دانیشتوان و چۆنییەتی دابەشبوونیان، هەروەها کاریگەری ڕوونی لەسەر چالاکییەکانیان هەیە[1]، ناوچەی لێکۆڵینەوە لەڕووی بەرز و نزمیەوە دەکەوێتە ناوچەی بان و گردەکان کە بریتییە لە ناوچەیەکی (ڕاگوێزراو- انتقالی) لە نێوان ناوچەی شاخاوی لە باکوورو باکووری ڕۆژهەڵات و

[1] صبری فارس الهیتي- د. خلیل اسماعیل محمد، جغرافیة الاسطیان الریفي، الطبعة الأولى، بغداد، ١٩٨٩، ص١٢٦.

هەرێمی دەشتی نیشتەنی لە باشوور و باشووری ڕۆژهەلات [1]، بە سەرنجدان لە نەخشەی ژمارە (٢) ڕوون دەبێتەوە شاری کەلار کەوتووەتە نێوان بەرزی (٢٠٠ – ٢٩٠) م، لە ئاستی ڕووی دەریاوە، لە دەووروبەری قەڵای شێروانە و لێواری ڕووباری سیروان لە ڕۆژهەڵاتی شارەکەوە دەستپێدەکات بە بەرزی (٢٠٠) م تا بەرەو باکوور و ڕۆژئاوا هەڵکشێین بەرزتر دەبێتەوە، لە ناوەڕاستی شاردا بەرزی دەگاتە (٢٢٠) م لە هەرە باکووری ڕۆژهەڵات لە بەرزایەکانی (بەردەسوورە) بەرزی دەگاتە (٢٩٠) م لەئاستی ڕووی دەریا، بەشێوەیەکی گشتی ناوچەی لێکۆڵینەوە تا ڕادەیەکی زۆر تەختاییە و بەرز و نزمییەکی زۆری تێدا نییە، دروست بوونی شار لەسەر ئەم ڕووبەرە تەختە و تەریب بە ڕووباری سیروان لە سەرەتادا یارمەتیدەر بووە بۆ کۆبوونەوەی دانیشتووان و دروستبوونی ئاوەدانی کە دەرفەتی کشتوکاڵ و ئاودێری و لەوەڕاندن ئاسان کردبوو، ئەم پیشانەیش زۆرجار تەنیا بۆ پیاوان سنووردار کرابوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەم یەکسانبوونە لە تۆبۆگرافیای شارەکە و ئاسانکاری هاتوچۆ و دەستراگەیشتن بە چالاکییە دانیشتووانییەکان کاریگەری لەسەر بواری جێندەری نەبووە لە ناوچەی توێژینەوە.

نەخشەی ژمارە (٢) , بەرزونزمی شاری کەلار




[1] عەبدڵڵا عامر عومەر، بەرزونزمی ڕووی زەوی هەرێمی کوردستان، کتێبی جوگرافیای هەرێمی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە, هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٥-٥٦.

سەرچاوە: کاری توێژەر بەپشت بەستن بە : ١- بەکارهێنانی بەرنامای (Arc Map١٠.٥).
٢-حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان، بەڕێوەبەرایەتی گشتی شارەوانیەکانی گەرمیان , بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی کەلار، نەخشەی بنەڕەتی شاری کەلار٢٠٢٢.

کەش و هەوا یەکێکی ترە لە بنەماکانی جوگرافیای سروشتی، کە کار دەکاتە سەر دابەشبوونی دانیشتوان، بەهۆی پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان کەش و هەوا و مرۆڤەوە، کە توانیویەتی بەشێوەیەک ژیانی خۆی لەگەڵ هەلومەرجە کەش و هەوایەکاندا بگونجێنێت و خزمەتی چالاکییەکانی پێ بکات [1]، ئەو ڕۆڵەی لەسەر سیستەمی بەرهەم هێنانی ڕووەکی و چالاکیە کشتوکاڵیەکان دەیگێڕێ کاریگەری لە پرسە جێندەری و ڕەگەزییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، چونکە فێنمێنیستەکان پێیان وایە چەوسانەوەی ژن لە بنەڕەتدا پشت ئەستورە بە سەرهەڵدانی کشتوکاڵ، (سیمۆن دیبۆڤوار) لە کتێبی (ڕەگەزی دووەم)دا ئاماژە بەوە دەکات لەگەڵ پەیدابوونی کێڵان، فراوانبوونی کرداری کشتوکاڵی، پاککردنەوەی دارستان و داچاندنی کێڵگەکان کە پێویستی بەئیشی چڕوپڕ و دەستی کاری زیاتر هەبوو، لێرەوە پیاو هانای برد بۆ خزمەتگوزاریی پیاوەکانی تر و لە کۆیلایەتیدا قەتیسی کرد، بەهەمان شێوەش بوو بەخاوەنی ژن[2] .

ئاو و هەوای ناوچەی توێژینەوە بەشێوەیەکی گشتی سەربە ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاستە کە هاوینی گەرم و وشک و زستانی سارد و بارانی مامناوەندە، ئەو بارانەی لێیدەبارێت وەرزییە و سەر بە سیستەمی ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاستە , هاوینی وشک و باران بارینیشی دەست پێدەکات لە ناوەڕاستی وەرزی پایز بەردوام دەبێت تا کۆتای وەرزی بەهار، بڕی بارانی

[1] الدكتور عبد الكاظم على الحلو، دراسات في المناخ الطبيعي، الطبعة الأولى، المطبعة شركة المارد-النجف الاشرف، النجف،٢٠٢١، ص٥.

[2] سیمۆن دیبۆڤوار، ڕەگەزی دوەم، وەرگێڕانی: کارزان کاوسێن، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئایدیا، ٢٠٢١، ل٧٤.

ساڵانەی لەنێوان (٢٠٠-٤٠٠)ملمە [١]، ئەم برەش جیاوازە لە ساڵێكەوە بۆساڵێكیتر و گۆرانكاری بەسەردا دێت، چونكە ئەم ناوچەیە دەكەوێتە ناوچەی بارانی نامسۆگەر، هەروەها تێكڕای پلەكانی گەرمی شاری كەلار دەكەوێتە ئەو ناوچانەی كە ئاو هەوای جیاوازە، بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لە مانگەكانی هاویندا (حوزەیران و تەمووز و ئاب) كە مانگی تەمووز گەرمترین مانگەكانێتی پلەی گەرمی دەگاتە (٣٦)پلەی سەدی، بەڵام لە وەرزی زستاندا پلەكانی گەرمی نزم دەبنەوە لە مانگەكانی (كانوونی یەكەم و كانوونی دووەم شوبات) كە مانگی كانوونی دووەم ساردترین مانگەكانێتی پلەی گەرمی دادەبەزێت بۆ (٩.٥)پلەی سەدی [٢]، هەروەها ئاراستە و خێرایی با لە ناوچەكەدا لەئەنجامی جیاوازی دەركەوتنی سەنتەرەكانی پەستان لە دەوروبەری ناوچەكە بە تایبەت لە وەرزی هاوین و زستاندا دەبنە هۆی دروستبوونی ئاراستەی جیاواز لە بایەكان، ئەو بایانەی لە وەرزی زستان هەڵدەكەنە سەر ناوچەكە، بریتیین لە بای باكور و باكوریی خۆرئاوا و بای پێچەوانەی خۆرئاوا و بای باشوری خۆرهەڵات، بەڵام ئەو بایانەی لە وەرزی هاوین هەڵدەكەنە سەر ناوچەكە بریتیین لە بای باشوری خۆرئاوا كە بایەكی وشكە و هەندێكجار تۆزی لەگەڵدایە، هەروەها بای باكوری خۆرئاوا كە بە (بای شەماڵ) ناسراوە بایەكی وشك و گەرمە، هەروەها خێرایی با لە ناوچەی لێكۆڵینەوە بەپێی مانگ و وەرزەكان جیاوازە [٣].

سەرچاوە ئاوییەكانیش كە ڕۆڵێكی كاریگەر دەبینن لە گەشە و فراوانبوونی ئاوەدانیەكاندا، بە هۆیەوە مرۆڤ لە دەوروبەری سەرچاوە ئاوییەكان نیشتەجێبوون، بەتایبەتی لە ناوچە وشك و نیمچە وشكەكان، لەبەر ئەوەی مرۆڤ و چالاكییەكانی ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە دەرامەتی ئاوەوە وەك بەكارهێنانی ئاو بۆ ژیانی ڕۆژانە و بۆ مەبەستی چالاكییە كشتوكاڵیەكانی و

[١] الدكتۆر شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحي الطبيعة والبشرية، الطبعة الأولى، مطبعة شفيق،١٩٧٣، ص١١٠.

[٢] بەڕێوەبەرایەتی گشتی كشتوكاڵی گەرمیان، بەشی كەشناسی، داتای بڵاونەكراوە،٢٠٢٢.

[٣] مقداد شاكەلی، شاری كەلار لێكۆڵینەوەیەك لە جوگرافیای شار، چاپی یەكەم، چاپخانەی گەنج، ٢٠١٦، ل٤٣-٤٧.

ئاژەڵداری...هتد، بە سەرنجدان لە نەخشەی (٤) بۆمان دەردەكەوێت شاری كەلار یەكێكە لەو شارانەی شوێنەكەی لەسەر ڕووباری سیروان هەڵكەوتووە، ئەم ڕووبارە سەرچاوەیەكی سەرەكی ئاوی ژێر زەوی و كشتوكاڵی و گوزەرانی خەلكی ناوچەكەیە، ڕۆڵێكی بەرچاوی بینیوە لە دابین كردنی پێداویستیەكانی ڕۆژانەی دانیشتوانی شار و چالاكییە كشتوكاڵیەكانیان لە ڕابردوو و ئێستادا.

نەخشەی ژمارە (٣) , دەرامەتی ئاو




سەرچاوە: كاری توێژەر بە پشت بەستن بە ١- بەكارهێنانی بەرنامای (Arc Map١٠.٥).

٢-حكومەتی هەرێمی كوردستان، وەزارەتی پلاندانان،بەڕێوەبەرایەتی گشتی شارەوانیەكانی گەرمیان، بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی كەلار، نەخشەی بنەڕەتی شاری كەلار٢٠٢٢.

خاك یەكێكی دیكەیە لە بنەما سروشتیەكان، كە چینێكی تەنكە ڕووی زەوی داپۆشیوە، تێكەڵەیەكی ئاڵۆزە لە ماددەی كانزایی و ئەندامی و ئاو و هەوا [1]، خاكی ناوچەی لێكۆڵینەوە

[1] الدكتور علی حسین الشلش، خغرافیة التربة، الطبعة الثانیة، مطبة جامعة البصرة، البصرة، ١٩٥٨، ص١٣.

لەجۆری قاوەیی مەیلەو سورە لە زۆربەی بەشەكانی خاكدا، چینەكانی ناوەوەی سوورترە، پێكهاتەی خاكەكەی تێكەڵاوە لە جۆری بەردی خۆڵین و بەردی گەچین، بەسەر سێ چیندا دابەش دەكرێت ئەوانیش بریتین لە (چینی نیشتوی نوێ، چینی بەختیاری سەرو، چینی بەختیاری خوارو) [1]، ڕێژەی ئۆرگانی تێیدا گونجاوە و دەگاتە (١-٢٪)[2]، جۆرێكی تری خاك (خاكی نیشتەنیە) كەلە ئەنجامی كرداری ڕامالینی ڕووباری سیروان دروست بووە، خاكێكی فشەڵە و توانای هەڵمژینی ئاوی زۆرە و شۆرەكاتی كەمە و بۆ كشتوكاڵ كردن زۆر شیاوە، بە شێوەیەكی گشتی دەشتە كشتوكاڵیەكانی ناوچەی لێكۆڵینەوە بە باشترین زەوییەكان دەژمێردرێن لە ڕووی بەپیتی و تەختاییەوە.

ئاشكرایە شاری كەلار لە سەرەتادا وەكو گوندێكی كشتوكاڵی و ئاژەڵداری لە سەرخۆ ئاوەدان كراوەتەوە، خەسڵەتە ئاو و هەواییەكان لە دەركەوتنی چوار وەرزەی ساڵ و زەوی تەخت و بەپیت و سەرچاوەی ئاوی ڕووباری سیروان لە سەرەتادا هۆكاربوون بۆ كۆبوونەوەی دانیشتوان و دروستبوونی نیشینگەیەكی مرۆیی، بەڵام كاریگەری فاكتەرە سروشتییەكان لەسەر لایەنی ڕەگەزی لە ناوچەی توێژینەوە جیاوازی هەیە لە ئێستا و ڕابردوودا، لە ڕابردوودا ژنانی ناوچەی توێژینەوە هەروەكو ناوچەكانی تری هەرێمی كوردستان بەزۆری لەماڵەوە بوون، بەشداریكردنیان لە سەرجەم سێكتەرە كۆمەڵایەتییەكان زۆركەم بووە، بەڵام ئەو خێزانانەی كە بە كاری كشتوكاڵیەوە خەریكبوون ژنان شان بەشانی پیاوان لە كێڵگە كشتوكاڵیەكان و لە ناو باخ و بێستانەكاندا كاریان كردووە، هەروەها لەوەرزی بەهاراندا پاش نیشتنەوەی لافاوی سیروان ژنانی ئەم شارە بەكۆمەڵ دەچوون بۆ كۆكردنەوەی وردە دار و دەوەن كە بەهۆی لافاوەوە لە كەناری ڕووبارەكە بەجێمابوون[3]، هەروەها كۆكردنەوەی ڕووەكی كێوی بەهارە بۆ بەكارهێنان و ڕایكردنی ژیانی ڕۆژانەی خێزانەكانیان و هەندێك جاریش ئەو بەرهەمە كۆكراوانە

---

[1] لیلا محمد قارەمان، خاكی هەرێمی كوردستان، كتێبی سەنتەری برایەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی كوردستانی عێراق، چاپی دووەم, هەولێر، ١٩٩٩، ل٨٠.

[2] ا الدكتۆر شاكر خصباك، العراق الشمالي دراسة لنواحي الطبيعة والبشرية، مصدر سابق، ص١١٠.

[1] چاوپێكەوتن لەگەڵ بەرێز شێخ محمد شاكەلی،٥/١٨ / ٢٠٢٢.

لە بازاڕی شارەكەدا دەفرۆشرا بەمەستی بژێوی خێزانەكانیان، جێگەی ئاماژە پێكردنە زۆربەی ئەم كارانەی ژنان كاری بێ هەق دەست و كرێ بوون بەڵكو بەزۆری هاوكاریكردنی خێزان بوون، بەڵام ئێستا كاریگەری خەسڵەتە جوگرافییایە سروشتییەكان لە پرسە جێندەریەكاندا لە شارەكەدا زۆر كەمی كردووە ، بەهۆی ئەوەی ژنان زۆركەم لەو كەرتانەدا كاردەكان كە بنەما سروشتییەكان كاریگەرییان لەسەر هەیە، وەكو چالاكیە كشتوكاڵ و ئاژەڵیەكان، بەڵكو زیاتر پیشەی كشتوكاڵی پیاوان ئەنجامی دەدەن لە زەوییەكانی دەوربەری شارەكە بەهۆی قورسی و گرانی كاركردن و بایەخ پێنەدانی دەسەڵات بۆ بوژانەوەی بەرهەمی ناوخۆیی، هۆكاربووە بۆ ئەوەی دەستی كاری ژنان لەم كەرتانەدا بەرەو نەمان ڕێچكە بگرێت.

## تەوەری دووەم/ ڕەهەندە مرۆییەكان:

مرۆڤ بوونەوەرێكی كۆمەڵایەتییە و هەمیشە لە پەیوەندیدایە لەگەڵ ئەوانی تردا و بەشێوەیەكی گشتی لە ناو سیستەمێكی كۆمەڵایەتیدا ژیان بەسەر دەبات، هەر كۆمەڵگایەك سروشتی تایبەتی خۆی هەیە، و خاوەنی كۆمەڵێك سیستەم و پێودانگە كە ژیانی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا ڕێك دەخەن، لە كۆمەڵگایەكەوە بۆ كۆمەڵگایەكی تر دەگۆڕێن، وەك داب و نەریت، بەهاكۆمەڵایەتیەكان، ڕەفتار...هتد، لەگەڵ جێگیر بوونی ئەم دیاردە كۆمەڵایەتیانە لە چوارچێوەی كلتوردا ئەركە كۆمەڵایەتیەكان بەرجەستە دەكەن، وەكو دابەشبوونی دەسەڵات و ئایین و پەروەردە، ئەم ئەركانەش لەگەڵ ژینگەی سروشتی بەرهەم و بنەما ماددییەكەی كۆمەڵگا پێكدێنن، ڕۆڵی پێناسەكراوی ئەم ئەركە كۆمەڵایەتیانە بۆ هەردوو ڕەگەزی (نێر و مێ) جیاوازییەكانی نێوان ژنان و پیاوان دیاری دەكات لەڕووی دەست گەیشتن بەسامان و بڕیاردان، هەرچەندە جیاوازی هەیە لە نێوان كۆمەڵگاكاندا بەڵام بنەمای سەرەكی ئەوەیە كە جیاكاری و ناهاوسەنگی لە پەیوەندی نێوان ڕەگەزەكان لە بەرژەوەندی پیاواندا هەیە[1]،بۆیە مەسەلە ڕەگەزییەكان بەشێوەیەكی گەورە پەیوەستن بە فاكتەرە مرۆییەكانەوە، لەم ڕوانگەیەوە

---

[1] الدكتور عبدالله عطوى، السكان والتنمية البشرية،الطبعة الأولى، دارالنهضة العربية،بيروت-لبنان،٢٠٠٤،ص٥٢٧.

كاریگەری بنەما مرۆییەكان لە سەر پرسی جێندەر لە ناوچەی توێژینەوە بەم شێوەی خوارەوە دەخەینەڕوو:

**یەكەم/ ڕەهەندی كۆمەڵایەتی:**

چەمكی كۆمەڵگا (Socitey) ئاماژەیە بە كۆمەڵە كەسێك كە سیستمێكی نیمچە داخراو پێكدەهێنن، ئەم سیستەمەش تۆڕی پەیوەندییەكانی نێوان دانیشتوان پێكدێنێت، بە شێوەیەكی سادەتر كۆمەڵگە بریتییە لە كۆمەڵە كەسێك كە بەشێوەیەكی ڕێكخراو لەناو گروپێكی ڕێكخراودا پێكەوە دەژین لە شوێنێكی دیاری كراودا كە كۆمەڵێك پەیوەندی كلتوری و كۆمەڵایەتی پێكەوە دایانبەستێتەوە[1]، بەڵام ژیانی كۆمەڵایەتی سیستەمێكە لە عورف و دەسەڵات و لایەنە جۆراوجۆرەكانی كۆنترۆڵكردنی هەڵسوكەوت و ئازادییەكانی مرۆڤ پێكدێت، واتە چوارچێوەیەكی سنورداركردن و ڕێكخراوە كە كۆمەڵە كەسێك كۆدەكاتەوە و چۆنیەتی پەیوەندییەكانی نێوانیان دیاری دەكات[2].

جوگرافیا گرنگی بەم لایەنە دەدات، چونكە پەیوەندی بە شێوازی ژیانی مرۆڤەوە هەیە لە ژینگە جیاوازەكاندا و لە مەودا جوگرافییە هاوشێوە و جیاكراوەكاندا بە ئامانجی چاودێری كردنی جیاوازییە شوێنیەكانی شێوازی ژیانی مرۆڤ و كاریگەری فاكتەرە جوگرافی و ژینگەیەكان لەسەر شێوە تایبەتەكانی ژیانی گرووپە مرۆییەكان و ئەو بەشە كۆمەڵایەتیانەی كە كۆمەڵگا بە گشتی پێكدێنن، كۆمەڵگا بەپێی جۆر لە دوو پارچەی گەورە پێكدێت كە بریتین لە (كۆمەڵگەی مێینە و كۆمەڵگەی نێرینە)بە نزیكەی یەكسان[3]، بەڵام ڕەگەزی

---

[1] ر.م.ماكيڤر- سارلز هـ .بيج، المجتمع، ترجمة الدكتور على احمد عيسى، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، مصر، ٢٠٠٠،ص١٦.

[3] غريب محمد أحمد، مجتمع القرية- دراسات وبحوث، دار المعرفة الجامعة – الاسكندريه، مصر،١٩٨٧،ص٤٥.

[3] فتحى محمد مصيلحى، الجغرافية الاجتماعية(الاطار النظري- وتطبيقات عربية، الطبعة الثانية، مطبعة جامعه المنوفيه، مصر،٢٠٠٠،ص١٩.

مێینە بەهۆی مێینەبوون و كۆت وبەندە كۆمەڵایەتییەكانەوە پلەی دووهەم و بنكی هەرەمی كۆمەڵگای گرتووە لە كاتێكدا پیاو لە لوتكەی ئەو هەرەمەدایە، لەم باسەدا هەوڵدەدەین ڕۆڵی فاكتەرە كۆمەڵایەتیەكان لەسەر پرسی جێندەر و دۆخی ژنان لە شاری كەلار بخەینەڕوو:

### ١-خێزان:

دامەزراوە كۆمەڵایەتیەكان ئامرازی بەیەكەوەبەستنی ژیانی كۆمەڵایەتین، كە ڕیزبەندییە بنەڕەتیەكانی ژیانی مرۆڤەكان فەراهەم دەكەن، لە كارلێكی بەرامبەر لەگەڵ یەكتر ئەنجامی دەدەن لە ڕێگەی ئەو ڕیزبەندییە بنەڕەتیانەشەوە ژیان بەردەوام دەبێت و درێژەدان بەڕەچەڵەكەكان بەدی دێت، ئەمەش لەڕێگەی دامەزراوەی هاوسەرگیری و خێزانەوە دەست پێدەكات[(١)]، لە قۆناغە بەراییەكانی مێژووی مرۆڤایەتیدا لە ناو خێڵەكاندا كە خێزان بە شێوە نەریتییەكەی ئێستای نەبوو، هەروەها كار هێشتا پێناسەیەكی ئابووری نەبوو، لەم جۆرە پەیوەندییەدا خێزان بەدەست ژن بووە، هیچ بەڵگەیەك نییە باوكی پێ بناسرێتەوە و ڕەچەڵەك بەپێی مافی دایك تەنها لە ڕێگەی دایكەوە دەتوانرا دیاری بكرێت[(٢)]، بەڵام بەدەركەوتنی سیستەمی كۆیلایەتی كۆیلەداران خێزانە شكۆدارەكانیان هێنایەكایەوە، خێزان بەلای كۆیلەدارانەوە زۆر گرنگ بووە، چونكە یەكێكە لە چەقەكانی گوشار و داگیركاری، لێرەوە نایەكسانی و كۆیلایەتی بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپێنرا و ژنیش یەكەمین چینە كە بەم نایەكسانی و كۆیلایەتییە مامەڵەی لەگەڵدا كراوە[(٣)]، لێرەدا ڕۆڵی خێزان لەسەر پرسی جێندر لەناوچەی توێژینەوە وەك مەڵبەندێكی هەرێمی كوردستان دەخەینەڕوو، ئاشكرایە خێزانی كۆنی كورد خێزانێكی باوك سالارییە، زیاتر بۆ باوك دەگەڕێتەوە، سەرۆكی خێزان بەگوێرەی داب و نەریتی كوردەواری خاوەن دەسەڵاتێكی فراوان بووە[(٤)]، پیاو زاڵە و هەر ئەویش هەڵگری ناوی

---

[(١)] الدكتور على عبدالواحيد وافي، الأسرة والمجتمع، الطبعة الثانية، ١٩٤٨،ص٢١.

[(٢)] د.محمد شوانی،سۆسۆلۆژیای چینە كۆمەڵایەتییەكان، چاپی یەكەم،چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر،٢٠١٢،،ل٢٣٣.

[(٣)] Richard peet, Modern Gographic Thought,Second edition, Rawat Publications, New Delhi-India,٢٠١١, P٢٧٢.

[(٤)] فائزة محمد عزت، الحياة الاجتماعية للكورد(٤-٩هـ /١٠- ١٥م)، مطبعة الحاج هاشم، اربيل، ٢٠٠٩،ص٨٩.

خێزانەکەیەتی، هەموو کار وپیشەیەکی جیاواز دەکات لە پێناو دابینکردنی گوزەران بۆ ئەندامانی خێزانەکەی، فاکتەری ئابووری بەپلەی یەکەم ڕۆڵی لە دەسەڵاتی باوک سالاریدا (البطرگیة- Patriarchal) بینیوە، وە لەبەرئەوەی داهاتە ئابوورییەکەی کشتوکاڵی و شوانکاری بووە، لەم کردارە ئابوورییەیشدا پیاو ڕۆڵی سەرەکی و باڵادەستی بینیوە، هەرچی ژنیشە ڕۆڵێکی کەمتری هەیە بەراورد لەگەڵ پیاودا و لە پلەی خوار باوکە[1]، ناوچەی توێژینەو وەک بەشێک لە هەرێمی کوردستان خاوەن هەمان سیستەمی خێزانی تاڕادەیەک توندتریش بووە بەهۆی زاڵبوونی زیاتری کلتور و داب و نەریتەکانەوە، قەبارەی خێزان گەورەبووە و زۆرێک لە خێزانەکان لە باپیر و داپیر و منداڵەکانیان و منداڵزاکانیان پێکهاتوون، وابەستە و ڕێزێکی زۆر بۆ بەساڵاچوان لە خێزاندا هەبووە پەیوەندی خزمایەتی زۆر بەهێز بووە، پیاو و کوڕەکانی ئەرکی ئابووری خێزانیان لە ئەستۆ گرتووە و دایکیش لە چوارچێوەی ماڵدا بەرپرسیارێتی پەروەردەکردن و چاودێری کردنی منداڵەکانی لە ئەستۆ دابوو، سەرەڕای چاودێری کردن و خزمەتکردنی بەساڵاچوان، دایک و کچەکان کاروباری ڕۆژانەی ماڵەوەیان ئەنجام دەدەن، باوک بڕیاردەری ژیانی منداڵەکانی بوو بەتایبەتی کچەکانیان، کارکردنی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ زۆر دەگمەن بووە، بەڵام خێزانی نوێ تا ڕادەیەکی بەرچاو ئەو سیمبولانەی ڕابردووی لەدەست داوە، قەبارەی خێزان بچوکە و بە کەمی ژمارەی منداڵ دەناسرێتەوە، زۆرێک لە دایکەکان سەرەڕای کاری ماڵەوە و پەروەردەکردن و بە خزمەتکردنی منداڵ کاری دەرەوەشیان هەیە، چ لە فەرمانگە و دامەزراوە گشتی و حوکمییەکان بێت یاخود کەرتی تایبەت، کچان و ژنان بەڕێژەیەکی بەرچاو لە بازاڕی کار و کەرتی ئابووردا دەبینرێن، بەڵام لەگەڵ ئەم کرانەوە کۆمەڵایەتییەشدا تا ئێستا هەندێک لە خێزانەکان خۆیان بڕیاردەری ژیانی کچان و ژنانی خێزانەکانیانن، و ڕێگری دەکەن لە کارکردنیان لە دەرەوەی ماڵ.

---

[5] شاكر خضباك،الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق، بغداد،١٩٧٢،ص٤٥٧.

**٢- كلتور:**

چەمكی كلتور و كۆمەڵگا یەكێكن لە و باسانەی كە زۆر لەگەڵ یەكتریدا بەكار دەهێنرێت، چونكە كلتور بریتییە لەو بەهایانەی كە ئەندامانی گرووپێكی دیاریكراو هەیانە كە نەوە بۆ نەوە لە رێگەی ئەو كۆمەڵگەی تێیدا ژیاوە گواستراوەتەوە [1]، جوگرافیا گرنگی بە روونكردنەوەی پەیوەندی نێوان جۆر و شێوەی ژیانی مرۆڤ بەپێی ئیمكانیاتە كلتورییەكانی لە چوارچێوەیەكی جوگرافیدا دەدات، چونكە هەر كلتورێك شوێنێكی جوگرافی هەیە، كە لە لایەن ئەندامە كۆمەڵایەتییەكانەوە بنیاتنراوە [2]،شوناسی جێندەری و پەیوەندییە رەگەزییەكانیش یەكێكن لە لایەنە گرنگەكانی كلتور، چونكە شێوەی ژیانی رۆژانەیان لە خێزان و كۆمەڵگا و شوێنی كاردا دەردەخسێنێت [3]، جێندەر وەكو پرەنسیپێكی رێكخستن بۆ كۆمەڵگا كاردەكات، بەهۆی ئەو مانا كلتوریانەی كە بە نێربوون یان مێبوون دراون، ئەمەش لە دابەشبوونی كاردا بەرووونی رەنگی داوەتەوە، لە زۆربەی كۆمەڵگاكاندا شێوازی رووونی كاری ژنان و كاری پیاوان هەیە لە ناو ماڵ و كۆمەڵگادا، ئەمەش شرۆڤەی كلتوری هەیە كە بۆچی دەبێت ئاوابێت، هەر چەندە سروشتی تایبەت بە پەیوەندییە رەگەزییەكان لە نێوان كۆمەڵگاكاندا جیاوازە، بەڵام شێوازی گشتی ئەوەیە كە ژنان تایبەتمەندی كەمتریان هەیە و سەرچاوەی كەمتریان لەبەردەستدایە كاریگەری كەمتر و سنوورداریان لە سەر ئەو پرۆسە و بریارانە هەیە كە ژیانی خۆیان و كۆمەڵگاكانیان پێكدەهێنێت، ئەم شێوازی جیاوازییەش لەسەر بنەمای جێندەری لە هەموو كۆمەڵگاكاندا رەنگی داوەتەوە [4]، كاریگەری كلتور لەسەر پرسی جێندەر لە ناوچەی توێژینەوە جیاوازی زۆری هەیە لە نێوان ئێستا و رابردوودا، بەهۆی پەرەسەندنی جیهانگیری و پێشكەوتنی تەكنەلۆجیا كە كاریگەری گەورەیان لەسەر تێكەڵاو بوونی كلتورە جیاوازەكانی

---

[1] H.J.de Blij, HUMAN GEOGRAPHY Culture, Society,and space,Fifth edition,١٩٩٩, p٨٧.

[2] أ.د.معین خلیل العمر، علم اجتماع الجندر، طبعة الأولى، سیدنی-استرالیا،٢٠١٤ ،ص٢٤.

[3] DAVID INGLIS ,Culture and Everyday Life, First edition, UK, ٢٠١٥, p٣-٤.

[4] Paola Giuliano, Gender and Culture, LZA-institute of labor Economics ,Location Network(www.iza.org),٢٠٢٠,P١-٥.

جیهان کردووە، ئەم تێکەڵاو بوونەش کاریگەریان لەسەر بیری تاکەکان دروستکردووە لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا وەکو ئاشنا بوونی کۆمەڵگاکان بە پێشکەوتنەکانی وڵاتانی گەشەسەندوو لە بوارەکانی زانست و مەعریفە و تەکنەلۆجیا و شێوازی ژیانیان ...هتد، ئاشکرایە کە پێشکەوتنی پەروەردە و زانست لە هەر کۆمەڵگایەکدا دەبێتە هۆی پێشکەوتی ئەو کۆمەڵگایە و یەکسان بوونی تاکەکانی، دیارە ناوچەی توێژینەوەش لە ڕابردوودا کۆمەڵگایەی ئاست نزم بووە، لە ڕووی پەروەردە و زانستەوە ئەمەش کاریگەری لەسەر باڵا دەستی کلتور و داب و نەریتی پیاوسالاری هەبووە لە ناوچەکەدا.

ئافرەتان بە زۆری بە کاری ماڵەوە خەریک بوون، بەڵام ئەو خێزانانەی کە کاری کشتوڵیان کردووە، ژنان هاوکاری خێزانەکانیان کردووە و بەشداربوون لە بە ئەنجام گەیاندنی قۆناغە جیاجیاکانی کاری کشتوکاڵی، ئەوەی لێدەرچێ بەهیچ شێوەیەک کاری سەربەخۆی ژن لەدەرەوەی ماڵ نەبووە، بەڵام لە ئێستادا بەهۆی پێشکەوتنی ئاستی ڕۆشنبیری و تەکنەلۆجیا و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و ئاشنابوونی کلتورە جیاوازەکان کاریگەری کلتور بەرەو کاڵبوونەوە ڕۆشتووە ژنانیش بەڕێژەیەکی بەرز ڕوویان لە ناوەندە گشتی و تایبەتەکان کردووە و خاوەن بڕیار و کاری خۆیانن، لەگەڵ ئەوەشدا تاوەکو ئێستاش هەندی لە خێزانەکان پیاوەکان بڕیاردەری ئافرەتەکانیان و ڕێگیری لە کارکردن و چونەدەرەوەیان دەکەن، بە تایبەت کارکردنیان لە کەرتی تایبەت دا .

**٣/ ئایین:**

لە ڕوانگەی جوگرافییەوە لەوەوەسەرچاوە وەردەگرێت کەلە هەموو بەشەکانی جیهاندا هەیە و بەربڵاوە، بۆیە جوگرافیا گرنگی بەم لایەنە دەدات و لە چوارچێوەیەکی کلتوریدا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات، چونکە پەیوەندی بە خودی مرۆڤ هەیە، نەک تەنیا وەک تاکێکی سەربەخۆ، بەڵکو وەک بەشدار و هەڵگری مەسەلە کلتورییەکان، لێکۆڵینەوە لە پەیوەندیە کلتوریەکان سەرنج دەخاتە سەر توخمی ئایین لە کلتورەکاندا، لەبەرئەوەی یەکێکە لە گرنگترین پێکهاتەکانی گرووپە کلتورییەکان، کە شێوازی جوگرافی ڕوون پیشان دەدات، بۆیە لقێک بەناوی جوگرافیای ئایینەکان (جغرافية الاديان) لە ناو جوگرافیادا سەری هەڵداوە، کە گرنگی بە چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی ئایین لەسەر زەوی و کاریگەرییە کۆمەڵایەتی و کلتوری و

ژینگەیەکانی دەدات، بە شێوەیەکی تایبەت نەخشەکێشان و لێکدانەوە و بەراوردکردن و شیکردنەوە بۆ ئایینە جۆراوجۆرەکان دەکات، هەروەها جوگرافیای ئایین زیاتر دەکۆڵێتەوە لە کاریگەرییەکانی ئایین لەسەر مەسەلە دیمۆگرافی و جێندەری و رامیاریی و ژینگەیەکان[1]، لەرووی جێندەرییەوە یەکێکە لە و میکانیزمانەی کە لە رێگایەوە پیاو ناوەندبوونی خۆی و پلە دوویی ژنانی دووپاتکردووەتەوە و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ژندا سەپاندووە[2] ، ناوچەی توێژینەوە وەک بەشێک لە هەرێمی کوردستان ئایینی ئیسلام پتر لە ئایینەکانی تر کاریگەری لەسەر دانیشتوانەکەی هەیە، بە حوکمی ئەوەی زۆرینەی خەڵکی پەیڕەوی ئایینی ئیسلام دەکەن، لەگەڵ کەمینەیەک لە موسڵمانی شیعە مەزهەب و پەیڕەوانی ئایینی کاکەی، سنوری ئایین و داب و نەریت لە زۆر شوێندا تێکەڵ بەیەک کراون، لە لایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە زۆر شت بەناوی ئایین و لە ژێر لێکدانەوەی ئایینەدا دەکرێن کە بیروباوەڕی خەڵک و داب و نەریتی کۆمەڵایەتین، بێگومان ئەمەش کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا جیاواز بووە لە قۆناغە مێژووییەکانی شارەکەدا، لە رابردوودا بەهۆی داخراوی کۆمەڵگا و لاوازی ئاستی رۆشنبیری کۆمەڵایەتی کاریگەری گەورەی لەسەر پرسە جێندەرییەکان بەجێهێشتووە، بەڵام لە ئێستادا بەهۆی کرانەوەی کۆمەڵگا و بەرزبوونەوەی ئاستی پەروەردە و رۆشنبیری و شارەزابوون و تێگەیشتنی زیاتر لە ئایین بەشداری کردنی ژنان لە سەرجەم سێکتەرەکاندا بەرەوپێش چوونی گەورەی بەخۆییەوە بینیوە.

---

[1] دافید سوفير، جغرافية الأديان، ترجمة: أحمد غسان سبانو، الطبعة الاولى، الطباعة والنشر دار قتيبة،١٩٩٠،ص٦.

[2] ريید، ئیڤلین ، پێکهاتەی بەدەنی و چارەنوسی ئافرەت، وەرگێڕانی حەمەکریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئارا، کەرکوک، ٢٠٠٦.،ل٥.

## ٤-پەروەردە و ڕۆشنبیری:

جیاوازی جێندەری لە پەروەردەدا كەلێنێكی گرنگی هەیە لە تەواو نەكردنی فێربوون و بەردەوام نەبوونی خوێندن لە زۆربەی ژینگەكاندا، كە زۆربەی كات كاریگەری لەسەر ڕەگەزی مێینە هەبووە بەبەراورد بە ڕەگەزی نێر، ئەگەرچی ژن یەكێكە لە پایە سەرەكیەكانی ژیان لەهەموو كۆمەڵگا مرۆییەكاندا، لەزۆربەی وڵاتاندا تەنانەت وڵاتە گەشەسەندوەكانیش ژنان پلەی پیاوان لە پێگە و ڕۆڵە كۆمەڵایەتیەكان وەرناگرن و بەگشتی نكوڵی لە بەها ماددی و مەعنەوییەكانیان دەكرێت (١)، سەرەڕای بەرزبوونەوەی ڕێژەی مێینە لە كەرتی پەروەردە لە كۆمەڵگا گەشەسەندووەكاندا، بەڵام ڕێكخراوەكانی ژنان بەردەوامن لە ئاماژەدان بە جیاوازییە جێندەرییەكان لەسەر ئاستی پەروەردەیی و دامەزراوە فێركارییەكاندا بەتایبەتی لە زانكۆ و پەیمانگاكانی خوێندنی باڵادا (٢)، لە ناوچەی لێكۆڵینەوە تا پێش سییەكانی سەدەی ڕابردوو خەڵك لە مزگەوت و حوجرەوە فێری خوێندەواری بوون، تا لەسەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی لە عێراق، بە هەوڵی (حەمە بەگی جاف )لە كەلار یەكەمین قوتابخانە كراوەتەوە لە ساڵی ١٩٣١ بە ناوی (كەلاری سەرەتایی)، بەپێی ژمارە (١)تۆماری گشتی (قید عام)ی قوتابخانەكە لە ساڵی خوێندنی ١٩٣١-١٩٣٢ دا، سی وسێ (٣٣) فێرخواز دەستیان بە خوێندن كردووە كە (٢٩) كوڕ و (٤) كچ بوون، بەپێی زانیارییە تۆماركراوەكانی قوتابخانەكە منداڵان تا پۆلی چوارەمی سەرەتایی خوێندوویانە، بۆ خوێندنی پۆلی پێنجەم بۆ قەزای كفری دەنێردران (٣)، ئەمەش كۆسپێك بووە لە بەردەم كچاندا و نەیان توانیوە درێژە بە قۆناغەكانی خوێندن بدەن، چونكە دەبوایە دوای قۆناغی چوارەمی سەرەتای بچنە شاری كفری ئەمەش گونجاو نەبوو، بەهۆی ڕەوشە كۆمەڵایەتی و كلتورییەكانی ناوچەكەوە، هەر چەندە لەو كاتەدا بەهۆی بارودۆخی ئەو سەردەمەوە خوێندن گرنگیەكی ئەوتۆی نەبووە، قوتابیەكان لەبەر هەژاری و

---

(١) د.محمد صبری الحوت- د.ناهد عدلي شاذلي، التعليم والتنمية، بدون تاريخ طبع، مكتبة النجلو المصرية،١٩٥٧،ص١٤٠.

(٢) أنتوني عدنز، علم الاجتماع، ترجمة: الدكتور فايز الصياغ، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٥،ص٥٦٢-٥٦٣.

(٣) صەباح علی سلێمان، سەرچاوەی پێشوو،ل١٤٣.

كاری كشتوكاڵی و ئاژەڵداری لەلایەن خێزانەكانیایەوە لە خوێندن دەردەكران، لە ماوەی ساڵانی (١٩٣١-١٩٤١) لە قوتابخانەی كەلاردا (١١٠) فێرخواز ناویان تۆماركراوە، كە (٩٢)لەڕەگەزی نێر و (١٨)شیان لە ڕەگەزی مێ بووە، تا ساڵی ١٩٥٨ (٤٦) فێرخوازی كچ ناویان تۆمار كراوە (١)، بەڵام جێگەی ئاماژە پێكردنە لەسەرەتای كرانەوەی قوتابخانە لە كەلار لە ساڵی ١٩٣١ تاوەكو ١٩٧٣ هیچ داتا و زانیارییەک نیە ئاماژە بە هەبوونی مامۆستای ئافرەت بكات لە نێوان ئەو ساڵاندا، تا ساڵی١٩٧٣ قوتابخانەیەكی تر لە كەلار دا كراوەتەوە و بەڕێوەبەرەكەیشی ئافرەت بووە و(٣) ئافرەتی دیكەش لەو قوتابخانەیە وەک مامۆستا دەرسیان وتووەتەوە، بەشێوەیەكی گشتی بەشداری كردنی كچان و ژنان لەو سەردەمانەدا لە بواری پەروەردە و دامەزراوە حوكمییەكاندا زۆركەم بووە، لەساڵی ١٩٨٠ لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە و گەیاندنی گەرمیان كە یەكێكە لە كۆنترین بەڕێوەبەرایەتییەكان لە شارەكەدا تەنیا (٣) ئافرەتی لێبووە كە ئەوانیش خەڵكی كەلار نەبوون (٢)، جێگەی ئاماژەیە ئەو ئافرەتانەی كە وەک فەرمانبەر یان مامۆستا كاریانكردووە لە حەفتا و هەشتاكاندا لە شارەكە زۆربەیان خەڵكی شارەكە نەبوون، بەڵكو خەڵكی شارەكانی كفری و خانەقین بوون، ئەمەش بەهۆی بارودۆخە كۆمەڵایەتی و كلتوورییەكانی ئەو كاتەی ناوچەكە و ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە سیاسیەیی كە ڕووبەڕووی ناوچەكە و كوردستان بەگشتی بووەتەوە، بەهۆی هێرشەكانی حكومەتی عێراق كە تا نەوەتەكانی سەدەی ڕابردوو درێژەی كێشا، بارودۆخێكی نەخوازراوی لە ناوچەكەدا دروست كردبوو بەتایبەتی بەهۆی نزیكی شارەكە لە سنوری عێراقەوە، بۆیە زۆرێک لە ژنانی شارەكە نەیانتوانیوە درێژە بە خوێندن بدەن، پاشان دوای نەوەتەكان و ئازادكردنی بەشێكی هەرێمی كوردستان تاڕادەیەک ئاسایشی ناوچەكە جێگیربوو .ئافرەتان توانیویانە بەشداربن لە پرۆسەی خوێندن، ئەمەش هۆكار بوو بۆ دەركەوتن و بەشداریكردنی ژمارەیەكی

---

(١) احمد باوەڕ،گەرمیان و ناوچەی خانەقین لە سایەی وولاتانی گەورە و فەرمانڕەوایی عێراقد ١٠١٤١-١٩٧٥،چاپی یەكەم،زنجیرە كتێبی گۆڤاری كۆچ، سلێمانی، ٢٠١٩،ل١١٢.

(٢) چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز برهان عبدالرحمن عبدالله، بەڕێوەبەری پۆستەو گەیاندنی گەرمیان، ٢٠٢٢.

زیاتر لە ئافرەتان لە دامودەزگا گشتییەکاندا لەسەرەتای ساڵانی دووهەزار دا کە توانیویانە قۆناغەکانی خوێندن تەواوبکەن لە پسپۆرییە جیاوازەکاندا، لە دوای ساڵی ٢٠٠٣ و ڕووخانی ڕژێمی پێشوی عێراق دەرگایەکی گەورەی بازرگانی بەڕووی شارەکەدا کرایەوە و گوزەرانی خەڵک بەرەوپێشچوو، ئەمەش کاریکردە سەر بەشداری کردنی ئافرەتان لە ناوەندەکانی خوێندندا، هەروەها گەڕانەوەی خێزانە کوردە تەعریب کراوەکان کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر پرۆسەی پەروەردە و ڕۆشنبیری شارەکە، چونکە زۆربەی ئەو خێزانانە ئافرەتەکانیان خوێندەوار و خاوەن بڕوانامەبوون، هەروەها کردنەوەی کۆلێجی پەروەردەی کەلار لەساڵی ٢٠٠٤ کە بوو بە بناغەی دروستبوونی زانکۆی گەرمیان لەساڵی ٢٠١٣ کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر گەشەسەندنی پەروەردە و ڕۆشنبیری دانیشتوانی شارەکە، ئەم هۆکارانە پێکەوە ڕۆڵی گەورەیان هەبوو لەسەر بەشداری کردنی ئافرەتان بە ڕێژەیەکی بەرز لە تەواوکردنی خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامە بەجۆرێک بووەتە هۆی یەکسانی جێندەری و بگرە زیاتر بەشداری کردنی ئافرەتان لە پرۆسەی پەروەردە و دامەزراوە جۆربەجۆرەکانی شارەکە لە ئێستادا بۆ نموونە بەشداریکردنی ڕەگەزی مێ لە کەرتی پەروەردە لە قۆناغەکانی (بنەڕەتی، ئامادەیی) وەکو فێرخواز بریتیە لە (٢٠٢٠٢) فێرخواز بە ڕێژەی (٦٩.٥٨٪) لە کۆی (٣٢٢٧٧)، بەڵام ژمارەی مامۆستا (٣٤٥٦)کەسە، کە (١٨٧٦) مامۆستا لە ڕەگەزی مێ بە ڕێژەی (٥٤.٢٨٪) بەرامبەر بە (١٥٨٠) مامۆستا لە ڕەگەزی نێر بە ڕێژەی (٤٥.٧٢٪)، لە خوێندنی باڵایش ژمارەی ڕەگەزی مێ بریتیە لە (١٨٣٣) فێرخوازی لەکۆی (٢٧٥٠) فێرخواز بە ڕێژەی (٦٦.٦٥٪)، بەڵام ژمارەی مامۆستا (٣٤٠) کەسە، کە (٨٥) مامۆستا لە ڕەگەزی مێیە بە ڕێژەی (٢٥٪) بەرامبەر بە (٢٥٥) مامۆستا لە ڕەگەزی نێر بە ڕێژەی (٧٥٪).

## دووەم/ ڕەهەندی ئابووری:

لە تێکڕای کۆمەڵگاکاندا چالاکی ئابووری و بەرهەمهێنان زۆرتر لە هەر چالاکیەکی تر بەشێکی گشتی ژیانی خەڵک پێکدێنێ، چونکە فێمێنیستە مارکسیەکان سەرەتای چەوسانەوەی ژن دەگەڕێننەوە بۆ دابەشکردنی کارو دەستکەوتی ئابووری کە دەسەڵاتەکانی نێو کۆمەڵگەو خێزانی دەست نیشانکرد , دابەشکردنی کارو نرخ دانان بەسەر کارو بەرهەم و بەهی خۆکردنی

ئامرازەکانی کار ململانێی خستە نێوان چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگاوە، ململانێی نێوان توخمی ژن و پیاویش لە ئەنجامی ئەو دابەشکردنەی کار دروست بووە، بەپێی بۆچوونی کارڵ مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) بەهامرۆییەکان نین کە سەرچاوەی سەرەکی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەکانن، بەڵکو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان لە بنەڕەتدا بەهۆی فاکتەرە ئابوورییەکانەوە سەرهەڵدەدەن، ئەو هۆکارانەش پەیوەندییان بە ناکۆکیەکانی نێوان چینەکانەوە هەیە[١]، هەروەها ئەنگڵس لە کتێبەکەیدا بەناوی (بنچینەی خێزان، خاوەنداریێتی تایبەت و دەوڵەت) لەساڵی ١٨٨٤ ئاماژە بە ئەوە دەکات چەوسانەوەی ژنان بەشێکی دانەبڕاوی پەیوەندی چەوسێنەرانەی چینایەتییە[٢]، پێی وایە سیستەمی سەرمایەداری هۆکاری جیاوازی ڕەگەزییە، چونکە دوای سەرهەڵدانی خاوەنداریێتی تایبەت بە ژنان چەوسانەوە و بوون بە پاشکۆی پیاو[٣]، لەماوەی چەند دەیەیی ڕابردوودا لێکۆڵینەوەکان لەسەر ڕۆڵی ڕەگەز لە ئابووریدا زۆر بە خێرایی پەرەیان سەندووە، لە ئەنجامی ئەو سەرنجەی کە مەسەلە جێندەرییەکان لە ناوندە ئەکادیمییەکان و کۆمەڵگا بەگشتی وەریگرتووە[٤]، هەروەها ژنان و هێزی کار بوون بە تەوەرەیەکی سەرەکی لە جوگرافیایی ئابووریدا کە جەخت دەکاتەوە لەسەر چەندین توخم کە پەیوەندی بە نێوان ژنان و هێزی کارەوە هەیە، کە بریتین لە کێبڕکێی نێوان ئافرەتان و پیاوان لە بازاڕی کاردا و خەملاندنی قەبارەی بەشداری کردنی کاری ژنان و چاودێری کردنی جیاوازی شوێنی لە بەشداری کردنی ژنان بۆ هێزی کار[٥]، کاریگەری ئابووری

---

(١)کارل ماركس، مدخل الى نقد الآقتصاد السياسي، طبعة الأولى. دار الطليعة الجديدة،سورية-دمشق،٢٠١٨،ص٣٧.

[٢]انجلس، أصل العائلة والملكية الخاصة والدولة،ترجمة:احمد عزالعرب،بدون تاريخ طبع ،دار الطباعة الحديثة،١٩٥٧،ص١٥٩.

[٣] تیری ئیگڵتۆن، بۆچی مارکس لەسەر حەق بوو، وەرگێرانی پێشڕەو محمد، چاپخانەی دلێر،٢٠١٥،ل٣٥٥.

[٤]ريتشارد سويدبرغ، مبادئ علم الاجتماع الاقتصاديي، ترجمة: جهاد الترك، الطبعة الأولى، الناشر: المركز العربي للأبحاث ودراسة السياسات، ٢٠١٩،ص٤٥٩.

[٥]محمد الفتحى بكير محمد، الجغرافية الإقتصادية أسس وتطبيقات، طبعة نشر و توزيع دار المعرفة الجامعية، جامعة السكندرية، مصر،ص٣٦٩.

لەسەر پرسە جێندەرییەکان لە ناوچەی توێژینەوە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەنێوان ئێستا و ڕابردوودا بەهۆی کاریگەری کلتور و لاوازی ئاستی پەروەردە و ڕۆشنیرییەوە کارکردنی ژنان بەکارێکی عەیب و شەرمەزار بیری لێدەکرایەوە لە ڕابردوودا، لە هەشتاکاندا بەشداری کردنی ئافرەتان لە بازاڕی کاردا ڕێژەیەکی زۆرکەمی هەبووە تەنها چەند ژنێک نەبێت کە ژمارەیان لە ١٠ ژن زیاتر نەبووە، لە نێو بازاڕی شارەکەدا کاریان کردووە و کە بەرهەمە ئاژەڵیەکانیان هێناوەتە بازاڕ و فرۆشتوویانە، جێگەی ئاماژەیە ئەم ژنانەیش دانیشتووی شارەکە نەبوون بەڵکو لەناوچەکانی دەوروبەری شارەکەوە دەهاتن بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمەکانیان و لەڕەگەزی عەرەب بوون[1] ، هەروەها لە نەوەتەکاندا بەهۆی ئەو بارودۆخە داراییەی کە لە کوردستان و ناوچەکەدا هەبوو، لە ئەنجامی ئەو ئابڵوقە ئابوورییەی کە وڵاتی عێراق بە سەر هەرێمی کوردستان سەپاندبووی و دۆخی خراپی خەڵک بە تایبەتی ئەو خێزانانەی بەهۆی پرۆسەی ئەنفالەوە پیاو و کوڕەکانیان لەدەست دابوو ناچار دەبوون ژن و ئافرەتانی ئەو خێزانانە ئەرکە ئابوورییەکەی خێزانیان لە ئەستۆ بگرن، بۆیە بۆ پەیداکردنی بژێوی روویان لە کێڵگە کشتوکاڵیەکانی دەوروبەری شارەکە دەکرد، وەک کاری گوڵەچنە و چنینەوەی بەرووبوومە هاوینەییەکان، هەروەها لەوەرزی زستاندا هەندێک لە پیاوان و ئافرەتان کاری کۆکردنەوەی گیا بەهارەیان دەکرد لە ناوچەکانی دەوروبەری شارەکە و بەمەبەستی فرۆشتن و بەدەستهێنانی داهات بۆ خۆیان و خێزانەکانیان، بەڵام لە ئێستادا بەهۆی ئەو گۆڕانانەی کەبەسەر ژیانی مرۆڤایەتیدا هاتووە بەتایبەتی ئەو گۆڕانکاریانەی لەبواری تەکنەلۆژیادا ڕوویانداوە ڕۆڵی گەورەیان هەیە لە تێکەڵ بوون و کرانەوەی کلتورەکان بەڕووی یەکتر و گواستنەوەی داب و نەریتەکان لەنێو کۆمەڵگاکاندا، و دەرکەوتنی چەمکی جیهانگیری، ئاشکرایە ئەم ڕووداوانە لە جیهانی ئەمڕۆدا نوێن و تێکەڵاوییەکی تەواویان دروست کردووە لەنێوان کلتورە جیاوازەکاندا[2]، ئەمەش کاریگەری لەسەر ناوچەی توێژینەوە هەبوو، هەروەها

---

[2] چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز پ.ی.م خالد محمود، مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان، ٢٠٢٢.

[2] ج.تیمونز ڕوبیرتس- ئەیمی هایت، لە مۆدێرنەوە بۆ جیهان گەرایی، و: محەمەد حسین، بەشی دووەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕوون،٢٠٠٩،ل٢٣٨.

لەگەڵ زیادبوونی دامەزراوە حوکمیەکان لە شارەکەدا، ئاماژە بەزیادبوونێکی بەرچاو لە ڕێژەی بەشداریکردنی ژناندا دەکرێت، بەشێوەیەک کە کۆی گشتی ڕەگەزی مێ لەکەرتی حوکمیدا لە سەرجەمی فەرمانبەرانی دەوڵەت لە شاری کەلار نزیکەی (٣٦٨٦) کەسە، بەڕێژەی (٢.٣٤٪) لەکۆی گشتی دانیشتوانی شاری کەلار لە ساڵی٢٠٢١، سەرەڕای ئەوەش هێشتا بەشداری و تواناسازی مێینە لە کەرتی تایبەتدا تەنها ڕێژەیەکی کەم پێکدێنێت کە لەدەرەوەی ماڵ خاوەنی پیشەی خۆیانن، نزیکەی (٥٢٨) کەسە، بە ڕێژەی(٠.٣٤٪) لەکۆی گشتی دانیشتوان کە بەسەر ئابووریە جۆراوجۆرەکاندا دابەشبوون لە ناوچەی توێژینەوە.

## تەوەری چوارەم/ ڕەهەندی سیاسی:

چەمکی بەشداری کردنی سیاسی ژن بەو ڕادەییە کە ژنان بەشداری لە ڕەفتاری سیاسیدا بکەن و ڕەفتاری هەڵبژاردنیش یەکێکە لە گرنگترین جۆرەکانی بەشداریکردن، کە دەنگدان و خۆکاندیدکردن و بەشداری لە بانگەشەی هەڵبژاردنی کاندیدەکان و شێوازەکانی تری بەشداری سیاسی کە ژنان ڕاستەوخۆ تێیدا بەشدارین (١)،ڕەهەندی سیاسی یەکێکە لەو لایەنانەی کە بەهۆی لە بەرچاونەگرتنی ڕەگەزییەوە کەوتووەتە بەر ڕەخنەی فێمێنیستەکان و باوەڕیان وایە کە دەسەڵات و پەیوەندیانی دەسەڵاتی جیهان بوونەتە هۆی ڕوانگەیەکی جنسییەتی کراو لە پرۆژە نەتەوەیی و نێونەتەوەیەکاندا[٢].

کاریگەری ڕەهەندی سیاسی لەسەر پرسی جێندەر لە ناوچەی توێژینەوە وەک مەڵبەندێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ و ڕابردوودا کاریگەری زۆر گەورەی لەسەر پرسی جێندەر و کەیسی ژنان هەبووە، چونکە ئەم بوارە زیاتر لەلایەن پیاوانەوە قۆرخ کراوە، جگە لە کاریگەرییەکانی شەڕە سیاسیەکان کە لە ناوچەکەدا ڕوویداوە وەک هێرشەکانی حکومەتی پێشوی عێراق بۆ سەر هەرێمی کوردستان و ناوچەکە بە تایبەتی بەهۆی نزیکی لە سنوری

---

[١] طارق محمد عبدالوهاب، سدكولوجية المشاركة السياسية: مع دراسة في علم النفس السياسي في البيئة العربية،الطبعة الأولى، دار الغريب للنشر والتوزيع، القاهرة،١٩٩٩،ص٩١ .

[٢] جین فریدمەن، ئیتنیسیتە و فێمێنیزم، کتێبی فێمێنیزم و چەند خوێندنەوەیەکی تازا،و: بەیان عەزیز، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠١٢،ل١٨٨.

خاکی عێراقەوە و ڕوودانی کارەساتی ئەنفال کە تێدا ١٨٢ هەزار هاوڵاتی کورد بێسەروشوێن کران و بوون بە قوربانی، کە تێیدا نزیکەی ٣٠-٤٠ هەزار کەس خەڵکی ناوچەی گەرمیان بوون[1]، دەکرێت بڵێین ژن لەم پرۆسەدا دووجار بووەتە قوربانی جارێک وەک تاکی کورد و جارێکیش وەک ڕەگەزی مێ، بۆیە ئەگەر نموونەی کاریگەری ئەنفال پێش چاو بخەین دەبینین لە لایەن حیزبی بەعسەوە ژن کراوە بە غەنیمە و دەستکەوتی شەڕ[2]، بۆیە لە ڕابردوودا بەهۆی ئەو ڕووداوانەی بەسەر ناوچەکەدا هاتوون لە شەڕ و ئەنفالی حوکمەتی عێراق و سەپاندنی گەمارۆی ئابووری و شەڕی ناوخۆ، سەرەڕای گاریگەریە جەستەیی و دەروونیەکانی ئەم ڕووداوانە لەسەر ژن، بەڵکو نەشتوانراوە گرنگی بەپرسی ژن و بەشدارییە سیاسیەکەی بدرێت، بەڵام لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ ڕزگاربوونی بەشێکی زۆری کوردستانی باشور و گرتنە دەستی دەسەڵات لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە تا ئێستادا بەشداری ژنان لە نێو حیزبە سیاسیەکان گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینیوە و بەرەو پێش ڕۆیشتووە، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی ڕووخساری سیاسی لە هەرێمی کوردستان نێرانە دەردەکەوێت، بەڵام لە ئاست ناوچەی گەرمیان حاڵەتەکە زەق ترە و بە شێوەیەکی گشتی بەشداری کردنی ژنان لە نێو حیزبە سیاسیەکاندا لاوازە و ئاستەنگی زۆرە لە بەردەم چوونە پێشەوەی ژنان بۆ نێو حیزبە سیاسیەکان دیارترینیان خێزان و ژینگەی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و داب و نەریتی ناوچەکەیە، کە وای کردووە ژنان دوور بن لە سیاسەت و نایانەوێ تێکەڵ بەو بوارە بن، ئەمەش هۆکارە بۆ کەمی بەشداری کردنی ژنان لە کایەی سیاسی ناوچەکەدا، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێک لە ژنانی کەلار گەیشتوون بە ئاستی پەرلەمانتار لە پەرلەمانی (عێراق و هەرێمی کورستان)کە ژمارەیان (٣) ئافرەتە، هەروەها بەشێکی دیکەیان پۆستی ئیداری باڵایان هەیە لەناو لە حیزبە سیاسیەکاندا، بەڵام ئەم ڕۆڵەیان لەبەردەم پرسیارێکی سەرەکیدا دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە ئایا بەشدارپێکردنی ڕاستەقینە و توانا پێدانی ژنان هەیە لەو بەشداری کردنەدا یان ئەوەتا ژنان دووبارە بەکاردەهێننەوە وەک

---

[٤] بەڕێوەبەرایەتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی گەرمیان،داتای بڵاونەکراوە،٢٠٢٢.

[١] عەدالەت عومەر صاڵح، ئانفال و ئافرەتی کورد، چاپی یاکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨،ل١٥.

سیاسەتێک، ئەمەش پێویستی بە زانینی ڕێژەی بەشداری ڕاستەقینە و تێڕوانینی ژن هەیە لە هەر شوێنێکدابێت، سەبارەت بە گرنگی و ڕاستی ئەو بەشداری کردنە.

## دەرئەنجام:

گومانی تێدانیە بایەخدان بەڕۆڵی ژن لە کۆمەڵگەدا ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەسەندندایە و گاریگەری لەسەر هەموو بەشەکانی جیهان دروست کردووە، جوگرافیا بە پشتبەستن بە ڕێبازەکانی تیۆری کۆمەلایەتی هاوچەرخ گرنگی دەدات بە دیراسە کردن و لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی ژن لەگەڵ ئەو بەهایانەی لە کۆمەڵگەدا زاڵن و کاریگەریان لەسەر پرسەکانی ژنان هەیە لە ڕوانگەیەکی جوگرافیاییەوە تیشک دەخاتە سەر ئاشکراکردنی نهێنیەکانی تایبەت نایەکسانی و چەوسانەوەی ژن لە پرۆسەی کارلێککردن لە نێوان مرۆڤ و ژینگە. لەم ڕووەوە ئەنجامی دیراسەکرنی کاریگەری بنەما جوگرافییەکان لەسەر پرسی جێندەر لە شاری کەلار دەخەینەڕوو بەم شێوەی خوارەوە:

١-کاریگەری ڕەگەزە سروشتیەکانی جوگرافیا لەسەر پرسی ژن لە ناوچەی توێژینەوە بەپێی قۆناغە مێژووییەکانی شارەکە گۆڕاکاری بەسەردا هاتووە ، لەبەرئەوەی لە ڕابردوودا ناوچەی توێژینەوە وەک گوندێکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری ئاوەدان کراوەتەوە ئەم پیشانەیش زیاتر کاری پیاوان بوون و ژن بەشداری کەمی هەبووە، بەڵام لە ئێستادا گاریگەری ئەم ڕەگەزانە لەسەر پرسەکانی ژن ئاستێکی لاوازیان هەیە.

٢- مەسەلە ڕەگەزییەکان بەشێوەیەکی گەورە پەیوەستن بە فاکتەرە کۆمەلایەتیەکانی وەک (خێزان، کلتوور، ئایین و ئاستی ڕۆشنبیریی)ەوە، کە ڕێسا و یاسا کۆمەلایەتیەکان دادەڕێژن و جێبەجێیشی دەکەن و کاریگەریشیان بە پێی سەردەمە مێژووییەکان دەگۆڕێت، ڕۆڵی ئەم فاکتەرانە لەسەر پرسەکانی ژن لە ناوچەی لێکۆڵینەوە تا ئێستاش ڕوخسارێکی زەقی هەیە و کاریگەریان لەسەرکۆمەڵگای دانیشتوان لە ئاستێکی باڵادایە.

٣- فاکتەرە ئابوورییەکان یەکێکی ترن لە ئەو هۆکارانەی کە کاریگەری گەورەیان لەسەر پرسەکانی ژنان بە جێهێشتووە، لە ناوچەی توێژینەوە لە ئێستا بەهۆی پێگە ئابووریەکەیەوە ئاماژە بەزیادبوونێکی بەرچاو لە ڕێژەی بەشداریکردنی ژناندا دەکرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ

گرنگی شوێنی شارەکە کە وەک دەرگایەکی بازرگانیە لە نێوان وولاتانی ئێران و عێراق و هەرێمی کوردستان، کە جۆرێک لە کرانەوەی کۆمەڵایەتی دروست کردووە بەیارمەتی دۆخە کۆمەڵایەتیەکانی وەکو بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاری و پەروەردە و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا رۆڵی گەورەی لەسەر دەرکەوتن و بەشداریکردنی ژنان بینیوە.

٤- روخساری سیاسی یەکێکی ترە لەو فاکتەرانەی بەهۆی نێرانە دەرکەوتنیەوە رووبەرووی رەخنە لێگرتن بووەتەوە، ئەم دۆخەیش لە ئاستی ناوچەی توێژینەوە بەهۆی سنورداریی بەشداریکردنی ژنان لەم سێکتەرە بەرِوونی رەنگی داوەتەوە، به شێوەیەکی گشتی بەشداری کردنی ژنان لە نێو حیزبە سیاسیەکاندا لاوازە و ئاستەنگی زۆرە لە بەردەم چوونە پێشەوەی ژنان بۆ نێو حیزبە سیاسیەکان دیارترینیان خێزان و ژینگەی کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و داب و نەریتی ناوچەکەیە، کە وای کردووە ژنان دوور بن لە سیاسەت و نایانەوێ تێکەڵ بەو بوارە بن.



## لیستی سەرچاوەکان:

### یەکەم: سەرچاوە کوردییەکان:

#### أ-کتێب

١- احمد باوەڕ،گەرمیان و ناوچەی خانەقین لە سایەی وولاتانی گەورە و فەرمانڕەوایی عێراقد ١٠١٤-١٩٧٥،چاپی یەکەم،زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ، سلێمانی، ٢٠١٩،.

٢-ئیگڵتۆن، تیری، بۆچی مارکس لەسەر حەق بوو، وەرگێرانی پێشڕەو محمد، چاپخانەی دلێر،٢٠١٥.

٣- سیمۆن دیبۆڤوار، رەگەزی دوەم،وەرگێرانی: کارزان کاوسێن، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئایدیا، ٢٠٢١.

٤- ریید، ئیڤیلین، پێکهاتەی بەدەنی و چارەنوسی ئافرەت، وەرگێرانی حەمەکریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئارا، کەرکوک، ٢٠٠٦.

٥- ڕوبيرتس، ج.تيمونز- ئەيمی هايت، لە مۆديرنەوە بۆ جيهان گەرايی، و: محەمەد حسين، بەشی دووەم، چاپی يەكەم، چاپخانەی ڕوون،٢٠٠٩.

٦- سيوەيلی، ڕێبوار ، ديارەدەی ناسينی شوێن و شوناس (خوێندنەوەيەكی ديارده ناسانە بۆ شاری سلێمانی)،چاپی يەكەم،چاپخانەی تاران،٢٠١٥.

٧- شاكەلی، مقداد، شاری كەلار لێكۆڵينەوەيەك لە جوگرافيای شار،چاپی يەكەم،چاپخانەی گەنج،٢٠١٦.

٨- شوانی، د.محمد ،سۆسۆلۆژيای چينە كۆمەڵايەتييەكان، چاپی يەكەم،چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر،٢٠١٢،ل٢٣٣.

٩- صالح، عەدالەت عومەر ، ئانفال و ئافرەتی كورد، چاپی ياكەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

١٠- عومەر، عەبدڵڵا عامر ،بەرزونزمی ڕووی زەوی هەرێمی كوردستان، كتێبی جوگرافيای هەرێمی كوردستان، چاپی يەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،١٩٩٨.

١١- فريدمەن، جين ، ئيتنيسيتە و فێمێنيزم، كتێبی فێمێنيزم و چەند خوێندنەوەيەكی تازا،و: بەيان عەزيز، چاپخانەی ڕۆشنبيری، هەولێر،٢٠١٢.

١٢- قارەمان، ليلا محمد ، خاكی هەرێمی كوردستان، كتێبی سەنتەری برايەتی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی كوردستانی عێراق، چاپی دووەم هەولێر،١٩٩٩.

## ب-نامەی زانكۆی:

١- سلێمان، صباح علی ،كەلار (١٩٢٧-١٩٧٥)لێكۆڵينەوەيەك لە بارودۆخی سياسی و كارگێڕی و ڕۆشنبيری،نامەی ماستەر (بڵاونەكراوە)،زانكۆی صەلاحەددين، هەولێر،٢٠٢١.

## ج-دامەزراوە حوكميەكان:

سەنديكای كرێكارانی گەرميان، داتای بڵاونەكراوە،٢٠٢٢.

بەڕێوەبەرايەتی پەروەردەی كەلار، داتای بڵاونەكراوە،٢٠٢٢.

بەڕێوەبەرايەتی گشتی كشتوكاڵی گەرميان، داتای بڵاونەكراوە،٢٠٢٢.

بەڕێوەبەرايەتی شەهيدان و ئەنفالكراوانی گەرميان،داتای بڵاونەكراوە،٢٠٢٢.

## ء-چاوپێكەوتن:

چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز پ.ی.م خالد محمود، مامۆستا لە زانكۆی گەرمیان، ٢٠٢٢.

چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز شێخ محمد شاكەلی،٢٠٢٢.

چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز برهان عبدالرحمن عبدالله، بەڕێوەبەری پۆستەو گەیاندنی گەرمیان، ٢٠٢٢.

دووەم: سەرچاوە عەرەبیەكان

أ-كتب

١-احمد، غريب محمد ، مجتمع القرية– دراسات وبحوث، دار المعرفة الجامعة – الاسكندريه، مصر،١٩٨٧.

٢- اسكندر، لويس ،الانسان والبيئة،مطبوعات مكتبة النهضة المصرية،القاهرة،١٩٣٦.

٣- انجلس،فردريك، اصل العائلة والملكية الخاصة والدولة،ترجمة:احمد عزالعرب،بدون تاريخ طبع ،دار الطباعة الحديثة،١٩٥٧،ص١٥٩.

٤- ج.سيمونز، ايان ، البيئة والانسان عبر العصور،ترجمة: السيد محمد عثمان،عالم المعرفة، الكويت،١٩٩٧.

٥- ريتشارد پيت، الفكر الجغرافي الحديث،ترجمة: عاطف معتمد و آخرون،الطبعة الأولى، المركز القومى للترجمة،٢٠١٨.

٦- حمدان، جمال ،جغرافيةالمدن،الطبعة الثانية،عالم الكتب،القاهرة،١٩٧٧.

٧- الحلو، الدكتور عبد الكاظم علي ، دراسات في المناخ الطبيعي، الطبعة الأولى، المطبعة شركة المارد-النجف الاشرف، النجف،٢٠٢١.

٨- الحوت، د.محمد صبرى- د.ناهد عدلي شاذلي، التعليم والتنمية، بدون تاريخ طبع، مكتبة النجلو المصرية،١٩٥٧.

٩- خصباك، الدكتور شاكر ، العراق الشمالي دراسة لنواحي الطبيعة والبشرية،الطبعة الأولى، مطبعة شفيق،١٩٧٣.

١٠- خصباك، شاكر ،الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق،بغداد،١٩٧٢.

١١- سوفير، دافيد ، جغرافية الأديان، ترجمة: احمد غسان سبانو، الطبعة الاولى، الطباعة والنشر دار قتيبة،١٩٩٠.

١٢- سويدبرغ، ريتشارد ، مبادئ علم الاجتماع الاقتصاديى، ترجمة: جهاد الترك، الطبعة الأولى، الناشر: المركز العربي للأبحاث ودراسة السياسات،٢٠١٩.

١٣- الشلش، الدكتور على حسين ، خغرافية التربة، الطبعة الثانية، مطبة جامعة البصرة، البصرة،١٩٥٨.

١٤- الشواورة، على سالم ، جغرافية المدن، الطبعة الأولى، دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة، عمان،٢٠١٢.

١٥- عبدالوهاب، طارق محمد، سدكولوجية المشاركة السياسية: مع دراسة في علم النفس السياسى في البيئة العربية،الطبعة الأولى، دار الغريب للنشر والتوزيع، القاهرة،١٩٩٩.

١٦- عزت، فائزة محمد ، الحياة الاجتماعية للكورد (٤-٩هـ /١٠- ١٥م)، مطبعة الحاج هاشم، اربيل، ٢٠٠٩.

١٧- عطوي، الدكتور عبدلله ، جغرافيةالسكان، الطبعةالاولى، المطبعة والنشر دار النهضةالعربية ،لبنان-بيروت،٢٠٠١.

١٨- عطوى، الدكتور عبدالله ، السكان والتنمية البشرية،الطبعة الأولى، دارالنهضة العربية ،بيروت- لبنان،٢٠٠٤.

١٩- العمر، ا.د.معين خليل ، علم اجتماع الجندر، طبعة الأولى، سيدنى-استراليا،٢٠١٤.

٢٠- غدنز، انتوني ، علم الاجتماع، ترجمة: الدكتور فايز الصياغ، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٥.

٢١- ماركس، كارل، مدخل الى نقد الآقتصاد السياسي، طبعة الأولى. دار الطليعة الجديدة ،سورية-دمشق،٢٠١٨،ص ٣٧.

٢٢- ماكيڤر، ر.م.- سارلز هـ .بيج، المجتمع، ترجمة الدكتور على احمد عيسى، مؤسسة فرانكلين للطباعة والنشر، مصر، ٢٠٠٠.

٢٣- محمد، محمد الفتحى بكير ، الجغرافية الإقتصادية اسس وتطبيقات، طبعة نشر و توزيع دار المعرفة الجامعية، جامعة السكندرية، مصر.

٢٤- مصیلحی، فتحی محمد ، الجغرافیة الاجتماعیة (الاطار النظري- وتطبیقات عربیة، الطبعة الثانیة، مطبعة جامعه المنوفیه، مصر،٢٠٠٠.

٢٥- الهیتي، صبری فارس- د.خلیل اسماعیل محمد، جغرافیة الاسطیان الریفي، الطبعة الأولی، بغداد،١٩٨٩.

٢٦- وافي، الدكتور علی عبدالواحید ، الأسرة والمجتمع، الطبعة الثانیة،١٩٤٨.

## سێیەم: سەرچاوە ئینگلیزییەكان:

١-Giuliano, Paola, Gender and Culture, LZA-institute of labor Economics,
Location Network (www.iza.org), ٢٠٢٠, P١-٥.

٢-H.J.de Blij, HUMAN GEOGRAPHY Culture, Society, and space, Fifth edition, ١٩٩٩, p٨٧.

٣- DAVID , Culture and Everyday Life, ١چ , UK, ٢٠١٥.
INGLIS,

٤-Joseph Holden, An Introductin to Physical Geography and the Environment, fourth edition, UK , ٢٠١٧.

٥-Richard peet, Modern Gographic Thought, Second edition, Rawat Publications, New Delhi-India, ٢٠١١, P٢٧٢.

## مستخلص:

شكلت موضوع الجندر محور النقاشات الرئيسة في العلوم الاجتماعية ومنها الجغرافيا البشرية التي اخذت الاهتمام بهذ الجانب من ثمانينيات القرن المنصرم.

تتناول هذه الدراسة قضية الجندر من منظور جغرافي في مدينة كلار مركز ادارة كرميان في اقليم كردستان العراق، وركزت الدراسة في الإجابة عن السؤال الأساسي المتمثل في اثر العوامل الجغرافية في قضية الجندر في مدينة كلار، وللوصول الى ذلك تم دراسة العناصر الطبيعية والبشرية وتفاعلها في زيادة مساهمة المراة في المجالات الاقتصادية والاجتماعية والسياسية من خلال تتبع مسار تاريخي - جغرافي يعتمد على المقاربات (approaches) الجندرية وارتباطها في انتاج المكان.

## :Summary

Gender issues, which form a key topic of discussion of social sciences, including human geography, have been focusing on this aspect since the ١٩٨٠s and have become one of the fields of research. This research shows the geographical effects of geographical principles on gender issue in Kalar city, the center of Garmian administration in The Kurdistan Region of Iraq, and focuses on the basic questions of the impact of geographical factors on the issues Women in the city, for this purpose, natural and human elements in the ability of women to participate in the economic, social and political fields by considering the historical-geographical trend based on gender path and related to the production of space for analysis It investigates the effects of the environment on gender building, because the social term gender, which talks about male-female behaviour, is built because of environmental effects and has a large lying gender impact.



د. کەریم ئەحمەد عەزیز

# هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەکان لە دیدی بەخێوکەرانیانەوە - ناوەندی قەزای کەلار  بە نمونە

پوختەی توێژینەوەکە:

قۆناغی باخچەی منداڵان گرنگترین قۆناغی ژیانی منداڵە لەڕووی گەشەکردنی جەستەیی و هزری و کۆمەڵایەتییەتییەوە، بۆیە هەرچەند چاودێری و توێژینەوە لەو قۆناغەی درووستبوونی کەسێتی منداڵ بکرێ واتە ئەوەندە گرنگی بە داهاتووی نەوەکانی وڵات دەدرێت، ئەم توێژینەوە بەناونیشانی: هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەکانی منداڵان لەڕوانگەی دایک و باوکانەوە (بەخێوکەرانیان) لەناوەندی قەزای کەلار، توێژەر لەڕێگەی فۆرمێکی ڕاوەرگرییەوە کە پێکهاتوە لە (٢٦) برگە بەسەر (٧) بواری گەشەی منداڵ لەڕوانگەی دایک و باوک (بەخێوکەران) هەڵسەنگاندنی بۆ کردوون، لەم توێژینەوەیە کێشە و گرنگی و ئامانج و کۆمەڵگا و نمونە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی گرنگترین چەمکەکان و چوارچێوەیەکی تیۆری خراوەتە ڕوو، لەگەڵ ڕێکارییەکان کە لەتوێژینەوەکەدا گیراوەتەبەر، گرنگترین ئەنجامەکانیش بریتی بوون لە: (لەڕووی هزری و زمانەوانی و پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەتیەکان و تەندرووستیەوە منداڵان گەشەی پێویستیان کردوە، بەڵام لەڕووی دەروون-جووڵەییەوە گەشەی پێویستیان نەکردوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامەکانی توێژینەوەکە توێژەر ئەم ڕاسپاردانەی خستوەتەڕوو: (گرنگیدانی مامۆستایانی باخچەکانی منداڵان بە ئامانجە پەروەردەییەکان لەبوار دەروون-جوڵەیی، هەروەها دابینکردنی مامۆستای پسپۆڕی هونەر و ژووری تایبەت بە میوزیک و ئامێرەکانی میوزیک، لەپێناو ئاشناکردنی منداڵان و زیادکردنی ئارەزوو و خولیای هونەرییان لە باخچەکانی منداڵان).

# بەشی یەكەم

## ١-١ گرفتی توێژینەوەكە:

پسپۆڕانی بواری دەرونی و پەروەردەیی پێیان وایە كە قۆناغی منداڵی گرنگترین قۆناغی ژیانی مرۆڤە بۆ گەشەكردنی لایەنەكانی كۆمەڵایەتییەتی و ژیری و جەستەیی، كە كاریگەری لەسەر قۆناغەكانی تری ژیانی دەبێت، باخچەی منداڵان یەكێكە لەو دامەزراوە پەوەردەییانەی كەمنداڵ پێیدا تێدەپەڕێت بەشێوەیەكی ئارەزومەندانە، بۆیە ئەگەر هەر كەموكورتیەك لەم قۆناغەی ژیانی منداڵدا ڕوبدات ئەوا كاریگەری خراپی لەسەر كەسایەتی منداڵ و دایك و باوك و كۆمەڵگەكەشی دەبێت، بۆیە لەڕێگەی ئەم توێژینەوەیەوە دەمانەوێ بگەین بەوەڵامی پرسیارێك ئایا ئەو لایەنانەی منداڵان كە پێویستە گەشەبكات لەباخچەكانی منداڵان تاچەند دایە و بابەكانیان هەستی پێدەكەن و لێی ڕەزامەندن، نەبوونی وەڵامێكی زانستی بۆ ئەم پرسیارە وەك كێشەیەك لە لایەن توێژەرەوە تەماشاكرا، بۆیە بڕیاری ئەنجامدانی ئەم توێژنەوەییدا بەم ناونیشانەی خوارەوە:

(هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەكان لە دیدی بەخێوكەرانیانەوە- ناوەندی قەزای كەلار بە نمونە).

## ١-٢ گرنگی توێژینەوەكە:

لە سەردەمی هاوچەرخدا هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەكان بەشێكی گرنگ و بنەڕەتییە لەپرۆگرامی باخچەكانی منداڵان، چونكە لەڕێگەیەوە ئاشنا دەبین بە چەندێتی و چۆنێتی بەشداریكردنیان لەچالاكیەكان ودەركەوتەی ئەو چالاكیانە لە سەر ڕەفتارەكانیان دواجاریش گەشەكردنیان لەڕووی مەعریفی و كۆمەڵایەتی ولێهاتووییەوە (مروان،١٩٨١،ص ١٤٤)، بۆیە هەڵسەنگاندنی منداڵان لە باخچەكان لەو ڕووانەی باسكران ئاشنامان دەكات بە چەندێتی گەشەكردنیان و پركردنەوەی پێداویستیەكانی گەشەكردنیان، دواتر دڵنیابوون لەو ژینگەیی كە هاندەرە بۆ پێگەیاندنی منداڵێكی گەشەكردوو بە ئامانجی پەروەردەیی هاوچەرخ (الفرح، ١٩٩٢، ص ١٣٥).

منداڵ بونەوەرێكی پاكوبێگەردە و پێداویستی زۆری بەخزمەتگوزاری و سۆز و خۆشەویستی كەسانی چواردەوری خۆی هەیە، لەقۆناغی یەكەمی منداڵی (دایك وباوك) پاشان لەباخچە فێری ئەو لێهاتوویی وئەزموونانە دەبێت كە لەماڵەوە بۆی فەراهەم نابێت (احمد، ٢٠٠٧، ص٥).

منداڵان سەرمایەیەکی گرنگی لەبن نەهاتوی کۆمەڵایەتی و دوارۆژی نەتەوەن، ئەگەر بمانەوێت کەسانی بەکەڵک و سوودبەخشیان لێدەربچێت ئەوا دەبێت هەموو پێداویستییە گرنگەکان و گەشەکردنیان بۆدابین بکەین لەو ژینگەیی تێدا دەژین، لەو هۆکارانەش دوربخرێنەوە کە زیان بەباری دەروونی و کۆمەڵایەتی و تەندروستیان دەگەیەنێت (قەرەچەتانی، ٢٠١٠، ل٣٣٣)، چونکە منداڵی ئەمڕۆ پیاوی دوارۆژە و بونەوەرێکی گەورە و پیرۆزە و ئەرکی سەرشانی هەمولایەکە کە ژینگەی لەبار بۆگەشەکردنی هەمەلایەنەی بخوڵقێنێ تاوەکو دوارۆژ مرۆڤێکی تەواو و بەرهەمهێنەر و سودبەخشی لێدەربچێت (قەرەچەتانی، ٢٠١٠، ل٢٤٧)، لەپێناو جێبەجێکردنی ئەو ئامانجە پێویستمان بە پرۆسەی هەڵسەنگاندنی بەردەوامی ساڵانە و گشتی هەیە بۆ ئەوەی گەشەی سەرجەم بوارەکانی منداڵ پێوانە بکەین (عنایە، ١٩٩٥، ص١١)، بۆ ئەوەی پێوانەکردنێکی زانستی گەشەی منداڵان بکەین و وەڵامێکی ڕوون و دیارمان بۆ گشت بڕگەکانی گەشەی منداڵ دەستبکەوێت بەنمرە و شیاوی پێوانەکردن و هەڵسەنگاندن بێت، پێویستمان بە فۆرمێکی ڕاوەرگری هەیە کە لەبڕگەکانیدا چونێتی گەشەکردنی منداڵی دیاری کردبێت (عدس و مصلح، ١٩٨٠، ص٢٢١) بۆ ئەم مەبەستەش دایک و باوک باشترین و نزیکترین کەسانێکن هەست بەو گەشەکردن و نەشونمایەی ڕەفتاری منداڵەکانیان کردبێت تاوەکو وەڵامی بڕگەکانی فۆرمی هەڵسەنگاندن بدەنەوە.

دەتوانین گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەم خاڵانەی خوارەوە بخەینەڕوو:-

- لەڕێگەیەوە زانیاری وورد لەسەر لایەنەکانی گەشەی منداڵ دەخەینەڕوو بۆ لایەنی پەیوەندیدار لەدیدی بەخێوکەرانیانەوە.

- بەسوودە بۆ مامۆستایانی باخچەکانی منداڵان بۆ زانینی گەشەی منداڵانی باخچەکان.

- ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە لایەنە پەیوەندیدارەکان ئاگادار دەکاتەوە لە ڕوانگەی دایە و بابەکان بۆ گەشەی منداڵەکانیان، لەپێناو کارکردن لەسەر لایەنە نەرێنی وهاندانی لایەنە باشەکان.

### ١-٣ ئامانجی توێژینەوەکە:

(هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەکان لە دیدی بەخێوکەرانیانەوە – ناوەندی قەزای کەلار بە نمونە).

**١-٤ سنوری توێژینەوەکە:**

سنووری کات: کۆتایی وەرزی دووەم ساڵی خوێندنی (٢٠١٣-٢٠١٤)

سنووری شوێن: باخچەکانی منداڵانی ناوەندی قەزای کەلار

سنووری بابەت: گەشەی کۆمەڵایەتییەتی و ژیری و جەستەیی منداڵ.

سنووری مرۆیی: منداڵانی باخچەکانی ناوەندی قەزای کەلار.

**١-٥ پێناسەکردنی چەمکەکان Definition Conceptions :**

**١-٥-١ هەڵسەنگاندن Evaluation :**

- (نعمت، ٢٠١٤) پێناسەی دەکات بەوەی:- « بریتییە لە بریاردان سەبارەت بەو شتەی کەپێوانە کراوە بە پەسەندکردن یاخود ڕەتکردنەوەی لەڕوانگەی چەند پێوەرێکی دیاری کراو، واتە وەسفکردنی چۆنیەتی جۆری شتێک». (نعمت، ٢٠١٤، ل٢٧).

- (عزیز، ٢٠١٢) پێناسەی دەکات بە:- «کردارێکی ڕێکخراو بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوەی ، ئەمەش بەمەبەستی بریاردان لەسەری و دواجار چاککردنی لایەنە لاوازەکان و گەشەپێدانی لایەنە بەهێزەکان». (عزیز، ٢٠١٢، ل١٢٢).

- پێناسەی ڕێکاری توێژەر:- «بریتیە لە کۆکردنەوەی زانیاری لەڕێگەی برگەکانی فۆرمی ڕاوەرگرییەوە لەسەر منداڵانی باخچە و بڕیاردان لەسەر چۆنێتی گەشەی منداڵ لەڕوانگەی (دایە و بابە) بەخێوکەرانیانەوە».

**١-٥-٢ باخچەی منداڵان Kindergartens :**

- (علی و ئەوانیتر، ٢٠١٣) پێناسەی دەکەن بەوەی: «بریتیە لەدەزگایەکی پەروەردەیی کەتایبەت کراوە بۆ پەروەردەکردنی ئەو منداڵانەی کەتەمەنیان لەنێوان (٤- ٥) ساڵیدایە و چەندین چالاکی جۆراو جۆری تێدایە کەئامانجیان ئەوەیە کەمنداڵ فێری بەها پەروەردەی و کۆمەڵایەتییەتیەکان بکەن، دەرفەتی خۆ دەربڕینیان بۆ برخسێت مەشقیان لەسەر چۆنیەتی ژیان وکارلێککردنیان پێبکەن». (علی وئەوانی تر، ٢٠١٣، ل٨).

- پێناسەی ڕێکاری توێژەر»دامەزراوەیەکی پەروەردەییە لە قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە، ئەو منداڵانە وەردەگرێت کە تەمەنیان لەنێوان (٤- ٥)ساڵیدایە، خوێندن تێدا بە دوو قۆناغ بەڕێوەدەچێت، قوتابی تێدا لەڕێگەی پرۆگرامێکی تایبەتەوە

بەگەشەکردنێکی هەمەلایەنەی مەعریفی– کۆمەڵایەتییەتی– ویژدانی– دەروون جوڵەیی گوزەر دەکات».

١-٥-٣ بەخێوکەران (خێزان) Parents:

- (حەمە، ٢٠٠٤) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات: - «بچوکترین یەکەیەکی کۆمەڵایەتییەتیە واتە زایگۆتی دروست بوونی کۆمەڵ و ئەلقەی پەیوەست بوونی تاکە بەکۆمەڵ» (حەمە، ٢٠٠٤، ل١٢).

- (ئالانی، ٢٠١٤) پێناسەی دەکات بەوەی «یەکەیەکی بنچینەی کۆمەڵگەیە بەکارگەیەکی بەرهەمهێنان و پەروەردەکردنی مرۆڤ دادەنرێ، ئۆرگانێکی کۆمەڵایەتییەتی گرنگە بۆ پەروەردەکردن و ڕاهێنانی ژیانی ئایندەی نەوەکان. (ئالانی،٢٠١٤، ل١١٣).

- پێناسەی ڕێکاری توێژەر «یەکەمین دامەزراوەی کۆمەڵایەتییەتیە لەئەنجامی بە یەکگەیشتنی ژن و پیاوێک لەڕێگەی گرێ بەستێکەوە درووست دەبێت، بەئامانجی پێکەوە ژیانێکی هاوژینانە و وەچەخستنەوە و بەشداریکردن لەبونیاتنانی ئایندەیەک لەکۆمەڵگەکەیان».

١-٥-٥ قەزای کەلار Kalar District :

- (عزیز، ٢٠١٣) پێناسەی دەکات بەوەی « ناوچەیەکە لەڕووی مێژوویەوە بوونی ژیان و ژیاری تیایدا بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دەگەڕێتەوە، ئەم ناوچەیە هەر ئاوەدان بووە تاوەکو سەردەمی بەعس بەپێی مەرسومێکی کۆماری، ژمارە (١٣٧ ) کە لە ( ٢٨ /١٩٧٠/٢) دەرکراوە بڕیاردراوە بکرێ بەقەزا، بۆ ئەوەی ڕێژەی کورد لەپارێزگای کەرکوک کەمبکرێتەوە لەداهاتوودا دابڕێت لە پارێزگای کەرکوک وە بەپێی مەرسومێکی کۆماری (٦٠٨) کە لە (١٩٧٥/١١/٦) دا ڕاگەیەنراوە خراوەتە سەر پارێزگای سلێمانی» (عزیز، ٢٠١٣، ل٥٩).

# بەشی دووەم

## ٢-١ مێژووی باخچەی منداڵان:

باخچەی منداڵان سیستەمێکی فێرکردنی منداڵانە لەنێوان تەمەنی (٤- ٦)ساڵ وەردەگرێت، ئەم سیستەمە مەبەستی پەرەپێدانی توانای منداڵە بۆ گوزارشت کردن لەخۆی و ئاوێتەبوونی لەگەڵ کەسانی تردا لەڕێگەی یاری و جموجوڵ و داهێنانەکانەوە، باخچەی منداڵان لەسەدەی نۆزدەهەم لەئەنجامی هەوڵی (ڕۆبەرت ئوینی) بەریتانی و (جێ ئاچ بستالۆزی) سویدی و (فریدریک فرۆبڵی ) ئەڵمانی و(ماریا مۆنتسۆری) ئیتالی هاتە دامەزراندن، لەبەریتانیا شۆڕشی پیشەسازی بووبە هۆی دروست بوونی باخچەی منداڵان بەپێی یاسا منداڵان بۆیان نەبوو ئیش بکەن. لەکاتێکدا ئەندامانی تری خێزان بۆ ماوەیەکی درێژ لەکارگەکاندا ئیشیان دەکرد و منداڵەکانیان لەیەکەم باخچەی منداڵان لەشاری (نیولاتارکی) سکوتلاند بەجێدەهێشت. ئەم باخچەیە لەساڵی (١٨١٦ز) لەلایەن (ڕۆبەرت ئۆین) بۆ منداڵانی کرێکارانی کارگەکەی دروست کرد. ئەم دامەزراوەیە گەشەدان بوو بەعەقڵی منداڵان لەڕێگەی زیاتر ڕەخساندنی ئازادی بەو منداڵانە، بەرنامەکانی دواتری باخچەی منداڵان بریتی بوو لە مەشقی پەروەردەیی ڕەوشتی (محمود برهوم و ئەوانی تر، ٢٠٠٦، ل٢٦).

بەبۆچونی (فرۆبڵ) گەشە و بەرەوپێشچوونی (کەسێتی) منداڵ تەنها لەسێبەری ئازادییدا دەگونجێ، لاسایکردنەوەی کوێرانە و ڕواڵەتی، بەتوندی لەلایەن ناوبراوەوە ڕەتدەکرایەوە، بەبڕوای (فرۆبڵ) مرۆڤ تیشکێکە لەتیشکەکانی خوداوەند، چونکە خواوەند داهێنەرە کەوابوو یەکێک لەگرنگترین تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ داهێنانە، داهێنان تەنها لەکەشوهەوایەکی ئازاد و ئاسودەدا دەتوانێت گەشەبکات، ئەوساتانەی منداڵ بەکاری بەرهەمهێنان و داهێنانەوە خەریکە، خۆشترین کاتەکانی ژیانی ئەو پێکدەهێنێت، (فرۆبڵ) بۆئەوەی بیروڕاکانی خۆی تاقی بکاتەوە بۆ یەکەمجار باخچەی منداڵانی بونیات ناوە بەکەڵک وەرگرتن لە میتۆدە دیموکراتییەکان لە باخچەی منداڵاندا (علی ئەکبەر میهر ئارا وئەوانی تر، ٢٠٠٥، ل١٣٠)، لەساڵی (١٨١٣ز) شەڕێک ڕوویدا لەوشەڕەدا (فرۆبڵ) لەگەڵ دووگەنجی پەروەردەنناس یەکتریان ناسی کەناویان (لاجنتال بارۆب، میدویزڤ) بۆچونیان یەک بوو لەسەر شێوازی پەروەردەکردنی منداڵ لەبەرئەوە بوو بەبیرۆکەی یاسای نوێ یان داهێنان بۆ پەروەردەکردنی منداڵ براگەورەی (فرۆبڵ ) مرد و سێ منداڵی لە دوای خۆی جێهێشت، (فرۆبڵ) سێ منداڵەکەی بەخۆی گرت لەگەڵ دوو منداڵی خزمێکی تری و برای، برادەرەکەی (لاجنتال ) بناغە و بنچینەی یەکەم قوتابخانەی سەربەخۆییان دانا بۆ جێبەجێکردنی فەلسەفەی

نوێ بۆ پەروەردەكردنی منداڵ.(نازدار ساڵح حەمید، بێ ساڵی چاپ، ل٤).

لەساڵی ١٨٣٧ (فرۆبل) لە (بلانكنبارگ)ی ئەڵمانیا قوتابخانەیەكی كردەووە بۆ مەشق پێكردنی مندڵان لەڕووی دەروونییەوە بەهۆی یاریكردنەوە و ناویشی لێنا (Kindergarten) واتە (باخچەی منداڵان)، فرۆبل هەوڵیدا باردۆخێكی وابخولقێنێت بۆ منداڵان كە بەئازادی تێدا گەشەبكەن، وەك چۆن درەختێك لەباخچەكەیدا گەشەدەكات، ئەم سیستەمە زاڵبوو بەسەر مێشكی باوكان و دایكان و پاش (٢٥) ساڵ لەمردنی ( فرۆبل ) قوتابخانەی هاوچەشنی قوتابخانەكەی لە شارە گەورەكانی (نەمسا و بەلجیكا و كەنەدا و ئەڵمانیا و هۆڵندا و هەنگاریا و ژاپۆن و سویسرا و  ویلایەتەیەككرتوەكان و بەریتانیا ) دامەزرا، ساڵەكانی دواتر وڵاتانی تری جیهان ئەوسیستەمەیان پەیرەوكرد (محمود برهوم و ئەوانی تر، ٢٠٠٦، ل٢٧)، بەڕای  (كۆمینوس ) دەتوانین فێركردن بكەین بەچوار قوناغ  قۆناغی یەكەم پێش شەش ساڵی كەناوی  (فێرگەی دایك) ی لەسەر داناوە لەم قۆناغەدا كە فێركردن بەهۆی سروود  لەباخچەی منداڵان دەگرێتەوە، منداڵ لەگەڵ ماددە سەرەتاییەكانی مێژوو و جوگرافیا ناسیاوی پەیدادەكا و بەشداری لەیاری وەرزشی دەكات و منداڵان ڕێوشوێن و هەڵسوكەوتی باش فێردەبێ  (علی ئەكبەر میهر ئارا و ئەوانی تر، ٢٠٠٥، ل١٣٨)، دیارە ئامانجی گشتی هەر وڵاتێك بۆ هەر قۆناغێكی فێركاری گرنگە بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوونی هەبێت لەسەر چۆنێتی ئاراستەكردنی پەروەردەیی و چاودێریكردنی ئەو ئامانجە، باخچەكانی ساوایان لە ئەڵمانیای دامەزرێنەری باخچە بریتییە لە گەشەكردنی هەمەلایەنەی منداڵ و چاودێریكردنی ئەو گەشەكردنە، لە بەریتانیا ئامانجی گشتی باخچەكان پاڵپشتیكردنی منداڵە بۆ گەشەكردنی لایەنی كۆمەلایەتییەتی لەڕێگەی بوار ڕەخساندن بۆ منداڵان بۆ ئاوێتەكردن لەگەڵ یەكتری و فێركردنی ڕەفتارە كۆمەڵایەتییەتیە پەسەندەكان، هەرچی وڵاتی كەنەدایە ئامانجی گشتی باخچەكان لە گەشەكردنی لایەنی زمانەوانی منداڵ دەبینێتەوە و جەختی لەسەر دەكاتەوە، لەگەڵ لایەنی ویژدانی و ڕۆحی وەك ئەنجامدانی نوێژكردنی بەیانیان بەمنداڵان و فێركردنی هاوكاریكردنی هاوڕێكانی، لە وڵاتی بەلجیكا جەخت لەسەر هەڵسەنگاندنی هەمەلایەنە و بەردەوامی گەشەی منداڵان دەكەنەوە لەڕێگەی تاقیكردنەوە وپێودانگی تایبەتەوە (Austin، 1976، p. 276).

## ٢-٢ گرنگی باخچەی منداڵان:

زاناكانی پەروەردە كۆكن لەسەر ئەوەی كەپرۆگرامی دامەزراوەكانی باخچەی منداڵان كاریگەری باشی لەسەر گەشەی منداڵ هەیە پێش ئەوەی بچێتە قوتابخانە گرنگترینیان :-

- ئامادەباشی منداڵ بۆ قوتابخانە بەشێوەیەک کەڕاستەوخۆ لەماڵەوە ناچێتە نێو ژینگەیەکی جیاواز کە قوتابخانەیە.

- پێدانی ئەزموونی گونجاو بۆگەشەی بیر و زانیاری ئەندێشەی منداڵ و گەشەسەندنی کەسایەتی و تێرکردنی پێداویستیەکانی (علی و ئەوانی تر،٢٠١٣، ل٢٩).

- چاودێریکردنی لایەنی کۆمەڵایەتییەتی ئەویش بە پشتگیریکردن و ڕێنمای کردن و بڕوابەخۆبون بۆ قسەکردن و دەربڕینی ڕاوبۆچونی و گەشەی تواناکانی وەرگرتنی فێربونی سیستەمی قوتابخانەی و ڕێزگرتن لەهاوڕێکانی و مامۆستاکان و لێپرسراوان.

- چاودێریکردنی گەشەی جەستەی، ئەویش بەچاودێریکردنی گەشەی ماسولکە (گەورەکان و بچوکەکان) لەڕێگەی ڕاهێنان و مەشق و یاریکردنی مەبەستدار بۆ گەشەی شارەزاییەکانی ئەویش بە بەکارهێنانی دەست و پەنجەکانی بۆ گرتن و بڕین و بونیاتنان و ڕێکەو کۆبونەوە. Heeper and Others، 1979، p 487).

- باخچەی منداڵان گرنگە بۆ منداڵان ئەگەر(بۆساڵێکیش بێت)هەتا منداڵ ئامادەباشی دەروونی هەبێت بۆپەیڕوکردنی سیستەمی قوتابخانەو پەیوەست بوون پێیەوەی (سۆزان جمال، ٢٠٠٦، ل٢٩).

- گەشەکردنی توانای زمانەوانی ئەویش لەڕێگەی قسەکردن لەگەڵ مامۆستاو هاوڕێکانی وە لاسایکردنەوە بە بەکارهێنانی زمان و چەمکە بنچینەییەکان. (الكلاب، ١٩٩٣، ص٢١٠).

- چاودێریکردنی لایەنی سۆزداری، ئەویش بە دەربڕینی هەست و سۆز و متمانە بەخۆبوون.

- گەشەسەندنی بوار ئاینی و ویژدانی، ئارامگرتنی دەروونی.

- پەروەردەکردن لەسەر ڕە فتارە ڕاست و دروستەکان ئەویش بە فێربوونی هەندێ دەستەواژەی سڵاوکردن و بەخێرهاتن، بەئاڕاستەی چاکەکاری هەنگاو بنێت لێبوردن و ڕاستگۆیی و خۆشەویستی و دورکەوتنەوە لەکارەخراپەکان، وەک درۆکردن و جنێودان و ئازاردان. (علی و ئەوانی تر، ٢٠١٣، ل٣٠).

- لایەنی ژیری، منداڵ لەباخچەی منداڵان لە ڕێگەی یاریكردن وگۆرانی و سرود و چیرۆك و حیكایەتەوە زۆر شارەزایی و زانیاری فێردەبێت و زمانی پاراو دە بێت و ژمارەی ووشەكانی زیاد دەبێت و هەڵەكانی بۆ ڕاست دەكرێتەوە و یادكردنەوە وئاگاداری وچاولێكردن و خەو وخەیاڵی بەهێز دەكرێت و شارە زایی هەندێك لە دیاردەكانی ژیان دە بێت.

- لایەنی هەڵچونی، منداڵ لەڕێگەی یاریكردن و تێكەڵاوبوونی بە منداڵانی تر و گێڕانەوەی چیرۆك و گۆرانی و سروود ووتنەوە لە زۆر گرژی وهەڵچوون وخەم و خەفەت ڕزگاری دەبێت، لەوانەیە ئەگەر ئەو ژینگەیە نەبێت ئەوا گرژی وخەم وخەفەت وهەڵچونەكان تووشی زۆر گرفت وگرێی دەروونی بكەن (قەرەچەتانی، ٢٠٠٩، ل١٤٨).

### ٢-٣ كاریگەری دایك و باوك له سەر منداڵ:

پەیوەندی نیوان دایك وباوك و منداڵ بەجوانترین وپیرۆزترین پەیوەندی كۆمەڵایەتییەتی دادەنرێت، بەتایبەتی ئەگەر لەسەر بنەمای لێكتێگەیشتن و ڕێز و خۆشەویستی ئەوپەیوەندیە دروست بووبێت، لەم سەردەمەدا كە منداڵان بیریان زیاتر كەوتووەتە ژێركاریگەری تەكنەلۆژیا پێشكەوتووەكان و ڕووداوە جیاوازەكانی كە دەوری جیهانەكەمانی داوە، ڕاگەیاندنەكانیش ڕۆڵێكی گەورەی بۆ سەر هزرو بیری منداڵان هەیە بۆگەیشتن بەهۆیەكانی گەیاندنی پەیامەكان و دەستكەوتنی زانیارییەكان بۆكەسانی دیكە، لێرەدا بۆ گەیاندنی ئەوپەیامانە چەند ڕێگەیەك هەیە بۆ دەستەبەركردنی وتووێژی زارەكی، یان لەڕێگەی دەربڕینەكانی دەموچاو یان جووڵەی دەستەكان. بۆ تێگەیشتنێكی كارا و چالاك هونەری ڕەفتاركردنی دایكان و باوكان لەگەڵ منداڵاندا پێویستیەكی گرنگە بۆ دەستەبەركردنی ژیانێكی باش و بۆ منداڵان (عبداللە، ٢٠١٠، ل٥٣).

هەموو منداڵێك كەلەدایك دەبێت مافی خۆیەتی شوێنێكی شیاوی بۆ ژیان و نیشتەجێبوون هەبێت كەلەسەرەتای ژیانیدا ئەوشوێنە بۆ ئەو باوەشی دایكییەتی. واتە دەبێت دایكی ئەو شوێنە شیاوەی بۆ دابین بكات. هیچ زیادەڕۆیی نیە كاتێك دەوترێت منداڵ لەسەرەتای ژیانیدا هەست بەگەرمی باوەشی دایكی وسۆز ودڵنەوایی دەكات و شیری دەداتێ .ئارەزووی بۆ ئەو منداڵە بەو شێوە سروشتیە نەبوو لەبەر هەرهۆیەك بێت (جمال، ٢٠٠٦، ل١١٠).

هەروەها كردنەوەی كەناڵەكانی پەیوەندی كارا لەگەڵ منداڵاندا زۆر گرنگە نەك بەتەنها بۆ منداڵان بەڵكو بۆ سەرجەم ئەندامانی خێزان گرنگە. بۆ گەیشتن بەپەیوەندییەكی باش وپتەو لەنێوان دایك وباوك و منداڵاندا گوێگرتن

ئەوچالاکیە داواکراوەیە بۆلێکگەیشتنی پەیوەندییەکی چالاک تایبەت ئەگەر گەیشتن بەو ئامانجە لەسەر بنەمای تێگەیشتن بێت نەک زەبرو زەنگ لەنێوان باوان و منداڵاندا . ئەو ڕێگەیەی کە ئێوە پێیگەیشتون منداڵانیش هەست بە هەمان گەیشتن دەکەن . بۆ نمونە ئەگەر منداڵ هەست بکات گوێ لێناگیرێت یان گرنگی پێنادرێت ئەوکاتە هەست بەبێزاری و نەمانی هیوا دەکات ، ئەگەر وەڵامەکەتان زێدەڕۆی تێدابوو بێگومان منداڵەکانیشتان بروایان پێنامێنێت وبێ هیوا دەبن . منداڵان ڕێگری لەدەربڕینەکان دەکەن بەوهەستەی بەمێشکیاندا دێت و دەڕوات یان ئەوهەستەی هەیانە . ئەوەش کاردانەوەیەکی ئاساییە ، چونکە دایە و بابەکان گرنگیەکی تایبەتیان بەقسەو داواکارییەکانی منداڵەکان نەداوە یان بەشێوەیەک نەبووە وەڵامەکان ببێتە هاندەرێک بۆ ئەوقسانەی کردوویانن هەمیشە بە ئاگادارییەوە نایەڵن زانیاریەکانیان دەربخەن کەدەبێتە ئاڵوگۆڕکردنی هەستەکانیان و گۆڕینی ئایندەی منداڵەکانتان (عبدالله ، ٢٠١٠،ل ٥٤ ) ، کاری باوان بریتیە لە دروستکردنی هاوبەشی لەبوار پەروەردەی منداڵ لەگەڵ مامۆستای باخچەی منداڵان بۆ هێنانەدی و گەیشتن بەو ئامانجانەی گەشەی منداڵ پێویستیەتی لەو قۆناغەدا ، هەر بۆیە دەبێت دایک وباوک و پەروەردەکراوبن لەبوار ئاڵوگۆڕ کردنی زانیاری دەربارەی پەروەردەی منداڵ . هەروەها بەم شێوەیە هەردوولا باوان و مامۆستای باخچەی منداڵان. زیاتر لەیەک نزیک دەبنەوە و ڕادەی لەیەک تێگەیشتن زیاتر دەبێت دەربارەی کێشەی منداڵەکە بەم شێوەیە ئەوان لەیەکترییەوە فێردەبن وکاردانەوەیان دەبێت لەسەر تێڕوانینی یەکتری دەربارەی پەروەردەی منداڵ .یان هەڵسوکەوتی منداڵ و بەرز نرخاندنی توانای یەکتر (علی و ئەوانی تر ،٢٠١٣ ،ل١١٩-١٢٠).

بەکورتی هەریەکەلەدایک وباوک مەوداو سنوری کاری پەروەردەییان دیاری کراوە ، هەریەکەیان لەلایەن خۆیانەوە خەریکی کاری خۆیەتی لەپێگەیاندن وبەخێوکردنی منداڵ و ئاراستەکردن و پەروەردە و فێرکردندا هەموو ئەمانەش هۆکارن بۆ دروست کردنی کەسێتی منداڵ . لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کەهەریەکە لەدایک وباوک لەجێگەی خۆیانەوە ئەندازیارن لەدروستکردنی کەسێتی نەوەکانیان ، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیەمان لەبیر نەچێت کە ئەندازیاریش هەڵەدەکات ، بەڵام گرنگ ئەوەیەکە ئەندازیارێکی ورد بێت . زوو هەست بەهەڵەی خۆی بکات چارە سەری بکات ، چونکە بونیاتنانی کەسێتی مرۆڤ کارێکی هەستیارە و پڕە لەوردەکاری واتە وەکو دروست کردنی بینایەک یان پردێک نیە بەڕوخانی هەڵەکان چارە سەربکرێن ، بەڵکو بینای کەسێتی مرۆڤ ناڕوخێت بگرە زۆربەی جار بواری چاککردنەوە و چاکسازیشی نیە، تائێستا لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا خێزان و پەیوەندیەکانی ئەندامانی خێزان تۆکمە و توندوتۆڵن ، کەواتە دایک وباوک لێپرسراوی یەکەمی خێزانن و هەر ئەوانیش ڕەنگرێژی کەسێتی ئایندەی

منداڵەکانیان دەکەن، کەواتە ئەوان ئەندازیاری کەسێتی منداڵەکانن (ئالانی ،٢٠١٤،ل ١١٦-١٧٧).

لەسەدەی ڕابردوو دایک وباوک ساڵی جارێک یان دووجار دەچوون بۆ کۆبونەوەی دایکان وباوکان کەتێیدا ڕەوشی گشتی منالان وباخچەکان دەخرایەڕوو، بەلام پەروەردەی نوێ جەخت لەسەر ڕەخساندنی هەلی بەردەوام دەکاتەوە بۆ دایکان و باوکان تاسەردانی باخچەکان بکەن و ئاگاداری پەروەردەو هەڵسوکەتی منداڵەکانیان ببن لەو جێگەیەی کەمنداڵەکانیان بۆناردووە و بێخەمبن و دڵنیان لەوێ پارێزراوە ، لێرەدا هاتنی دایکان و باوکان دەبێتە هۆی دروستبوونی نزیکایەتی وهاوکاری لەنێوان ئەوان و مامۆستایاندا ، بەمەش هەردوولا هەم مامۆستایانی باخچەو هەم دایکان و باوکان زیاتر برەودەدەن بە پەروەردەکردنی منداڵ (ڕەزا،٢٠٠٩،ل ٧٠).

منداڵ کاتێک دەبینێت دایک و باوکیان لەگەڵ پەروەردەکاراندا دانیشتوون بەڕێزەوە تەماشای یەکتری دەکەن منداڵەکان دەبینن کەچۆن دایک و باوک و باخچەی منداڵان بۆسەرکەوتنی ئەوان پێکەوە کاردەکەن هەریەک لەوان تەواوکەری ئەوانی تریانن ،چونکە باخچەی منداڵان سەرکەوتوو دەبێت گەر پەیوەندی باش هەبێت لەنێوان دایکان و باوکاندا ئەمەش کاردانەوەی باشی دەبێت لەسەر گەشەسەندنی منداڵەکە بۆدروستکردنی پەیوەندی بەهێز لەنێوان باوان و باخچەی منداڵان زۆر گرنگە بەرامبەر یەکتری کراوە بن واتە شەفاف بن ئارام گرتووبن بەرامبەر یەکتری و بتوانن یەکتری قبوڵ بکەن ئامادەبن بۆ پەیوەندی کردن لەگەڵ یەکتریدا ، بوونی لێبوردەی و دروستکردنی متمانە بەیەکتری ، ئامادەبن بۆ دیالۆگ ئەمانە هەمووی گرنگن و بەردی بناغەی کاری هاندانی دایکان و باوکانە لەباخچەی منداڵان ،بەتایبەتی کاتێک چاوپێکەوتن لەگەڵ دایک و باوکانە لە باخچەی منداڵان دەبێت بەتێروتەسەلی و کات هەبێت بۆیەکتری و ڕێز گرتن لەیەکتری هەوڵدان بۆتێگەیشتن لەیەک و ڕاستگۆی لەگەڵ یەکتری ئەمانە هەمووی هەڵسوکەتی گرنگن دەبێتە هۆی بەباشی و گەشەکردنی منداڵەکە لەباخچەی منداڵان (علی و ئەوانی تر ،٢٠١٣ ،ل ل ١١٨،١١٩).

## باخچە وقوتابخانەکانی کەلار :-

هەرچەندە مێژووی پەروەردە بەبەراورد بەقەزابوونی کەلار لەپێشترە ئەوەتا یەکەمین قوتابخانەی حکومی بەناوی قوتابخانەی شێروانە لەساڵی ١٩٣١ لەگەڕەکی کەلاری کۆن دامەزراوە، ئەمەو هەرچەندە پێش دەساڵێک و بەتایبەت لەساڵی ١٩٢٠ لەشاری کفری یەکەمین قوتابخانەی حکومی بەناوی (قوتابخانەی باوەشاسوار) کرایەوە، هەرچی قەزای خانەقینە هەر لەسەردەمانی عوسمانییەوە شوێنی هەڵکەوتنی چەندین مەلای ئاینی بووە لەوانە مەلا قاسم و مەلا حسن لە گوندی بان میل و

مەلا نادر و شێخ عەلی ئەمیر لە گوندی کارێز ، هەروەها مەلا عبدالصمد سلێمان لە گەڕەکی پاشاکۆپری..، ئەوەی جێگەی سەرنجە یەکەمین قوتابخانە لە پارێزگای دیالی و دووەم قوتابخانەی فەرمی حکومی لەسەر ئاستی عێراق لەساڵی ١٩٠٨ بووە بە ناوی قوتابخانەی عەلیاوا لە گوندی عەلیاوای کە ئێستا کەوتوەتە ناو شارەکەوە ، شایانی باسە ئەم قوتابخانەیە لەبنەڕەتدا کۆشکێک بووە بۆ بنەماڵەی پاشایەتی هاشمی بونیادنراوە و دواتر بووە بە قوتابخانە، یەکەمین باخچەش لە شاری خانەقین لە ساڵی ١٩٥٨بەناوی باخچەی خانەقین بووە کە تاوەکو ئێستاش ماوە .

بەڵام هەرچی مێژووی باخچە و قوتابخانە ناحکوومییەکان لە شاری کەلار مێژوویەکی نوێیە و دەتوانین بڵێین یەکەمین باخچە و قوتابخانەی ناحکوومی پێکەوە خۆی لە باخچە و قوتابخانەی وانۆوی ناحکومی دەبینێتەوە کە لە ساڵی خوێندنی ٢٠١١-٢٠١٢ دامەزراوە و لە سەرەتادا ئەم دامەزراوەیە لە چەند کابینەیەک خۆی بینیوەتەوە و پاشان گواستراوەتەوە بۆ گەڕەکی بنگرد لە گوندی دریم لاند لە باڵەخانەیەکدا درێژەیان بە پرۆسەی خوێندن داوە تاوەکو ساڵی خوێندنی ٢٠١٦-٢٠١٧بینایەکی سەربەخۆ و گەورە بۆ خۆیان درووستدەکەن و تاوەکوو ئێستاش لەو بینایە پرۆسەی خوێندن بەڕێدەکەن کە بیناکە هەم باخچەی منالانی تێدایە هەم قوتابخانە، دەتوانین بڵێین یەکێکە لەو باخچە و قوتابخانە نا حوکمیانەی کە زۆرینەی مەرج و ڕێنماییەکانی وەزارەتی پەروەردەی تێدا فەراهەم کراوە و زۆرترین منداڵ و قوتابی تێدا دەخوێنن.(بڕوانە توێژینەوەی کۆنفرانسی چوارەمی زانکۆی گەرمیان لەلایەن پ.ی.د.کریم احمد عزیز بەناونیشانی هەڵسەنگاندنی باخچە و قوتابخانە ناحکومیەکان بەپێی مەرج وڕێنماییەکانی وەزارەتی پەروەردە لە شاری کەلار) ، هەروەها یەکێکی دیکە لەو باخچە و قوتابخانە ناحکومیانەی لەشاری کەلار بینای سەربەخۆ و منداڵ و قوتابی زۆری لەخۆگرتووە باخچەی مێخەک و قوتابخانەی دوارۆژە کە باخچەکەیان لەساڵی ٢٠١٧-٢٠١٨ لە بینایەکی سەربەخۆی کرێ لە شارەدێی گردەگۆزینە دامەزراوە ، پاش دوو ساڵ خوێندن تێدا و هەڵپەساردنی بۆ ماوەی ساڵێک گواستراوەتەوە بۆ بینای قوتابخانەی دوارۆژ لەساڵی خوێندنی ٢٠٢٠-٢٠٢١ و تاوەکو ئێستا بەشێوەی سەربەخۆ بەردەوامە، هەرچی قوتابخانەکەیە

واتـە قوتابخانـەی دواڕۆژی ناحکومـی بەزمانـی ئینگلیـزی لەسـاڵی خوێندنـی ٢٠١٨-٢٠١٩ دامــەزراوە و تاوەکــو ئێســتا خزمەتگــوزرای پــەروەردە و فێرکــردن پێشکەشــدەکات، قوتابخانـەی نـاوازە یەکێکـی تـرە لەباشـترین قوتابخانـە ناحکومیەکانـی قـەزای کـەلار ، هەرچـی قوتابخانـەی پـلان و ئانـا ..تـاد هەیـە بەردەوامـن لە پـەروەردەی سـەردەمیانەی منــداڵان لەقەزاکــەدا ، بەنیســبەت باخچــە حکومیــەکان لەبەشــی ســێیەم بەشــێوەی زانسـتی خراونەتـەروو.

## بەشی سێیەم / ڕێکارەکانی توێژینەوە

### ٣-١ کۆمەڵگەی توێژینەوە:

کۆمەڵـگـەی توێژینــەوە بریتیــە لەگشــت ئــەو دایەبابانــەی منداڵیــان هەیــە لــە باخچــە حکومیەکانــی منــداڵان کەدەکەونــە ناوەنــدی قــەزای کــەلارەوە بــۆ ســاڵی خوێندنــی ٢٠١٣-٢٠١٤ کــە ژمارەیــان (٧) باخچەیــەو ژمــارەی دایەبابەکانیــش دەگاتــە ( ٣٠٥ ) دایەبابــە ، خشــتەی (١) ژمــارەی باخچــەو دایەبابەکانــن لەگــەڵ ئــەو شــوێنانەی باخچەکانــی منداڵانــی تێدایــە لەناوەنــدی قــەزای کــەلارەوە .

خشتەی (١)

ژمارەی دایەبابانەی منداڵیان هەیە لە باخچەکانی ناوەندی قەزای کەلار

| ژ | ناوی باخچە | ژمارەی دایەبابە | گەڕەک |
|---|---|---|---|
| ١ | بەرسیلە | ٤٠ | بەردەسور |
| ٢ | –ئازادی | ٣٢ | سەرکەوتن |
| ٣ | پەپوولە | ٦٨ | ڕاپەڕین |
| ٤ | ڕازاوە | ٣٧ | سەرکەوتن |
| ٥ | کازیوە | ٣٨ | ئەندازیاران |
| ٦ | کەلار | ٥٥ | بنگرد |
| ٧ | پەری | ٣٥ | نەورۆز |
| کۆ | | ٣٠٥ | |

### ٣-٢ نمونەی توێژینەوە:

توێـژەر هەسـتاوە بـە وەرگرتنـی نمونـەی توێژینـەوە بەشـێوەی هەڕەمەکـی سـادە لەکۆمەڵـگـەی توێژینــەوە لــە (٥) باخچــەی منــداڵان وەک لەخشــتەی (٢) هاتــووە، توێـژەر هەسـتاوە بـە وەرگرتنـی ژمـارەی (٤٩) دایەبابـە بۆنمونـەی توێژینـەوە کـە ڕێژەکـەی دەکاتـە (١٦,٠٦٪) لەکۆمەڵـگـەی توێژینـــەوە .

خشتەی (٢)

نمونەی توێژینەوەیە

| ژ | ناوی باخچە | ژمارەی وەرگیراوان | ڕێژەی سەدی | گەڕەک |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەرسیلە | ١٠ | ٪٣،٢٧ | بەردەسور |
| ٢ | پەپوولە | ١٣ | ٪٤،٢٦ | ڕاپەڕین |
| ٣ | ڕازاوە | ٨ | ٪٢،٦٢ | سەرکەوتن |
| ٤ | کازیوە | ٩ | ٪٢،٩٥ | ئەندازیاران |
| ٥ | کەلار | ٩ | ٪٢،٩٥ | بنگرد |
| کۆ | | ٤٩ | ٪١٦, ٠٦ | |



ئامـڕازی توێژینـەوە: بـۆ ئـەوەی داتـا وزانیاریمـان دەسـت بکەوێـت پێویسـتمان بـە ئامرازێـک هەیـە لەڕێگەیـەوە هەسـتین بـە کۆکردنـەوەی ئـەو زانیـار وداتایانـە ، هـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە توێـژەر سـودی لـە ئامـرازە ئامادەکراوەکانـی توێژینەوەکانـی پێشـتر و سـەرچاوە پەروەردەییـەکان وەرگرتـووە ، هـەر بـۆ زیاتـر گەیشـتن بـە ئامانـج و مەبەسـتەکانی توێژینەوەکـە توێـژەر هەسـتاوە بەئەنجامدانـی ڕاوەرگرتنـی سـەرەتایی (استـبیان اسـتطلاعی) بـۆ بەدەسـتهێنانی زانیـاری سـەرەتایی بـۆ دروسـتکردنی فۆرمـی ڕاوەرگـری ، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فۆرمێکـی سـەرەتایی پێشـکەش بـە ژمارەیـەک لـە مامۆسـتایانکرد کـە بریتـی بـوو لـە شـەش بـوار وبوارێـک بـۆ تێبینـی وپێشـنیازەکانیان ، پـاش کۆکردنـەوەی سـەرجەم فۆرمـەکان و زانیاریەکانـی بەتاڵکرانـەوە و پاشـتر بەسـەر چەنـد بوارێکـی سـەرەکیدا دابەشـکران و فۆرمـی ڕاوەرگـری بەشـێوەی کۆتایـی لێدرووسـت بوو(بڕوانـە پاشـکۆی ژمـارە ١).

ڕاستێتی ڕواڵەتی ئامراز Face Validity :- ڕاستێتی لەگرنگترین مەرجەکانە بۆ پێودانکردنی ئامراز بۆ ئەو دیاردە وباس وکێشەیەیی کە دەپێوریت ، چونکە مەبەست لە ڕاستێتی تواناداری ئامرازە بۆ پێوانەکردنی ئەو بابەتەی لەپێناویدا دانراوە (الطريحي،٢٠٠١ ، ص٧٢)، باشترین میکانیزمیش بۆ دەرخستنی ڕاستێتی ئامراز بریتییە لە ڕاستێتی ڕووکەشی (Face Validity ) ئامرازی ڕاوەرگری ، واتەپیشاندانی ئامرازەکەیە بۆ کۆمەڵێک پسپۆڕ وتایبەتمەند بۆ داوەریکردنی و دەرخستنی ڕادەی گونجاوی برگەکانی (احمد،١٩٩٨ ،ص٣٧٠)، هەر بۆیە پاش ئەوەی ئامرازی توێژینەوە لەلایەن چەند شارەزاییەکی بواری پەروەردە و دەروونناسی ڕاستێتی بۆ ئەنجامدرا کە ژمارەیان ( ٧ )پسپۆڕ بوون (بڕوانەپاشکۆی ژمارە ٢ )، توێژەر ڕێژەی (٨٠٪)ی پشتیوانی داوەری وەرگرت بۆ هەر برگەیەک ، لەکۆتاییدا چەند برگەیەک گۆڕانکاری تێدا کراو ژمارەیەک برگەش لابران، لەئەنجامدا کۆی برگەکان لە فۆرمی ڕاوەرگری گەیشتە ( ٢٦) برگە و دابەشکران بەسەر (٦) بوار، توێژەر سێ هەڵبژاردنی بەشێوەی ( بەڵێ )، ( تاڕادەیەک)، ( نەخێر ) کە ناسراوە بەپێوەری لیکەرتی سێی بەشێوەی پلەبەند داناوە، بۆ ئەوەی چەندێتی هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان ڕوونبێتەوە، لەکۆتاییدا دەرکەوت ڕاستێتی ئامرازەکە گونجاوە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەکە .

جێگیری ئامراز:- توێژەر هەستاوە بە وەرگرتنی (٢٠)دایەبابە لە دەرەوەی نموونەی وەرگیراوی توێژینەوەکە فۆرمیان بەسەردا دابەشکرا پاش (١٥) ڕۆژ ، جارێکی تر توێژەر فۆرمی نوێی بەسەریاندا دابەشکردەوە، پاش وەرگرتنەوەی هەموو فۆرمەکان دەستمانکرد بە ئەنجامدانی دۆزینەوەی جێگیری ئامرازەکە بە هاوکێشەی ( پێرسۆن ) بۆ ژماردنی کارایی جێگیری دەرکەوت جێگیری ئامرازەکە بریتییە لە (٠،٨٧) .

جێبەجێکردنی ئامراز Application of the Scale :- پاش دڵنیابوون لە ڕاستێتی وجێگیری ئامرازەکانی توێژینەوە ، توێژەر هەستا بەجێبەجێکردنی ئامرازی توێژینەوە بەشێوەی کۆتایی لەسەر کۆمەڵگەی توێژینەوە کە پێکهاتبوو لە (٤٩) دایەبابە کە هەریەکەیان منداڵیان هەیە لەو باخچانەی وەک نمونەی توێژینەوە وەرمان گرتبوون لە شوێن وگەڕەکی جیاواز لە ناوەندی قەزای کەلار کە ڕێژەی سەدیان دەکاتە (١٦،٠٦٪ ) لەکۆمەڵگەی توێژینەوە ، توێژەر بەشێوەی دابەشکردنی ڕاستەوخۆ فۆرمی ڕاوەرگری لەبەرواری ٢٠١٤/٤/٢ بۆ١٦ /٢٠١٤/٥ بەسەر دایەبابەکان جێبەجێکرد ، ئەم کارەش وەک (عوبەیدات ) جەختی لەسەر دەکاتەوە دەبێتە هاندەرێک بۆ ئەوەی وردتر وەڵامبدەنەوە و دەرئەنجامەکان درووست تر بەدەست بێن (عبيدات، ١٩٩٢،ص ١٢٨ ) .

## ئامرازە ئاماریەكان (The Statistical Procedures):

١- هاوكێشەی پێرسۆن ( Pearson ) :

توێژەر بۆ ئەژماركردنی بەهای هاوسەنگی جێگیری ئامرازی ڕاپرسیەكە بەشێوەی دووبارەكردنەوەی وەلامدانەوە .

ن مج س ص - ( مج س ) ( مج ص )

ر = ―――――――――――――

[ ن مج س٢– ( مج س٢ )] [ ن مج ص٢ – ( مج ص )٢]

(السید،١٩٧٩، ص١٨٣)

٢ـ ناوەندی شیاوی (یەكلاییكەرەوە) :

ت١ × ٣ + ت٢ × ٢ + ت٣ × ١

ناوەندی شیاوی (یەكلاییكەرەوە) = ―――――――――

كۆ ت

( Fischer، 1955 ، P ١٥٦ )

بەپێی هاوكێشەكە كێشی هەڵبژاردەكان بەم شێوەیە بوو .

ت١ = نابێتە كێشە ، (یەک پلە) .

ت٢ = كێشەی لاوەكیە ، (دوو پلە) .

ت٣ = كێشەی سەرەكیە ، (سێ پلە) .

٤- ڕێژەی سەدی ( Percentage ) : لەپێناو ئەژماركردنی كۆمەڵگا و نمونەی توێژینەوە بەكارهاتووە.

ژمارەی لاوەكی

ڕێژەی سەدی = ――――― × ١٠٠

كۆی گشتی

(السید،١٩٧٩،ص ١١٢)

ه- كێشی سەدی ( Coefficient of Weight) :

$$\text{كێشی سەدی} = \frac{\text{ناوەندی شیاو}}{\text{بەرزترین كێش}} \times ١٠٠$$ ( الغریب،١٩٧٨،ص ٧٦)

## بەشی چوارەم / خستنەڕوو شیكردنەوەی ئەنجامەكان

### ٤-١ هەڵسەنگاندنی دایەبابەكان بۆ گەشەی منداڵەكانیان

توێژەر هەستاوە بە ڕیزبەندكردنی داتاكان بۆ هەر بوارێك بەشێوەی دابەشكردنی لیكرت ، واتە چەندی لەگەڵ ( بەڵێ ، تاڕادەیەك ، نەخێر )ە ، پاشان لەڕێگەی بەكارهێنانی ئامڕازەكانی ئاماركردن ( ناوەندی شیاوی ، كێشی سەدی) ڕێكاری ئاماری گرتوەتەبەر برگەكان لەڕێگەی ڕیزبەندی بەرزترین بۆ نزمترین خراوەنەتە ڕوو وەك لە خوارەوە دیارە .

خشتەی ( ٣ )

یەكەم/بوار گەشەكردنی بوار دەروون-جوڵەیی

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەكان بەڵێ (٣) | تاڕادەیەك (٢) | نەخێر (١) | ناوەندی شیاوی | كێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١ | ٣٤ | ١٢ | ٢ | ٢،٥٦ | ٪٨٥،٣٣ |
| ٣ | ٢ | ٢٨ | ١٨ | ٢ | ٢،٤٤ | ٪٨١،٣٣ |
| ٤ | ٣ | ١٢ | ١٢ | ٢٤ | ١،٦٨ | ٪٥٦ |
| ٢ | ٤ | ٢ | ٨ | ٣٨ | ١،٢ | ٪ ٤٠ |
| كۆی گشتی | | ٧٤ | ٥٠ | ٦٦ | ١, ٩٧ | ٪٦٥, ٦٦ |

خشتەی (٣) برگەكانی ( ٣،١ ) بەهێزن چونكە مامۆستاكان منداڵانی باخچەكانیان ڕاهێناوە لەسەر گرتنی قەڵەم و بەكارهێنانی بۆكێشانی وێنە . منداڵان خۆیان دەتوانن جلوبەرگ وپێڵاو لەپێ بكەن بەبێ ئەوەی هاوكاری بكرێن لەلایەن دایك و باوكانەوە . هەر لەم خشتەیە برگەی (٢ ، ٤) لاوازە هۆكاری لاوازی برگەی (٢) ئەوەیە كەلەباخچەكاندا بەكارهێنانی دەرزی قەدەغەكراوە، دایكان ئەوكارە بەمنداڵان ناكەن و خۆیان ئەوكارە دەكەن ، هۆكاری لاوازی برگەی (٤) ئەوەیە منداڵان توانای بەكارهێنانی كۆمپیوتەریان نیە ناتوانن سوود لەكۆمپیوتەر وەربگرن، هەرچەندە تەنها ناسینی بەشە هارویرە ڕواڵەتەكانە ، بەڕای توێژەر قۆناغێكی هێشتا زووە واباشتر بكرێت بە ئارەزوومەندانە لەگەڵ ئامرازی دیكە .

خشتەی ( ٤ )

دووەم/بوار گەشەكردنی هزری

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەكان | | | ناوەندی شیاوی | كێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ (٣) | تارادەیەك (٢) | نەخێر (١) | | |
| ١ | ١ | ٢٨ | ٢٢ | ٠ | ٢،٥٦ | ٪٨٥،٣٣ |
| ٣ | ٢ | ٢٦ | ٢٤ | ٠ | ٢،٥٢ | ٪٨٤ |
| ٢ | ٣ | ٢٦ | ٢٠ | ٤ | ٢،٤٤ | ٪٨١،٣٣ |
| ٤ | ٤ | ١٢ | ٢٢ | ١٦ | ١،٩٢ | ٪٦٤ |
| كۆی گشتی | | ٩٢ | ٨٨ | ٢٠ | ٢, ٣٦ | ٪٧٨،٦٦ |

لەخشتەی (٤) برگەكانی ( ١ ، ٣ ، ٢) بەهێزن هۆكاری بەهێزی برگەكانیش توێژەر بۆ ئەوەی دەگێڕێتەوە كەمنداڵان لەماڵەوە گرنگی زۆر دەدەن بەو بەسەرهاتە سروشتیانەی كە لە تەلەفزیۆن و تۆڕەكانی نێتەوە پەخش دەكرێت ، دەتوانن لە ماڵەوە ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانە بگێڕنەوە كە لەباخچە لەلایەن مامۆستاوە بۆیان باس دەكرێت ، پرسیار دەربارەی شتە نامۆكانی دەوروبەریان دەكەن، بەڵام برگەی (٤) لاوازە ئەمەش هۆكاری ئەوەیە كەمنداڵان ناتوانن سود

لەبەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەربگرن و پاشان دایکان و باوکان کۆمپیوتەر نادەن بەدەست منداڵەکانیانەوە بۆیە نازانن کۆمپیوتەر بکەنەوەو بیکوژێننەوە، یاخود لە باخچەکاندا نییە یاخود هەیە و بەکارناهێنرێت .

خشتەی ( ٤ )

سێیەم/ بوار گەشەی زمانەوانی

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەکان بەڵێ (٣) | تاڕادەیەک (٢) | نەخێر (١) | ناوەندی شیاوی | کێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣ | ١ | ٣٦ | ١٤ | ٠ | ٢،٧٢ | ٩٠،٦٦٪ |
| ١ | ٢ | ٢٨ | ١٨ | ٤ | ٢،٤٨ | ٨٢،٦٦٪ |
| ٢ | ٣ | ١٦ | ٢٤ | ١٠ | ٢،١٢ | ٧٠،٦٦٪ |
| ٤ | ٤ | ١٨ | ٢٦ | ٦ | ٢،٢٤ | ٧٤،٦٦٪ |
| کۆی گشتی | | ٩٨ | ٨٢ | ٢٠ | ٢, ٣٩ | ٧٩،٦٦٪ |

خشتەی (٤) هیچ برگەیەک لاواز نیە ، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی منداڵانی باخچە کەتەمەنیان لەنێوان (٤-٦) ساڵیدایە بەباشی فێری قسەکردن بوون دەتوانن لەگەڵا مامۆستاکان و دایک وباوک و ئەو کەسانەی کەلەگەڵیان هەڵسوکەوت دەکەن و هاوڕێکانیان قسە بکەن و سەرجەم پیت و وشەکان بەباشی دەر دەبڕن و توانای تێگەشتنیان لەو چیرۆکانە هەیە کە بۆیان دەخوێنرێتەوە .

خشتەی (٥)

چوارەم/بوار گەشەی لایەنی دەروونی

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەکان بەڵێ (٣) | تاڕادەیەک (٢) | نەخێر (١) | ناوەندی شیاوی | کێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤ | ١ | ٣٩ | ١١ | ٠ | ٢،٧٨ | ٪٩٢،٦٦ |
| ٣ | ٢ | ٢٨ | ١٠ | ١٢ | ٢،٣٢ | ٪٧٧،٣٣ |
| ١ | ٣ | ٢٦ | ١٣ | ١١ | ٢،٣٠ | ٪٧٦،٦٦ |
| ٢ | ٤ | ٢٧ | ١٥ | ٨ | ٢،٢٨ | ٪٧٦ |
| کۆی گشتی | | ٦٢ | ٣١ | ٣ | ٢, ٤٢ | ٪٨٠, ٦٦ |

لەخشتەی ( ٥) هیچ بڕگەیەک لاواز نیە ، ڕەنگە هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەومنداڵانەی کە دەچنە باخچەکان لەڕووی دەروونییەوە گۆڕانکاریەکی بەرچاویان بەسەر منداڵاندا دێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کە لەڕووی دەروونییەوە ئاسودە ببن و بەردەوام دڵخۆشبن بەو جێگە تازەیەی کە بۆی ڕۆیشتوون هەر ئەمەش وایکردووە کە ئەو منداڵانە ڕفتاری شەرەنگێزیان بەڕێژەیەکی باش کەم بکات و ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتییەتی و تێکەڵاوی منداڵانی تر ببن و یەکترقەبوڵکردنیان لادرووست بێت ، ئەمەش یەکێکە لە ئەرکەکانی پەروەردە ( عزیز، ٢٠١٤ ، ٣٤ ).

خشتەی (٦)

پێنجەم/بوار پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەكان بەڵێ (٣) | تاڕادەیەک (٢) | نەخێر (١) | ناوەندی شیاوی | کێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢ | ١ | ٢٨ | ١٨ | ٤ | ٢،٤٨ | ٪٨٢،٦٦ |
| ٣ | ٢ | ٢٥ | ١٥ | ١٠ | ٢،٣ | ٪٧٦،٦٦ |
| ١ | ٣ | ٢١ | ٢٣ | ٦ | ٢،٣ | ٪٧٦،٦٦ |
| کۆی گشتی | | ٢٥ | ٤٣ | ٤ | ٢, ٣٦ | ٪٧٨, ٦٦ |

لەخشتەی ( ٦) هیچ بڕگەیەک لاواز نییە ، چونکە دایک و باوکانی منداڵان زیاتر گرنگی بەلایەنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییەکانی منداڵان دەدەن، ئەمەش وای کردووە کە منداڵان زیاتر ڕێزی هاوڕێکانیان بگرن و لەکاتی یاری کردندا هاوکاری یەکتری بکەن .

خشتەی (٧)

شەشەم/ بوار تەندرووستی

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەکان | | | ناوەندی شیاوی | کێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ (٣) | تاڕادەیەک (٢) | نەخێر (١) | | |
| ٣ | ١ | ٣٢ | ٧ | ١١ | ٢،٤٢ | ٪٨٠،٦٦ |
| ٢ | ٢ | ٢٣ | ٢٤ | ٣ | ٢،٤ | ٪٨٠ |
| ١ | ٣ | ١٥ | ٢٨ | ٧ | ٢،١٦ | ٪٧٢ |
| ٤ | ٤ | ٢٢ | ٢٤ | ٤ | ٢،٣٦ | ٪٧٨،٦٦ |
| کۆی گشتی | | ٩٢ | ٨٣ | ٢٥ | ٢, ٣٣ | ٪٧٧, ٨٣ |

لەخشتەی (٧) هیچ برگەیەک لاوازنیە ، توێژەر هۆکاری سەرکەوتنی گشت برگەکانی بوار تەندرووستی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە لەئێستادا لایەنی تەندروستی منداڵان گرنگی زیاتری پێدەدرێت چ لەلایەن دایک وباوکانەوە بێت یان لە لایەن باخچەکانی منداڵان بەئەنجامدانی پشکنینی تەندرووستی وچاودێریکردنیان ئەم گرنگی پێدانەش وایکردووە کەمنداڵان بەردەوام گرنگی بەپاک ڕاگرتنی جل و بەرگیان بدەن و گرنگیدانی هەریەکە لە دایک و باوکان هەروەها باخچەکان بەپاکوخاوێنی ئەو خواردنانەی کە دەیدەن بەمنداڵەکان..

خشتەی (٨)

حەوتەم / بوار لێهاتووییەکان

| زنجیرەی فۆرم | ڕیزبەند | دووبارە بووەکان | | | ناوەندی شیاوی | کێشی سەدی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ (٣) | تاڕادەیەک (٢) | نەخێر (١) | | |
| ١ | ١ | ٣٢ | ١٢ | ٦ | ٢،٥٢ | ٪٨٤ |
| ٣ | ٢ | ٢٦ | ١٣ | ١١ | ٢،٣ | ٪٧٦،٦٦ |
| ٢ | ٣ | ١١ | ٢٤ | ١٥ | ١،٩٢ | ٪٦٤ |
| کۆی گشتی | | ٢٧ | ١٩ | ٢٦ | ٢, ٢٥ | ٪٧٤, ٨٨ |

لەخشتەی (٨) دەردەکەوێت تەنها برگەی (١ ، ٣) بەهێزە و سەرکەوتوو بوون، لەبەر ئەوەی ناوەندی شیاوی (٢،٥٢) (٢،٣)یان تۆمارکردوە و کێشی سەدی (٪٨٤) (٪٧٦،٦٦)بەدەستهێناوە ، واتە بەگشتی منداڵان ئاستیان بەرزە لە ناسینەوەی ڕەنگەکان و وەرزەکانی ساڵ و شێوەی تەنە ئەندازییەکان ، هەروەها ئەو کەرەستانەی کە بەکاریدەهێنن لەباخچەکانیان تێدا لێهاتوون ودەتوانن لەهەڵوێستی نوێ وجیاواز بەکاری بهێنن ( عزیز ، ٢٠١٤، ٧٦) .

هەریەکە لە برگەکانی ( ٣ ،٢) ئاستی لاوازیان تۆمارکردوە ، واتە ناوەندی شیاویان کەمتر لە (٢)تۆمارکردوە ، هەر بۆیە برگەی (٣) کە دەقەکەی دەڵێت :« لێهاتون لەناوهێنانی ئامێرەکانی میوزیک وبەکارهێنانی» ناوەندی شیاوی (١،٩٢) وکێشی سەدی (٪٦٤)تۆمارکردوە ، توێژەر هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە لەباخچەکانی منداڵان ئامێرەکانی میوزیک بەردەست نییە ، هەر بۆیە ناوەکانیان نازانن و ناتوانن بەکاری بهێنن .

## ٤-٢ ئەنجام و ڕاسپاردە وپێشنیار

### ٤-٢-١ ئەنجام :-

١. منداڵان لە باخچەكانی منداڵان لەڕووی دەروون-جووڵەییەوە گەشەی پێویستیان نەكردووە.

٢. منداڵان لە باخچەكانی كەلار لەڕووی هزریەوە گەشەی پێویستیان كردوە .

٣. منداڵانی باخچە گەشەی پێویستیان كردبوو لەڕووی زمانەوە .

٤. لەڕووی دەروونیەوە گەشەیان كردبوو، لەڕووی ئاوێتەبوونی كۆمەڵایەتییەتی و دووركەوتبوونەوە لە ڕەفتاری شەرەنگێزی .

٥. لەڕووی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەتیەكانیش ، یارمەتیدانی ئەوانی تر و ڕێزگرتن لە مافی بەرامبەر وداب ونەریتە كۆمەڵایەتییەتیەكان گەشەیان كردبوە .

٦. لەبوار تەندروستی وهەروەها گرنگیدانیان بە پاك وخاوێنی خۆیان گەشەیان كردبوو،.

٧. لەڕووی لێهاتوویی هونەریەكانەوە گرفتی ناسینەوەی ناوهێنانی ئامێرە میوزیكیەكانیان هەبوو ..



### ٤-٢-٢ ڕاسپاردەكان :-

لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامەكانی توێژینەوە توێژەر ئەم ڕاسپاردانە دەخاتەڕوو:-

١. گرنگیدانی مامۆستایانی باخچەكانی منداڵان بە ئامانجە پەروەردەییەكان لەباری دەروون-جولەیی.

٢. دابینكردنی ژووری تایبەت بە میوزیك و ئامێرەكانی میوزیك ، لەپێناو ئاشناكردنی منداڵان و زیادكردنی ئارەزوو و خولیایی هونەریان .

٣. دابینكردنی مامۆستای پسپۆڕی هونەر لە باخچەكانی منداڵان .

٤. كردنەوەی خوولی ڕاهێنان بۆ مامۆستایانی باخچەكانی منداڵان .

٥. درووستكردنی پەیوەندی لەنێوان باخچەكانی منداڵان سەر بەوەزارەتی پەروەردە و بەشە زانستییەكانی باخچەی منداڵان لەزانكۆكانی هەرێمی كوردستان.

### ٤-٢-٣ پێشنیازەكان:-

١-ئەنجامدانی توێژینەوەیەكی هاوشێوە ، لەسەر ئاستی سەرجەم باخچەكانی منداڵان لە هەرێمی كوردستان .

٢-هەڵسەنگاندنی لێهاتووییەكانی وانەوتنەوەی مامۆستایانی باخچەكانی منداڵان .

٣-توێژینەوەیەك ئەنجام بدرێت، بە مەبەستی دانان و ئامادەكردنی بەرنامەیەك بۆ گەشەپێدان و بەهێزكردنی لێهاتووییەكانی وانەوتنەوەی مامۆستایانی باخچەكانی منداڵان .


## Abstract:

The aim of this research is to" Evaluate the growth of children in kindergartens From the perspective of parents (guardians) In the center of Kalar district « .

The researcher took a sample of the research community (50) Parents and parents (16.5%) From the research community, the researcher designed a questionnaire to assess the growth of children from seven areas the researcher chose the statistical methods weighted mean and percentage weight, the research has reached the following results:-

١- the most paragraphs related to the areas of social, linguistic, mental, health, psychological and artistic development of children achieved the highest weighted average and the percentage of weight and thus shows the level of good growth according to the opinions of participants in the evaluation.

٢- As for the paragraphs related to the field of motor psy-

chology any child’s performance is related to the applied side of motor skills They received the lowest weighted failure to achieve .ie .average and the percentage weight resulting in the least interest of teachers in .paragraphs .the practical side of the material

The results showed that the child’s development in ٣- general achieved its goals and the satisfaction of the .majority of parents about it

## سەرچاوەکان


١. احمد ، سليمان عوده (١٩٩٨): القياس والتقويم فى العمليه التدريسيه ، دار الآمل ، عمان ، الآردن .

٢. احمد ، نافز ايوب محمد على (٢٠٠٧): تقويم الوچع رياچ الآگفال من وجهه نڤر المعلمين والاباو الآگفال ، جامعه القدس المفتوحه ، فلسگين .

٣. برهوم ،محمد،ئەوانی تر(٢٠٠٦) : بانکی زانیاری ،و: مستەفا سەعید ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی .

٤. جەمال ، سۆزان (٢٠٠٦) : سایکۆلۆژیای منداڵ ، سلێمانی .

٥. حیلمی ، مەریوان صلاح (٢٠٠٣) : کۆمەڵەووتارێک لەبارەی پەروەردە ، چاپخانەی قانع ،سلێمانی .

٦. ڕەزا،محمد ئەمین (٢٠٠٩) : سیستەمی نوێی خوێندن و گۆڕانکاری .

٧. السيد، فؤاد البهى(١٩٧٩): علم النفس الإحصائى وقياس العقل البشرى، دار الفكر العربى ، الگبعه اليالپه، القاهره، مصر.

٨. عبيدات، ژوقان، وێخرون(١٩٩٢): البحپ العلمى (مفهومه،ادواته،اساليبه)، دار الفكر للگباعه والنشر والتوزيع، الگبعه الرابعه،عمان، الآردن.

٩. عبداللە،تاهیر (٢٠١٠): پەروەردەی منداڵ لەسەردەمێکی مەترسیداردا ، چاپخانەی دهۆک، دهۆک.

١٠. عزیـز، كەریـم احمـد (٢٠١٢) : پرۆگرامـی پـەروەردەی ،چاپخانـەی پەیوەنـد ، سـلێمانی.

١١. عزیز، كەریم احمد (٢٠١٣) : كەشكۆڵی مێژوو ،چاپخانەی پەیوەند ، سلێمانی .

١٢. عزیـز، كەریـم احمـد (٢٠١٤) : بنەمـا گشـتیەكانی ڕێگانـی وانەوتنـەوە ،دەزگاوچاپـی پەخشـی نارین ، هەولێـر.

١٣. علی ، سۆلاف فائق محمد وئەوانی تر (٢٠١٣) : ئاسۆی پەرەپێدانی باخچەی منداڵان ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی .

١٤. عنایـه، افنـان صـادق محمـود (١٩٩٢): نمـوژج مقتـرح لتقییـم گفـل الروچـه فـی ریاچـال الاگفـال فـی لـواو نابلـس فـی الچفـه الغربیـه، (رساله ماجسـتیر غیر منشـوره)،جامعه النجـاح الوگنیـه ، فلسـگین.

١٥. الغریـب، رمزیـه (١٩٨٧): التقویـم والقیـاس النفسـی والتربـوی، مكتبـه الانجلـو المصریـه، القاهـره.

١٦. الفـرح ،وجیـه (١٩٩٢): التنشـئه الاجتماعیـه لگفـل ماقبـل المدرسـه ، المجلـه الپقافیـه ، العـدد ،(٢٧) ، الجامعـه الاردنیـه ، الاردن .

١٧. قەرەچەتانی ، كەریم شـەریف (٢٠٠٨): سـایكۆلۆژیای پەروەردەیـی ، چاپخانـەی پەیوەنـد ،سـلێمانی، ٢٠٠٨ .

١٨. قەرەچەتانـی ، كەریـم شـەریف (٢٠٠٩): سـایكۆلۆژیای گەشـە ، چاپخانـەی پەیوەنـد ، سـلێمانی.

١٩. قەرەچەتانـی ، كەریـم شـەریف (٢٠١٠): نەخۆشـی وگرفتـە دەروونـی وكۆمەڵایەتییەتیـەكان ، چ٢ ، چاپخانـەی پەیوەنـد ،سـلێمانی .

٢٠. الگریحـی ، فاهـم حسـین ، وئـخـرون (٢٠٠١): مبـادئ القیـاس والتقویـم التربـوی ، المكتبـه الوگنیـه، الگبعـه الاولـی .

٢١. مـروان ، نجـم الدین علـی (١٩٨١): اسالیب تقویـم گفـل الروچـه ، مجلـه دراسـات الأجیـال ، العـدد (٢) ، العـراق .

٢٢. میهر ئارا وئەوانی تر ،عەلی ئەکبەر(٢٠٠٥): مێژووی پەروەردەوفێرکردن لەرۆژگاری کون تاڕێنسانس ، و:قادر ووریا .

٢٣. حەمید ،نازدار سالح: شارەزا لە باخچەی منداڵان ، خوولی زێڕینی باخچەی منداڵان.

٢٤. نعمت ، جواد (٢٠١٢) : هونەری وانەوتنەوە ، وەرگێڕانی، جمیل قادر عبدالله ،چاپخانەی پەیوەند ،سلێمانی .

٢٥. النكلاوى،احمد(١٩٨٦) : الوجيع التعليمى للگفل فى الخليج العربى ، مكتب التربيه العربيه للدول الخليج .

٢٦. یوسف عسمان حەمەد ، سایکۆلۆژییەتی منداڵ وخێزان ، چاپخانەی دیلان ،سلێمانی، ٢٠٠٤.

٢٧. Fischer(1955). Euqence C "International Survey of and Other. Wilbur A . the Beginning Teacher" in Yauch New York . The Beginning Teacher . Henry Holt.

٢٨. Austin. Gilbert (1976). Early Childhood Education. London Academics Press

٢٩. Heeper. Sarah and Others (1979). Good Schools for Young Children. 26.

Macmillan Publishing Comp. U.S.A

## پاشکۆی ( ١ )

فۆرمی ڕاوەرگری (دایەبابە)

وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی

زانکۆی گەرمیان

کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتی

ب/ فۆرمی ڕاوەرگری تایبەت بە دایەبابە

سڵاوی زانست...

دایەبابەی هێژا ....

بـۆ ئەنجامدانـی توێژینەوەیـەک بەناونیشـانی (هەڵسـەنگاندنی گەشـەی منـداڵان لـە باخچەکانـی منـداڵان لەڕوانگـەی دایـک و باوکانـەوە (بەخێوکەرانیـان) لەناوەنـدی قـەزای کـەلار) ئـەم فـۆ رمـی ڕاوەرگرییـە دەخەینـە بەردەسـتان کـە مەبەسـت هەڵسـەنگاندنی لایەنـی گەشـەکردنی هەمەلایەنـەی منداڵەکانتانـە بەپێـی برگەکانـی ئـەم فۆرمـەی بەردەسـتتان ، بەهیـوای ئـەوەی ببێتـە جێـگەی گرنگـی پێدانتـان و وەڵامەکانتـان بەشـێوەیەکی بابەتیانـە بەدانانـی هێمـای (/) لـەو خانـەی بـە گونجـاوی دەزانن (بەڕادەیەکـی زۆر ، بەڕادەیەکـی مـام ناوەنـد ، بەڕادەیەکـی کـەم) بخەنـەڕوو .

سوپاس بۆ هاوکاریتان .

توێژەر

کریم احمد عزیز

فۆرمی هەڵسەنگاندنی گەشەی منداڵان لە باخچەکانی منداڵان لەڕوانگەی دایک و باوکانەوە (بەخێوکەرانیان) لەناوەندی قەزای کەلار

یەکەم/ بوار دەروون- جوڵەیی

| ز | بـــــڕگــــە | بەڵێ | تاڕادەیەک | نەخێر |
|---|---|---|---|---|
| ١ | پـاش چوونـی بـۆ باخچـە فێربـووە بەڕێکـی قەڵـەم بگرێـت و بنووسـێت | | | |
| ٢ | لەباخچە ڕاهێنانی دەزوو کردن بە دەرزی پێکراوە. | | | |
| ٣ | توانای هەیە بۆ لەبەرکردنی جل و بەرگ و لەپێکردنی پێڵاو. | | | |
| ٤ | فێربووە ماوسی کۆمپیوتەر بەدرووستی بگرێت . | | | |
| دووەم/ بواری گەشەکردنی هزری . | | | | |
| ٥ | توانای هەیە لەدەربڕینی پرسیارەکانی وەک:چۆن؟ بۆچی؟ | | | |
| ٦ | گرنگی بەدیاردە سروشتیەکان دەدات. | | | |
| ٧ | توانای هەیە بۆنەو و ڕوداوەکان بگێڕنەوە . | | | |
| ٨ | دەتوانێت کۆمپیوتەر دابگرسێنێ و بیکو ژێنێتەوە بە دروستی. | | | |
| سێیەم/ بواری گەشەی زمانەوانی | | | | |
| ٩ | زۆرینەی پیتەکان بەدرووستی دەردەبڕێت . | | | |
| ١٠ | دەربڕینی ڕستەکانی بە تەواوی و ماناداری گوزارشت دەکات. | | | |
| ١١ | توانای ئەزبەرکردنی سرودەکانی باخچەی هەیە . | | | |
| ١٢ | ئەو چیرۆکانەی لەباخچە دەخوێنێت لەماڵەوە دەیگێڕێتەوە . | | | |
| چوارەم/ بواری گەشەی دەروونی | | | | |
| ١٣ | باخچە ئاسوودەیی دەروونی زیاتری بۆ فەراهەم کردوە . | | | |
| ١٤ | ڕەفتارەکانی شەڕەنگێزی و بیانووگرتنی کەم بوەتەوە . | | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٥ | ئاوێتەی منداڵانی تر دەبێت لەیاری کردن . | | | |
| ١٦ | چوونی بۆ باخچە بڕوای بەخۆی زیاتر بوووە . | | | |
| پێنجەم/ بواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەتیەکان | | | | |
| ١٧ | ڕێزو مافی هاوڕێکانی لەیاری کردن دەگرێ . | | | |
| ١٨ | دەستپێشخەری دەکات لەهاوکاری و یارمەتی دانی هاوڕێکانی. | | | |
| ١٩ | داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەتیەکان بەجوانی دەردەخات وەک:بەیارمەتیت،سوپاس...تاد . | | | |
| شەشەم/ بواری تەندروستی منداڵ | | | | |
| ٢٠ | ئارەزوی خواردن و خواردنەوەی زیاتر بووە . | | | |
| ٢١ | گرنگی بە پاک ڕاگرتنی جل و بەرگ وشوشتنی دەست وددان دەدات . | | | |
| ٢٢ | دڵنیای وەردەگرێ لەپاکی خواردن و خواردنەوەی پاشان دەیخوات | | | |
| ٢٣ | هەندێک لە جوڵەی پێویستی وەرزشی فێرکراوە . | | | |
| حەوتەم/ بواری لێهاتویی هونەری | | | | |
| ٢٤ | ڕەنگەکان و تەنە ئەندازیی و وەرزەکانی ساڵ دەناسێتەوە . | | | |
| ٢٥ | لێهاتوە لەناوهێنانی ئامێرەکانی میوزیک وبەکارهێنانی . | | | |
| ٢٦ | سرودی پەروەردەیی و نیشتیمانی فێربوون . | | | |



ڕێبوار سەرتیب زەندی

# ڕەگ و ڕیشەی مێژووی ناوی گەرمیان و دەروازە و ڕێگا بازرگانییەکانی

## ناوی گەرمیان

کۆمەڵێک هۆکار بوونە یارمەتیدەر بۆ مرۆڤی چاخەکانی پێشوو، بە تایبەت ئەوکاتانەی کە سەرەتاکانی شارستانییەت لە دەرکەتندا بوو، لە چاخی بەردینی کۆنەوە مرۆڤ لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بووە، پاشماوە شوێنەوارییەکانیان دۆزراوەتەوە لە ناوچەکەدا، لەبەرئەوە دەشتە بە پیتەکان سەکۆی پێشکەوتن و دەرکەوتنی کۆنترین لایەنە شارستانییەتەکان بوون، کە مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوە. سروشتی گەرمیان جیاوازە و ئەم جیاوازییە وایکردووە ببێتە ناوچەیەک زۆربەی پێکهاتە سروشتییەکانی تێدا کۆ ببێتەوە، ئەمەش یارمەتیدەری دروستکردنی لایەنە ژیارییەکانە، بە درێژایی مێژوو ئەم خاکە کاریگەری لە سەر ناوچەکانی دەوروبەر دروست کردووە،

ناو و شوێنی جوگرافیای ئەم ناوچەیە بە شێوەی جیا جیا لە دەق و سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە , لە سەردەمە هەرە کۆنەکانەوە ئەم پێگە جوگرافیاییە هەمیشە جێگەی بایەخ و گرنگی پێدان بووە، بەڵگەی ڕاستی سەلماندنی چەندین ناوچە و شوێنەواری دێرینە لەم پێدەشتانەدا، بە زۆری لە ڕێگەی دەقە مێخییەکانەوە ئاماژەیان بۆ کراوە و ناسراونەتەوە، وەک باتیر ’Batir (= تەل سولیمە)، ئاو/بال ’Aw/Bal (لە شوێنێکی دەوروبەری قەرەتەپەیە) ڕاشاب ’Rašab (ڕەنگە تەل حەداد یان تەل سیب بێت)، ماتکا ’Matka (ڕەنگە ماتیکی باشوری ڕۆژئاوای تاوق بێت)، نوزی ’Nuzi، ئەڕڕاپخا ’Arrapẖa و

کیماش Kimaš’ و خومورتوم Humurtum’ ) لەوانیە لە نزیک دوزی ئێستا بوبێت)، هەڵکەوتەی ئەم دەشتانە لە نێوان جەمسەرەکانی هێزدا هەمیشە گرنگیەکی تایبەتی پێ بەخشیبوون.١

کۆنترین ناوهێنانی گەرمیان لە دەق و سەرچاوە کۆنەکاندا بۆ سەردەمی ئاشوریی نوێ دەگەڕێتەوە.٢ بە پێی سەرچاوە سریانییەکان لە سەردەمی سارگۆنی ئاشوریدا ئەم ناوچایە شانشینێکی تێدا هەبووە بە ناوی ‘بیث گرمای Bēth Garmai ’ کە یەکێک لە شارەکانی ناوی کرخا دی بیث سلۆک’ بووە، دواتر ئارباکس کە فەرمانڕەوایەکی میدی بووە و شوێنکەوتەی ئاشور بوو، کەوتە شۆڕش و ڕاپەڕین لە دژی ئاشورییەکان وردە وردە بەهێز بوو، توانی هێرش بکاتە سەر ئەم ناوچانە، بەرەو بیث گرمای بەڕێکەوت، ئارباکس داگیری کرد، و نە ڕووبەڕووی هێرشی میدیایەکان بونەوە، ناوچەی گرمای کە ئامادە نەبوون باج و سەرانە بدەن بە میدیاییەکان، پەنایان بۆ ئاشورییەکان برد، سارگۆنی ئاشوری بە سوپاکەیەوە بەرەو ناوچەکە ڕۆیشت خستیە سەردەسەڵاتەکەی خۆی، لە ژێر چاودێری پاشای ئاشوری و بەسەرپەرشتی فەرمانڕەوای گرمای شارێکی نوێیان بنیاد نا، پێدەچێت بەناوی ‘کرخ سارگون Karḫ Sargon’ەوە بوبێت، لە سەردەمی سلوکییەکاندا ناوەکەی گۆڕا بۆ ‘کرخ دی بیث سلۆک Karḫ de Bēth Slok’.٣ هەروەها هەندێک لێکۆڵەر لە زاری پلینی Pliny’یەوە دەڵێن «هەرێمەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ئەشکانی لە هەژدە شانشین پێکهاتبوون، یازدەیان شانشینی سەروو حەوتیشیان شانشینی خواروو بوون، ناوچەی گەرمیانیش بە زمانی پەهلەوی ئەشکانی پێی وتراوە ‘گەرمیکان Garmikan’ بە ئارامیش پێی وتراوە ‘بیث گەرمای Bēth Garmai’».٤

١ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز دا، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل.١٣.

٢ ابراهیم، نوعمان جمعە، ناوچەی گەرمیان لە ژێر ڕۆشنایی کنە و پشکنینە شوێنەوارییەکاندا"، سێیەمین کۆنفرانسی زانستی و نێودەوڵەتی شوێنەوار و کەلەپوری کوردستان زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٩. ل.٣.

٣ ن. پیگلوسکایا، شهرهای ایران در روزگار پارتیان و ساسانیان، ت.عنایت اللە رضا، چ٢، تهران، ١٣٧٢، ص. ٦٨،٦٩.

٤ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، لە: مێژووی خانەقی، ئامادەکردنی، مامۆستا جەعفەر (فاضل کەریم ئەحمەد)، سلێمانی، ٢٠١٧، ل.٤٧.

لە سەردەمی ساسانییەکاندا مێژوونوسی ناسراوی ئەرمەنی موسیس خورینی (لەسەدەی پێنجەم و سەرەتای سەدەی شەشەم)ی زایینی ژیاوە، دەڵێت «ساسانییەکان بەم ناوچانەیان وتووە ,گەرمەکان Garmakan’ کە مەڵبەندەکەی کەرکوکی ئەمڕۆ بووە،[١] سنورەکەی لە باکوری خۆرئاواوە زێی بچوک و لە باشوری خۆرئاواوە زنجیرە بەرزاییەکانی حەمرین بووە، لە باشوری خۆرهەڵاتەوە ڕوباری دیالە و لە باکوری خۆرهەڵاتیشەوە بۆ زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس.

بەتلیمۆسPtolemy’ لە جوگرافیاکەیدا ناوی گەرمیان بە ‘گەرەمایۆی Garamaioi’ بردووە، کە واتای گەرمیانییەکان دەبەخشێت، هەروەها لە بارەی گەرەمایۆی زیاتر دەڕوات و دەڵێت «پایەتەختەکەی شاری ‘کەرخ دی بیث سلۆک Karḫ de Bēth Slok’ بووە، کە دەکاتە کەرکوکی ئەمڕۆ، ئەم شانشینە تا هاتنی ساسانییەکان دەسەڵاتیان هەبووە».[٢] لە سەرچاوە سریانییەکاندا وڵات یان شانشینی گرمای کە پایەتەختەکەی کرخ دی بیث سلوک بووە، سنورەکەی لە نیوان ڕوباری زێ بۆ ڕوباری دیجلە و بە درێژای ڕوباری ,ئەتراکون Atrakon’[٣]بووە، لە بەرزاییەکانی حەمرینەوە بۆ شاخەکانی ‘ئوروکو

---

١ احمد، کمال مظهر، کرکوك و توابعها حکم التاریخ والضمیر، مطبعة رینوین، وزارة تربیة، ب.ت.ط، ص. ١٦. ؛ زەندی، ڕێبوار سەرتیب: دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی گەرمیان لە نێوان ساڵانی (١-٦٥١ز)، توێژینەوەیەکی بڵاو نەکراوەیە، ل ٣.

٢ باقر، طه و سفر، فؤاد، المرشد الی مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة، بغداد، ١٩٥٠، ص. ٤. ؛ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل. ٤٧. ؛ شاکەلی، محەمەد، گەرمیان ڕابردووی نزیك و ئایندە، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل. ٩.

٣ ڕوباری ئەتراکون مەبەست لێی هەمان ڕوباری تامارا یان تومرا یە کە ڕوباری دیالە دەگرێتەوە. دەڕواندرێتە ن. پیگلوسکایا، المصدر السابق، ص. ٥٤. هەروەها سەبارەت بە ناوی ڕوباری سیروان/ دیالە لە سەرچاوە و دەقە کۆنەکاندا بە زۆر شێوە هاتووە، ڕوباری سیروان بە ڕوباری دیالە ناو دەبرێت، ئەوەش دوای ئەوە دێت کە ڕوباری ئەڵوەندی تێدەڕژێت لە نزیك قزراباتەوە. لە مێژووی دێریندا ناوی ڕوباری سیروان/دیالە بە ناوی جیاجیا هاتووە، لە سەرچاوە سریانییەکاندا بە ناوی ‘تورمارا Turmara’ هاتووە، لە قۆناغی دواتردا بووە بە ‘تامرا Tamra’ بەڵام لە سەرچاوە مێخییەکاندا بە شێوەی تورنات Turnat’ هاتووە، بە تایبەت لە سەردەمی ئاشور ناسر پاڵی دووەم،هەروەها ڕوباری سیروان/دیالە لە تێکستە مێخییەکاندا بە ناوی ‘دور-ئول Dur-ul’ هاتووە، بەڵام لە قۆناغی دواتردا بە ناوی جیا هاتووە، وەکو ناوی ‘دیالاس Dialas’ و لە هەندی کاتدا بە ‘دیاباس Diabas’ دەخوێنرێتەوە، هەروەها بە ‘دیلتا Dilta’ش ناوی بردراوە کە لە زمانی ئارامیدا بەمانای زێ یان ڕوبار دێت. دەرواندرێتە زەندی، ڕێبوار سەرتیپ: مێژووی دێرینی گەرمیان، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٢٢، ل ١٧.

'Uroukou' هەروەها ڕوباری دیالە سنوری ڕۆژهەڵاتی شانشینی بیت- گرمای بووە ١، سەبارەت بە ناوهێنانی گرمای کە لە یەکێک لەدەقەکانی سەردەمی نارسەی پاشای ساسانییەکاندا هاتووە، لە دەقە نوسراوەکەی پەیکوڵیدا دەڵێت «من توانای ئەمەم هەیە، ئەویش کوشتنی گەورە پیاوانی فارس و پیاو ماقوڵەکان و ماڵ و موڵکیان بدەم بە گەرەمابیەکان» . لێرەدا پاشای ساسانی مەبەستی دانیشتوانی گەرمیانە.٢ ڕەنگە هۆکاری ئەم وتانەی پاشای ساسانی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە شانشینی گەرمایەکان پشتیوانی بوون، لە تاج وەرگرتن و هاتنە سەر دەسەڵاتیدا، بەڵام لە سەرچاوە سریانییەکاندا ناوچەی گەرمیان و بەتایبەت کەرکوک و دەوروبەری پێی وتراوە 'باث گەرمای 'Bēth Garmai هەروەها سلوقییەکان بە قەڵاکانی کەرکوک و دەوروبەریان وتووە 'سەربوگ 'Sarbug.٣

بە شێوەیەکی گشتی ئەم ناو و شانە لە ئێستادا لە زمانی کوردیدا ماوەتەوە، تاڕادەیەکی زۆریش نزیکن لە وشە سلوقی و سریانی و ساسانییەکانەوە، بە نموونە وشەی گەرمەکان لە وشە و ناوی گەرمیانەوە نزیکە، ناوەکە لە ئێستادا بووە بە گەرمیان، بەشێک لە خاکی کەرکوک و ناوچە گەرمەکان بە گەرمیان ناودەبرێت.٤ لە ڕاستیدا ئەو ناوچەیەی لە سەردەمە جیاوازەکاندا بە ناوی گەرمیان و یاخود بە هەموو شێوە جیاوازەکانییەوە بۆ ناوی گەرمیان بەکار هاتووە، مەرج نیە پراوپڕی ئەو سنورە جوگرافیاییە بێت، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە گەرمیان دیاریکراوە، بە پێی سەردەم و دەسەڵاتەکان ناوچەکانی گەرمیان لە ڕووی سنورەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

## گرنگترین ڕێگا و دەروازەکانی گەرمیان

ئەو پێگە جوگرافیای و سروشتییەی گەرمیان وایکردووە لە هەموو ڕوویەکەوە خاوەنی بایەخ و تایبەتمەندی خۆی بێت، گەرمیان وەک ناوەندێکی گرنگ لە نێوان ناوچەکانی مێسۆپۆتامیا و ناوچەی چیاکانی زاگرۆس بوو، ئەڵقەیەکی بەیەکگەیشتنی گرنگ بووە، لە

١ ن. پیگلوسکایا، المصدر السابق، ص.٥٤.
٢ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، پەیکولی شوێنەوارێکی گرنگ و دەقێکی لە بیرکراو"، گۆڤاری ژین، ژمارە ٣، (٢٠١١)، ل.٢٢.

٣ مارکوارت، ی.، ایرانشهر بر مبنای جوغرافیای موسی خورنی، ت. د.مریم میر احمدی، تهران، ١٣٧٣، ص.٥٢.

٤ احمد، کمال مظهر، المصدر السابق، ص.١٦.

هەموو سەردەمەكاندا، ئەم بایەخەی لە دەست نەداوە.

لەبەرئەوە ئەگەر ناوچەكانی مێسۆپۆتامیا هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی یەك لایەندا بوو بێت، یاخود چەند هێزێكی سیاسی و پارچە پارچە بووبێت، چەند دەروازەیەكی لاوەكی و یەك دەروازەی سەرەكی و شارێیەكی هەبووە، بۆ ڕۆژهەڵات و بانی ئێران[١]. ئەوەش دەروازەی پەرویزخان (خوسروی)یە، لەبەرئەوە ئەم دەروازەیە وەك دەروازەیەكی نێوان مێسۆپۆتامیا و بانی ئێران بووە، بە تێپەڕبوون لەم دەروازەیەوە ناوچەكانی سەرەوە و خوارەوە لەبەردەمیاندا واڵا دەبوو[٢].

بە درێژای مێژوو ئەم دەروازەیە ناوەندێك بووە بۆ هاتوچۆی نێوان گەلانی مێسۆپۆتامیا و گەلانی زاگرۆس، لە سەرەتاوە گەلانی گوتی و كاشی بەم ناوچەیەدا تێپەڕیون بۆ ناوچەكانی بابل، هەروەها میدیاییەكان بەم ناوچەیەدا تێپەڕیون بۆ داگیركردنی نەینەوای پایتەختی ئاشور[٣]، لە دواتریشدا ئەخمینییەكان دژی كلدانییەكان و ئەسكەندەر دژی ئەخمینییەكان، تەنانەت سەردەمی ئەشكانی و ساسانی و دواتریش لەسەردەمی ئیسلامدا ئەم دەروازەیە وەك ناوەندێكی گرنگ تەماشا كراوە، بەكارهێنراوە بۆ مەبەستی بازرگانی و سەربازی، لە زۆر قۆناغە مێژووییەكاندا ململانێكان لەم دەروازەیەوە سەرچاوەی گرتووە، لەبەرئەوە بە دەروازەی ئاسیا ناودەبرێت[٤].

ئەم شارێگایە بە سەرپێڵی زەهاودا تێپەڕ دەبێت، شاری خانەقینیش لەسەر ئەم ڕێگایە بنیاتنراوە، بە شارێگەی خوراسان دەناسرێتەوە، چونكە ڕێگەی مێسۆپۆتامیای سەردەمانی

---

١ ئەحمەد، كۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل. ٢٩.

٢ امین، میر قادری محمد و كمالدین نیكنامی، گذرگاه كوهستانی غرب زاگرس مركزی و شاهراه خراسان بزرگ بر مهرهای دوره اكد، مجله مطالعات باستان شناسی، عدد٢، (١٣٩٩)، ص. ٢٤٧.

٣ ئەمەش پێدەچێت لە ڕوانگەی ئەو دەقەوە بێت كە سوپای میدیا توانیویەتی ناوچەی ئەڕاپخا داگیر بكات كە لە ناوچەی گەرمیاندایە، هەروەها ئەو ڕێگایەش كە ئاسانتر توانراوە هاتوچۆی سەربازی و ئابوری پێدا بكرێت دەروازەكانی منزرییە و دەروازەی پەرویزخانە كە هەردوو دەروازەكە لە ناوچەی گەرمیاندایە.

٤ Herzfeld, Ernst, *Am Tor Van Asien, Felsdenkmäle aus Irans Heldenzeit*, Berlin, 1920, p. 2.

پێش ئیسلام و خوراسان بووە.١ ڕێگای خوراسان لە سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستیشدا بەشێک بووە، لە ڕێگای ئاوریشم، کە بە هەمەدان و کرماشاندا تێپەڕ دەبوو، بە گەرمیاندا دەچوو تاوەکو دەگەیشت بە بەغداد.٢

گەرمیان جگە لەم دەروازەیە چەند دەروازە و ڕێگایەکی دیکەی هەیە بۆ ناوچەکانی دەرەوە، وەک ڕێگای 'دێر Der' یاخود پێی وتراوە 'دور_ئیلو Dūr-ilu' کە ناوچەی تەل عەقەر دەگرێتەوە لە نزیک قەزای بەدرەی ئەمڕۆ، دواتر دەڕوات تا دەگاتە ناوچەی 'سوسە Susa' یان 'شوش Šūš' کە پایتەختی عیلام بوو، ئەم ڕێگایە زیاتر بۆ مەبەستی سەربازی بە کارهێنراوە لە نێوان مێسۆپۆتامیا و وڵاتی عیلام.٣

لە گەرمیاندا ڕێگەی دیکە هەبووە، بۆ ناوخۆ بەکارهاتووە، وەک ڕێگەی نێوان مەندەلی و خانەقین و ڕێگای بەغداد کرماشان کە بە خانەقیندا تێدەپەڕی ٤،هەروەها ڕێگای موسڵ و بەغداد، لە سەردەمی ئیسلامدا، کە بە ناوچەی گەرمیاندا تێپەڕیوە، لە بەغدادەوە بۆ بەعقوبە و بە حەمریندا لە ڕووباری دیالە پەڕیونەتەوە بە نێو دەلی عەباسدا بۆ قەرەتەپە، لەسەردەمی کۆندا ڕێگەی دیکە هەبووە، لە خوزستانەوە دەهاتە ئەم ناوچەیە، لێرەوە دەچونە ناوچەکانی باکور، ئەم ڕێگایە لە سەردەمی ئەخمینییەکاندا بەشێک بووە لە ڕێگای شاهانەی ئەخمینییەکان.٥



بەگشتی ڕێگا و دەربەندەکان هەمیشە جێگەی بایەخی تایبەت بوون، لەبەرئەوەی لە کاتی ئاشتیدا شادەماری ئابوری و جوڵەی بازرگانی و هاتوچۆ و باج وەرگرتن و هێنان و بردنی کەرستەی خاو و کەرستە دروستکراوەکان بوون، لە کاتی شەڕ و جەنگیشدا شوێنی هاتن و چوونی هێزی سەربازی و جێگەی هەڕەشەی داگیرکاری و کۆچ و ڕەوی گەلان و هێرش

---

١ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل. ٢٩.

٢ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا"، گۆڤاری ژین ١، (٢٠٠٩)، ل. ١٣.

٣ باقر، طه، مقدمة في تاريخ الحضارات، ص. ٤٤.

٤ Prepared on Behalf on the Admiralty and the War Office, Handbook of Mesopotamia, Vol. 3, London, 1917, 205-206.

٥ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا، ل. ١٤.

و پەلامار بووە.[١]

ناوچەی گەرمیان وەک ئەڵقەی بەیەکەوە بەستنی ناوچەکانی میسۆپۆتامیا و ناوچەکانی زاگرۆس و بانی ئێران بووە، سنوری جوگرافی ئەم ناوچەیە مێژوویەکی دەوڵەمەند و لایەنی شارستانی و فەرهەنگی جیاوازی بە خۆوە بینیوە، ئەم ناوچەیە لە ڕوی سیاسی و ئابورییەوە بایەخێکی زۆری هەبووە، لەگەڵ دروست بوونی هەر هێزێکی سیاسی لە مێسۆپۆتامیا و ناوچەکە، بەردەوام ڕووبەڕووی هێرش و داگیرکاری بونەتەوە، هەر لە سەردەمی بنەماڵە سومەریەکانەوە تاوەکو کۆتایهاتنی دەوڵەتی میدیا، هەموو هێز و قەوارە سیاسیەکانی ئەو کات هەوڵی ئەوەیان داوە بەجۆرێک لە جۆرەکان دەسەڵاتیان بگەیەننە ئەم ناوچەیە و هەمیشە بەشێک بووە لە هاوکێشە سیاسی وسەربازی وئابورییەکانی ناوچەکە.

## لیستی سەرچاوەکان


1. Herzfeld, Ernst, Am Tor Van Asien, Felsdenkmäle aus Irans Heldenzeit, Berlin, 1920.
2. Prepared on Behalf on the Admiralty and the War Office, Handbook of Mesopotamia, Vol. 3, London, 1917.

٣. احمد، كمال مظهر، كركوك و توابعها حكم التاريخ والضمير، مطبعة رينوين، وزارة تربية، ب.ت.ط.

٤. ابراهیم، نوعمان جمعە، ناوچەی گەرمیان لە ژێر ڕۆشنایی کنە و پشکنینە شوێنەوارییەکاندا"، سێیەمین کۆنفرانسی زانستی و نێودەوڵەتی شوێنەوار و کەلەپوری کوردستان زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٩.

٥. امین، میر قادری محمد و کمالدین نیکنامی، گذرگاه کوهستانی غرب زاگرس مرکزی و شاهراه خراسان بزرگ بر مهرهای دوره اکد، مجله مطالعات باستان شناسی، عدد٢، (١٣٩٩).


---

١ ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، ل. ٢٩.

٦. باقر، طه و سفر، فؤاد، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الرابعة، بغداد، ١٩٥٠.

٧. باقر، طه، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج١، ط٢، بغداد، (٢٠١٢).

٨. الدوري، رياض عبدالرحمن، ''عصر الانتقال من الكهوف الى القرى''، هزارميرد، عدد ٢٤، (٢٠٠٤).

٩. زەندی، ڕێبوار سەرتیب: دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی گەرمیان لە نێوان ساڵانی (١-٦٥١ز)، توێژینەوەیەکی بڵاو نەکراوەیە.

١٠. زەندی، ڕێبوار سەرتیپ: مێژووی دێرینی گەرمیان، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٢٢.

١١. سليمان، عامر و فتيان، احمد مالك، محاضرات في التاريخ القديم، بغداد، ١٩٧٨.

١٢. شاکەلی، محەمەد، گەرمیان ڕابردووی نزیک و ئایندە، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٣. مارکوارت، ی. , ايرانشهر بر مبناى جوغرافيای موسى خورنى، ت. د.مريم مير احمدى، تهران، ١٣٧٣.

١٤. ن. پيگلوسكايا، شهرهاى ايران در روزگار پارتيان و ساسانيان، ت.عنايت الله رضا، چ٢، تهران، ١٣٧٢.

١٥. ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، بایەخی خانەقین و گەرمیان لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە کۆنەکاندا''، گۆڤاری ژین ١، (٢٠٠٩)، ل. ١٣.

١٦. ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، پەیکوڵی شوێنەوارێکی گرنگ و دەقێکی لە بیرکراو''، گۆڤاری ژین، ژمارە ٣، (٢٠١١).

١٧. ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، خانەقین و دەوروبەری لە سەرەتاوە تا ئیسلام، لە: مێژووی خانەقی، ئامادەکردنی، مامۆستا جەعفەر (فاضل کەریم ئەحمەد)، سلێمانی ، ٢٠١٧.

١٨. ئەحمەد، کۆزاد محەمەد، کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ.ز دا، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٨.

# ڕەنگدانەوەی پرسەکانی کۆمەڵگە لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا



پ.ی. د. یادگار عەلی
مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان
دکتۆرای شەرەفی یەکەم لە ڕاگەیاندن- زانکۆی مەنسورە - میسر

پێشەکی:

قسەیەکی باو هەیە: (ڕۆژنامەنووسی باشمان هەبێت، پێویستمان بە مێژوونووس نامێنێت). بەومانایەی ڕۆژنامە بەشێوەیەکی ڕۆژانە زانیاریی لەبارەی ڕووداوەکانی کۆمەڵگە لە بوارە جیاجیاکان کۆدەکاتەوە، دوای بژاردن و سازاندنیان لە چوارچێوەی هونەرە ڕۆژنامەنووسییەکان پێشکەش بە جەماوەری دەکات، بۆ داهاتووش؛ دەبێت بە بەشێک لە مێژووی هاوبەشیان.

لایەنی پیشەیی ڕۆژنامەنووس و دەزگای ڕۆژنامەنووسیی و ئەو ژینگە سیاسیی، کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەی ڕۆژنامەنووس و ڕۆژنامە کاری تێدا دەکەن، لەو فاکتەرە کاریگەرانەن، کە دیاریدەکەن یاداشتکردنی ڕووداوەکانی ڕۆژ لەلایەن ڕۆژنامە، چەند ورد و زانستیین، تا چەند ڕاستگۆیانە تۆمارکراون و دەشێت بە بەڵگەنامەکی مێژوویی لەلایەن خەڵک و مێژوونووسانیش تەماشا بکرێن.

دکتۆر جیلبێرت، مامۆستای مێژووی یۆنانی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، وتوویەتی: (ئەگەر یۆنان ڕۆژنامەی هەبووایە، ئەگەر تەنها یەک ڕۆژنامەی هەبووایە یان تەنانەت یەک لاپەڕە لە ڕۆژنامەیەکەوە بگەشتایەتە دەستمان، زانیارییمان لەسەر مێژووی یۆنان گەورەتر دەبوو).

ئێمە سەدان و بگرە هەزاران لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوە چاپکراوەکانی گەرمیانمان بەدەستگەیشتووە. هەریەکەیان هی سەردەم و قۆناغێکی دیاریکراون. لەلایەن تواناناوچەییەکان و بە ڕەنج و بازووی ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسیی کورد بەرهەمهاتوون. دەیان و سەدان ڕووداویان بۆ تۆمارکردووین، لە ئەرشیفی کتێبخانەکان بۆیان بەجێهێشتووین، ڕووداوەکان گەلێک جۆراوجۆرن، تایبەت نیین بە پرس و بوارێکی دیاریکراو، بەڵکوو ڕۆچوونەتە نێو هەموو کایەکانی ژیانی کۆمەڵگەی گەرمیان.

هەندێکجار گوێمان لە قسەیەک دەبێت: (گەرمیان ڕابردووی لە ئێستای گەشاوەترە)، کاتێک ئاوڕێک لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی تەنانەت ڕووناکبیریی ناوچەکە دەدەینەوە، ناتوانین یەکسەر ئەو قسەیە ڕەتبکەینەوە، چونکە بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت گەرمیان لێوانلێو بووە لە جوڵە و بزاوتی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی. کەچی زیاد لە (١٠) ساڵیش دەبێت ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە و گۆڤارێکی مانگانە لەم ناوچەیە دەرناچێت. ڕادیۆکان بەردەوام کەمدەبنەوە، تەلەڤزیۆنە ناوچەییەکان نەماون و کۆڕ و بزاوتە ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسییەکان لە خراپترین ڕۆژگاری تەمەنیاندان.

(ڕۆژنامەی گەرمیان ئەمڕۆ) یەکێک لەو ڕۆژنامانە بووە، کە بەشێوەی مانگانە لە ناوەڕاستی ساڵی (٢٠٠٦) لە گەرمیان دەرچووە. بۆ ماوەی چەند ساڵێک درێژەی بە کاروانی خەباتی ڕۆژنامەنووسیی خۆی داوە و ڕووماڵی پرسەکانی کۆمەڵگەی گەرمیان و بابەتەکانی ڕۆژی لەو قۆناغەدا کردووە.



## تەوەری یەکەم: میتۆدنامەی توێژینەوە

توێژەر لێکۆڵینەوە لە پرس و بابەتەکانی کۆمەڵگەی گەرمیان لەو ڕۆژگارەدا بە گرنگ دەزانێت، چونکە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە ژیانی سیاسیی بووە لە پاش پرۆسەی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراق و یەکخستنی کابینەی حکومەت لە هەرێمی کوردستان و ئەنجامدانی پرۆسەی هەڵبژاردن و سەرەتاکانی دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنی ڕاستەقینە لە هەرێمی کوردستان.

### کێشە و ئامانجی توێژینەوەکە

کێشەی سەرەکی توێژینەوەکە بریتییە لە: ڕەنگدانەوەی پرسە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەی گەرمیان لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ. هەروەها ئامانجی توێژینەوەکەیە، بزانێت: دیارترین پرس و بابەتە ڕووماڵکراوەکان کامانەن؟ ژانرە ڕۆژنامەنووسییە بەکارهاتووەکان لە ڕووماڵی

پرسەکان چین؟ زانینی جۆر و خاوەندارێتی ئەو وێنانەی لەگەڵ بابەتە رۆژنامەنووسییەکان بەکارهاتوون. لەگەڵ گەیشتن بە سەرچاوەی زانیارییەکانی رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ.

## کۆمەڵ و نموونەی توێژینەوەکە

کۆمەڵی توێژینەوەکە لە هەموو ژمارەکانی رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) پێکهاتووە و نموونەی توێژینەوەکەش بریتییە لە لاپەڕەی یەکەم و کۆتایی هەموو ئەو ژمارانەی رۆژنامەکە، کە لەماوەی ساڵی (٢٠٠٩) دەرچوون و لە (٩) ژمارە پێکهاتوون.

١- بابەتە بڵاوکراوەکان بەپێی بوارە جیاوازەکان لە رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ (٢٠٠٩).

لە بەشەکانی لای ڕاست، ناوەڕاست، چەپ، سەرەوە و خوارەوەی لاپەڕە یەک و کۆتایی رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) و لەچوارچێوەی سنوری کاتی توێژینەوەکەدا؛ سەدان بابەتی جۆراوجۆر بڵاوکراوەتەوە، هەریەکەیان خاوەن سروشتێکی دیاریکراون. بەسەرنجدان لێیان: پرسە سیاسییەکان لە پلەی یەکەم هاتوون، پاشان پرسی ئەدەب و هونەر لە پلەی دووەم، دواتریش پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە پلەی سێیەم و بەدوای ئەوانیش هەریەک لە پرسەکانی: وەرزش، پەروەردە و خوێندنی باڵا، پرسە رۆشنبیرییەکان، ریکلام و کاریکاتێر، هۆشیاریی تەندروستیی، گەندەڵی، خزمەتگوزاریی، کەلەپوور و شوێنەوار، پرسە ئایینییەکان، شەهیدان و ئەنفال پاشان پرسە تەکنەلۆژییەکان.

ئەو ئەنجامەش دەرخەری ئەوەیە: رۆژنامەکە گشتی بووە، نەوەک تایبەتمەند بە بوارێکی دیاریکراو، هەروەها ئاماژەیە بەوەش، کە زیاتر بەلای پرسە سیاسییەکان، پرسەکانی پەیوەست بە ئەدەب و هونەر و پرسە کۆمەڵایەتییەکان رۆیشتووە. ڕەنگبێت ئەوەش بۆ گرنگیدانی خەڵک بۆ ئەو پرسانە لەوکاتەدا بگەڕێتەوە. بڕوانە خشتەی (١).

خشتەی (١): سروشتی پرسە رووماڵکراوەکان لە رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ پیشان دەدات.

| سروشتی پرسەکانی کۆمەڵگە | دووبارە | ٪ | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| پرسە کۆمەڵایەتییەکان | ٣٤ | ١٢، ٥ | سێیەم |
| پرسە سیاسییەکان | ٤٦ | ١٧ | یەکەم |
| پرسی گەندەڵی | ١٠ | ٣، ٧ | نۆیەم |
| پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا | ٢٦ | ٩، ٦ | پێنجەم |
| پرسی ئەدەب و هونەر | ٣٥ | ١٢، ٩ | دووەم |

| پرسی شەهیدان و ئەنفال | ٣ | ١, ١ | سیازدەهەم |
|---|---|---|---|
| پرسی هۆشیاریی تەندروستیی | ١٦ | ٥, ٩ | هەشتەم |
| پرسی خزمەتگوزاریی | ٦ | ٢, ٢ | دەیەم |
| پرسی وەرزش | ٣٣ | ١٢, ٢ | چوارەم |
| پرسی کەلەپوور و شوێنەوار | ٥ | ١, ٨ | یازدەهەم |
| پرسە رۆشنبیرییەکان | ٢٥ | ٩, ٢ | شەشەم |
| پرسە ئاینییەکان | ٤ | ١, ٥ | دوازدەهەم |
| پرسە تەکنەلۆژییەکان | ٢ | ٠, ٧ | چواردەهەم |
| پرسە یاساییەکان | ٤ | ١, ٥ | دوازدەهەم |
| پرسی ڕیکلامەکان و کاریکاتێر | ٢٢ | ٨, ١ | حەوتەم |
| کۆیگشتی | ٢٧١ | ١٠٠ | |

نموونـەی توێژینەوەکـە (بابەتـە شـیکارکراوەکان لـە لاپـەڕە یـەک و کۆتایـی ڕۆژنامـەی گەرمیانـی ئەمـڕۆ)

لـە مـاوەی سـاڵی (٢٠٠٩) دا؛ ڕۆژنامـەی گەرمیانـی ئەمـڕۆ تەنها نـۆ ژمـارەی بەردەسـتن، لەکاتێکـدا بەوتـەی سەرنووسـەری ڕۆژنامەکـە، هەمـوو ژمارەکانـی بەشـێوەی مانگانـە لـەو سـاڵەدا دەرچـوون، بـەڵام دەردەکەوێـت، کـە فەوتـاون و نەتوانـراوە چ بەشـێوەی ئەلیکترۆنیـی یاخـوود چاپکـراو یـان هەردووکیـان پێکـەوە ئەرشـیفبکرێن و لـە لەناوچـوون بپارێزرێـن. هـەر بۆنموونـە ڕۆژنامـەی (گەرمیانـی ئەمـڕۆ) ڕۆژنامەیەکـی مانگانـە بـووە، بـەڵام ژمـارەی مانگەکانی (ئایـار، ئەیلـوول و تشـرینی دووەمـی ٢٠٠٩) نەمـاوە و ژمـارەی مانگـی (ئاب)یـش بـە مانگـی (جـوڵای) نووسـراوە، کـە دەکاتـە مانگـی (حوزەیـران).

لـە لاپەڕەیـەک و کۆتایـی هەمـوو ئـەو نـۆ ژمـارەی لـەو سـاڵەدا بەردەسـت بـوون تەنهـا (٧٧) بابـەت بڵاوکراونەتـەوە، هەندێـک لـەو بابەتانـەش کورتەیەکیـان لـە لاپـەڕە یـەک بـووە و درێژەکانیـان لـە لاپەڕەکانـی دواتـر و هەموویـان شـیکاریان بـۆ کـراوە. هەروەهـا لـە لاپـەڕە یـەک چەندیـن بابـەت و وتـار تەنهـا بەناونیشـان و هەندێکجاریـش ناونیشـان و وێنـەی نووسـەری بابـەت هاتـوون و ناوەڕۆکـی بابەتەکانیـان لەلاپەڕەکانـی نـاوەوە هاتـوون، توێـژەر بەپێویسـتی نەزانیـووە لـە چوارچێـوەی کاری توێژینەوەکـەی ئەژماریـان بـکات.

سـەرباری ئـەوەش لـە لاپـەڕەی کۆتایـی ڕۆژنامەکـە چەندجارێـک ئامـاژە بـەوەدراوە، کـە خوێنـەر دەتوانێـت بگەڕێتـەوە بـۆ لاپەڕەکانـی پێشـووتر بـۆ خوێندنـەوەی ئـەو بابەتانـەی لـە کۆتـا لاپـەڕە ناونیشـانەکانیان خراوەتـەڕوو. لـە ڕاسـتیدا ئەوانـەش لەچوارچێـوەی شـیکار دانـەنراون،

چونكە توێژەر پێیوایە ئەو كارە هەڵەیەكی میتۆدییە و ناكرێت لە لاپەڕەی كۆتاییەوە خوێنەر بۆ خوێندنەوەی لاپەڕەكانی پێشووتر ئاراستە بكرێت، بەڵكوو پێچەوانەكەی راستە، وەك ڕۆژنامەكە لە لاپەڕە یەك ئەنجامیداوە. بڕوانە خشتەی (٢).

خشتەی (٢): ژمارەكانی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ و ڕێكەوتی دەرچوونیان پیشان دەدات.

| ژمارەی ڕۆژنامەكە و ڕێكەوتی دەرچوون | ژمارەی بابەتە بڵاوكراوەكان |
|---|---|
| (29) لە (كانوونی دووەمی ٢٠٠٩) | ١١ |
| (30) لە (مانگی شووباتی ٢٠٠٩) | ٨ |
| (31) لە (مانگی ئازاری ٢٠٠٩) | ٩ |
| (32) لە (مانگی نیسانی ٢٠٠٩) | ٩ |
| (34) لە (مانگی حوزەیرانی ٢٠٠٩) | ٨ |
| (35) لە (مانگی تەمووزی ٢٠٠٩) | ٩ |
| (36) لە (مانگی ئابی ٢٠٠٩) | ٨ |
| (37) لە (مانگی تشرینی یەكەمی ٢٠٠٩) | ٧ |
| (39) لە (مانگی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٩) | ٨ |
| كۆیگشتی | ٧٧ |

## جۆر و ڕێبازی توێژینەوەكە

توێژینەوەكە لە ڕووی جۆرەوە وەسفییە و هەردوو میتۆدی (مێژوویی) و (شیكاری ناوەڕۆك) بەكارهاتوون، یەكەمیان؛ بۆ زانینی پرس و ڕووداوەكانی ئەوكات لە ڕێگەی ڕووماڵی ڕۆژنامەكان، دووەمیشیان؛ بۆ شیكردنەوەی ڕووپەڕی ڕۆژنامەكان لە ڕووی شێوە و ناوەڕۆك و گەیشتن بە ئامانجی توێژینەوەكە.

## سنوری توێژینەوەكە

لە ڕووی سنوری توێژینەوەكەش؛ سنوری كات، ساڵی (٢٠٠٩) دەگرێتەوە، كە پرس و بابەتەكانی ڕۆژنامەكە بڵاوكراونەتەوە سنوری شوێن، بریتییە لە شاری كەلار، كە ئێستا ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە و ئەوكات بارەگای سەرەكی ڕۆژنامەكە بووە، سنوری بابەتیش هەموو ئەو پرس و بابەتانەیە لە لاپەڕەی سەرەكی و لاپەڕەی كۆتایی ڕۆژنامەكە بەدرێژایی ئەو ساڵە بڵاوكراونەتەوە.

# تەوەری دووەم:
# تیۆرینامەی توێژینەوە: (ڕۆژنامە و ڕووماڵی پرسەکانی کۆمەڵگە)

## یەکەم: لەبارەی ڕۆژنامە و کایەی ڕۆژنامەنووسیی لە کۆمەڵگەدا

### مێژووی ڕۆژنامە

لەسەرەتادا؛ ڕۆژنامەی چاپکراو بەو ناوەی ئێستای نەناسرابوو. تەنها کۆمەڵێک هەواڵ بوو لەنێو خەڵکدا بڵاودەکرایەوە و هەموو ئامانجی گەیاندنی زانیاریی بوو بە هەموو ئەوانەی مەبەست بوون. بۆ ئەنجامدانی ئەو کردەیەش زۆرجار کەسێکی وتاربێژ و زمانپاراو دەنێردرایە ئەو شوێنانەی مەڵبەندی کۆبوونەوەی زۆرترین خەڵکن، بەتایبەت بازاڕە باو و میلییەکان، بۆئەوەی لە ناوەڕاستی قەرەباڵغییەکەیاندا بووەستێت، هەندێک هەواڵ یان فەرمان بە گوێیان بدات. بەم شێوەیە هەواڵەکە لەناو خەڵکدا بڵاودەبوویەوە. پاشان چاپەمەنی پشتی بەبیرۆکەی هەواڵنامە بەست، کە ئامانجی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵە لەنێوان تاکەکاندا لەڕێگەی نووسینەوە، ئەم شێوازە ڕۆژنامەوانییە لە کاتی شەڕەکاندا بڵاوبووەوە و ڕۆژنامە بەردەوام بوو لە پشتبەستن بەو شێوازە تا دۆزینەوەی چاپ و ئامرازەکانی. چاپ بەشداریی گەورەی هەبوو بۆ بیرکردنەوە لە دەرکردنی هەواڵ بەشێوەی چاپکراو. یەکەم ڕۆژنامە لە ئینگلتەرا لە ساڵی (١٧٠١)ی زایینی چاپکرا، دواتر لە ساڵی (١٧٧٧)ی زایینیش ڕۆژنامەیەک لە فەرەنسا دەرکەوت.

سەبارەت بە سەرهەڵدانی ڕۆژنامەنووسیی لە لای عەرەبەکان، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەمی زایینی، کاتێک یەکەم ڕۆژنامە لە بەغدا لە ساڵی (١٨١٦)ی زایینی دەرچوو، پاشان ڕۆژنامەی ئەلوەقائیعی میسری لە ساڵی (١٨٢٨)ی زایینی و بووە بە یەکەم ڕۆژنامەی ڕەسمی عەرەبی. بەو شێوەیە بڵاوکراوە ڕۆژنامەوانییەکان گەشەیەکی بەرچاویان بەخۆوە بینی.

نووسین یارمەتیدەر بوو لە دۆزینەوەی ڕۆژنامەنووسیی بەو پێیەی، وەک ئامرازێک بەکاردەهێنرا بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵک لەو شتانەی لە دەوروبەریان ڕوودەدەن بۆ یەکەمجار، لە شاری ڕۆما ئەنجومەنی پیران دادەنیشت بۆ تۆمارکردنی وتووێژەکانیان و دواتر هەڵیان دەواسی بۆ ڕایگشتی بۆئەوەی ببینن و ئیدی بەو تۆمارانە دەگوترا: (ڕووداوە گشتییەکان). هەروەها لە هەمان کاتدا هەندێک بڵاوکراوەی کاغەی تر دەردەکران، هەندێکی باسیان لە کۆمەڵێک بۆنە و ڕووداو دەکرد، وەک: هاوسەرگیریی، مردن، ئاهەنگ و جەژن. ئەمانە پێیان دەگوترا: (ڕووداوە ڕۆژانەییەکان). ئەو چاپکراوانە بەشێوەی ڕۆژانە دەرنەدەکران، بەڵکوو بەپێی ئەوەی هەلومەرجەکە پێویست بووایە.

دانیشتووانی نیمچە دورگەی عەرەبی پێش ئیسلام ئاگاداری ئەو دیاردەیە بوون، لێرە بەرهەمی شاعیران و ئەدیبان (موعەلەقات) بۆ خەڵکی هەڵدەواسران. ئەو بەرهەمانە کاغەزگەلێکن، پڕن لە هەواڵ و ڕووداوەکان، کە شاعیر شایەتحاڵی بووە و تۆماری کردووە و لە کاغەزەکانی ڕۆما باشترن و ساڵانە لە بازاڕی عوکاز دانراوە. سەبارەت بە ئەوروپا، دەبینین سەرەتای ڕۆژنامەنووسیی لە سەدەی چوارەمی زاییندا لە ئیتالیا دەرکەوتووە، لەوێدا کاغەزی بڵاوکردووەتەوە بە ناوی (ڕاگەیاندن)، ئەم کاغەزانە بە دەست کۆپی دەکران و تایبەت بوون بە شازادەکان و دەوڵەمەندەکان و بەمجۆرە سنووردار بوون بەوەی کە بۆ چینێکی دیاریکراو دەردەکران.

## لە خوارەوە بەکورتی ئاماژە بە چەند وێستگەیەکی گەشەی ڕۆژنامەنووسیی دەدەین:

دەوترێت یەکەم کتێب لە چین لە ساڵی (١٠٤١)ی زایینی چاپکراوە، شۆڕشی چاپەمەنی لە سەدەی پانزەهەمەوە دەستی پێکردووە، بووەهۆی دەستپێکردنی سەردەمی ڕۆژنامەنووسیی و دەستپێکردنی چاپکردنی ڕۆژنامە و کتێب بە قەبارەیەکی گەورە. لەماوەی سەدەی بیستەمدا، تەکنەلۆژیا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە گەشەسەندنی کەرتی چاپەمەنی و ڕاگەیاندن و لەسەر ئەم هێڵە کاتییە دەجووڵایەوە:

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، گرنگی بە ڕۆژنامە و گۆڤاری خولی و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆکان دەدرا.

لە ساڵانی چلەکاندا پەخشی ڕادیۆیی بەربڵاو بوو.

لە ساڵانی (١٩٥٠) شۆڕشی پیشەسازی تەلەڤزیۆن دەستی پێکرد.

لە ساڵی (١٩٦٢)ی زایینی شۆڕشی مانگی دەستکرد هاتە ناو بواری ڕۆژنامەنووسیی و ڕاگەیاندن و لە ڕێگەی تەلەڤزیۆنەوە هەواڵەکانی لە هەموو جیهانەوە پەخش دەکرد.

لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا سەردەمی ڕۆژنامەنووسیی چووە ناو شۆڕشێکی نوێ و بە پەخشی ڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆ و خزمەتگوزاریی کەناڵی مانگی دەستکرد ناسرا.

لە ساڵانی نەوەدەکاندا مەزەندە دەکرا کە (٩٨٪)ی ئەمریکییەکان تەلەڤزیۆنیان لە ماڵەکانیاندا هەبووە.

لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا شۆڕشی ئینتەرنێت هاتە ناو گۆڕەپانی ڕۆژنامەنووسیی و ڕاگەیاندن.

## ڕۆژنامەنووسیی (چەمک – گەشەکردن - بوارەکانی)

ڕۆژنامەنووسیی بە یەکێک لە پیشە گرنگ و بەهادارەکان لە هەر کۆمەڵگەیەکی شارستانی دادەنرێت. زانیاریی لەبارەی ئەو ڕووداوانە بە هاووڵاتیان دەگەیەنێت، کە لەنێو خۆیان و دەوروبەری کۆمەڵگەکەیان و هەموو جیهان ڕوودەدەن. یارمەتی خەڵک دەدات لە ڕێگەی ڕۆژنامە و گۆڤار، ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و ئامرازەکانی میدیای نوێوە بۆچوون و ڕای خۆیان سەبارەت بە کاروبارە هەنووکەییەکان دەرببڕن و پێکبهێنن.

ڕۆژانە ڕۆژنامەنووسان لە سەرانسەری جیهان بابەت و هەواڵ لەسەر هەزاران ڕووداوی جۆربەجۆر دەنووسن. پەیامنێرانی ناوەوە ڕووماڵی ڕووداوە ناوخۆییەکان دەکەن و پەیامنێرانی دەرەوەش هەواڵە نیشتیمانیی و نێودەوڵەتییەکانی جیهانی دەرەوە ڕووماڵ دەکەن.

ڕۆژنامە چەند لاپەڕەیەکی تەنکە و مرۆڤ بابەتەکانی لەسەر دەنووسێت. بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دەردەچێت و هەواڵ و بابەتی ڕۆشنبیریی لەبارەی سیاسەت، کۆمەڵناسیی، ئابووریی و زانست لەخۆدەگرێت. ئەو کەسەی لەم بوارەدا کاردەکات پێی دەگوترێت: ڕۆژنامەنووس.

ڕۆژنامە پشت بە دارشتن، گواستنەوە، بڵاوکردنەوە و شیکردنەوەی هەواڵ و بابەت دەبەستێت و لە بڵاوکراوەیەکی چاپکراو یاخوود ئەلیکترۆنیی بڵاودەکرێتەوە. ئامانجی ئەوەیە ڕۆشنایی بخاتە سەر ڕووداوە سیاسیی، کۆمەڵایەتیی و کەلتوورییە پەیوەندیدارەکان بە گەلان و کۆمەڵگە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان. ڕۆژنامەنووسیی بوارێکی گرنگە لە کۆمەڵگەدا و بەشدارە لە پێکهێنانی کۆمەڵێک ڕەهەندی هزری، کە پەیوەندییان بە زانیارییەوە هەیە لەنێو تاکەکان لەناو یەک کۆمەڵگەدا، وەهایان لێدەکات لە دەوروبەری خۆیان نزیکتر بن، هەروەها هەموو ئەو هەواڵانەیان بۆ دەستەبەر دەکات سەبارەت بەو بابەتانەی، کە حەزیان لێیە زانیاریی لەبارەوە بزانن، وەک: وەرزش، هونەر، زانیاریی گشتیی، توێژینەوە پزیشکییەکان و..هتد.

ڕۆژنامەنووسیی بریتییە لە هونەری ئامادەکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار و سازاندنیان بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. هەندێک دەڵێن: ڕۆژنامە بە واتای (کاغەز) دێت، (جۆرناڵ)یش وشەیەکی وەرگیراوی ڕۆژئاواییە بۆ ئاماژەدان بە ڕۆژنامەی ڕۆژانە بەکاردەهێنرێت. لە زمانی عەرەبیش وشەی (الجريدة) لەلایەن (رشيد دحداح) بەکارهاتووە و هەندێکیش وشەی (الصحيفة) بەکاردەهێنن. لە زمانی کوردیشدا؛ ڕۆژنامە بەمانای نامەی ڕۆژ دێت، واتە سەکۆی بڵاوکردنەوەی ئەو ڕووداو و زانیاریی پاشان هەواڵانەی ڕۆژانە لە کۆمەڵگە ڕوودەدەن.

(بورک ئینگلیزیی)، بەمشێوەیە پێناسەی دەکات: ڕۆژنامەنووسیی: بریتییە لە دەسەڵاتی چوارەم.

فەرهەنگی (الرائد): ڕۆژنامەنووسیی: بریتییە لە هونەری بەرهەمهێنان و نووسینی ڕۆژنامە و گۆڤار.

گرنگە لەبیرمان بێت بڵاوكراوەی ڕۆژنامەنووسیی دوو جۆری سەرەكی هەیە: سیاسیی و ناسیاسیی و لەڕووی بابەت یان لەڕووی كات دابەش دەبێت:

- بڵاوكردنەوەی ڕۆژنامەنووسیی خولی: بە بەردەوامی لە ژێر ناوێكی دیاریكراو و یەك لە دوای یەك و لەكاتێكی دیاریكرا و ڕێكخراو و بەشێوەی زنجیرەیی دەردەچێت، وەك ڕۆژنامە ڕۆژانەییەكانی: كوردستانی نوێ و خەبات.

- بڵاوكراوەی ڕۆژنامەنووسیی ناخولی: ئەو بڵاوكراوە چاپكراوانە دەگرێتەوە، كە لە هەفتەیەكدا لە جارێك زیاتر بڵاوناكرێنەوە و زۆرجار كات و وادەی بڵاوكردنەوەی بەشێوەیەكی ڕێكخراو و ڕێكوپێك نییە. كتێبیش هەر هەمان سرووشت و ناوی هەیە.

هەروەها ڕۆژنامە بۆڵتنێكی تایبەتە بە پێشكەشكردنی هەواڵ و سەرنجدان لەسەری. ڕۆژنامەكان ڕێگەیەكی نایابن بۆ بەدواداچوون لەبارەی ڕووداوەكانی ئێستا، هەروەها ڕۆڵێكی گرنگ دەگێڕن لە پێكهێنانی ڕایگشتیدا. ڕۆژنامەكان بەراورد بە دەزگا هەواڵییە گەورەكانی، وەك: ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن سوودی زیاتریان هەیە، بەو پێیەی، كە هەواڵی زیاتر و بە وردیەكی زیاتر ڕووماڵ دەكەن. ڕۆژنامە دیاردەیەكی شارستانیی و پێشكەوتووە، ئەركی تەنها گەیاندنی هەواڵ و ڕووداوەكان نییە، بەڵكو بەشی هونەریی، وەرزش، كاتبەسەربردن و بازرگانی بە هەموو فۆرمەكانیانەوە هەیە، تامەزرۆی دابینكردنی پێداویستییەكانی هەموو مرۆڤێكە، بۆیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئارەزووی بۆی زیاد دەكات، خەڵكیش لە هەر كاتێكی ڕۆژدا دەتوانن وەریبگرن.

دەتوانین بڵێین: ڕۆژنامە ئەو ئامرازەیە، كە لە ڕێگەیەوە هەواڵ و زانیاریی لەسەر ڕووداوە هەنووكەییەكان داڕێژراون و شیكاریان بۆ دەگۆڕێت و بڵاودەكرێنەوە. هەروەها دەتوانرێت بەم شێوەیە پێناسە بكرێت: ئاوێنەی ژیانە لە كۆمەڵگەدا. بەومانایەی دەبێتە سەكۆی بڵاوكردنەوەی هەموو چالاكییەكان و تۆماری ڕووداوەكان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەفتە لە دوای هەفتە... هتد.

## سەرهەڵدانی ڕۆژنامەی هەفتانە

ڕۆژنامەنووسیی بە خێرایی لە جیهان گەشەی كرد، بەتایبەت لە ڕووی ناوەڕۆكەوە، دەستیكرد بە ڕووماڵكردنی ململانێی سیاسیی و ئایینییەكان بە شێوەیەكی بەرفراوان، كاریگەرییەكەی وەهای كرد، زۆرێك لە حكومەت و دەسەڵاتەكان بیر لە سەپاندنی سانسۆر و ئاستەنگ لە ڕێگەی بكەنەوە، بەڵام ئەو ڕێگەیە هەرگیز لە كاریگەریی دەسەڵاتی

ڕۆژنامەی لەسەر حکومەتەکان کەمنەکردووە. لە ساڵی (١٥٠٩)ی زایینی یەکەم ڕۆژنامەی هەفتانە لە شاری ستراسبۆرگ دەرکەوت، پاشان لە ساڵی (١٦٢٢) زایینی لە شاری لەندەن ڕۆژنامەی هەفتانە دەرکەوت و لە ساڵی (١٦٣١)یش لە شاری پاریس.

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمدا یەکەم ڕۆژنامەی ڕۆژانە دەرکەوت، بەڵام دەستپێکردنی ڕاستەقینەی لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا بوو و لە ساڵانی یەکەمی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بەردەوام بوو، ڕۆژنامەنووسەکان زیادیان کرد و چالاکیی ڕۆژنامەوانیی وەک پیشەیەک خۆی سەلماند و لە ڕووی یاساییەوە چوارچێوەی بۆ دانرا. یاسای (یاسای لیبل) لە ساڵی (١٧٩٢)ی زایینی لە ئینگلتەرا تایبەت بە کاری ڕۆژنامەنووسیی دەرچوێنرا، هەندێک گەرەنتی بە ڕۆژنامەنووسان بەخشی و بەم شێوەیەش بوارێکی فراوانی بۆ ململانێ گەورەکە کردەوە لە نێوان چاپەمەنی و دەسەڵاتدا. چەندین هۆکاریش یارمەتی ڕۆژنامەنووسییاندا بۆ گەشەکردن، لەوانە: سەرهەڵدانی ئاژانسەکانی هەواڵ، ئاژانسەکان کاریان کرد بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاریی و دابەشکردنی بەسەر ڕۆژنامە جۆراوجۆرەکاندا. بەکارهێنانی ڕیکلامی بازرگانی بەجۆرێک، کە ڕۆژنامەکان دەستیان کرد بە بەدەستهێنانی سەرچاوەی زیاتر بۆ فرۆشتنەکانیان. دۆزینەوەی شێوازی نوێی چاپکردن (ڕۆتاتیف)، کە لە ساڵی (١٨٧٠)ی زایینیدا هاتە ئاراوە و توانی (١٨) هەزار دانە لە کاتژمێرێکدا چاپ بکات. چاپخانەی مۆدێرن لە جیهانی عەرەبیدا نووسراوە ڕۆژنامەکان لە جیهانی عەرەبیدا لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینی دەستیان بە دەرکەوتن کرد، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هاتنە ناوەوەی هەڵمەتی فەرەنسی بۆ میسر، کە لەلایەن ناپلیۆن بۆناپارت لە ساڵی (١٧٩٩ی زایینی- ١٨٠١ی زایینی) ئەنجامدرا.



## گرنگی ڕۆژنامەنووسیی

بەرفراوانکردنی پانتایی دەربڕینی بیروڕا و ئازادی ڕادەربڕین بە یەکێک لە ئامانجە گرنگەکانی ڕۆژنامەنووسیی دادەنرێت، ڕۆژنامەنووسیی مافی دەربڕینی بیروڕای خۆیان و دەربڕینی بیروڕای جۆراوجۆر لە کۆمەڵگادا بە خەڵک دەبەخشێت. دەنگی بێدەنگەکانە و زانیاریی و ڕاپۆرتی پێویست دەدات بە خەڵک سەبارەت بەو ڕووداو و پێشهاتانەی، کە لە دەوروبەریان و لە جیهاندا ڕوودەدەن.

بناغەی کۆمەڵگەیەکی دیموکراسیی: ڕاگەیاندن پێگەیەکی گرنگی لە هەر کۆمەڵگایەکی دیموکراسیدا هەیە، تەنها سەرچاوەی هەواڵ نییە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ زانیاریی هەنووکەیی و ئامرازێکە بۆ ڕەخنەی گشتی، بەو پێیەی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر پێکهاتنی ڕایگشتی هەیە. ئەرکی سەرنووسەری هەواڵ و ستافەکەیەتی، ئەو هەواڵانە هەڵبژێرن، کە لە دەزگا و پەیامنێری جۆراوجۆرەوە دێن. لەگەڵ ئامادەکردنی چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵک و دەستکاریکردن و ڕێکخستنی و نمایشکردنی بە شێوەیەک، کە بۆ خەڵک ڕوون بێت.

ئەڵقەی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و خەڵك: ڕۆژنامەنووسیی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و خەڵكە و ناوەڕۆكی ڕۆژنامە بە زۆری بەهرەی چەند ڕۆژنامەنووسێك لەخۆدەگرێت، لەوانە: هونەرمەندان، كاریكاتێریستەكان، فۆتۆگرافەران و ئەوانی تر. ڕۆژنامە دەوڵەمەند و كاریگەرەكان هەمیشە پەیامنێرەكانیان لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات دەپارێزن، لەپێناو كۆكردنەوەی زانیاریی لە سەرچاوە جیاوازەكانەوە.

یارمەتیدانی خەڵك بۆ درككردن بە مافەكانیان: ڕۆژنامەنووسیی لە بنەڕەتدا ئامانجی یارمەتیدانی خەڵكە بۆ بەدیهێنانی مافەكانی، لە ڕێگەی نووسینەوە ڕۆژانە و هەفتانە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی لە كاتی نووسیندا هەواڵەكە گونجاو بێت بۆ هەموو خوێنەران، بەبێ گوێدانە ئاستی پەروەردەیی و باری سۆزداریی و كۆمەڵایەتییان، بەوجۆرەش ڕێگە بە نەخوێندەوارەكانیش دەدات دەنگ و بۆچوونەكانیان بخەنەڕوو و پەیوەستی تاكەكان بە كۆمەڵگەوە دەهێڵێتەوە.

خزمەتكردنی هاووڵاتیان: ئامانجێكی بنەڕەتی سەرهەڵدان و بەردەوامی كاروانی ڕۆژنامەنووسییە. ڕۆژنامە بە بڵاوكردنەوەی هەواڵ كاریگەریی لەسەر خەڵك دادەنێت و خزمەتیشیان دەكات. زیادبوونی ئارەزووی ڕۆژنامەنووسیش هاوكاتە لەگەڵ زیادبوونی بەرژەوەندییە ئابورییەكان لە كۆمەڵگەدا. بنەمای خزمەتكردنی هاوڵاتیان ڕۆژنامەنووسێكی باش دروست دەكات. ڕۆژنامەنووس دەبێت ئاگاداری ڕەوتی ئێستای تێكەڵبوونی هەواڵ و دەنگۆ بێت بەیەكتری، هەروەها ئاگاداری سەپاندنی بۆچوونەكانی سەرنوسەر بەسەر خوێنەراندا بێت.

گەشەپێدانی گەلان: لەگەڵ هەر كاتژمێرێكدا چیرۆكێكی نوێ دەربارەی دۆزینەوە، سیاسەت، زانست، وەرزش، پەروەردە، و تەكنەلۆژیا لە هەموو جیهانەوە دێتە ئاراوە، بەبێ ڕۆژنامەنووس مەحاڵە ئەم چیرۆكانە بگاتە خەڵك، مەودای ڕۆژنامەنووسیی بەدرێژایی ساڵان فراوانتر بووە. ئێستا ئامرازەكانی پەیوەندی، وەك: ڕادیۆ، تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەكان، سۆشیال میدیا و ماڵپەڕەكانی هەواڵ لە ئینتەرنێتدا لەخۆدەگرێت. لەگەڵ زیادبوون و هەمەچەشنی ئامرازەكانی پەیوەندیكردن؛ ژمارەی وەرگرانیش بە ڕێژەیەكی بەرچاو زیادیكرد. ڕۆژنامەنووسی بووەتە هەڵبژاردەیەكی پیشەیی دیار بۆ ژۆرێك لە خوێندكاران، بەو پێیەی بوارێكی پڕە لە ئاڵەنگاریی و ڕۆڵێكی سەرەكی دەگێڕێت لە گەشەپێدانی گەلان.

زیادكردنی هۆشیاریی كۆمەڵگەكان: ئامانجەكانی پیشەی ڕۆژنامەنووسیی بە تەكنەلۆجیا و ڕۆژنامەنووس و تەكنیكەكانی بەكارهێنراو پێناسە ناكرێن، بەڵكو پرەنسیپ و ئامانجی ڕۆژنامەنووسیی بە شتێكی گرنگتر دیاریدەكرێت، كە ئەو ئەركەیە هەواڵ لە ژیانی مرۆڤەكاندا دەیگێڕێت. هەواڵ ئەو بەشەیە لە پەیوەندییەكان، كە تاكەكان ئاگادار

دەکاتــەوە لــە ڕووداو و پرســەکان. هەروەهــا لەبــارەی پرســەکانی پەیوەســت بــە جیهانــی دەرەوە زانیاریــی پێویســت دەدات بــە هاوڵاتیــان بــۆ ئــەوەی باشــترین بڕیــار لەســەر ژیانیــان، کۆمەڵگەکانیــان و حکومەتەکانیــان بــدەن بەهــای یەکەمــی هــەواڵ بەهێزکــردن و زیادکردنــی هۆشــیاریی کۆمەڵگەکانــە.

دابینکردن و گەیاندنی زانیاریی: بریتییە لـە پێشکەشـکردنی ڕاپـۆرت و هـەواڵ و ڕووداوەکانی پەیوەسـت بـە ژیانـی ڕۆژانـە، هیـچ زانیارییەکـی کات بەسـەربردن لەخۆناگرێـت، وەک خـۆی هەمـوو هەواڵەکانـی پەیوەسـت بـە سیاسـەتی حکومـەت و کاروبـاری دەرەوە و کـەش و هـەوا و ڕووداوەکان و بازرگانـی و پـەروەردە دەگرێتـەوە. ئـەم کارە زیاتـر پێکدێـت لـەو مادانـەی، کـە لـە هەواڵـەکان لـە ڕادیـۆ و تەلەڤزیـۆن یاخـود لـە سـتوونی هەواڵـی ڕۆژنامـە و گۆڤارەکانـدا پەخـش و بڵاودەکرێنـەوە.

لێکدانـەوەی هـەواڵ: لـە ڕێگـەی ڕۆژنامەنووسـییەوە، خوێنـەر یـان گوێگـر بـە بەکارهێنانـی مـادەی پاشـخان و گرافـەکان ڕوونکردنـەوە و لێکدانـەوە لەسـەر بابـەت و ڕووداوە جیاجیـاکان بەدەسـت دەهێنێـت، کـە هەمـوو ئەمانـە ئامانجیـان یارمەتیدانـی تاکەکـەس بـۆ گەیشـتن بـە تێگەیشـتنێکی باشـتر لـەو هەواڵـەی، کـە وەریدەگرێـت.

کاتبەسـەربردن: ڕۆژنامەنووسـیی جگـە لـە ڕۆڵـە جدییەکانـی، گرنگـی بـە ئەرکـی خـۆی، وەک هونەریـش دەدات، وەک: پێدانــی زانیاریــی و لێکدانــەوە، ڕۆڵــی کاتبەســەربردن لــە بــواری ڕۆژنامەنووسـیی بریتییـە لـە سـەرگەرمیکردنی چیرۆکـی کۆمیـدی لایەنەکانـی ژیانـی ڕۆژانـە، هەواڵەکانــی پەیوەســت بــە ڕووداوە وەرزشــییەکان، مــۆدە پێشــهاتەکان، نواندن..هتــد. کاتبەســەربردن بــە یەکێــک لــە ئەرکــە گرنگــەکان دادەنرێــت وەهــا دەکات خەڵــک ئەگــەر بــۆ ماوەیەکیـش بێـت لـە جەنجاڵییەکانـی ژیانـی ڕۆژانـە دووربکەوێتـەوە و پشـوویەک بـدات.

ڕێکلامـە بازرگانییـەکان: ڕێکلامـەکان کۆمەڵێـک پەیـام و فەرمانـی کۆمەڵایەتیـی لەخۆدەگـرن، وەک: ڕیکلامـە جیاوازەکانـی پەیوەسـت بـە پلاندانانـی خێـزان، لێخوڕینـی سـەلامەت، چاودێـری منــداڵ، چاودێــری تەندروســتی و هتــد. هەروەهــا ڕێکلامــە بازرگانییــەکان هەوڵــدەدەن بــۆ بەرەوپێشـبردنی فرۆشـتنی کاڵاکانیـان. ڕیکلامـەکان پێکهێنـەری گەورەتریـن بـەش لـە داهاتـی ڕۆژنامەکانـن بـۆ دابینکردنـی لایەنـی دارایـی و بەردەوامیـان لـە کارکـردن. هەروەهـا ڕیـکلام زانیاریـی سـەرەتایی بازاڕکـردن دەداتـە خەڵـک و یارمەتـی بازرگانـان دەدات لـە گۆڕانکارییەکانی بوارەکانیـان ئاگاداربـن.

## ئەركە بنچینەییەكانی ڕۆژنامەنووسیی

ڕۆژنامەنووسیی، وەک پیشەیەک پێناسە دەکرێت بەوەی، کە کۆمەڵێک ئەرک لەخۆدەگرێت لە ڕێگەی ڕۆژنامەنووس ئەنجام دەدرێت. پەیوەندی بە کۆکردنەوەی هەواڵ، تێڕوانین، بەدواداچوون و نووسینی ڕاپۆرت لەسەر پرسە جیهانییە باوەکان، سیاسیی یان پێشهاتە گشتییەکان و هەندێک بوارە جۆراوجۆرەکان هەیە، وەک: مۆدە، خواردن و ئەوانی تر. چاپەمەنی چەندین ئەرکی بنەڕەتی هەیە، کە بریتیین لە:

ئەرکی پەروەردەیی: ڕۆژنامەنووسیی کار بۆ پەروەردەکردنی خەڵک دەکات لە ڕێگەی پێدانی زانیاریی جۆراوجۆر لەسەر بابەتی هەمەجۆر بە هەندێک کەس، کە ئەمڕۆ پێویستیان بەو زانیارییانە هەیە. واتە لە ڕێگەی گەیاندنی هەواڵ، ڕاستی، ڕووداو بە لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەیان؛ کاردەکات بۆ پێدانی زانیاریی و کەرەستەی سەرەتایی بە خوێنەر یان گوێگر ئەوەش بە بەکارهێنانی گراف و ئامرازەکانی تر. ئامانج لەوەش یارمەتیدانی تاکە بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی باشتر لە هەموو ئەو شتانەی، کە دەیبینێت یان دەیبیستێت.

ئەرکی پێکهێنانی کاریگەریی: ڕۆژنامەنووسیی لە ڕێگەی ئەو پەیام و زانیارییانەی، کە بڵاوی دەکاتەوە، کاریگەریی لەسەر بۆچوونی وەرگرەکان درووستدەکات، بەو پێیەی، کە تەنها لەسەر بنەمای بڵاوکردنەوەی هەواڵ بۆ خەڵک و ڕێنماییکردنیان و سەرگەرمیکردنیان نییە، بەڵکو کاریگەریی لەسەر بۆچوونەکانیان لەبارەی زۆر بابەت هەیە، دەتوانێت هەندێکجار بۆچوونی خەڵک بۆ ئاراستەکانی تر بگۆڕێت، جا نەرێنی بێت یان نەرێنی.

ئەرکی ڕێنماییکاریی ڕۆژنامەنووسیی: ڕۆژنامەنووسیی هەر لە کۆنەوە هەوڵی داوە کاریگەریی لەسەر مرۆڤایەتی درووست بکات و ڕێنوێنی بکات لە ڕێگەی بابەت و کارتۆن و وێنەکانەوە، کە لە ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب و ڕادیۆ و چەندانی تردا بڵاوی دەکاتەوە، ڕۆژنامەنووسیی خەمی کۆکردنەوە و دەستکاریکردنی مادده گرنگەکانە پاشان پیشاندانی لە ڕێگەی ئامرازە جۆراوجۆرەکان.

ئەرکی هەواڵیی: ڕۆژنامەنووسیی لە بنەڕەتدا؛ کاردەکات بۆ پێدانی هەواڵی ڕۆژانە بەشێوەیەکی بەردەوام بە ئەندامانی کۆمەڵگە لە ڕێگەی ڕۆژنامە و کەناڵی هەواڵ و ئەوانی ترەوە، ئەرکی هەواڵ بریتییە لە کۆکردنەوەی ڕاپۆرتی هەواڵ و ڕووداوەکانی پەیوەست بە ژیانی ڕۆژانە لە بوارەکانی سیاسەت، کاروبارەکانی دەرەوە، کەش و هەوا، ڕووداوەکان، بازرگانی، پەروەردە و ئەوانی تر بەجۆرێک، کە هەواڵەکان زانیاریی واقیعی و گرنگ لەخۆبگرێت بۆ هاوڵاتیان بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی کاریگەر بەشداریی دیموکراسی لە کۆمەڵگەدا بکەن.

ئەرکی کۆمەڵایەتیی: ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵگە بە ئەرکی بنەڕەتی ڕۆژنامەنووسیی دادەنرێت، ئەوەش بە پێشکەشکردنی ڕاپۆرت لەسەر هەواڵ و ڕووداوە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان، بەو پێیەش ڕۆژنامەنووسان هەوڵدەدەن بابەتگەلێکی بابەتیی بنووسین،

تاوەکو ئەندامانی کۆمەڵگە بەرەو پەیامەکانیان ڕابکێشن، کە لەسەر بنەمای ڕاستییەکان و بەڵگەکان دەبن، نەک بۆچوون و بانگەوازی سۆزداری، لەگەڵ بەکارهێنانی ڕستە و بڕگەی کورت، بۆیە ڕۆژنامەنووسان ئەرکیان پێ سپێردراوە، کە زانیاریی درووست سەبارەت بە ڕووداوەکان، وەک خۆیان پێشکەش بە خوێنەران بکەن، لەوانەش بۆچوونی جیاواز و هەندێکجاریش ناکۆک لەسەر ئەو بابەتەی ڕووماڵی دەکەن.

ئەرکی زانستیی: ڕۆژنامەنووسان ڕووبەڕووی ئاستەنگی گەورە دەبنەوە لە هەوڵدان بۆ خستنەڕووی زانیارییە زانستییە ئاڵۆزەکان بۆ ڕایگشتی، پێویستە ڕۆژنامەنووس هاوسەنگ بێت لەگەڵ گەشەسەندنی خێرای زانستیی، سەرچاوەی باوەڕپێکراو بۆ گواستنەوەی زانیاریی زانستی دەستنیشان بکات، ئەمە جگە لەوەی ڕووانگەی جیاواز لەسەر بنەمای زانست هاوکات دەبێت ڕۆشنبیریی تەواوی لەبارەی ئەوە هەبێت، کە توێژینەوەی زانستی تەکنەلۆژیا نوێیەکان ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕن لە گفتوگۆی سیاسیی، ئابووری، کولتووری و کۆمەڵایەتیدا.

ئەرکی چاودێریکردن: میدیا بەرپرسیارێتی چاودێریکردنی بەردەوامی تاک و گرووپەکانی لە کەسانی تایبەت و گشتیدا هەیە، بە ئامانجی پاراستنی خەڵک لە کردەوەگەلێک، کە ئاماژەن بۆ خراپبەکارهێنانی دەسەڵات، کە بەبێ دەستێوەردانی میدیا بە نهێنی دەمێنێتەوە.

ئەرکی سازدانی دیالۆگ: گرنگی ڕۆژنامەنووسیی لە بناغەی کۆمەڵگەیەکی دیموکراسیدایە لە ڕێگەی ڕەخساندنی پانتاییەک بۆ دیالۆگ و گفتوگۆ لەنێوان تاک و گرووپەکان بەمەبەستی پێکهێنانی ڕایگشتی، لەبارەی ئەو پرس و بابەتانەی بەلایانەوە جێگە بایەخ و گرنگییە.

ئەرکی هێنانەزمانی ئەوانی تر: ئەرکی هێنانەزمان ئەوەیە، کە میدیا تا دەتوانێت نوێنەرایەتی زانیاریی و بۆچوونی هەموو تاکەکان و بەرژەوەندییەکان دەکات، نەک تەنها پێشخستنی دۆخی ئێستا یان بەرژەوەندی چەند کەسێک.

## دووەم: کورتەیەك لەبارەی ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ)

مانگنامەیەکی ئەهلی ئازاد بووە، ژمارە یەکی لە (٥ی ئایاری ٢٠٠٥) لە شاری کەلار ناوەندی گەرمیان دەرچووە و لە (١٢) لاپەڕەی ڕەش و سپی پێکهاتووە.

خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە (شێخ سەعید شاکەلی) و سەرنووسەرەکەی (لاوان ئەحمەد) و بەڕێوەبەری نووسین (ساڵەح میروەیس) بووە. هەرچی ستافی نووسین پێکهاتووە لە: (جەلال ئەلیاسی، شیلان ڕۆژبەیانی، عەباس ئەنوەر).

سەربارى ڕۆژنامەکە، گەرمیانى ئەمڕۆ چەندین پاشکۆشى هەبووە، لەوانە: پاشکۆی وەرزشی، کە تایبەت بووە بە ڕووداوە وەرزشییە ناوخۆیی و جیهانییەکان و لەلایەن (یاسین محەمەد کەلاری) سەرپەرشتی کراوە، هەروەها پاشکۆی (پاریا)، کە زیاتر تایبەت بووە بە پرسەکانی ژنان، ژمارە یەکی لە ئازاری (٢٠٠٧) دەرچووە و سەرپەرشتیارەکەی (سارا مەجید) بووە و هەریەک لە: (شنۆ قادر) و (ئیمان جەبار) دەستەی نووسەرانی بوون.

جگە لە پاشکۆکان بە زمانی کوردی، ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ پاشکۆیەکیشی بە زمانی عەرەبی و بەناوی (الحوار) هەبووە و ژمارە سفری لە شوباتی (٢٠٠٨) و لە ئامادەکردنی (لاوان ئەحمەد) دەرچووە.

سەربارى ئەوەش پاشکۆی (وەرگێڕان) لە ڕۆژنامەکە هەبووە، تایبەت بووە بە بابەتە وەرگێڕدراوەکان لە زمانەکانی تر بەتایبەت زمانی عەرەبی بۆ زمانی کوردی و ژمارە یەکی لە (تشرینی دووەمی ٢٠٠٩) دەرچووە و لەلایەن هەریەک لە: (ڕزگار فایەق سەعید) و (ئاسۆ وەهاب) سەرپەرشتی کراوە.

ڕۆژی جیهانی کتێب، دیسان پاشکۆیەکی دیکەی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ بووە، تایبەت بووە بە ڕۆژی جیهانی کتێب (٢٣ی نیسان)، ژمارە یەکی لە نیسانی (٢٠١١) دەرچووە و لەلایەن (سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسین) سەرپەرشتی کراوە و (کازم جەباری)یش هاوکارێکی کارایان بووە.

چواردەی چوار، کە گوزارشتە لە ڕۆژی ئەنفال و هەموو ساڵێک بە مەراسیم و بۆنەیەکی جیاواز لە گەرمیان و ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی کوردستان یادەکە دەکرێتەوە، بووەتە پاشکۆیەکی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ و ژمارە یەکی لە (نیسانی ٢٠١٠) بە چوار لاپەڕەی قەبارە بچووکی ڕەنگ ڕەش و سپی دەرکراوە.

تیپی شانۆی منداڵانی گەرمیان، پاشکۆیەکی دیکەی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ بووە، تایبەت بووە بە مێژووی تیپی شانۆی منداڵانی گەرمیان و ژمارە یەکی لە (تەمموزی ٢٠١١) دەرچووە و لەلایەن (محەمەد سابیر کەمەر) و (سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەکە) ئامادە کراوە.

توێژینەوە، پاشکۆیەکی تایبەتی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ بووە، لە (٢٠١١) دەرچووە و لەلایەن (عەباس مەحمود) سەرپەرشتی کراوە و هەریەک لە: (سادق ئەحمەد، کارزان فوئاد، حەیدەر عەلی، کارزان ئازاد، عومەر عەبدولکەریم –تینوو) هاوکاری ئامادەکردنی بوون. ئەو بڵاوکراوەیە، پێشتر بە شێوەی ڕۆژنامە دەردەچوو، بەڵام ژمارە (٩١)ی لەشێوەی گۆڤار و بە بەرگێکی ڕەنگاوڕەنگ و بەقەبارەی (٤٠) لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە و خاوەن ئیمتیازەکەی (لاوان ئەحمەد) بووە. ژمارە (٩٢)ی ئەو بڵاوکراوەیە لە ئابی (٢٠١٥)، وەک دوا ژمارە دەرچووە.

# تەوەری سێیەم: شیکارنامەی توێژینەوە (ڕەنگدانەوەی پرسەکانی کۆمەڵگە لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

## یەکەم: شیکار لە ڕووی ڕووخسارەوە

### ١- ژانرە بەکارهاتووەکان لە ڕوومالّی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان

بەپێی ئەنجامەکان: پلەی یەکەمی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ لە ڕێگەی ژانری (چاوپێکەوتن) بەرهەمهاتوون. لە پلەی دووەمیش ژانری (وتار)، پاشان (هەواڵی کورت)، (ڕیکلام و ڕێنمایی)، (ڕاپۆرتە هەواڵ) و (بەدواداچوون)، لەکۆتاییشدا؛ ژانری (چیرۆکە هەواڵ) هاتووە. ئەو ئەنجامە ئەوە دەردەخات: بەپێی پێویست گرنگی بە هەموو ژانرە ڕۆژنامەنووسییەکان دراوە، ئەوەش خاڵێکی ئەرێنییە. هەروەها ئەوەش پیشان دەدات: زۆربەی بابەتەکان لەلایەن ڕۆژنامەکەوە سازدراون. بڕوانە خشتەی (٣).

خشتەی (٣): ژانرە بەکارهاتووەکان لە سازدانی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان پیشان دەدات.

| جۆری ژانرەکان | | دووبارە | ٪ | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|---|
| هەواڵ | ڕاپۆرتە هەواڵ | ٩ | ١١, ٩ | پێنجەم |
| | چیرۆکە هەواڵ | ٢ | ٢, ٦ | حەوتەم |
| | هەواڵی کورت | ١١ | ١٥, ٧ | سێیەم |
| وتار | | ١٧ | ٢٤, ٣ | دووەم |
| بەدواداچوون | | ٤ | ٥, ٢ | شەشەم |
| چاوپێکەوتن | | ٢٤ | ٣٢, ٢ | یەکەم |
| ڕیکلام و ڕێنمایی | | ١٠ | ١٣ | چوارەم |
| کۆیگشتیی | | ٧٧ | | |



### ٢- جۆری وێنە بەکارهاتووەکان لەگەڵ بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان

تێبینی: (لە زۆربەی ژمارەکان لە لاپەڕەی یەکەم خوێنەر ئاراستەکراوە بۆ بابەتەکانی ناوەوە و ئەژمارکراون).

ئەنجامەکان پیشانی دەدەن: پلەی یەکەمی ئەو وێنانەی لەگەڵ بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان بەکارهاتوون بریتیین لە (وێنەی هەواڵی)، کە پەیوەستن بەخودی ئەو ڕووداوەی

رووماڵ کراوە، پلەی دووەمیش بریتییە لە (وێنەی کەسی)، بەومانایەی وێنەی کەسی و تایبەت لەگەڵ بابەتەکان بەکارهێندراوە بەتایبەت وێنەی ئەوانەی بوونەتە پێکهێنەری رووداوەکە، لە پلەی سێیەمیش (بەبێ وێنە) هاتووە، واتە هیچ وێنەیەک لەگەڵ بابەتە رۆژنامەنووسییەکە بەکارنەهاتووە، پاش ئەوەش (وێنەی هێمایی)، دواتریش (نەخشە و هێڵکاریی) و هیچ بابەتێکیش زیاد لە ئامرازێکی وێنەی بۆ بەکارنەهاتووە. بڕوانە نەخشەی (٤).

نەخشەی (٤): جۆری وێنەی بەکارهاتوو لەگەڵ بابەتە رۆژنامەنووسییەکان پیشان دەدات.

| جۆری وێنە | دووبارە | % | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| وێنەی هەواڵی | ٦٥ | ٦٣, ١ | یەکەم |
| وێنەی کەسی | ١٩ | ١٨, ٤ | دووەم |
| وێنەی هێمایی | ٦ | ٥, ٨ | چوارەم |
| نەخشە و هێڵکاریی | ٢ | ١, ٩ | پێنجەم |
| زیاد لە ئامرازێک | ٠ | ٠ | شەشەم |
| بەبێ وێنە | ١١ | ١٠, ٧ | سێیەم |
| کۆیگشتیی | ١٠٣ | ١٠٠ | |

## ٣- جۆری خاوەنداریەتی وێنە رۆژنامەنووسییەكان

تێبینی: (ئەو بابەتانە ئەژمارنەکراون، کە وێنەیان لەگەڵدا نەبووە).

بەپێی ئەو ئەنجامانەی لە خشتەکەی خوارەوە هاتوون: خاوەنداریەتی زۆرینەی رەهای ئەو وێنانەی لەگەڵ بابەتە رۆژنامەنووسییەکان بەکارهاتوون بریتیین لە خودی رۆژنامەکە (رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ) و لە پلەی دووەمیش ئەو وێنانە هاتوون، کە خاوەنداریەتیان بۆ سەرچاوەکانی دیکەی دەرەوەی رۆژنامەکە دەگەڕێتەوە. ئەنجامەکان خاڵێکی ئەرێنییە بۆ رۆژنامەکە و تێگەیشتنی ستافی رۆژنامەکە لە گرنگی وێنەی بەرهەمهاتووی تایبەت بە رۆژنامە پێش هەر وەرگرتنی لە هەر سەرچاوەیەکی تر دەگەیەنێت. بڕوانە خشتەی (٥).

خشتەی (٥): خاوەنداریەتی وێنە رۆژنامەنووسییەکان لە رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ پیشان دەدات.

| خاوەنداریەتی وێنە | دووبارە | ٪ | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| رۆژنامەی گەرمیانی ئەمرۆ | ٧٨ | ٨٤, ٨ | یەکەم |
| وەرگیراو | ١٤ | ١٥, ٢ | دووەم |
| کۆیگشتیی | ٩٢ | ١٠٠ | |

## ٤- سەرچاوەی زانیاریی لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ

بەپێی ئەنجامەكان لە خشتەی خوارەوە: پلەی یەكەمی سەرچاوەی زانیاریی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەكان لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ بۆ (پەیامنێر و راسپێردراوی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ) دەگەڕێتەوە. پلەی دووەمیش بۆ (میدیا ناوخۆییەكان)، دواتریش (ئاژانسەكان) و (بەرپرسی حكومی) هاتووە. ئەنجامەكان دەكرێت بە خاڵێكی بەهێز بۆ ڕۆژنامەكە تەماشا بكرێت، كە توانیویەتی زۆربەی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەكانی لە ئەنجامی بەدواداچوونی ستافەكەی بەدەستبهێنرێت و خۆیان خاوەندارییەتی بكەن. بڕوانە خشتەی (٦).

خشتەی (٦): سەرچاوەی زانیاریی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەكان پیشان دەدات.

| سەرچاوەی زانیاریی | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| پەیامنێر و راسپێردراوی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ | ٥٣ | ٦٨, ٨ | یەكەم |
| ئاژانسەكان | ٣ | ٣, ٩ | سێیەم |
| میدیا ناوخۆییەكان | ١٠ | ١٣ | دووەم |
| بەرپرسی حكومی | ١ | ١, ٣ | چوارەم |
| بەبێ سەرچاوە | ١٠ | ١٣ | دووەم |
| كۆیگشتیی | ٧٧ | ١٠٠ | |



### دووەم: شیكار لە ڕووی ناوەڕۆكەوە

## ١- سروشتی بابەتە بڵاوكراوەكان لە ژمارەكانی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ

بەپێی ئەنجامەكان لە هەر نۆ ژمارەكەی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ، كە شیكار بۆ ناوەڕۆكەكانیان ئەنجامدراوە، لە چوارچێوەی (٧٧) بابەتی هەمەجۆر، ڕووماڵ بۆ چەندین پرسی جۆربەجۆر لە كۆمەڵگە كراوە، بەشێوەیەك پرسە سیاسییەكان لە پلەی یەكەم، پرسی ئەدەب و هونەر لەگەڵ ڕیكلام و كاریكاتێر لە پلەی دووەم و پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵاش لە پلەی سێیەم هاتوون. هەرچی پرسەكانی تریش بەڕیزبەندی و بەدوای یەك و بەمشێوەیە هاتوون: ڕۆشنبیریی، كۆمەڵایەتیی و هۆشیاریی تەندروستیی، گەندەڵی و خزمەتگوزاریی، شەهیدان و ئەنفال و پرسە یاساییەكان، كەلەپوور و شوێنەوار، ئایین و وەرزش و تەكنەلۆژیا. بڕوانە خشتەی (٦).

خشتەی (٦): جۆری پرسە ڕووماڵكراوە جیاجیاكان لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ پیشان دەدات.

| جۆری پرسەکانی کۆمەڵگە | دووبارە | ٪ | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| پرسە کۆمەڵایەتییەکان | ٥ | ٦,٥ | پێنجەم |
| پرسە سیاسییەکان | ٢٠ | ٢٦ | یەکەم |
| پرسی گەندەڵی | ٣ | ٣,٩ | شەشەم |
| پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا | ١٠ | ١٣ | سێیەم |
| پرسی ئەدەب و هونەر | ١٢ | ١٥,٦ | دووەم |
| پرسی شەهیدان و ئەنفال | ٢ | ٢,٦ | حەوتەم |
| پرسی هۆشیاریی تەندروستیی | ٥ | ٦,٥ | پێنجەم |
| پرسی خزمەتگوزاریی | ٣ | ٣,٩ | شەشەم |
| پرسی وەرزش | ٠ | ٠ | نۆیەم |
| پرسی کەلەپوور و شوێنەوار | ١ | ١,٣ | هەشتەم |
| پرسە رۆشنبیرییەکان | ٧ | ٩ | چوارەم |
| پرسە ئاینییەکان | ٠ | ٠ | نۆیەم |
| پرسە تەکنەلۆژییەکان | ٠ | ٠ | نۆیەم |
| پرسە یاساییەکان | ٢ | ٢,٦ | حەوتەم |
| پرسی ریکلامەکان و کاریکاتێر | ٧ | ٩ | چوارەم |
| کۆیگشتی | ٧٧ | ١٠٠ | |

## ٢- ڕەنگدانەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

بەپێی ئەنجامەکان: لە پلەی یەکەم باس لە (مەترسی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکان) کراوە، پاشان بابەتەکانی تری، وەک: (بەکارهێنانی ئاژەڵان بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی تاوان)، (نارەزایەتییە کۆمەڵایەتییەکان لەبارەی خراپی شێوازی ژیان) و (توندوتیژی دژ بە ژنان نەبوونی شەڵتەری داڵدەدان).

هەر بۆ نموونە لەبابەتێک بە ناونیشانی: (عێراق .. لە ساڵی ٢٠٠٣ دا نزیکەی ٤٠ هەزار کەس ئالوودەبوون بە مادده هۆشبەرەکان)، کە لە بەشی سەرەوەی لای ڕاستی بەرگی سەرەکی یەکێک لە لاپەرەکان بڵاوکراوەتەوە، باس لە بەرزی ڕێژەی ئالوودەبوونی گەنجانی عێراق و هەرێمی کوردستان بە مادده هۆشبەرەکان دەکات لە (٢٠٠٣) دەکات و بە (٤٠) هەزار گەنج مەزەندەی کردووە، کە تەمەنیان لەنێوان (١٨-٢٥) ساڵدایە و لە (٢٠٠٦) ڕێژەکە گەیشتووە بە (١٣٠) هەزار کەس، لە هەرێمی کوردستانیش لە (٢٠٠٦) سەرووی هەزار کەس ئالودەی مادە هۆشبەرەکان بووە.

لەبەشی خوارەوەی ژمارەیەکی تری ڕۆژنامەکە و لە بەشی لە ناوەڕاستی لاپەرەکە، چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەکە لەگەڵ بازرگانێکی مادەی هۆشبەر بەناونیشانی: (لە شاری سنە

لەسنوری سەرپێڵی زەهابەوە , خانەقین و بەغداد نووقمی مادده بێهۆشکەرەکان دەکەین) هاتووە و باس لەوەدەکات لە ئەفغانستان و پاکستانەوە ئەو مادانەیان پێدەگات و دەیهێنن بۆ عێراق.

هەر لەلاپەڕە یەک بەشی ڕاستی سەرەوەی یەکێکی تر لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکە، وێنەی خەتەنەکردنی کچە منداڵێک لە گەرمیان دانراوە لە لایەن ڕۆژنامەنووسێکی ئەمەریکی گیراوە لە یەکێک لە گوندەکانی گەرمیان و باس لەوەدەکات هێشتا ئەو دیاردەیە لە بەشێک لە گوندەکان هەر ماوە و لە لاپەڕە چواریش ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل لەوبارەوە ئامادەکراوە.

هەروەها یەکێکی تریش لەو بابەتانەی گرنگی پێدراوە، بریتییە لە پرسی توندوتیژی بەرامبەر ژنان و ڕۆژنامەکە بەناونیشانی سەرەکی لە لاپەڕە یەک نووسیویەتی: (بەپێی ئامارێکی بەڕێوەبەرایەتی بەدواداچوونی توندوتیژی دژی ژنان لە گەرمیان (٩٩٪) ئەنجامدەرانی توندوتیژی دژ بە ژنان لە گەرمیان دەستگیرکراون) لەوبارەوە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل ئامادەکراوە، کە بریتییە لە خستنەڕووی ئامارێکی حەوت مانگی ڕووداوەکانی توندوتیژی لەناوچەکە بەرامبەر بە ژنان و بەدواداچوونی لایەنەی پەیوەندیدار بۆ (١٥٦) حاڵەتی توندوتیژی. بڕوانە خشتەی (٧).

خشتەی (٧): ڕەنگدانەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسە کۆمەڵایەتییەکان | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| مەترسی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکان | ٢ | ٤٠ | یەکەم |
| بەکارهێنانی ئاژەڵان بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی تاوان | ١ | ٢٠ | دووەم |
| ناڕەزایەتییە کۆمەڵایەتییەکان لەبارەی خراپی شێوازی ژیان | ١ | ٢٠ | دووەم |
| توندوتیژی دژ بە ژنان و نەبوونی شەڵتەری داڵدەدان | ١ | ٢٠ | دووەم |
| کۆیگشتیی | ٥ | ١٠٠ | |

### ٣- ڕەنگدانەوەی پرسە سیاسییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

چەندین بابەتی سیاسیی ڕۆژ ڕوومال و شرۆڤەیان بۆ کراوە. دیاریترینیان لە پلەی یەکەم (هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان- ٢٠٠٩)، پاشان لە پلەی دووەم کۆمەڵێک بابەتی تر هاتووە: (دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت)، (باڵباڵێن و دوورخستنەوەی ئەندامان لە ڕیزەکانی حیزب)، (پێویستی پابەندبوون بە ڕێککەوتنی نێوان حیزبەکان)، (تەخوینکردنی ڕا جیاوازەکان لەبارەی بەشداریی لە پرسە دیموکراتییەکان)، (ناڕەزایەتی بەرامبەر سیاسەتی ئەمەریکا لە عێراق)، (نرخاندنی ڕۆڵی سەرکردەی حیزبەکان)، (دامەزراندنی حیزبی نوێ)، (پرسە سیاسییەکان لە پارچەکانی تری کوردستان)،

(ناوچە جێناكۆكەكان)، (پەراوێزخستنی گەرمیان لە پۆستە باڵاكانی هەرێمی كوردستان)، (جیاكاریی لەنێوان شایستەی پێشمەرگە دێرینەكان)، (كابینەی حكومەت) و (بە پارێزگاكردنی گەرمیان).

چەندین بابەتی جۆربەجۆر لە ئاستی ناوچەیی و هەرێمی كوردستان و عێراق بەرچاو دەكەوێت

وتارێك لەبارەی (پێڵاوەكەی ئەلزەیدی و هەڵوێستەكان)، لە بەشی سەرەوەی لاپەڕە یەك لەلای چەپ ریكلامی بۆكراوە و لە بەشی چەپی لاپەرە (١٢) و كۆتایی هاتووە. باس لە رووداوی پێڵاوتێگرتنی (جۆرج دەبلیو بووش، سەرۆكی ویلایەتەیەكگرتووەكانی ئەمەریكا) دەكات لەكاتی كۆنگرەی رۆژنامەنووسیی لەگەڵ (نوری كامل ئەلمالیكی، سەرۆكوەزیرانی عێراق) لە بەغداد، كە لەوكاتەدا رۆژنامەنووسێك بەناوی (مونتەزر ئەلزەیدی) پێڵا□وەكانی دەگرێتە سەرۆكی ئەمەریكا. هەروەها هەڵوێستی هەندێك لایەنی عێراقی و عەرەبی بەنموونە هێناوەتەوە، كە رووداوەكە بە سەرەتای كۆتایی ئەمەریكا لە عێراقیان داوەتەقەڵەم.. نووسەر پێیوایە ئەوان بە هەڵەداچوون و لێكدانەوەكانیان بە مەهزەلە ناودەبات و پێیوایە ئەوكارە پێچەوانەی پەیامی كاری رۆژنامەنووسیشە و تەنها ئەو كەسە و هاندەر و بەرنامەدارێژەرانی كارەكە لێی بەرپرسیارن.

رۆژنامەكە ناونیشانی سەرەكی لاپەرە یەكی یەكێك لە ژمارەكانی تەرخانكردووە بۆ ئەنجامی راپرسییەك لەبارەی دەنگی لایەنەكان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستان (٢٠٠٩) و نووسیویەتی: لە راپرسیەكدا سەبارەت بە هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستان.. (٣١٪)ی گەرمیانییەكان دەنگ بە لیستی نەوشیروان مستەفا دەدەن. (٢٥٪) دەنگ بە لیستی یەكێتی و پارتی و (٢١٪)یش بەشداری هەڵبژاردن ناكەن.

بابەتەكە هیچ وێنەیەكی لەگەڵدا نییە و راپرسیەكی رۆژنامەكەیە لەبارەی بەشداریی و دەنگدانی خەڵكی ناوچە جیاجیاكانی گەرمیان لە هەڵبژاردنی ( ١٩ی ئایاری ٢٠٠٩)ی پەرلەمانی كوردستان.

هەروەها لە بابەتێكی دیكەدا؛ رۆژنامەكە چاوپێكەوتنێكی بەناونیشانی: (عوسمان بانی مارانی: تائێستا یاسا سەروەر نییە لەكوردستاندا) بڵاوكردووەتەوە.

بابەتەكە دیدارێكە لەگەڵ سەرۆكی فراكسیۆنی سەوز لە پەرلەمانی كوردستان، باس لە خراپی دۆخی حوكمرانی لە هەرێمی كوردستان و نەبوونی سوپای نیشتیمانی و نەبوونی سەروەری یاسا و خراپی حزمەتگوزاریی و كێشەكانی بواری كشتوكاڵ و وەرگرتنی قوتابیان لە زانكۆكان كردووە و بەراوردیشی كردووە، كە عێراق لە كەمترین كات ئەو قۆناغەی تێپەڕاندووە.

بابەتێکی تریش لە چوارچێوەی هەواڵێکی ڕۆژنامەنووسیی بەناونیشانی: (چوار کارگێڕی لقی گەرمیانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان دوور دەخرێنەوە) هاتووە، لێدوانی لەگەڵدایە و باس لەوەدەکات بەهۆی یاداشتی ڕەخنەئامێز لە گەندەڵییەکانی کۆمەڵەی خوێندکاران ئەو بەرپرسە حیزبیانە دوورخراونەتەوە و هۆکارەکەشی بۆ تەکەتولات گەڕاندووەتەوە.

ڕۆژنامەکە دیدارێکی لەگەڵ بەرپرسی لقی پارتی دیموکراتی کوردستان لە گەرمیان بەناونیشانی: (دژوار فایەق: دەبێت ئەندامانی یەکێتی پابەندی ڕێکەوتننامە ستراتیژییەکەی پارتی و یەکێتی بن) بڵاوکردووەتەوە. باس لەوەدەکات نابێت دروستبوونی لیست لەلایەن نەوشیروان مستەفا ببێتەهۆی پەرتکردنی ڕێککەوتننامەی ستراتیژی نێوان یەکێتی و پارتی و دەبێت ئەندامان و بەرپرسانی هەردوو حیزب پێوەی پابەندبن.

لای چەپی بەشی سەرەوەی یەکێک لە ژمارەکانیش وتارێک بەناونیشانی: (ئێوە چەند ڕێز لە بیرو ڕای جیاواز دەگرن!!) هاتووە و وێنەی نووسەری لەگەڵدایە. باس لەوەدەکات، کە بەرپرسانی یەکێتی و پارتی هەرکەس بەشداریی هەڵبژاردن نەکات پلانی ناحەزان وەشفدەکەن و تێناگەن لە ناڕەزایەتیی و هەڵوێستی مەدەنی و داهات و ئیمتیازی وڵات دەبەن.

ناونیشانی سەرەکی لاپەڕە یەک تەرخانکراوە بۆ چاوپێکەوت لەگەڵ سەرۆکی پێشووتری پەرلەمانی کوردستان، بەناونیشانی: (گەر پارتی و یەکێتی چارەی ناڕەزایەتییەکان نەکەن، چارەیان دەکات). (جەوهەر نامق سالم، سەرۆکی پێشووتری پەرلەمانی کوردستان) باس لەوە دەکات یەکێتی و پارتی دەبێت ئاوڕ لە گلەیی و کێشە و گرفتەکانی خەڵک بدەنەوە. فاکتەری دەرەکی هاوکار نییە لەگەڵ خەونی کورد و دەسەڵات دابڕاوە لە خەڵکی کوردستان. چاوپێکەوتنەکە وێنەی لەگەڵ نییە و درێژەکەی لە لاپەڕەکانی ناوەوە هاتووە و لەوێ وێنە بەکارهاتووە.

هەر لە بەشی سەرەوەی ڕۆژنامەکە لای چەپ دیدارێک لەگەڵ (سالار مەحمود، کارگێڕی مەڵبەندی خانەقینی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، بەناونیشانی: (ئەوانەی زەروورەتی تاڵەبانی نادیدە دەگرن، وەک ئەوانە وان کە بایەخی نەوشیروان بۆ یەکێتی و کوردستان بەهەند وەرناگرن) بڵاوکراوەتەوە.

هەواڵێکی وەرگیراویش بەبێ وێنە و لێدوان، بەناونیشانی: (شیوعیە دێرینەکانی گەرمیان بە دروستبوونی (یەکێتی چەپی کوردستان) گەشبینن) هاتووە و باس لە دروستبوونی ئەو ڕوتە لەناو حیزبیی شیوعی دەکات.

هەر لە بەشی خوارەوە لای ڕاستیش کورتەی دیدارێکی ڕۆژنامەکە بەناونیشانی: (ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵی ئیسلامی: لیستەکەی نەوشیروان مستەفا دەتوانێت

ئاراستەی هەڵبژاردنەکان بگۆڕێت) بڵاوکراوەتەوە.

سەربارى ئەوەش لە لاپەڕەی کۆتایی ڕۆژنامەکە، وتارێک لای ڕاست و بە دانانی وێنەی نووسەر و بەناونیشانی: (دواخستنی هەڵبژاردن ترسە لە دۆڕان؟ یان شتی تر) هاتووە و باس لە ترسی پارتی و یەکێتی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان دەکات.

هاوکات لای ڕاست دوا لاپەڕەی ڕۆژنامەکەش وتارێک، بەناونیشانی: (یەکگرتوو-یش) هاتووە و باس لەوەدەکات جگە لە لیستی نەوشیروان مستەفا، دەبێت حیساب بۆ پێگەی یەکگرتووش بکرێت و خەڵکێکی زۆر لە گەرمیان لە دەوری ئەو حیزبە کۆبووەتەوە.

لە بەشی خوارەوەی لای ڕاستیش چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەکە، بەناونیشانی: (عەبدوڵڵای مەلا نوری مافناس و ڕۆژنامەنووس: لە کوردستاندا باجی ئازادی بوختیانی ناڕەوایە) هاتووە و باس لە پێویستی گۆڕان و خراپی ڕەوشی دیموکراسی و ئازادی دەکات.

لای خوارەوە بەشی چەپی ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە بابەتێک، بەناونیشانی: (لیستی ئازادی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی زیاتر لە حەوت کورسی بەدەست دەهێنێت) بڵاوکراوەتەوە. دیدارێکە لەگەڵ بەرپرسی یەکێک لەو پێنج حیزبە چەپەی یەکیان گرتووە بۆ پەرلەمانی کوردستان.

لە بەشی سەرەوەی ڕۆژنامەکە بابەتێک بەناونیشانی: (دەنگ ناموسە و نافرۆشرێ) هاتووە، کە بریتییە لە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەکە لەگەڵ سەرنووسەری ڕۆژنامەیەک لە شاری سنە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. باس لەهەڵبژاردنەکانی ئێران و ڕۆڵی کوردانی ڕۆژهەڵات دەکات و وێنەی لەگەڵدایە.

لای چەپی هەمان ژمارەی ڕۆژنامەکە، وتارێک، بەناونیشانی: (سەرخستنی پرۆسەکە گرنگترە) هاتووە و باس لە ناڕێکی دەسەڵاتی یەکێتی و پارتی دەکات و پێیوایە هێشتا کوردستان لە بارودۆخێکی هەستیارە و دەبێت هەموو لایەک بەتایبەت ئەو دوو حیزبە کەشێکی باش بۆ هەڵبژاردن و بەڕێوەچوونی بسازێنن و شەڕ و ململانێ و ناڕەوا نەکەن.

لە ناوەڕاستی لاپەڕە یەکیش دیدارێک، کە وێنەی بەرپرسەکە هاتووە و خاوەنداریەتی بۆ ڕۆژنامەکە دەگەڕێتەوە، بەناونیشانی: (سالار مەحمود، نووسەر و ڕۆژنامەنووس: نیەتێکی ڕاستگۆیانە نیە بۆ چارەسەرکردنی ناوچە دابڕاوەکان) هاتووە و درێژەکەی براوەتە لاپەڕەکانی ناوەوە.

سەروتارێک، بەناونیشانی: (ئێمە و هەڵبژاردن) هاتووە و باس لە پێویستی چاکسازیی و گۆڕانکاری لە بارودۆخی هەرێمی کوردستان دەکات.

هەروەها لای ڕاستیش وتارێکی دیکە، بەناونیشانی: (حیزب و ئینتیما) هاتووە و باس لەوەدەکات، نابێت چاوەڕوانی شتی گەورە بکەین لە حیزبەکان، چونکە تەمەن و

ئەزموونیـان كەمتـرە لەوانـەی ئەورپـا.

لـە ژمارەیەكـی تـری ڕۆژنامەكـە، ناونیشـانی سـەرەكی لاپـەڕە یـەك، كـە هیـچ وێنەیەكـی لەگەڵـدا نییـە، بریتییـە لـە: هۆكارەكـەی حـزب و حكومەتـە .. گەرمیانیـەكان نیگەرانـن لـە نەبوونـی پۆسـتی بـاڵا لـە حكومـەت و حزبدا) هاتـووە. ڕاپۆرتێكـی ڕۆژنامەكەیـە، بـاس لـەوەدەكات گەرمیـان (كـەلار، كفـری و چەمچەمـاڵ) سـەرباری زۆری ژمـارەی دانیشـتووانیان، پۆسـتی باڵایـان لـە حوكمڕانـی هەرێمـی كوردسـتان لەنـاوەوە دەرەوە نییـە.

هـاوكات بابەتێكـی تریش، كـە بریتییـە لـە ڕاپۆرتێكـی ڕۆژنامەكـە، بەناونیشـانی: (٤٢ ڕێكخراو كار لەسـەر بـە پارێزگاكردنـی گەرمیـان دەكـەن) لـە ناوەڕاسـتی لاپەڕەكـە هاتـووە و بـاس لـە پێویسـتی بـە پارێزگاكردنـی گەرمیـان دەكات. بڕوانـە خشـتەی (٨).

خشـتەی (٨): ڕەنگدانـەوەی پرسـە سیاسـییەكان لـە ڕۆژنامـەی (گەرمیانـی ئەمـڕۆ) پیشـان دەدات.

| پرسە سیاسییەكان | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| ناڕەزایەتی بەرامبەر سیاسەتی ئەمەریكا لە عێراق | ١ | ٥ | دووەم |
| دەستوەردانی حیزب لە كاروباری حكومەت | ١ | ٥ | دووەم |
| هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستان (٢٠٠٩) | ٦ | ٣٠ | یەكەم |
| باڵباڵێن و دوورخستنەوەی ئەندامان لە ڕیزەكانی حیزب | ١ | ٥ | دووەم |
| پێویستی پابەندبوون بە ڕێككەوتنی نێوان حیزبەكان | ١ | ٥ | دووەم |
| تەخوینكردنی ڕا جیاوازەكان لەبارەی بەشداریی لە پرسە دیموكراتییەكان | ١ | ٥ | دووەم |
| نرخاندنی ڕۆڵی سەركردەی حیزبەكان | ١ | ٥ | دووەم |
| دامەزراندنی حیزبی نوێ | ١ | ٥ | دووەم |
| پرسە سیاسییەكان لە پارچەكانی تری كوردستان | ١ | ٥ | دووەم |
| ناوچە جێناكۆكەكان | ١ | ٥ | دووەم |
| كاری حیزبی لە هەرێمی كوردستان | ١ | ٥ | دووەم |
| پەراوێزخستنی گەرمیان لە پۆستە باڵاكانی هەرێمی كوردستان | ١ | ٥ | دووەم |
| جیاكاریی لەنێوان شایستەی پێشمەرگە دێرینەكان | ١ | ٥ | دووەم |
| كابینەی حكومەت | ١ | ٥ | دووەم |
| بە پارێزگاكردنی گەرمیان | ١ | ٥ | دووەم |
| كۆیگشتیی | ٢٠ | ١٠٠ | |

## ٤- ڕەنگدانەوەی پرسی گەندەڵی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

لەپرسی خستنەڕووی پرسی گەندەڵی لە پلەی یەكەم و كۆتایی ڕۆژنامەكە باسی لە خراپ دابەشكردنی زەوی و دوكان لە ناوچەی پیشەسازی كەلار كردووە و لە چەند ژمارەیەكی یەك بەدوای یەك بابەتی ڕۆژنامەنووسیی و بەڵگە و داتای لەوبارەوە خستووەتەڕوو.

ناونیشانی سەرەكی یەكێك لە ژمارەكانی ڕۆژنامەكە بریتییە لە: (لەنێویاندا بەرپرسی حیزبی و مامۆستا و خوێندكار و پارێزەر و ڕاوچی هەیە .. لەناوچەی پیشەسازی كەلار (١١٥) دوكان بەنایاسایی دابەشكراوە).

ڕاپۆرتێكی ڕۆژنامەكە و ناوی ئامادەكاری بەسەرەوە نییە، هەروەها هیچ وێنەیەك نەهاتووە و بە پشتبەستن بە سەرچاوە تایبەتەكانی ڕۆژنامەكە ئامادەكراوە. هیچ بەڵگەیەكی لەگەڵدا نییە، باس لەوەدەكات، كە بە پێی كۆنووسی لیژنەی دابەشكردنی زەوی و دوكان و گەراجی ناوچەی پیشەسازیی كەلار لە (٣٠ی ئایاری ٢٠٠٥) جارێك بە لیستێكی شارەوانی، بڕیاردراوە (٧٨٩) دوكان و زەوی بدرێت بە پیشەوەران و جارێكی تریش بە كۆنووسێكی شارەوانی لیستێك ئامادەكراوە (٦٧٤) دوكان و زەوی دابەشكراوە، كەچی (١١٥) دوكان دراون بە خەڵكی ناشایستە. ڕۆژنامەكە داوای پێكهێنانی لیژنە لە شارەوانی دەكات و پێیوایە ئەوەی كراوە گەندەڵییە و تەجاوزكردنە سەر مافی خەڵكی شایستەیە. سەرۆكی شارەوانی لێدوانی بۆ ڕۆژنامەكە داوە و وتویەتی لەپێش من كراوە و ئاگادارنیم ڕاستە یاخوود نا.. بەڵام ڕۆژنامەكە لیستێكی دووردرێژی ناوی سیانی و پیشەی ڕاستەقینەی هەموو ئەو كەسانەی لە لاپەڕە دوو بڵاوكردووەتەوە، كە بە نایاسایی دوكانیان وەرگرتووە.. خەڵكی وەهای تێدایە شەش جار دوكانی وەرگرتووە و زۆرێك لە پیشەوەران بێبەشكراون.

ڕۆژنامەكە بەدواداچوونێكی ڕۆژنامەنووس شەهید (كاوە گەرمیانی) لەبارەی هەمان پرس و بەناونیشانی: داوادەكرێت دۆسییەكە ڕادەستی دادگای سلێمانی بكرێ .. لە ئایندەیەكی نزیكدا بەتۆمەتی گەندەڵی ستافی پێشووی شارەوانیی كەلار بانگهێشتی دادگا دەكرێن) بڵاوكردووەتەوە.

بابەتەكە لە ناوەڕاستی لاپەڕە یەك هاتووە و پاشان درێژەكەی لە لاپەڕە سێ. پەیوەستە بە دۆسیەی گەندەڵی لەناو كاروباری شارەوانی كەلار. لەزاری سەرچاوەیەك لە شارەوانی كەلار باس لەوەدەكات لیژنەی شارەوانیەكانی سلێمانی سەردانی شارەوانی كەلاریان كردووە بەمەبەستی بەدواداچوون لەسەر ئەو قسەوباسانەی لەبارەی گەندەڵی لە شارەوانی دەكرێت.. باسی لەوەشكردووە بەمزوانە ستافی پێشووی شارەوانی بانگهێشتی دادگا دەكرێن و دۆسیەكەیان لە پۆلیسی كەلارە.. هەروەها سەرچاوەیەكیشی لە كۆمەڵەی گەنجە سەربەخۆكانی گەرمیان وەرگرتووە و داوا دەكەن دۆسیەكە ڕادەستی دادگای سلێمانی بكرێت بۆئەوەی چاوپۆشی لە گەندەڵكاران نەكرێت. لێدوانی چەند بەرپرس و چالاكوانێكیش بۆ بەدواداچوونەكە وەرگیراوە و هیچ وێنەیەكی لەگەڵدا نەهاتووە.

هەروەها ڕۆژنامەكە بابەتێكی دیكەی بەناونیشانی: (گەرمیانی ئەمڕۆ.. چەند دۆسیەیەكی تر لە گەندەڵییەكانی شارەوانی پێشووی كەلار ئاشكرا دەكات) بڵاوكردووەتەوە. بابەتە بووەتە ناونیشانی سەرەكی ئەو ژمارەیە و باس لە گەندەڵی و بەهەدەردان لە بواری دابەشكردنی زەوی و تەزویركردن و دابەشكردنی زەوی بەسەر خەڵكی شارەكانی تر و خەڵكانی ناشایستە دەكات. لەكاتێكدا نزیكەی (٢٠٠٠) كرێچی لە شاری كەلار هەبووە. تەنها دوو كەس دەستگیركراوە كەچی ئەوانیش بەكەفالەتی (٢٥) ملیۆن دینار ئازادكراون.

لە بەشی سەرەوەی لای چەپی كۆتا لاپەڕەی یەكێك لە ژمارەكانیش، وتارێك بەناونیشانی: (تا لەمانای بەرپرسیاریەتی بگەن) هاتووە. باس لە گەندەڵییەكانی شارەوانی كەلار و بەرپرساریەتی بەرامبەر نیشتیمان، هاووڵاتیان و دادگا دەكات. بڕوانە خشتەی (٩).

خشتەی (٩): ڕەنگدانەوەی پرسی گەندەڵی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی گەندەڵی | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| دابەشكردنی زەوی و دووكان لە ناوچەی پیشەسازی كەلار | ٣ | ١٠٠ | یەكەم |
| كۆیگشتیی | ٣ | ١٠٠ | |

## ٥- ڕەنگدانەوەی پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ)دا

لە بواری پەروەردە و خوێندنی باڵادا، ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ كاری لەسەر چەندین بابەت كردووە.

لای چەپ و بەشی خوارەوەی لاپەڕە یەكی یەكێك لە ژمارەكانی ڕۆژنامەكەش، بابەتێك بەناونیشانی: (بردنی زانكۆكەی گەرمیان بۆ خانەقین ناڕەزایی گەرمیانییەكانی گەیاندووەتە تروپك) هاتووە. ڕاپۆرتەكە وێنەی كۆلێجی پەروەردەی كەلاری لەگەڵدایە و باس لەو ناڕەزایەتیانە دەكات، كە لەلایەن خەڵكی ناوچەكەوە بەرامبەر بە بیرۆكەی بردنی كامپی سەرەكی زانكۆی گەرمیان كە پاشتر لە (١٤ی نیسانی ٢٠١٠) لە كەلار كرایەوە، بۆ شاری خانەقین دەكات، بۆ ئەو مەبەستەش بۆچوونی لایەنی پەیوەندیدار و هاووڵاتیان وەرگیراوە و پێیانوایە لە ناوچەكەیان هەموو ئامادەكاریی و زەمینەسازییەك بۆ كردنەوەی زانكۆی گەرمیان هەیە.

چەند بابەت و وتارێكی دیكەش لەبارەی پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا لە ڕۆژنامەكە بڵاوكراونەتەوە، لەوانە: وتارێك بەناونیشانی: (پۆلی حەوتەكان گرفتێكی هەمیشەیی پەروەردە)، ستوونێك بەناونیشانی: (دەربارەی زانكۆی گەرمیان)، نووسەر باس لەوەدەكات بەخاترانە زانكۆ لە كۆیە و سۆران كراوەتەوە.. بەڵام لە گەرمیان تا ئەوكاتە زانكۆ نییە سەرباری ئیمزا و كەمپین و لیژنەكاری و سەردان و بەڵێن.. هەروەها باس لە خراپی حوكمڕانی لە حكومەت تا سەندیكای ڕۆژنامەنووسان و فیفتی بە فیفتی دەكات و

بەکارهێنانی کردنەوەی زانکۆکە بۆ بانگەشەی هەڵبژاردن دەزانێت.

هەروەها ناونیشانی سەرەکی لاپەڕە یەکی ژمارە (٣٤)ی ڕۆژنامەکە تەرخانکراوە بۆ هەمان پرس: (٤١) ڕێکخراو: نابێت کردنەوەی زانکۆی گەرمیان وەک بەڵێنی هەڵبژاردن بمێنێتەوە.. لە لاپەڕەی دوو درێژەی بابەتەکە هاتووە و بەیاننامەی هۆشداری و هەڕەشەی ئەو ڕێکخراوانەی بڵاوکردووەتەوە، لە ئەگەری گواستنەوەی زانکۆی گەرمیان لە کەلار، بۆ خانەقین.

هەروەها ڕاپۆرتێکیش بەناونیشانی: (پێویستە لە کەلار کۆلێژی کشتوکاڵ بکرێتەوە) هاتووە و درێژەکەی گواستراوەتەوە بۆ لاپەڕەی (١٠)ی ڕۆژنامەکە.

یەکێکی دیکە لەو بابەتانەی ڕۆژنامەکە بە گرنگییەوە ڕووماڵی کردووە، بریتی بووە لە بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا لە لایەن مامۆستایانی گەرمیان لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستان. بۆئەو مەبەستەش دوو بابەت بەرچاو دەکەون، یەکێکیان بەناونیشانی: فەرهاد قادر دکتۆرا لە بواری ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا بەدەستدێنێت، دووەمیشیان؛ (خوێندکارێکی گەرمیانی ماستەر لە بواری وەرزشدا وەردەگرێت). ڕۆژنامەکە سەرباری بڵاوکردنەوەی ئەو ڕووداوە زانستیانە پیرۆزباییشی ئاراستەکردوون.

ناونیشانی سەرەکی ژمارە (٣٧) ڕۆژنامەکەش تەرخانکراوە بۆ بابەتێک بەناونیشانی: سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان: کردنەوەی زانکۆی گەرمیان نەبووەتە بڕیار. لەو چاوپێکەوتنەدا؛ ئەو بەرپرسە حکومیەی گەرمیان باسی لە کردنەوەی زانکۆی گەرمیان کردووە، هەروەها گۆڕانکاری حیزبی و دەرهێنانی نەوت لەناوچەکەدا.

لە گۆشەی (پەیامی پەیامنێران)، هەواڵێکی کورتی بەناونیشانی: (دەرچووانی پەیمانگای مامۆستایانی کەلار مانگرتنەکەیان شکاند) بڵاوکردووەتەوە. وێنە و لێدوانی لەگەڵدا نییە. باس لەوەدەکات پاش (٤٠) ڕۆژ مانگرتن و خێوەتهەڵدانیان لەبەردەم پەروەردەی گەرمیان و سەردانی پەرلەمانی کوردستان، دەرچووانی دانمەزراو بەڵێنی دامەزراندنیان لە پەرلەمان وەرگرتووە و وەزارەتی پەروەردەش پەیوەندی تەلەفۆنی کردووە بە پەروەردەی گەرمیان و بڕیاریداوە هەموویان دابمەزرێنێت.

ناونیشانی سەرەکی لاپەڕە یەک لە بەشی ناوەڕاست بابەتێک بەناونیشانی: (بەهاوکاری بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی گەرمیان .. لە شاری کەلار بڕوانامە بەخشرایە ٤٠ مامۆستای زمانی ئینگلیزی) هاتووە. هەواڵێکە لەبارەی تەواوبوونی خولێکی بەهێزکردنی زمانی ئینگلیزی بۆ مامۆستایان و وێنەشی لەگەڵدایە.

لە بەشی ڕاست لە لاپەڕەی کۆتایی یەکێک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکە و گۆشەی (Class) وتارێک بەناونیشانی: (قوتابی یان خوێندکار) بڵاوکراوەتەوە. باس لە جیاوازی نێوان ئەو دوو وشەیە دەکات.

هاوکات لای چەپی کۆتا لاپەڕەی یەکێک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەکەش، وتارێک بەناونیشانی: (قوتابخانە یان بەندیخانە) هاتووە و ڕەخنە لە بەرزی دیواری قوتابخانەکان دەکات بەشێوەیەک، وەک بەندیخانەی لیهاتووە بۆ قوتابیان. بڕوانە خشتەی (١٠).

خشتەی (١٠): ڕەنگدانەوەی پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی پەروەردە و خوێندنی باڵا | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| ناڕەزایەتی و داواکاریی بۆ پرسی دامەزراندن | ١ | ١٠ | سێیەم |
| داواکاری بۆ کردنەوەی زانکۆی گەرمیان | ٤ | ٤٠ | یەکەم |
| خولی بەهێزکردنی بۆ مامۆستایان | ١ | ١٠ | سێیەم |
| هۆشیاریی لەبارەی چەمک و زاراوەی پەروەردەیی | ١ | ١٠ | سێیەم |
| بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا | ١ | ١٠ | سێیەم |
| کێشە و گرفتی قوتابخانەکان | ٢ | ٢٠ | دووەم |
| کۆیگشتیی | ١٠ | ١٠٠ | |

## ٦- ڕەنگدانەوەی پرسی ئەدەب و هونەر لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

بەپێی ئەنجامەکان: گرنگیدان بە هونەری هونەرمەندانی کورد لە پلەی یەکەم، بڵاوکردنەوەی شیعری شاعیران و کۆڕی شیعری و دیداری شاعیران لە پلەی دووەم هاتوون، بەدوای ئەوان و لە پلەی سێیەمیش چەندین لایەنی تری هونەریی هاتوون، لەوانە: هونەری هونەرمەندانی بیانی، دەرخستنی توانای هونەرمەندانی میللی، یادکردنەوەی شاعیرانی کۆچکردوو، دەستگیرۆیینەکردنی توانا هونەریی و ئەدەبییەکانی منداڵان و بواری شانۆ.

لەلاپەڕە یەک و لەخوار ناونیشانی سەرەکی بابەتێک، بەناونیشانی: (سەرەڕای نەبوونی پاڵپشتی حکومی گرووپی سۆزی گەرمیان بەردەوامن لە چالاکییەکانیان) بڵاوکراوەتەوە و پاشان درێژەی بابەتەکە لە لاپەڕە نۆ بە ناونیشانی: (جەماوەرێکی زۆر ئامادەی ئاهەنگەکە بوون .. بەبۆنەی سەری ساڵی نوێوە گرووپی موزیکی سۆزی گەرمیان ئاهەنگێکی سازکرد) هاتووە. ڕووماڵێکی ڕۆژنامەکەیە بۆ ئاهەنگێکی ئەو گرووپە میوزیکییە لە شاری کەلار، کە بەهۆی ساڵی نوێی (٢٠٠٩) ئەنجامیانداوە. وێنەیەک لە گرووپە بە گشتی و ئەندامەکانی بە دانە دانە دانراوە و یەک لاپەڕەی تەواوی بەشێوەی ڕەش و سپی بۆ تەرخانکراوە. لەکۆتایی ئاهەنگەکەدا؛ ڕۆژنامەکە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ (کارزان ئیبراهیم، بەڕێوەبەری گرووپ) سازکردووە. باسی لە دامەزراندن و چالاکییەکانیان و گرفتی نەبوونی مۆڵەتی کارکردنی گرووپەکەیان کردووە.

لە کۆتا لاپەڕەی ژمارە (٢٩)ی ڕۆژنامەکە بابەتێکی هونەریی، بەناونیشانی: (ئەنجلینا جولی ناودارترین و بەهرەمەندترین ئەکتەر دادەنرێت) هاتووە، بابەتێکی وەرگێڕانە و دوا

لاپـەڕەی ڕۆژنامەکـە ئامـادەی کـردووە. وێنەیەکـی گـەورەی ئەنجلینـا جولـی لەگەڵدایـە.

لـە لاپـەڕەی کۆتایـی ژمارەیەکـی تـری ڕۆژنامەکـە بابەتێکی دیکـە هاتووە: (مەحمـود جەلەولایی .. لیژنـەی هەڵسـەنگاندنی بەرنامـەی کوردسـتار سـێ سەرسـام دەکات) بـاس لـە ئەزموونـی بەشداریی بەهرەمەندێکی ناوچەکـە لـە بەرنامەیەکـی هونەریـی یەکێـک لـە کەناڵـە ئاسـمانییە کوردییـەکان دەکات.

لـە بەشـی سـەرەوەی لای ڕاسـتی لاپـەڕەی کۆتایـی یەکێـک لـە ژمـارە وەرگیراوەکانـی ڕۆژنامەکە بابەتێکـی دیکـەی هونەریـی، بەناونیشـانی: (٢٧ـهەمین سـاڵیادی کۆچـی دوایـی شـاعیر شـێخ ئەحمـەد شـاکەلی بـەرز ڕاگیـرا) هاتـووە. وێنەیەکـی گـەورە و ڕەنگاوڕەنگـی شـاعیر دانـراوە و بـاس لـە مەراسـیمێک دەکات، کـە بـۆ یـادی کۆچـی دوایـی ئـەو شـاعیرە ئەنجامـدراوە.

لای چـەپ بەشـی خـوارەوەی لاپەڕەکـەش بابەتـی: (سـیما جـاف: زۆر نیگـەران دەبـم کـە خەڵکانێـک ئێـژن باوکـت ئـەم چیرۆکانـەت بـۆ دەنووسـێت) هاتـووە و چاوپێکەوتنێکـی کورتـی ڕۆژنامەکەیـە لەگـەڵ کچـە منداڵێـک، کـە چیـرۆک بـۆ منـداڵ دەنووسـێت و هەندێـک خەڵـک بەتانـەوە پێـی دەڵێـن بەرهەمەکانـی لەلایـەن باوکییـەوە بـۆی دەنووسـرێت و لـە ئاسـتی توانا و تەمەنـی ئـەودا نییـە.

هەروەهـا چاوپێکەوتنێکـی ڕۆژنامەکـە لەگـەڵ ژنـە شـاعیرێک، بەناونیشـانی: (ڤینـۆس فایـەق: قوبـادی جەلـی زادە لـە نرخـی ژنـی کەمکردووەتـەوە) هاتـووە و درێـژەی دیدارەکـە لـە لاپـەڕە (١٠) بڵاو کراوەتـەوە و وێنـەی لەگەڵدایـە.

لـە بەشـی ناوەڕاسـتی لاپـەڕەی کۆتایـی یەکێـک لـە ژمارەیەکـی ڕۆژنامەکـە پارچـە شـیعری: (خەوێکـی سـەوز) بڵاوکراوەتـەوە، کـە بریتییـە لـە بەرهەمێکـی شـاعیر لەتیـف هەڵمـەت و لەسـەر وێنـەی کچێکـی بیانـی نەخشـێنراوە.

هـاوکات ڕۆژنامەکـە چاوپێکەوتنێکـی بـە ناونیشـانی: (عەدنـان کەریـم .. داوای شـیعرەکانی مینەجـاف و شـاکەلی دەکات) لەگـەڵ هونەرمەندێکـی ناوچـەی گەرمیان ئەنجامـداوە و درێژەکەی خسـتووەتە لاپـەڕە شـەش.

لـە بەشـی سـەرەوەی لاپـەڕەی کۆتایـی ڕۆژنامەکـەش بابەتێکـی دیکـە، بەناونیشـانی: (ئیسـماعیل خورماڵـی.. لـە کۆڕێکـی نووسـینگەی کـەلاری کۆمەڵـەی ڕوناکبیـری کۆمەڵایەتـی کەرکوکـدا) هاتـووە و وێنـەی شـاعیرەکەی لەگەڵدایـە.

بابەتێکـی دیکـەش بەناونیشـانی: (شـاعیری لاو جاسـمی ئەحمـەد مـەلا: نیگاکانـی ئـەو فێـری کـردم ئاوێتـەی دنیـای شـیعر ببـم) هاتـووە و بـاس لـە ئەزموونـی شیعرنووسـین لای ئـەو شـاعیرە دەکات.

لای ڕاستی لاپەڕەی کۆتایی ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە بابەتێک، لە قاڵبی وتار و بەناونیشانی: (دەشنێ مۆراد و چەند پرسیارێک..؟) بڵاوکراوەتەوە و وێنەی گۆرانیبێژەکە دانراوە، بەڵام خاوەنداریەتی بۆ خۆیان ناگەڕێتەوە. لە ژمارەیەکی دیکەش بابەتی (دەشنێ.. سەیری کوڕی لەخۆبایی ناکات) هاتووە و زیاتر هەواڵێکی وەرگیراوە لەسەر نوێترین بەرهەمی بڵاوکراوەی ئەو گۆرانیبێژە کوردە و وێنەیەکی نیمچەڕووتیش لەگەڵ هەواڵەکە هەیە.

لە بەشی سەرەوەی کۆتا لاپەڕە بابەتێک، بەناونیشانی: (هەرجارە و گەرمیانییەک)، وێنەی هونەرمەندی بواری شێوەکاریی (عەلی تازەدێی) دانراوە و کورتەیەک لەسەر ژیان و هونەری وێنەکێشانی هاتووە. بڕوانە خشتەی (١١).

خشتەی (١١): ڕەنگدانەوەی پرسی ئەدەب و هونەر لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی ئەدەب و هونەر | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| هونەری هونەرمەندانی بیانی | ١ | ٨,٣ | سێیەم |
| دەرخستنی توانای هونەرمەندانی میللی | ١ | ٨,٣ | سێیەم |
| یادکردنەوەی شاعیرانی کۆچکردوو | ١ | ٨,٣ | سێیەم |
| دەستگیرۆیینەکردنی توانا هونەریی و ئەدەبییەکانی منداڵان | ١ | ٨,٣ | سێیەم |
| بڵاوکردنەوەی شیعری شاعیران | ٢ | ١٦,٧ | دووەم |
| کۆڕی شیعری و دیداری شاعیران | ٢ | ١٦,٧ | دووەم |
| هونەری هونەرمەندانی کورد | ٣ | ٢٥ | یەکەم |
| بواری شانۆ | ١ | ٨,٣ | سێیەم |
| کۆیگشتیی | ١٢ | ١٠٠ | |

## ٧- ڕەنگدانەوەی پرسی شەهیدان و ئەنفال لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

لەسەر پرسی شەهیدان و ئەنفالکراوان تەنها دوو بابەت لە سنوری توێژینەوەکە بڵاوکراوەتەوە و هەردووکیشیان پەیوەستن بە بابەتی هێنانەوەی تەرمی ئەنفالکراوانی گەرمیان لە بیابانەکانی خوارووی عێراق بۆ هەرێمی کوردستان.

یەکەمیان؛ هەواڵێکی تاڕادەیەک درێژە و لە بەشی خوارەوە لاپەڕە یەکی ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە، بەناونیشانی: (ئەندامێکی لیژنەی داکۆکیکار لە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان: بەهۆی نەبوونی بودجەی پێویست، هێنانەوەی ڕوفاتی ١٥٠ ئەنفالکراوەکەی گەرمیان

دوادەكەوێت) هاتووە. ئەو بابەتە تایبەت بە ڕۆژنامەكە ئامادەكراوە. لێدوانی لە ئەندامێكی لیژنەی داكۆكیكار لە كەسوكاری ئەنفالكراوان وەرگرتووە. باس لە هۆكاری دواكەوتنی هێنانەوەی تەرمی ژمارەیەك ئەنفالكراو بۆ گەرمیان دەكات و هۆكارەكەی بۆ نەبوونی بودجەی پێویست و پشووەكانی جەژن دەگەڕێنێتەوە، هەروەها باس لەوەش دەكات گۆڕەكان لە دێی دێبنەی گەرمیان ئامادەكراون و تەنها دروستكردنی گۆڕەپانێك بۆ مەراسیمەكە ماوە.

دووەمیان؛ وێنەیەكی گەورەی (مەسعود بارزانی) سەرۆكی ئەوكاتی هەرێمی كوردستان لە لاپەڕە یەك دانراوە و لە ژێر وێنەكە بەناونیشانێك نووسراوە: (بۆ بارزانی لە بەخاكسپاردنی ئێسك و پروسكی ئەنفالكراوانی گەرمیان بەشداری نەكرد؟)، درێژەی بابەتەكە لە لاپەڕە هەشت هاتووە، زیاتر قسەیەكی ڕۆژنامەوانییە و گلەیی لەوەدەكات دەبوو سەرۆكی هەرێمی كوردستان بەشداریی لە مەراسیمی ناشتنی تەرمی (١٧٨) ئەنفالكراوی گەرمیان بكردایە. بڕوانە خشتەی (١٢).

خشتەی (١٢): ڕەنگدانەوەی پرسی شەهیدان و ئەنفال لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی شەهیدان و ئەنفال | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| هێنانەوەی تەرمی ئەنفالكراوان بۆ گەرمیان | ٢ | ١٠٠ | یەكەم |
| كۆیگشتیی | ٢ | ١٠٠ | |

## ٨- ڕەنگدانەوەی پرسی هۆشیاریی تەندروستیی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

بەپێی ئەنجامەكان: باسكردن لە (مەترسییەكانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز) لە پلەی یەكەم و بابەتەكانی دیكەی، وەك: (پێویستی قەتیسنەكردنی فرمێسك لەكاتی هەستكردن بە گریان)، (مەترسی بەكارهێنانی دەرمان بەبێ ڕێنمایی پزیشك) و (بەختەوەریی لە ژیان) لە پلەی دووەمدا هاتوون.

وتارێك بەناونیشانی: (ئایدز شەڕێكی جیهانی لە سەدەی ٢١ دا لە دژی مرۆڤایەتی) بڵاوكراوەتەوە. لە لاپەڕە یەك ڕیكلامی بۆ كراوە و لە لاپەڕە حەوت درێژەكەی هاتووە. وێنەی منداڵێك دانراوە و چاوەكانی شاردراوەتەوە. باس لە یەكی دیسەمبەر ڕۆژی جیهانی ئایدز و مەترسییەكانی ئەو مەترسییەكانی لەسەر كۆمەڵگە و ئامارەكان و هەڵكشانی ڕێژەی تووشبوون و نیشانەكانی نەخۆشییەكە دەكات.

بابەتێكی دیكە لە بواری هۆشیاری تەندروستی، بەناونیشانی: (ئەگەر هەستت بە گریان كرد فرمێسكەكانت قەتیس مەكە) بڵاوكراوەتەوە. بابەتێكە هەرچەندە وەرگێڕانە، بەڵام هیچی وەهای لەسەر نەنووسراوە، باس لەوە دەكات بەپێی ئەنجامی توێژینەوەكان و بۆچوونی زانایانی دەروونی وەها باشترە لەكاتی هەستكردن بە گریان، مرۆڤ بگری و فرمێسكەكانی قەتیس نەكات، چونكە لەگەڵ فرمێسكەكان ئازار و خەفەت و تووڕەیی لە جەستەدا بەتاڵ دەبێتەوە.. هەروەها باسی لە سوودەكانی گریانیش كردووە. بابەتەكە وێنەی ژنێكی بیانی لەگەڵدایە، كە چاو بە فرمێسكە.

هەروەها بابەتێكی دیكەش لەبارەی مەترسییەكانی بەكارهێنانی هەندێك جۆری دەرمان بەبێ ڕەزامەندی پزیشكان، بەناونیشانی: (مەلا محەمەد ئەمین: بەبێ پسوڵەی دكتۆر حەبی ڤیاگرا حەرامە) هاتووە. ڕاپۆرتێكە لە بەشی ناوەڕاستی لاپەڕە یەك، باس لەوەدەكات بەكارهێنانی حەبی ڤیاگرا لەناو گەنجان ڕووی لە زیادبوون كردووە. بۆئەوەش بۆچوونی مامۆستایانی ئایینی و خاوەن دەرمانخانەكان و دەروونناسان وەرگیراوە.

(مێشوولەیەك دەبێتە ڕێبەری پۆلیس بۆ دەستگیركردنی دزێك) ئەوەش ناونیشانی بابەتێكی ڕۆژنامەكەیە و پێكهاتووە لە چیرۆكێكی ڕاستەقینەیە و ڕۆژنامەكە وەریگێڕاوە، باس لەوەدەكات بەهۆی مێشوولەیەك لە شارێكی فینلەند دزێك لەلایەن پۆلیس دەستگیركراوە.

وتارێكیش بەناونیشانی: (چۆن بەختەوەر دەبیت؟) لە لاپەڕە یەك ڕیكلامی بۆ كراوە و درێژەكەی لە لاپەڕەكانی ناوەوەی ڕۆژنامەكەیە و باس لە بەختەوەری و ئەو هۆكارانە دەكات، كە وەها دەكەن مرۆڤ لە ژیان بەختەوەر بێت. بڕوانە خشتەی (١٣).

خشتەی (١٣): ڕەنگدانەوەی پرسی هۆشیاریی تەندروستیی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی هۆشیاریی تەندروستیی | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| مەترسییەكانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز | ٢ | ٤٠ | یەكەم |
| پێویستی قەتیسنەكردنی فرمێسك لەكاتی هەستكردن بە گریان | ١ | ٢٠ | دووەم |
| مەترسی بەكارهێنانی دەرمان بەبێ ڕێنمایی پزیشك | ١ | ٢٠ | دووەم |
| بەختەوەریی لە ژیان | ١ | ٢٠ | دووەم |
| كۆیگشتی | ٥ | ١٠٠ | |

## ٩- ڕەنگدانەوەی پرسی خزمەتگوزاریی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) دا

بەشێوەیەکی گشتی سێ بابەت بەرچاو دەکەوێت و هەموویان لە پلەی یەکەم هاتوون و بریتیین لە: (داواکاریی خەڵک بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنی بەرپرسان)، (دواکەوتنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان) و (نەبوونی پێداویستی خزمەتگوزاریی لە نەخۆشخانەکان).

لە بەشی چەپی لای خوارەوەی لاپەڕە یەکی ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە، بابەتی: (گەرمیانییەکان داوای جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی حکومەت دەکەن) هاتووە. بریتییە لە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەکەیە لەگەڵ نوێنەری گەنجە سەربەخۆکانی گەرمیان، کە داوای جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانە لە لایەنەپەیوەندیدارەکانی حکومەت دەکەن، لە بواری خزمەتگوزارییە گشتییەکان بە ناوچەکەیان داوە.

لە بەشی ناوەڕاست و لای ڕاستی لاپەڕە یەکی ژمارە (٣٩)ی ڕۆژنامەکە بابەتێک، بەناونیشانی: (دووساڵ بەسەر تەواوبوونیدا تێدەپەڕێت نەخۆشخانە نموونەیەکەی گەرمیان تاوەکو ئێستا نەکراوەتەوە) هاتووە. ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەکەیە و وێنەی بینا تەواونەکراوەکەی لەگەڵدایە و باس لە پێویستی کردنەوەی نەخۆشخانەی شەهید شێرەی نەقیب دەکات. ڕۆژنامەکە دواکەوتنی تەواوکردنی کاری پرۆژەکان لەکاتی خۆیان بەیەکێک لە گرفتەکان دادەنێت، کە ڕووبەڕووی هاووڵاتیانی ناوچەکە بووەتەوە.

هەروەها لە بەشی خوارەوە لاپەڕەکە لای ڕاست بابەتێک، بەناونیشانی: (بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی گشتی کەلار: وەزارەتی تەندروستی وەڵامی داواکارییەکانمان ناداتەوە) بڵاوکراوەتەوە. چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەکەیە لەگەڵ بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی کەلار. باس لە نەبوونی پزیشکی پێویست دەکات سەرباری داواکاریی و نووسراویان بۆ وەزارەتی تەندروستی. بڕوانە خشتەی (١٤).

خشتەی (١٤): ڕەنگدانەوەی پرسی خزمەتگوزاریی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) پیشان دەدات.

| پرسی خزمەتگوزاریی | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| داواکاریی خەڵک بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنی بەرپرسان | ١ | ٣٣,٣ | یەکەم |
| دواکەوتنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان | ١ | ٣٣,٣ | یەکەم |
| نەبوونی پێداویستی خزمەتگوزاریی لە نەخۆشخانەکان | ١ | ٣٣,٣ | یەکەم |
| کۆیگشتیی | ٣ | ١٠٠ | |

**١٠- ڕەنگدانەوەی پرسە ڕۆشنبیرییەكان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا.**

لەبواری پرسە ڕۆشنبیرییەكان، ڕۆشنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ گرنگی بە ڕووماڵی چەندین پرس و بابەتی جۆربەجۆر كردووە.

بابەتێكی ڕۆشنبیری، بەناونیشانی: (ڕێنمایی دەزگای ڕۆیتەرز بۆ پەیامنێران) لە لاپەڕە یەک بەشی ناوەڕاست بۆ خوارەوە ڕیكلامەكەی هاتووە و لە لاپەڕە (١٠) بەشێوەی وتار نووسراوە.

لە لاپەڕە یەكی ژمارە (٣١)ی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ، لەبەشی ناوەڕاست تاخوارەوەی لای ڕاستی ڕۆژنامەكە ڕیكلامێک بۆ چاوپێكەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەنووسیی دەزگایەكی چاپكراوی حیزبی، بەناونیشانی: (هۆكاری دەستلەكاركێشانەوەم ئەوەبوو كە ئومێدم بەوە نەما كوردستانی نوێ بەو جۆرە بگرێت كە خەونم پێوە دەبینی) هاتووە و درێژەی بابەتەكە براوەتە بەشی خوارەوەی لاپەڕە شەش.

لە ژمارە (٣٥)ی ڕۆژنامەكە، ناونیشانی سەرەكی لاپەڕە یەک بریتییە لە بابەتێک، بەناونیشانی: (شێخ سەعید شاكەلی ڕاوێژكاری وەزارەتی ڕۆشنبیری: كار بۆ دامەزراندنی دەزگایەكی چاپەمەنی دەكەین بۆ گەرمیان). پووختەی بابەتە خۆی لە یاداشتنامەیەک دەبینێتەوە، كە دراوەتە ڕۆژنامەكە و باسی ناوەڕۆكەكەی دەكات.. وێنەی ئەو بەرپرسە بە گەورەی دانراوە، كە خاوەندارێتی وێنەكە بۆ خودی ڕۆژنامەكە دەگەڕێتەوە.

هەروەها ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ بە ستوونێكی ڕۆژنامەنووسیی، وەڵامی ڕۆژنامەیەكی دیكەی چاپكراوی داوەتەوە، كە لە گەرمیان دەردەچێت، بەناونیشانی: (وەڵامێک بۆ وڕێنەكانی ڕۆژنامەی گەرمیان پۆست). باس لەوەدەكات تۆمەتەكانی نێو بابەتێكی ئەو ڕۆژنامەیە، كە بێلایەنی ئەوان دەخاتە ژێر پرسیار و گومان، ڕاستنییە و ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ ڕۆژنامەیەكی تەواو سەربەخۆیە.

هەر لە ڕۆژنامەكەدا؛ لە بەشی سەرەوەی لای چەپی لاپەڕە یەک، ڕیكلام بۆ چاوپێكەوتنێک لەگەڵ وەزیری ڕۆشنبیریی ئەوكات هاتووە، وێنەیەكی وەزیر و ناونیشانێک نووسراوە: (فەلەكەدین كاكەیی: گەنجانی گەرمیان كتێب سوتێنەر نین، بەڵكو كتێبیان دەوێ)، درێژەی چاوپێكەوتنەكە خراوەتە لاپەڕەی دواتر.

هەروەها ڕۆژنامەكە لە بەشی خوارەوەی لاپەڕە یەكی یەكێک لە ژمارەكان، هەواڵێكی كورتی لەبارەی كردنەوەی بارەگاكەیان لە كەلار، بەناونیشانی: (كەلار ... نووسینگەی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ كرایەوە) بڵاوكردووەتەوە. وێنەیەكیش لەگەڵ هەواڵەكە دانراوە، كە بریتییە لە مەراسیمی كردنەوەی نوسینگەی ڕۆژنامەكە. بڕوانە خشتەی (١٥).

خشتەی (١٥): ڕەنگدانەوەی پرسە ڕۆشنبیرییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسە ڕۆشنبیرییەکان | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| بڵاوکردنەوەی ڕێنمایی کارکردن بۆ ڕۆژنامەنووسان | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| پێویستی چاکسازیی لە بواری کاری ڕۆژنامەوانیی حیزبیی | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| کردنەوەی چاپخانە لە گەرمیان | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| وەڵامکاریی ناوەندی ڕۆژنامەنووسیی گەرمیان | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| ڕۆڵی میدیا لە کۆمەڵگە | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| سووتاندنی کتێبی ڕۆشنبیران و نووسەران | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| مەراسیمی کردنەوەی بارەگای ڕۆژنامە | ١ | ١٢, ٣ | یەکەم |
| کۆیگشتیی | ٧ | ١٠٠ | |

### ١١- ڕەنگدانەوەی پرسە یاساییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

ڕۆژنامەکە بابەتێکی بەناونیشانی: (پێنج گەڕەکی کەلار بە تەجاوز دروستکراون) بڵاوکردووەتەوە و لەوبارەیەوە چاوپێکەوتنێکی کورتی لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی کەلار ئەنجامداوە. ڕۆژنامەکە باس لەوە دەکات دیاردەی زیادەڕەوی بۆ سەر موڵکەکانی حکومەت زیادیکردووە و پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان سنورێکی بۆ دابنێن.

لە گۆشەی (پەیامی پەیامنێران)یش هەواڵێک، کە وێنەی لەگەڵ نییە، لە بەشی خوارەوەی لای چەپی ڕۆژنامەکە، بەناونیشانی: (دەربەندیخان مەڵبەند دەست وەردەداتە کاروباری تەندروستی) هاتووە. بابەتەکە لەلایەن پەیامنێری دەربەندیخان بەبێ هەبوونی ناو بڵاوکراوەتەوە. باس لەوە دەکات وەزارەتی تەندروستی لیژنەی بۆ هاوکاریکردنی نەخۆشانی دڵ و مێشک و خوێن و شێرپەنجە پێکهێناوە، بەڵام مەڵبەند نوێنەری خۆی خستووەتە ناو لیژنەکەوە و بەبڕوای ڕۆژنامەکە ئەو کارە نایاساییە.. بەپێی وتەی سەرچاوەیەکیش ڕاستە کەسی حیزبی تێدایە، بەڵام بۆ هاوکاری ئەوان هاتووە، نەک نوێنەری حیزب. بڕوانە خشتەی (١٦).

خشتەی (١٦): ڕەنگدانەوەی پرسە یاساییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسە یاساییەکان | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| سەروەرنەبوونی یاسا | ١ | ٥٠ | یەکەم |
| زیادەڕەویی بۆ سەر موڵکەکانی حکومەت | ١ | ٥٠ | یەکەم |
| کۆیگشتیی | ٢ | ١٠٠ | |

## ١٢- ڕەنگدانەوەی پرسی ڕیکلام و کاریکاتێر لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

ڕۆژنامەکە چەندین کاریکاتێر و ڕیکلامی بڵاوکردووەتەوە و لە پلەی یەکەم گرنگی بە دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت داوە.

ڕۆژنامەکە ڕیکلامی بۆ خۆی، بەناونیشانی: (دەنگی ئازاد و وشەی بوێر) کردووە، هەروەها چەندین ڕیکلامی بازرگانیشی بڵاوکردووەتەوە، لەوانە: (پەیمانگەی گەرمیان بۆ پەرەپێدانی زمان و پرۆگرامەکانی خوێندن)، (ڕێکخراوی خێرخوازی گەرمیان).

هەروەها ڕۆژنامەی گەرمینی ئەمڕۆ چەندین کاریکاتێری لەسەر بارودۆخی ئەو سەردەمی حوکمڕانی و بەڕێوەبردن لە گەرمیان و هەرێمی وردستان بڵاوکردووەتەوە و هەموویان لەلایەن کاریکاتێریست (ئەحمەدی خۆشنووس) کێشراون، بۆ نموونە: لەبارەی بێبەڵێنی کاندیدەکانی هەڵبژاردن، دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت، پشتکردنی بەرپرسان لە بواری ڕۆشنبیری و رووکردنە بازرگانی لەبیرکردنی خەمی ناوچە جێناکۆکەکان. بڕوانە خشتەی (١٧).

خشتەی (١٧): ڕەنگدانەوەی پرسی ڕیکلام و کاریکاتێر لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی ڕیکلام و کاریکاتێر | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| ڕیکلام بۆ ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ | ١ | ١٤, ٣ | دووەم |
| کاریکاتێر– دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت | ٢ | ٢٨, ٦ | یەکەم |
| کاریکاتێر- بێبەڵێنی کاندیدەکانی پەرلەمان | ١ | ١٤, ٣ | دووەم |
| ڕیکلامی بازرگانی بۆ پەرەپێدانی زمان و کاری خێرخوازی | ١ | ١٤, ٣ | دووەم |
| کاریکاتێر- کتێب لە شاخ و دەفتەر لە شار | ١ | ١٤, ٣ | دووەم |
| کاریکاتێر- لەبیرکردنی خەمی ناوچە جێناکۆکەکان | ١ | ١٤, ٣ | دووەم |
| کۆیگشتیی | ٧ | ١٠٠ | |

### ١٣- ڕەنگدانەوەی پرسی کەلەپوور و شوێنەوار لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) دا

تەنها بابەتێک لە ڕۆژنامەکە لە سەر پرسی شوێنەوار بڵاوکرابێتەوە لە ژمارە (٣٠) دایە، بەناونیشانی: (شوێنەوارەکانی گەرمیان لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچووندا). ئەویش وتارێکە بەشێکی کەمی لە بەشی سەرەوەی لای ڕاستی لاپەڕە یەک هاتووە و هێمای بەوەکردووە درێژەکەی لە لاپەڕە دوو هاتووە. باس لە پەراوێزخستنی ناوچە شوێنەوارییەکانی کفری لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی دەکات، وەکچۆن ئاماژە بە خراپ نۆژەنکردنەوەی پرۆژەی ماڵی مەجید پاشا لەو قەزایەش دەکات و داوای گرتنەبەری ڕێکار لە دژی ئەو لیژنەیەش دەکات کارەکەیان کردووە. بڕوانە خشتەی (١٨).

خشتەی (١٨): ڕەنگدانەوەی پرسی کەلەپوور و شوێنەوار لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پیشان دەدات.

| پرسی کەلەپوور و شوێنەوار | دووبارە | % | ڕیزبەندی |
|---|---|---|---|
| مەترسی لەناوچوونی شوێنەوارەکانی گەرمیان | ١ | ١٠٠ | یەکەم |
| کۆیگشتیی | ١ | ١٠٠ | |

## ئەنجامەکان

### ئەنجامەکانی شیکاری ناوەڕۆك

#### أ- شیکار لە ڕووی شێوە (ڕووخسار)

١. بابەتە ڕووماڵکراوەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) سرووشتی جۆراوجۆریان هەیە. پرسە سیاسییەکان لە پلەی یەکەم هاتوون، پاشان پرسی ئەدەب و هونەر لە پلەی دووەم، دواتریش پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە پلەی سێیەم و بەدوای ئەوانیش هەریەک لە پرسەکانی: وەرزش، پەروەردە و خوێندنی باڵا، پرسە ڕۆشنبیرییەکان، ڕیکلام و کاریکاتێر، هۆشیاریی تەندروستیی، گەندەڵی، خزمەتگوزاریی، کەلەپوور و شوێنەوار، پرسە ئایینییەکان، شەهیدان و ئەنفال پاشان پرسە تەکنەلۆژییەکان.

٢. پلەی یەکەمی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) لە ڕێگەی ژانری (چاوپێکەوتن) بەرهەمهاتوون. لە پلەی دووەمیش ژانری (وتار)، پاشان (هەواڵی کورت)، (ڕیکلام و ڕێنمایی)، (ڕاپۆرتە هەواڵ) و (بەدواداچوون)، لەکۆتاییشدا؛ ژانری (چیرۆکە هەواڵ) هاتووە.

٣. ئەو وێنانەی لەگەڵ بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان بەکارهاتوون لە پلەی یەکەم بریتیین لە (وێنەی هەواڵی)، کە پەیوەستن بەخودی ئەو ڕووداوەی ڕوومال کراوە، پلەی دووەمیش بریتییە لە (وێنەی کەسی)، بەومانایەی وێنەی کەسی و تایبەت لەگەڵ بابەتەکان بەکارهێنـدراوە بەتایبەت وێنەی ئەوانەی بوونەتە پێکهێنەری ڕووداوەکە، لە پلەی سێیەمیش (بەبێ وێنە) هاتووە، واتە هیچ وێنەیەک لەگەڵ بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکە بەکارنەهاتووە، پاش ئەوەش (وێنەی هێمایی)، دواتریش (نەخشە و هێڵکاریی) و هیچ بابەتێکیش زیاد لە ئامرازێکی وێنەی بۆ بەکارنەهاتووە.

٤. سەرچاوەی زانیاریی بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) لە پلەی یەکەمدا؛ بۆ (پەیامنێر و ڕاسپێردراوی ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ) دەگەڕێتەوە، پلەی دووەمیش؛ بۆ (میدیا ناوخۆییەکان)، دواتریش؛ (ئاژانسەکان) و (بەرپرسی حکومی) هاتووە.

٥. خاوەندارێتی زۆرینەی ڕەهای ئەو وێنانەی لەگەڵ بابەتە ڕۆژنامەنووسییەکان بەکارهاتوون بریتیین لە خودی ڕۆژنامەکە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) و لە پلەی دووەمیش ئەو وێنانە هاتوون، کە خاوەندارێتیان بۆ سەرچاوەکانی دیکەی دەرەوەی ڕۆژنامەکە دەگەڕێتەوە.



### ب- شیکار لە ڕووی ناوەڕۆک

١. لە پلەی یەکەم باس ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ ڕووماڵی بۆ پرسی (مەترسی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکان) کردووە، پاشان بابەتەکانی تری، وەک: (بەکارهێنانی ئاژەڵان بۆ دۆزینەوەی سەرەداوی تاوان)، (نارەزایەتییە کۆمەڵایەتییەکان لەبارەی خراپی شێوازی ژیان) و (توندوتیژی دژ بە ژنان نەبوونی شەڵتەری داڵدەدان).

٢. لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ چەندین بابەتی سیاسیی ڕووماڵ و شرۆڤەیان بۆ کراوە، دیارترینیان لە پلەی یەکەم (هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان- ٢٠٠٩)، پاشان لە پلەی دووەم کۆمەڵێک بابەتی تر هاتووە: (دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت)، (باڵباڵێن و دوورخستنەوەی ئەندامان لە ڕیزەکانی حیزب)، (پێویستی پابەندبوون بە ڕێککەوتنی نێوان حیزبەکان)، (تەخوینکردنی ڕا جیاوازەکان لەبارەی بەشداریی لە پرسە دیموکراتییەکان)، (نارەزایەتی بەرامبەر سیاسەتی ئەمەریکا لە عێراق)، (نرخاندنی ڕۆڵی سەرکردەی حیزبەکان)، (دامەزراندنی حیزبی نوێ)، (پرسە سیاسییەکان لە پارچەکانی تری کوردستان)، (ناوچە جێناکۆکەکان)، (پەراوێزخستنی گەرمیان لە پۆستە باڵاکانی هەرێمی کوردستان)، (جیاکاریی لەنێوان شایستەی پێشمەرگە دێرینەکان)، (کابینەی حکومەت) و (بە پارێزگاکردنی گەرمیان).

٣. ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ ڕووماڵی بۆ پرسی گەندەڵییش کردووە و بابەتی (خراپ دابەشکردنی زەوی و دوکان لە ناوچەی پیشەسازی کەلار) لە چەند ژمارەیەکی یەک

بەدوای یەک بابەتی ڕۆژنامەنووسیی و بەڵگە و داتای لەبارەوە خراوەتەڕوو.

٤. لەبواری پرسەکانی پەروەردە و خوێندنی باڵاش ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) لە پلەی یەکەم ڕووماڵی بۆ (داواکاری بۆ کردنەوەی زانکۆی گەرمیان) کردووە، پاشان (ناڕەزایەتی و داواکاریی بۆ پرسی دامەزراندن)، (خولی بەهێزکردنی توانای بۆ مامۆستایان)، (هۆشیاریی لەبارەی چەمک و زاراوەی پەروەردەیی)، (بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا) و (کێشە و گرفتی قوتابخانەکان).

٥. ڕووماڵی پرسی ئەدەب و هونەر لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ)دا پێگەیەکی گرنگی هەبووە، گرنگیدان بە هونەری هونەرمەندانی کورد لە پلەی یەکەم هاتووە، پاشان بڵاوکردنەوەی شیعری شاعیران و کۆڕی شیعری و دیداری شاعیران لە پلەی دووەم هاتوون، بەدوای ئەوان و لە پلەی سێیەمیش چەندین لایەنی تری هونەریی هاتوون، لەوانە: هونەری هونەرمەندانی بیانی، دەرخستنی توانای هونەرمەندانی میللی، یادکردنەوەی شاعیرانی کۆچکردوو، دەستگیرۆیینەکردنی توانا هونەریی و ئەدەبییەکانی منداڵان و بواری شانۆ.

٦. لەسەر پرسی شەهیدان و ئەنفالکراوان تەنها دوو بابەت لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) بڵاوکراوەتەوە و هەردووکیشیان پەیوەستن بە بابەتی هێنانەوەی تەرمی ئەنفالکراوانی گەرمیان لە بیابانەکانی خوارووی عێراق بۆ هەرێمی کوردستان.

٧. پرسی هۆشیاریی تەندروستیی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ)دا ڕەنگدانەوەی هەیە و باسکردن لە (مەترسییەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئایدز) لە پلەی یەکەم و بابەتەکانی دیکەی، وەک: (پێویستی قەتیسنەکردنی فرمێسک لەکاتی هەستکردن بە گریان)، (مەترسی بەکارهێنانی دەرمان بەبێ ڕێنمایی پزیشک) و (بەختەوەریی لە ژیان) لە پلەی دووەمدا هاتوون.

٨. لە پرسی خزمەتگوزاریی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ)دا؛ بەشێوەیەکی گشتی سێ بابەت بەرچاو دەکەوێت و هەموویان لە پلەی یەکەم هاتوون و بریتیین لە: (داواکاریی خەڵک بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنی بەرپرسان)، (دواکەوتنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکان) و (نەبوونی پێداویستی خزمەتگوزاریی لە نەخۆشخانەکان).

٩. لە ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ پرسە ڕۆشنبیرییەکان گرنگی بە ڕووماڵی چەندین پرس و بابەتی جۆربەجۆر بەشێوەی یەکسان دراوە، لەوانە: (بڵاوکردنەوەی ڕێنمایی کارکردن بۆ ڕۆژنامەنووسان، کردنەوەی چاپخانە لە گەرمیان، پێویستی چاکسازیی لە بواری کاری ڕۆژنامەوانیی حیزبیی، وەڵامکاریی ناوەندی ڕۆژنامەنووسیی گەرمیان، ڕۆڵی میدیا لە کۆمەڵگە، سووتاندنی کتێبی ڕۆشنبیران و نووسەران و مەراسیمی کردنەوەی بارەگای ڕۆژنامە).

١٠. لە بواری پرسە یاساییەكان ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) گرنگی بە مەترسی دیاردەی تەجاوزات بۆ سەر موڵك و ماڵەكانی حكومەت بەتایبەت لەبواری زەویوزار كردووە و باسی لە پێویستی لێپێچینەوە لەلایەن لایەنە پەیوەندیدارەكان كردووە، هەروەها (سەروەرنەبوونی یاسا)شی بە كێشەیەكی گەورە لەقەڵەمداوە.

١١. پرسی ڕیكلام و كاریكاتێر یەكێكی ترە لەو بابەتانەی لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) پێگەیەكی بەهێزی هەیە. ڕۆژنامەكە چەندین كاریكاتێر و ڕیكلامی بڵاوكردووەتەوە و لە پلەی یەكەم گرنگی بە دەستوەردانی حیزب لە كاروباری حكومەت داوە، پاشان هەریەك لە: (ڕیكلام بۆ ڕۆژنامەی گەرمیانی ئەمڕۆ، كاریكاتێر- بێبەڵێنی كاندیدەكانی پەرلەمان، ڕیكلامی بازرگانی بۆ پەرەپێدانی زمان و كاری خێرخوازی، كاریكاتێر- كتێب لە شاخ و دەفتەر لە شار و كاریكاتێر- لەبیركردنی خەمی ناوچە جێناكۆكەكان) هاتوون.

١٢. پرسی كەلەپوور و شوێنەوار لە ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) ڕووماڵكراوە و باس لە پەراوێزخستنی ناوچە شوێنەوارییەكانی كفری لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی كراوە، وەكچۆن ئاماژە بە خراپ نۆژەنكردنەوەی پرۆژەی ماڵی مەجید پاشا لەو قەزایەش كراوە و داوای گرتنەبەری ڕێكار لە دژی ئەو لیژنەیەش دەكات كارەكەیان كردووە.

## ڕاسپاردە و پێشنیازەكان

١. دۆزینەوە و بەردەستخستنی تەواوی ژمارەكانی ڕۆژنامەی (گەرمیانی ئەمڕۆ) بۆ خوێنەران و توێژەران و پاراستنیان بەشێوەیەكی گونجاو بە كۆكردنەوەیان لە بەرگێكی شایستە و هەڵگرتنیان لە كتێبخانەكان و ناوەندە ئەرشیفییەكانی هەرێمی كوردستان.

٢. كاركردن بۆ یەكخستنی هەوڵ و توانا ڕۆژنامەنووسییەكانی گەرمیان لەپێناو دەرچوواندنی ڕۆژنامەیەكی شایستە و بەردەوامیدان بە كاروانی ڕۆژنامەنووسیی چاپكراو و بەشداریی ڕۆژنامە لە هێنانەكایەی حكومڕانییەكی تەندرووست و كۆمەڵگەیەكی هۆشیار. لەگەڵ گەرەنتیكردنی پاراستنی پێگەی ڕۆژنامەكە لە سەردەمی جیهانگیریی میدیا و شۆڕشی تەكنەلۆجیای ڕاگەیاندن و پەیوەندیكردن.

٣. دامەزراندنی چاپخانەیەك لەلایەن دەزگاكانی پەیوەندیدارەكانی حكومەتی هەرێمی كوردستان یاخوود سەرمایەداران بۆ چاپكردنی ڕۆژنامە و گۆڤار و كتێب و بڵاوكراوە ڕۆشنبیرییەكان بشێوەی بێبەرامبەر یاخود نرخێكی ڕەمزی.

٤. چاپكردنی هەموو ئەو توێژینەوە زانستییانەی لەبارەی كایەی ڕۆژنامەنووسیی گەرمیان

ئەنجامدەدرێن و دانانی پاداشتی ماددی و مەعنەوی بۆ توێژەران و نووسەرەکانیان.

٥. ئەنجامدانی توێژینەوەی (پەسنی – شیکاریی) بەشێوەی جیا جیا لەبارەی رووماڵی هەر پرسێکی کۆمەڵایەتیی، سیاسیی، ئابووریی و رۆشنبیریی ..هتد لە رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ).

٦. دەکرێت توێژینەوەی زانستیی لەبارەی ئاستی پابەندبوونی رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) بە لایەنە یاسایی و ئێتیکییەکانی پەیوەست بە کاری راگەیاندن ئەنجام بدرێت.

٧. دەشێت توێژینەوەی زانستیی لەبارەی زمان، لایەنی رێنووس و درووستنووسین لە رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) ئەنجام بدرێت.

٨. گرنگە توێژەران کار لەسەر لایەنە هونەرییەکان و دەرهێنانی رۆژنامەنووسیی لە رۆژنامەی (گەرمیان ئەمرۆ) ئەنجام بدەن.

٩. ئەنجامدانی توێژینەوەی بەراوردکاری لە نێوان رووماڵی پرسە جیاوازەکان لە رۆژنامەی (گەرمیانی ئەمرۆ) لەگەڵ ئەو رۆژنامانەی ئەو سەردەمە لە گەرمیان دەرچوون یان پێش ئەوکات دەرچوێنراوەکان

## پاشكۆ

١٠. توێـژەر بـە پێویسـتی دەزانێـت هەندێـك لـەو لاپەڕانـەی ڕۆژنامـەی (گەرمیانـی ئەمـڕۆ) بەتایبـەت لاپـەڕی یەكـەم لێرەدا بخاتـەڕوو. لـە چوارچێـوەی سـنوری كاتـی توێژینەوەكـە كاریـان لەسـەر كـراوە.



# لیستی سەرچاوەکان

بۆ نووسینی لایەنی تیۆریی ئەم توێژینەوەیە سوود لە کۆمەڵێک سەرچاوە وەرگیراوە، لە دیارترینیان:


1. Admin: Importance of Journalism, web Site Name: (assignmentpoint), Date of entry: (12- 5- 2023). https://assignmentpoint.com/importance-of-journalism/
2. Aveek Pal Chaudhuri: A career in Journalism in India Course, Scope and Salary, web Site Name: (higher education review), (20-2-2023).

https://www.thehighereducationreview.com/news/a-career-in-journalism-in-india-course-scope-and-salary-nid-972.html

3. Lisa McQuerrey: What Are the Advantages of Being a Journalist?, Web Site Name: (chron), (15-3-2023).

https://work.chron.com/advantages-being-journalist-10341.html

4. Janine Dellinger, David White, and Jenna Clayton: Journalistic Writing Style | Definition, Features & Examples, and Web Site Name: (study.com), (11-2-2023).

https://study.com/academy/lesson/journalistic-writing-characteristics-functions.html

5. Thomas Ernste: The enduring importance of newspaper journalism in a networked




پ. ی. د .شێروان عومەر ڕشید

کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان/زانکۆی سلێمانی

ئەژین کەریم محەمەد

کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکان/

زانکۆی سلێمانی


# هەڵسەنگاندنی خزمەتگوزارییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان بۆ چالاکییە خۆشگوزەرانیەکان لە شاری کەلاردا


## پوختە

ئەم توێژینەوەیە بە ناونیشانی (هەڵسەنگاندنی خزمەتگوزارییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان بۆ چالاکییە خۆشگوزەرانیەکان لە شاری کەلاردا) ئامانج لێی دەرخستنی شێوازی دابەشبوونی خزمەتگوزارییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکانە لە شاری کەلاردا، هەروەها هەلسەنگاندنی ئاستی ئەم خزمەتگوزارییانە لە ئێستادا و خەمڵاندنی پێداویستییەکانی شارەکە بۆ ئەم خزمەتگوزارییانە لە داهاتوودا. بۆ گەیشتن بە ئامانجی توێژینەوەکە، لە سەرەتا کۆکردنەوەی داتا لە ڕێگەی سەرچاوەی فەرمی و ڕێکخراوەکان ئەنجامدراوە، پاشان دەرخستنی ئەنجامەکان لە شێوەی خشتەی جۆراوجۆر، هەروەها وەرگرتنی داتای شوێنی ناوەندەکان لە ڕێگای بەکارهێنانی بەرنامەکانی (Google pro earth) و دووبارە ڕێکخستن و نیشاندانیان بەشێوەی نەخشە لە ڕێگەی بەکارهێنانی سیستەمی زانیارییە جوگرافییەکان (GIS)، دواتر هەڵسەنگاندنی ئاستی ئەم خزمەتگوزاریانە و مەزەندەکردنی پێداوستییە چاوەڕوان کراوەکان بە پێی پێوەرە ستانداردەکان بۆ هەریەکەیان خراونەتەڕوو. لە کۆتایدا توێژینەوەکە گەیشتوە بە کۆمەڵێک دەرئەنجام کە هەندێک لە خزمەتگوزارییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان لە شاری کەلاردا کەمترە لە پێوستی شارەکە بە پێی ستانداردە جیهانیەکان، بۆنمونە ئێستادا (2) کتێبخانە بوونی هەیە، هەرچەندە بەپێی پێوەر بڕی (4) کتێبخانەی دیکە پێویستە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی دانیشتوان، هەروەها تا ڕادەیەک ناهاوسەنگی هەیە لە دابەشبوونی ئەم خزمەتگوزاریانە

لە شارەکەدا. لەگەڵ خستنەڕووی چەندین پێشنیار لەوانە هەوڵدان بۆ دروستکردنی پلانێکی ستراتیجی مامناوەند و درێژخایەن لە بواری خۆشگوزەرانی پشتبەستن بە گەشە و زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی شاری کەلار بە شێوەیەک کاربکرێت بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییان بۆ خزمەتگوزارییەکان، سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی خزمەتگوزارییەکان بۆ فەراهەمکردنی هاوسەنگی دابەشبوونی خزمەتگوزارییەکان لەسەرجەم ناوچەکانی شارەکەدا.

کلیلی ووشەکان: خزمەتگوزاری، خۆشگوزەرانی، پێوەرەکانی هەڵسەنگاندن.

## پێشەکی

لە سەر ئاستی جیهاندا خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان گرنگی زۆری پێدەدرێت، هەروەها لە نێوان چالاکیە ئابووریە جۆربەجۆرەکانی تردا بایەخی تایبەتی هەیە، چونکە هۆکارێکی گرنگە لە پێشکەوتنی هەر ناوچەیەک یان دواکەتنی لە کاتی نەبوون یان خراپی ئاستی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکاندا، ئەمەش بە هۆکاری ئەوەی ئەم خزمەتگوزاریانە هۆکارێکی گرنگە بۆ بەسەربرنی کاتێکی خۆش و ئەنجامدانی ئەو چالاکیانەی کە ئارەزووی دەکات، هەروەها دەبێتە هۆی بووژانەوەی ئابووری لە ڕێگەی ڕەخساندنی هەلی کارکرن بۆ هاوڵاتیان لە ناوەندە خۆشگوزەرانیەکاندا. بۆیە دەکرێت لە ڕێگەی گرینگیدان بەم خزمەتگوزاریەوە گەشە بە کۆمەڵگا بدرێت لە سەرجەم لایەنەکانی دەروونی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات بۆهەڵسەنگاندنی خزمەتگوزاریە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان بۆ چالاکیە خۆشگوزەرانیەکان لە شاری کەلار لەڕێگەی دەرخستنی پاڵنەرەکانی داواکاری لەسەر ئەم خزمەتگوزاریە لە ناوچەکەدا، بەمەبەستی دروستکردنی چەندین پێشنیاری بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و پێشخستنیان لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی ئاستی خزمەتگوزاریەکان و زۆرکردنی خزمەتگوزاریەکان لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە وە پیشکەشکردنی پێشنیارە ستراتیجیەکان لە پێناو پێشخستنی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان لە ناوچەی لێکۆڵینەوە.

## یەکەم: گرنگی توێژینەوەکە

- شێوەیەکی ئەکادیمی هەڵسەنگاندن بۆ خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان دەکات، کە ڕێگەیەیەوە گەیشتووین بە چەندین دەرئەنجام و ڕاسپاردەی زانستی بۆ پێشخستنی کەرتی خۆشگوزەرانی لە ناوچەی لێکۆڵینەوە.
- گرنگیدان بە پێشخستنی کەرتی خۆشگوزەرانی هۆکارێکی سەرەکیە بۆ پارستنی ژینگە و پێشخستنی کۆمەڵگا لەڕووی دەروونی و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیرییەوە.

### دووەم: ئامانجی توێژینەوەكە

- دەرخستنی شێوازی دابەشبوونی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەكان لە شاری كەلاردا.
- هەڵسەنگاندنی ئاستی خزمەتگوزارییەكان لە ئێستادا و خەمڵاندنی پێداویستییەكانی شارەكە بۆ ئەم خزمەتگوزاریانە لە داهاتوودا.

### سێیەم: كێشەی توێژینەوەكە

گرفتی لێكۆڵینەوەكە بریتیە لە كەمی و نارێكی لە دابەشبوونی خزمەتگوزاری رۆشنبیری و وەرزشییەكان لە شاری كەلاردا، بەتایبەت دوای زیادبوونی داواكاری لەسەر ئەم خزمەتگوزاریانە بە هۆی زیادبوونی ژمارەی دانشتوان و گەشەسەندنی لایەنی ئابووری.

### چوارەم: گریمانەی توێژینەوەكە

- بوونی چەندین توانستی سروشتی و مرۆیی كە پاڵنەرن بۆ داواكاری لەسەر خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانییەكان لە شاری كەلاردا.
- خزمەتگوزاریە رۆشنبیری و وەرزشییەكان لە شاری كەلاردا لە رووی ئاست و دابەشبوونیانەوە لەگەڵ ئاستی داواكاری دانیشتواندا ناگونجێت.

### پێنجەم: میتۆدی توێژینەوەكە

گومان لە وەدا نییە هەر لێكۆڵینەوەیەكی ئەكادیمی پێوستی بە بەكارهێنانی میتۆدێك یاخود چەند میتۆدێكی لێكۆڵینەوە هەیە، تاكو ببێتە رەوتێكی زانستی بۆ تەواوی هەنگاوەكانی ناو لێكۆڵینەوەكە. لە گرنگترین میتۆدە بە كارهاتووە كانیش لەم لێكۆڵینەوەدا بریتین لە :

- میتۆدی ئسوڵی بۆ دەرخستنی گرنگی وكاریگەری فاكتەرە سروشتی و مرۆییەكان لەسەر چالاكیە جیاوازەكانی خۆشگوزەرانی.
- میتۆدی دووەم میتۆدی تاقیكاری، كە بەچەند قۆناغێك جێبەجێ دەكرێت، سەرەتا كۆكردنەوەی داتا لە رێگەی سەرچاوەی فەرمی و رێكخراوەكان دەرخستنی ئەنجامەكان شێوەی خشتە و شێوەی جۆراوجۆر، هەروەها وەرگرتنی داتای شوێنی ناوەندەكان وەرگرتنی داتای شوێنی ناوەندەكان لە رێگای بەكارهێنانی بەرنامەكانی (Google pro earth) و دووبارە رێكخستن و نیشاندانیان بەشێوەی نەخشە لە رێگەی بەكارهێنانی سیستەمی زانیارییە جوگرافییەكان (GIS) .

هەشتەم: پلانی توێژینەوەکە

بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی توێژینەوەکە، توێژینەوەکە دابەشکراوەتە سەر پێشەکی و سێ تەوەری سەرەکی، تەوەرەی یەکەم کە تایبەتکراوە بە ناساندنی ناوچەی لێکۆڵینەوە، تەوەری دووەم بۆ دابەشبوونی جوگرافی خزمەتگوزاریە رۆشنبیری و وەرزشییەکان لە شارەکەدا ، تەوەری سێیەم تایبەتکراوە بە هەڵسەنگاندنی ئاستی ئەم خزمەتگوزاریانە و مەزەندەکردنی پێداوستییە چاوەڕوان کراوەکان بە پێی پێوەرە ستاندەردەکان بۆ هەریەکە لە خزمەتگوزاریەکان پاشان بە چەند دەرئەنجام و پێشنیارێک کۆتای هاتووە .

## تەوەرەی یەکەم: ناساندنی ناوچەی لێکۆڵینەوە

شوێن و پێگە بایەخێکی زۆری لە توێژینەوە جوگرافیەکاندا هەیە، جوگرافیناسان هەوڵیانداوە جیاوازی لە نێوان هەریەکە لە شوێنی جوگرافی شار (الموقع الجغرافي Location) و پێگەکەیدا بکەن (الموضع Site)، مەبەست لە پێگە (Site) ئەو پارچە زەوییەیە کە شاری لەسەر دادەمەزرێت لەوێوە فراوان دەبێت و بەرەوپیش دەچێت، کە ڕووی زووی بەرزونزمیەکانی و پێکهاتەی جیۆلۆجی و چەندین خەسڵەتی تر دەگرێتەوە، گرنگی پێگە لەوەدایە، کە کاریگەریەکانی لەسەر بناغەی دروست بوونی شار و تۆڕەکانی هاتوچۆ دەردەکەوێت کە ئەوەش کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر جوڵەی مرۆڤ و شێوازی ژیان لە ناو شاردا،[١] بەڵام شوێن (Location) دیاریکردنی سەنتەری شار و پەیوەندی بە ناوچە یان هەرێمەکانی دەوروبەری، کە گرنگی تایبەتی هەیە لە دیاریکردنی ڕۆڵی شار و ئەو ئاستەی کە لە ئایندەدا پێدەگات.[٢]

شوێنی جوگرافی یەکێکە لە گرنگترین پێکهاتەکانی ژینگەی سروشتی، بە جۆرێک کاردەکاتە سەر دیاریکردنی شوێنی وڵات و شار و ناوچەی بازرگانی و سەنتەری خزمەتگوزارییەکان و شوێنی بەرهەمهێنان و بەکاربردن، شاری کەلار هەروەک لە نەخشەی (1) دەردەکەوێت دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (٢٧«٣٩'٣٤°-٣٤°٣٦'١٢») ی باکوور و هێڵی درێژی (٤٩«٢١'٤٥°-٤٥°١٧'١٢») ی ڕۆژهەڵات، کە لەسەر ڕووبەرێکی تەخت بنیات نراوە، کە بەرزێکەی لە ئاستی ڕووی دەریاوە (200-255) مەتردایە. کە ئەمەش تەخت بنیات نراوە، کە بەرزێکەی لە ئاستی ڕووی دەریاوە (200-255) مەتردایە . کە ئەمەش هیچ لێژیەکی تیا نیە کە ئاستەنگی سروشتی لە بەردەم دروستکرنی دامەزراوەکان و

---

[١]- صبري الهيتي و صالح فليح حسن، جغرافية المدن, مديرية دار كتب لطباعة و النشر، الوصل، ص ١٠-٤٣.

[٢]- عبدالرزاق عباس حسين، جغرافية المدن, مطبعة اسعد، بغداد،١٩٧٧, ص٣٦.

فراوانبوونی شاردا لە داهاتووی شارەکەدا.[1]

شاری کەلار لە ڕووی جوگرافیاوە دەکەوێتە ناوچەی نیمچە شاخاوی، لە ناوچەی بان و گردەکانی کەرکوکدایە، دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە، وەکو ناوەندی ئیدارەی گەرمیان دەکەوێتە دووری (269کم) لە هەولێری پایتەختەوە، هەروەها (173کم) لە شاری کەرکوکەوە دوورە و (144کم) لە شاری سلێمانیەوە.[2]

هەروەک لە نەخشەی (2) دەردەکەوێت، ئەم شارە دەکەوێتە سەر هێڵی گوستنەوەی (پارێزگای سلێمانی- کەلار- پارێزگای دیالە- پایتەختی عێراق«بغداد»)، هاوکات لە ڕێگەی هێڵی کفریەوە دەبەستریتەوە بە پارێزگای کەرکوکەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە (35کم) لە خاڵی سنووری پەروێزخانەوە دوورە، کە لەو ڕێگەیەوە شاری کەلار بە شاری (قەسری شرین) لە کۆماری ئسلامی ئێرانەوە دەبەستریتەوە. هەروەها ئەم شارە دەکەوێتە (202کم) لە باکووری بەغدادی پایتەختەوە دوورە، لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە کە نزیکترین دووری هەیە لەگەڵ شاری بەغداد و بەشەکانی تری ناوەڕاستی عێراقدا.[3]بە هۆی شوێنی جوگرافیکەیەوە قەزای کەلار بوەتە یەکێک لە قەزا گرنگ و ستراتیجیەکان، کە ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، هەروەها شوێنی ناوچەی لێکۆڵینەوە ڕۆڵی گرنگی لە قەبارە و ڕووبەری شارەکە هەیە لە ڕووی خێرا فراوان بوون و گەشەسەندنەوە و چالاکیە ئابووریەکانیەوە، ڕووبەری شاری کەلار دەگاتە (17, 270, 806)م[2]. لە (28) گەرەک پیک هاتووە، کە سنووری ناوچەی لێکۆلینەوەکەمان دەگریتەوە. لێرەدا دەتوانین بڵێن شوێنی جوگرافیایی شاری کەلار یەکێکە لە پاڵنەرە سەرەکی و گرنگەکان بۆ پێوستی شاری کەلار لە دامەزراندنی خزمەتگوزاریە خۆشگەزرانیەکان لەلایەکەوە، هاتنی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی دەووروبەری کەلار وەکو سەردانیکەر بۆ دامەزراوە خۆشگوزەرانییەکانی شارەکە، کە لەم ڕووەوە بووەتە خالێکی ئەرێنی گرنگ بۆ شاری کەلار.

---

[3]- جاسم محمد، کەلار لە لادێوە بۆ شار، بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاری، سلێمانی، 2005، لا28.

[4]- ڕزگار حاجی حمید، کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زندوو (1970-2012)، لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیایی مرۆیدا، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، کوردستان، 2019، لا32.

- خالد وەلی عەلی، دابەشبوون و ئاستی خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی لە شاری کەلاردا، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارە (4)، بەرگی (8)، 2018، لا55.

خشەی (1) شوێنی ئەسترۆنۆمی شاری کەلار




کاری توێژەر بە پشت بەستن بە:

١- شاهۆ سالح ئەمین وئەوانی تر، ئەتڵەسی هەرێمی کەردستانی عێراق، عێراق و جیهان، چاپی یەکەم، کۆمپانیایی تێنوس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٣٩٧.

٢- حوکمەتی هەرێمی کوردستان،وەزارەتی پلاندانان، بەڕێوبەرایەتی ئاماری سلێمانی، نەخشەی کارگێڕی پارێزگای سلێمانی، بەشی Gis، ٢٠١٢.

٣-بەرنامەی arc gis ١٠, ٨

نەخشەی (2) شوێنی قەزای کەلار بە گوێرەی هەرێمی کوردستان و عێراق



کاری توێژەر بە پشت بەستن بە:

١- شاهۆ سالح ئەمین وئەوانی تر، ئەتڵەسی هەرێمی کەردستانی عێراق، عێراق و جیهان، چاپی یەکەم، کۆمپانیایی تێنوس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٣٩٧.

٢- حوکمەتی هەرێمی کوردستان،وەزارەتی پلاندانان، بەڕێوبەرایەتی ئاماری سلێمانی، نەخشەی کارگێڕی پارێزگای سلێمانی، بەشی Gis، ٢٠١٢.

٣-بەرنامەی arc gis ١, ٨, ١٠.

## تەوەری دووەم: دابەشبوونی جوگرافی خزمەتگوزاریە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان لە شاری کەلاردا

-1.2خزمەتگوزاریە ڕۆشنبیریەکان (هۆڵی شانۆ و چالاکیە ڕوشنبیریەکان،کتێبخانە)

لە ئەمڕۆدا ڕۆشنبیری بوە بە زمان و پێوەری پێشکەوتن و شکۆداری شانازی بۆ گەلانی ڕۆشنبیر، چونکە ڕۆشنبیری پێشکەوتنی هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ و بوارەکانی زانیاری و زانستی و ئەدەبی و هونەری و ڕەفتار و هەڵسوکەوت و بەها مرۆیەکان دەگرێتەوە، لە زۆربەی وڵاتە پیشکەوتووەکانی جیهاندا، لە هەر شارو شارۆچکەیەدا چەندین دەزگا و مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەن، کە ڕۆڵی گرنگی لە خزمەتکردنی لایەنی ڕۆشنبیری دانشتوانیان هەیە، لە شاری کەلاردا خزمەتگوزاریە ڕۆشنبیریەکان بریتین لە:

١-هۆڵی شانۆ و چالاکیە ڕۆشنبیریەکان لە شاری کەلار

شانۆ وەک دەزگایەکی سەربەخۆی ڕۆشنبیری هەوڵدەدات بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژی و جیاکاری نەکردنی ڕەگەزی و دانان بە مافەکانی یەکتردا و چاندنی گیانی لێبووردەیی و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە، کۆتایهێنان بە هەموو زەبر و زەنگ و چەوسانەوەیەکی مرۆڤ واتا شانۆ ئامانجی خزمەتکردنی مرۆڤایەتیە[١]، هۆڵی شانۆ و چالاکیە ڕۆشنبیریەکان لە شاری کەلار ژمارەیان (4) هۆڵە:

أ-هۆڵی هونەر

ئەم هۆڵە دەکەوێتە گەڕەکی بنگردەوە، لە ساڵی (2014) دروست کراوە، ڕووبەرەکەی (2800) مەتر دووجایە، پێکهاتووە لە (310) کورسی، ئەم هۆڵە گرنگیەکی زۆری بۆ لایەنی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و هونەری شاری کەلار هەیە، چونکە زۆربەی چالاکی ڕۆشنبیریەکان لەم هۆڵە ئەنجام دەدرێت، هەروەها تاکە هۆڵە لە شارەکەدا کە فلیمی سینەمای تێدا نمایش دەکرێت (سینەمای نێودەوڵەتی و سینەمای ناوخۆیی)، بۆ نمونە هەر لە ساڵی (2021)دا زیاتر لە (25) فلم و (15) شانۆ و نزیکەی (100) کۆڕی

---

١ - بورهان قەرەداغی، ئەزموونی شانۆی گەڕۆک، ناوەندی ڕۆشنبیری بەدلیسی، چاپخانەی ڕوون، چاپی یەکەم، 2007،ل20.

سیمیناری تێدا ئەنجام دراوە.[١]

ب-هۆڵی بۆنەكان (شەهید سیراون سەید جەژنی و براكانی)
ئەم هۆڵە دەكەوێتە تەنشت بەڕێوبەرایەتی پەروەردەی گەرمیان لە گەڕەكی (ڕزگاری)، كە لە ساڵی (2007) دروست كراوە، بە ڕووبەری (3000) مەتر دووجا، ژمارەی كورسیەكانی بریتیە لە (400) كورسی[٢]، لەم هۆڵەدا زیاتر چالاكیەكانی وەكو كۆڕ و بۆنە و یادە نشتیمانیەكان ئەنجام دەدرێت.

ت-هۆڵی وەرزش و لاوان
ئەم هۆڵە لە ساڵی (2010) دروست كراوە، دەكەوێتە گەڕەكی (ڕووناكی) نزیك بینای ئیدارەی گەرمیان، ڕووبەرەكەی (351) مەتر دووجایە، ژمارەی كورسیەكانی بریتییە لە (167) كورسی، لەم هۆڵەدا چالاكی ئەدەبی و هونەری سیمینار و كۆڕ و كۆبوونەوەی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەم هۆڵە سەر بە وەزارەتی ڕۆشنبیریە و میلاكی ناوەندی وەرزش و لاوانی كەلارە، بوەتە جێگایەك بۆ نمایشكردنی سینەماو شانۆ تیادا، جگە لە چالاكیەكانی وەك كۆڕ و سیمینار بەڕێوەچوونی بۆنە جیاوازەكان لە شارەكەدا.[٣]

ث-هۆڵی سەنتەری چالاكی گەنجان
هۆڵی سەنتەری چالاكی گەنجان یەكێكی ترە لە هۆڵەكانی شاری كەلار، دەكەوێتە ناو بینای سەنتەری چالاكی گەنجان لە كەلار، لە گەڕەكی سەركەوتن، لە ساڵی (2002) دامەزراوە، كە نزیكەی (150) كورسی جێگەی دەبێتەوە تێدا، هەریەكە لە چالاكیە ڕۆشنبیر و هونەریەكانی (شانۆ و سیمینار و كۆڕ) و چەندین چالاكیتری تیدا ئەنجام دەدرێت، ئەم سەنتەرە ڕێكخراوێكی ناحوكمیە ئامانجی خزمەتكردنی توێژی گەنجانی شاری كەلارە.[٤]

---

١ -چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز (سەربەست ئەحمەد) سەرپەرشتیاری هۆڵی هونەر مامۆستا لە بەرواری 2021/12/14.

٢ - چاوپێكەوتن لەگەڵ بەرێز (ئەحمەد رحیم) لە بەشی ئەندازیاری بەرێوبەرایەتی ڕۆشنبیری لاوانی گەرمیان لە بەرواری 2021/12/14.

٣ - چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز (قەیس سعداللە)، سەرپەرشتیاری هۆڵی وەرزش و لاوان لە بەرواری 2021/12/16.

٤ - چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز (نەبەز ئەحمەد) بەڕیوبەری سەنتەری چالاكی گەنجانی كەلار لە بەرواری 2021/12/12.

ئـەوەی جێگـەی ئامـاژە بـۆ کردنـە لەگـەڵ ئـەوەی کـە سـینەما یەکێکـە لـە پێداوسـتییە ڕۆشـنبیری و هونەرییـە گرنگـەکان، بـەڵام لـە شـاری کـەلاردا هیـچ سـینەمایەک نیـە، بەڵکـو ئـەو فلیمـە سـینەمایەی کـە دەهێنرێنـە شـارەکە لـە هۆڵـە شـانۆیەکاندا نمایـش ئەکرێـت.

٢-کتێبخانە

زاراوەی کتێبخانـە لـە کتێبـەوە وەرگیـراوە، لەبـەر ئـەوەی کتێـب بـە ڕێژەیەکـی زۆر بەشـداری لـە پێکهاتـەی کتێبخانـە دەکات، هەرچەنـدە لـەم سـەردەمەدا کتێبخانـە بـەو شـێوەیەی جـاران نیـە، گۆڕانـکاری و تازەگـەری بەسـەر جـۆر و سـەرچاوە و پێکهاتـەی کتێبخانـەدا هاتـووە، سـەرچاوەی تـری لـە خۆگرتـوە بـە ئامانـج و مەبەسـتی جیـاواز، جگـە لـە کتێـب وەکـو سـەچاوەکانی بینیـن و بیسـتن و چاپکـراو و چاپنەکـراو.

گـەر پێناسـەیەکی کتێبخانـە بکەیـن بـە شـێوەیەکی گشـتی دەڵیـن: دامودەزگایەکی ڕۆشـنبیری، پـەروەردەی، فێرکـردن، زانسـتی، کۆمەڵایەتـی، ئامانجـی کۆکردنـەوەی سـەرچاوەی زانیاریـە بـە شـێوە جیاوازەکانییـەوە، وەکـو چاپکـراو و چاپنەکـراو.[1]

بـە شـێوەیەکی گشـتی کتێبخانـە هـەوڵ دەدات بـۆ بـە دەسـت هێنانـی چەندیـن ئامانجـی جیـاواز، کـە گرنگترنیـان لایەنـی ڕۆشـنبیری بـە بەرزکردنـەوەی ئاسـتی تێگەیشـتنی تـاک و کۆمـەڵ و فێرکردنیـان،[2] هەروەهـا بەسـەربردنی کاتـی هاوڵاتیـان بـە شـێوەیەکی بـە سـود لـە کتێبخانـەکان.[3] هـەر ئـەم هۆیانـەی کتێبخانـەکان بونەتـە ناوەندێـک بـۆ ڕاکێشـانی هاوڵاتیـان و سـەردانکردنیان، بـە مەبەسـتی بەسـەربردنی کات و وەرگرتنـی زانیـاری و بەرزکردنـەوەی مەعریفـەی کەسـییان.

سـەبارەت بـە ناوچـەی لێکۆڵینـەوە بـە شـێوەیەکی ڕەسـمی تەنهـا یـەک کتێبخانەیـی تێدایـە کـە ئەویـش کتێبخانـەی گشـتی کـەلارە، جگـە لـە ئـەوە لـە شـاری کـەلاردا هەریـەک لـە زانکـۆی گەرمیـان و پەیمانـگای تەکنیکـی کـەلار و و هەریەکـە لـە پەیمانـگا ئەهلیـەکان کـە لـە شـارەکەدا هـەن، خاوەنـی کتێبخانـەی تایبـەت بـە خۆیانـن.

---

١ - شـاهۆ عوسـمان سـەید قـادر، کتێبخانـەی قوتابخانـە و خوێندنگـەکان، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی هەورامـان، سلێمانی، 2015، لا89.

٢ - یاسـین قـادر بەرزنجـی، چەنـد بابەتێـک سـەبارەت بـە کتێبخانـە و زانیارییـەکان، چاپـی یەکـەم، چاپخانـەی ڕۆژهـەڵات، هەولێـر، 2011، لا13.

٣ - شاهۆ عوسمان سەید قادر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا106.

أ-کتێبخانەی گشتی کەلار

کتێبخانەی گشتی کەلار لە ساڵی (1983) دامەزراوە، دەکەوێتە گەڕەکی فەرمانبەرانەوە، یەکێکە لە ناوەندە ڕۆشنبیرە گرنگەکان لە ناوچەی گەرمیان و شاری کەلاردا، کە لە (19854) سەرچاوە پێک هاتووە بە زمانە جیاوازەکان، بە شێوەک (11720) سەرچاوەی کوردی، (7040) سەرچاوەی عەرەبی، (764) سەرچاوەی ئینگلیزی، (293) سەرچاوە زمانەکانیتر، هەروەها بەشێکی تایبەتیان هەیە بە منداڵان، کە لە (1975) سەرچاوەی کتێب و (509) گۆڤار پێک هاتووە، جگە لەوەی ساڵانە چەندین کۆڕی و سیمینار و خولی تایبەت لە هۆڵی کتێبجانەی گشتی کەلاردا ئەنجام دەدرێت، هەروەها کتێبخانەکە چالاکی تایبەت بە خۆیان هەیە ، وەکو ساڵانە گۆڤارێکی تایبەت بە کتێبخانەکە دەردەکرێت بە ناوی (جیهانی کتێب)، لە ڕۆژی جیهانی کتێبدا کە دەکەوێتە (4/22)ی هەموو ساڵێکەوە[١] .

ب-کتێبخانەی سەنتەری چالاکی گەنجان

کتێبخانەیەکی ناحوکمیە، سەربە سەنتەری گەنجانە لە کەلار، دەکەوێتە گەڕەکی سەرکەوتن، لە ساڵی (2002) دامەزراوە، نزیکەی (10000) سەرچاوەی هەیە لە سەر بابەتە جیاوازەکان و بەزمانی جیاواز[٢]، ڕۆڵی ئەم کتێبخانەیە لە ڕۆشنبیری ناوچەکە بە بەرز دەنرخێنرێت، چونکە جگە لەو ژمارە زۆرە لە سەرچاوەکانی کتێب، زۆربەی ژمارەکانی (گۆڤاری ئەدەبی و فکری و زانستی و کۆمەلایەتی و پەروەردەیی) کە مانگانە و وەرزانەن تێدا دەست دەکەوێت، گەنجان و خوێنەرانی تریش لە هەموو تەمەنەکاندا، سەردانی کتێبخانە دەکەن و دادەنیشن بۆ خوێندنەوە یان بە شێوەی خواستنی کتێبەکان دەبرێنە دەرەوە، کە زیاتر خوێندکارانی قۆناغە جیاوازەکانی خوێندن تا دەگاتە (ماستەر و دکتۆرا)، سودمەند دەبن لە گشت سەرچاوەکان، هەروەها هۆڵی کتێبخانەی سەنتەر، شوێنێکە بۆ دانشتن و ناساندن و گفتوگۆی کتێب و چەندان سیمینار و چالاکی تری ڕووناکبیری، لەگەڵ دروستبوونی چەندان گرووپی خوێندنەوە لە هەردوو ڕەگەز، کە

---

١ - چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (شرین محمود علی) جێگری بەڕێوبەی کتێبخانەی گشتی کەلار، لە بەرواری 2021/12/8.

٢ - چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (شەهلا کریم) سەرپەرەشتیاری کتێبخانەی سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار، لە بەرواری 2021/12/14




کاری توێژەر پشت بەستن بە:

١- وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامەی sasplanet.

٢- google earth pro ٢٠٢٠.

٣- بەرنامەی arc gis 10.8.1.

## ٢,٢-خزمەتگوزاریە وەرزشییەکان

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا تێکڕای کۆمەڵگا مۆدرینەکانی جیهان، وەرزش وەکو نەریتێکی ڕۆژانە پیادە دەکرێت، بە شێوەیەک وەرزش بوەتە پێداوستیەکی گرنگی ژیانی ڕۆژانە، هەموان بە دوای یاریگا و فێرگە و هۆڵە وەرزشییەکاندا دەگەڕێن، تا جموجۆڵەکانیان لە پێناو تەندروستیەکی باش یان دابین کردنی حەز و ئارەزووەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن، بۆیە دابینکردنی خزمەتگوزاری و ناوەندە وەرزشیەکان ڕۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ خۆشگوزەرانی دانشتوان، سەبارەت بە خزمەتگوزاریە وەرزشییەکان لە شاری کەلاردا بریتیە لە هەبوونی ئەم شوێنانە:

1- یاریگاکان

أ-یاریگای شێروانە (مەلعەبەکەی کەلار)

یاریگای شێروانە یارگایەکی تۆپی پێیە، کە تایبەتە بە یانەی وەرزشی شێروانە، جگە لە تۆپی پێ چەندین چالاکی وەرزشی و پاڵەوانێتی تری تێدا ئەنجام دەدرێت، وەکو یاریەکانی گۆڕەپان و مەیدان، ئەم یاریگایە لە ساڵی (1983) دروست کراوە، دەکەوێتە گەڕەکی (فەرمانبەران)ەوە، کە لە (2000) کەس دەگرێت[٢].

---

١ - سەردار نۆڕێ، ڕۆڵی سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار، لە پێشخستنی کایە جیاوازەکانی ناوچەکەدا، بڵاوکراوەی (یادی کەلار)، بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی ڕۆژی کەلار، ژمارە(4)، 2020، لا143.

٢ --چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (ئەحمد رحیم) ئەندازیار لە بەڕیوبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەری گەرمیان لە بەرواری 2021/12/7.

ب- یاریگای نوێیی شێروانە

ئەم یاریگایە لە ساڵی (2013) دروست کراوە، کە ئەمیش تایبەتە بە یانەی شێروانە پێی دەوترێت یاریگای نوێی شێروانە، کە زیاتر لە (5000) کەس دەگرێت. دەکەوێتە نزیک لە ناوچەی پیشەسازی کەلارەوە[1]. یانەی شێروانە لە ساڵی (1992) دامەزراوە، یەکێکە لە یانە ناودارەکان لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستان، بارەگای یانەکە هەر لە یاریگای شێروانەیە.

جگە لەم دوو یارگایە (5) یاریگای تر لە شاری کەلاردا هەیە کە پێیان دەوترێت یاریگای تیپە مللیەکان، بەسەر چەند گەڕەکێکی کەلاردا دابەش بوون بەم شێوەیە:

خشتەی (3) یاریگای تیپە مللیەکان

| ژ | یاریگا | گەڕەک | ڕووبەر بە مەتر دووجا |
|---|---|---|---|
| 1 | مام جلال (حەمەی کەریم) | فەرمانبەران | 7799 |
| 2 | شەهید سالح | کەلاری کۆن | 8040 |
| 3 | شەهید بورهان | ئاوارەکان | 8466 |
| 4 | شەهید ڕەمەزان گلاڵی | بەردەسوور | 8739 |
| 5 | شەهید نەجم | بنگرد | 8518 |
| کۆی گشتی | | | ٤١٥٦٢ |

کاری توێژەر پشت بەستن بە:

١- بەڕێوەبەرایەتی وەرزش و لاوانی گەرمیان، داتای بڵاونەکراوە لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/٧.

٢- وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامەی sasplanet.

٣- google earth pro ٢٠٢٠.

٤- بەرنامەی arc gis

٥-

٦- ١, ٨, ١٠.

[1] - چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (ئەحمەد رحیم) لە بەشی ئەندازیاری بەڕێوبەرایەتی ڕۆشنبیری لاوانی گەرمیان لە بەرواری 2021/12/14.




کاری توێژەر پشت بەستن بە:

١. وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامەی sasplanet.

٢. google earth pro ٢٠٢٠.

٣- بەرنامەی arc gis ١, ٨, ١٠.

2-مەلەوانگە

مەلەوانگاکان یەکێکە لەو شوێنە وەرزشیانەی کە زۆرترین داواکاری لەسەرە لە لایان هەدوو ڕەگەزەوە لە تەمەنە جیاوازەکان، بە مەبەستی جیاواز وەک بەسەر بردنی کاتی بەتاڵی یاخوود بۆ مەبەستی تەندروستی وەکو بەشێک لە چارەسەری سروشتی بۆ هەندێ لە نەخۆشیەکان یاخود سەردانیکردنی هاوڵاتیان بۆ مەلەوانگەکان بەمەبەستی بەشداریکرن لە خولەکانی فێربوونی مەلەوانی، لە شاری کەلادا تەنها چوار مەلەوانگە هەیە کە ئەوانیش:

أ-مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر

ئەم مەلەوانگەیە لە ساڵی (2015) دامەزراوە، دەکەوێتە گەرەکی فەرمانبەرانەوە، لە بەشی پیاوان و ژنان پێکهاتووە، هەریەکەیان چەندی خزمەتگوزاری تیدایە وەکو ژووری ساونا و جاکوزی گەرم و سارد و ژووری هەڵم، ژووری مەساج. مەلەوانگەکە دوو حەوزی تێدایە بۆ مەلەکردن، کە ڕووبەرە حەوزی بەشی ژنان (180) مەتر دووجایە، حەوزی

بەشی پیاوان (230) مەتر دووجایە[١].

ب-مەلەوانگەی کارێزە سەنتەر

دەکەوێتە گەڕەکی (شارەوانی2)، لە ساڵی (2019) دامەزراوە، هەرچەندە بەشی ژنان و پیاوان پێک دێت بەڵام بەشی ژنانی تەنها لەوەزی هاویندا کراوەیە، مەلەوانگەکە دوو حەوزی مەلەکردنی تێدایە بە ڕووبەری (225) و (345) مەتر دووجا.

ت-مەلەوانگەی ستی ئای

ئەم مەلەوانگەیە دەکەوێتە گەڕەکی ڕووناکی شاری کەلارەوە، لە ساڵی (2021) دروست کراوە، تاکە مەلەوانگەی کراوەیە لەشاری کەلادا، بویە مەلەوانگەکە وەرزیە و لە وەرزی زستاندا بە هۆی ساردی کەش و هەواوە دادەخرێت، ڕووبەری حەوزی مەلەوانگەکە (207) مەتر دووجایە[٢].




کاری توێژەر پشت بەستن بە:

-1وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامەی sasplanet.

-.google earth pro 2020 2

-1 بەرنامەی arc gis 10

-3 هۆڵی لەشجوانی

لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستی خوێنەواری و ڕۆشنبیری هاوڵاتیان زیاتر گرنگی بە لایەنی

١ - چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (کوردستان عسری) سەرپەرشتیاری بەشی ژنانی مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر لە بەرواری 2021/12/18.

٢ - چاوپیکەوتن لەگەڵ بەریز(ئارا خان) سەرپەشتیار لە هەوارگەی ستی ئای لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/٢١.

٣ - چاوپێکەوتن بەڕێز (قەیس سەعداللە) سەرپەرشتیاری مەلەوانگەی سیروان لە بەرواری 2021/12/21.




کاری توێژەر پشت بەستن بە:

- 1وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامەی sasplanet.
- 2 google earth pro 2020.
- 3 بەرنامەی arc gis 10.8.1.

## تـەوەری سـێیەم: هەڵسـەنگاندنی ئاسـتی خزمەتگوزارییـە ڕۆشـنبیری و وەرزشـییەکان و مەزەندەکردنـی پێداوسـتییە چـاوەڕوان کـراوەکان بـۆ خزمەتگوزارییانـە لـە داهاتـوودا.

بارودۆخـی خزمەتگوزاریـە خۆشـگوزەرانیەکان و دابەشـبوونیان وئاسـت و ڕێـژەی داواکاری لەسـەریان لـە هەرناوچەیەکدا، دەکەوێتـە ژێر کاریگـەری کۆمەڵێـک فاکتـەرەوە کـە پەیوەندیـان بـە تایبەتمەندیەکانـی خـوودی ناوچەکـەوە هەیـە، کـە دەشـێ کاریگەریەکانیـان ئەرێنـی بـن و بـە ئاراسـتەی بـەرەو پێـش چوونـی ئـەم جـۆرە لـە خزمەتگوزاریـەکان و ببنـە هـۆی زیادبوونـی داواکاری لەسـەریان، شـاری کـەلار لـە سـەرەتای دروسـت بوونیـەوە بەهـۆی ئـەو باروودۆخـی سیاسـی و گۆڕانکاریـە ئیداریـەکان بوەتـە هـۆی زیادبوونـی نائاسـایی ژمـارەی دانیشـتوانی شـارەکە بـە شـێوەیەک لـە مـاوەی پەنجا سـاڵی ڕابـردوودا (25) گـەڕەک زیـادی کـردووە، پێکهاتـەی ئابـووری دانیشـتوان یەکێکیتـرە لـە پاڵنەرەکانـی زیادبوونـی داواکاری

١ -بەڕیوبەرایەتـی گشـتی تەندروسـتی گەرمیـان، بەڕوەبەرایەتـی خۆپاراسـتنی تەندروسـتی گەرمیـان، بەشـی مۆڵـەت، داتـای بڵاونەکـراوە2021.

لەسەر خزمەتوگوزاریە خۆشگوزرانیەكان لە هەرناوچەیەك، سەبارەت بە لایەنی ئابووری ناوچەی لێكۆڵینەوە، بەهۆی هەڵكەوتەی جوگرافی شاری كەلار وەك لە پێشووتر ئاماژمان پێكردووە، نزیكی شارەكە لە مەرزی نێودەوڵەتی پەروێز خانەوە، كاریگەری گەورەی لەسەر جوڵەی بازرگانی لە شارەكە بە دۆزینەوەی هەلی كار بۆ بەشێك لە دانیشتوانی شارەكە و بەرزبوونەوەی داهاتیانەوە هەیە[١]، هەروەها زیادبوونی ئاستی خوێندەواری پاڵنەرێكی كاریگەر دادەنرێت لەسەر داواكاری لەسەر خزمەگوزاریە خۆشگوزەرانیەكان، پێكهاتەی خوێندەواری لە شاری كەلار بە پێێ داتاكانی بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی بۆ ساڵی (2020) كۆی گشتی ژمارەی خوێندكارانی شاری كەلار (63993) خوێندكارە، لەو ژمارەیە (47912) خوێندكاری بنەڕەتییە، (13214) خوێندكارەی ئامادەییە، كۆی گشتی مامۆستایان و فەرمانبەرانی بەڕێوبەرایەتی پەروەدەی گەرمیان ژمارەیان (5785) كەسە. كە لەناوچەی لێكۆڵینەوە ژمارەی خوێندگەی بنەرەتی بریتیە لە (٢١١) خوێندنگە، كۆی گشتی ژمارەی خوێندنگەی ئامادەیی (٣١) خوێندنگەیە، هەروەها كۆی گشتی باخچەی مندالان (١٦) باخچەیە لە هەمان ساڵدا.[٢] یەكێكیتر لە پاڵنەرەكان زیادبوونی كاتەكانی بەتاڵیە بەو پێیەی ناوچەی لێكۆڵینەوە وەكو بەشێك لە هەرێمی كوردستان، كە جگە لە لە رۆژانی هەینی و شەمە كە پشووی رەسمیە لە زۆربەی فەرمانگەكان، رۆژە پشووەكان لە ساڵێكدا دەگاتە نزیكەی (96) رۆژ[٣]، ئەم رۆژە پشوانە هەموو خوێندكاران و مامۆستایان و فەرمانبەرانی كەرتی گشتی بەشێك لە كەرتی تایبەت دەگریتەوە، لەگەڵ چەندین رۆژ لە پشووی دیكە كە لەلایەن حوكمەتی هەرێمەوە دیاریدەكرێت. كە بێگومان لەگەڵ زیادبوونی رۆژە پشووەكان كاتی بەتاڵی دانیشتوان زیاد دەكات و ئەبێتە هۆكارێك بۆ زیادبوونی چالاكیە خۆشگوزەرانییەكان و داواكاری لەسەر ناوەندە خۆشگوزەرانیەكان. مەزەندەكردنی پێداوستی دانیشتوان بۆ خزمەتگوزاریەكان گرنگیەكی گەورەی هەیە لە بواری پلاندانان پیشخستنیان، بۆ ئەم مەبەستەش دیاریكردنی قەبارەی دانیشتوان لە داهاتوودا سەرەكیترین بنەمایە بۆ مەزەندەكردنی پێداوستیە خۆشگوزارییەكان، مەزەندەكردنی پێویستی بۆ خزمەتگوزارییەكان لەسەر بنەمای ئەو پێوەرانەی، كە لەبەردەستدان بۆ ئێستا و داهاتوو بۆ ساڵی بە ئامانج گیراو كە ساڵی (٢٠٤٠)، لێرەدا پێویستە پێشبینی بۆ قەبارەی دانیشتوان وەربگیرێت بۆ شاری كەلار.

---

١ -چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێز (شەرمین عەلی)، لێپرسراوی هۆبەی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەكانی دەروازەی نێودەوڵەتی پەرویزخان، لە بەرواری 2022/3/1.

٢ -بەڕێوبەرایەتی ئاماری سلێمانی ،داتای بڵاونەكراوە،2020.

٣ - سایتی فەرمانگەی میدیا و زانیاری حوكمەتی هەرێمی زانیاری لە ڕێكەوتی 2021/11/12.

خشتەی (4) ژمارە و ڕێژەی ساڵانەی دانشتوانی شاری کەلار لە نێوان ساڵانی (١٩٧٧-٢٠٢٠)

| ساڵەکان | ژمارەی دانشتوان | ڕێژەی گەشەی ساڵانە٪[1] |
|---|---|---|
| 1977 | 9177 | |
| 1987 | 63102 | 21,2٪ |
| 2002 | 90519 | %19,4 |
| 2012 | 132197 | %3,8 |
| 2020 | 160614 | %2,46 |

سەرچاوە: کاری توێژەر بە پشت بەستن بە بەڕێوەرایەتی ئاماری گەرمیان، داتای بڵاونەکراوە، ٢٠٢١

بۆ پێشبینیکردنی داهاتووی قەبارەی دانیشتوان لە شاری کەلاردا، تیشک دەخەینە سەر سێ گریمانەکە ئەوانیش گریمانەی بەرز و گریمانەی مامناوەند و گریمانەی نزم، بە سوود وەرگرتن لە خشتەی (4) ی گەشەی دانیشتوان شارەکە لە نێوان ساڵانی (١٩٧٧-٢٠٢٠).

- گەشەی دانشتوانی نزم (٪1.5) وەردەگرین.
- گەشەی دانشتوانی مامناوەند (٪3) وەدەگرین.
- گەشەی دانشتوانی بەرز (٤,٥ ٪) وەردەگرین.

وەک لە خشتەی (4)دا دیارە ژمارەی دانیشتوانی شاری کەلار لە ساڵی (١٩٧٧) بریتی بووە لە (٩١٧٧) کەس، بۆ ساڵی (١٩٨٧) ژمارەی دانیشتوان بوە بە (٦٣١٠٢) کەس، بەمەش ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لە نێوان ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧) بریتیبووە لە (٢١,٢٪)، کە ئەمەش ڕێژەیەکی زۆرە واتا گەشەی لەم ساڵانەدا زۆربووە بەشێوەیەکی

[1] ڕێژەی گەشەی ساڵانەی دانشتوان لە ڕێگەی ئەم هاوکێشەیەوە دەردەچێت:

R= ڕێژەئ گەشەی ساڵانە
T= ژمارەی ساڵانی نێوان دوو سەرژمێری
P1= ژمارەی دانشتوان لە دواین سەرژمێریدا
P0= ژمارەی دانشتوان لە سەرژمێری یەکەم
سەرچاوە: طة حمادي الحديثي، جغرافية السكان، دار الكتاب للطبعة و النشر، جامعة الموصل، ص٣٩١.

نائاسایی ژمارەی دانیشتوانی شاری كەلار زیادی كردووە، ئەمەش وەكو لە پێشووتر ئاماژەمان پێكردووە، دەگەڕێتەوە بۆ دەسپێكردنی شاڵاوی سێی ئەنفال لەم ماوەیدا زۆربەی دانیشتوانی گوندەكانی سەر بە ناوەند و پێباز و تیلەكۆ سەر بە قەزای كەلار بەتەواوی چۆڵكران گواسترانەوە بۆ شاری كەلار، كە نزیكەی (168) گوند بوون، هەروەها چۆڵكردنی گوندەكانی دەوروبەی قەزای كەلار و كفری و رووخاندنیان، پاشان گوستنەوەی دانیشتوانەكەی بۆ سەنتەری شاری كەلار، پاشان ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی (٢٠٠٢) گەیشتە (90519) كەس و ڕێژەی گەشەی دانیشتوان بریتیە لە (١٩, ٤٪) لە نێوان ساڵانی (١٩٨٧-٢٠٠٢)، ئەوەی تێبینی دەكرێت گەشەی دانیشتوان دابەزیوە بە بەراورد بە ساڵانی (١٩٧٧-١٩٨٧)، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خراپبوونی بارودۆخی ئابووری و كۆچكردنی هاوڵاتیان بۆ دەرەوەی وولات، كە ئەمەش هۆكار بوو بۆ دابەزینی ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لەم ساڵانەدا، لە ساڵی (٢٠١٢) ژمارەی دانیشتوانی شارەكە بوو بە (١٣٢١٩٧) كەس وە ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٢) بوو بە (٨, ٣٪)، هەروەها لە ساڵی (٢٠٢٠) ژمارەی دانشتوانی شارەكە (١٦٠٦١٤) كەسە، ڕێژەی گەشەی دانیشتوان لە نێوان ساڵانی (٢٠١٢-٢٠٢٠) بریتیە لە (%2, 46)، ئەمەش ڕێژەیەكی زۆر و بەرچاو نییە بۆ گەشەی دانیشتوان هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی ئاستی ڕۆشنبیری دانیشتوان و زۆربوونی داخوازی و پێداویستی بۆ بەخێوكردن و پەروەردەكردنی منداڵ، دروستبوونی گروپی تیرۆرستی داعش و توشبوونی ناوچەكە بە شەڕی نەخوازراو و دروستبوونی قەیرانی ئابووری و كێشەی پاشەكەوتكردن و پێنەدانی مووچە بە فەرمانبەران، هەموو ئەمانە هۆكاربوون بۆ ئەوەی ڕێژەی هاوسەرگیری و لەدایكبوون كەم بێتەوە بەمەش ڕێژەی گەشەی دانیشتوان بەرەو دابەزین دەچێت.



خشتەی (5) پێشبینیەكانی گەشەی دانشتووان لە شاری كەلار لە ماوەی (٢٠٢٠-٢٠٤٠)

| ساڵەكان | پێشبینی بە پێی گەشەی نزم ١,٥٪ | پێشبینی بە پێی گەشەی مامناوەند ٣٪ | پێشبینی بە پێی گەشەی بەرز ٤,٥٪ |
|---|---|---|---|
| 2030-2020 | 186399 | 215852 | 249429 |
| 2040-2020 | 216324 | 290087 | 387355 |

سەرچاوە: كاری توێژەر بە پشت بەستن بە خشتەی (٤)

پێشبینیكردنی قەبارەی دانیشتوان لە داهاتوودا، دەتوانرێت وەكو بنەمایەكی سەرەكی گرنگ دابنرێت لە كاتی پلاندانان و زانینی پێوستی دانیشتوان بۆ هەیەكە لە خزمەتگوزارییەكان لە داهاتوودا، خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەكانیاش یەكێكە لەو پێداووستیانەی لە ڕێگەی پێشبینیكردنی ژمارەی دانیشتوانەوە دەتوانین بڕی پێوستیان بۆ داهاتوو دیاری بكرێت،

کە لە ڕێگەی ئەو خشتەیەی سەرەوە و بە پشت بەستن بە داتاکانی ساڵی (٢٠٢٠) وەکو ساڵی بنەڕەت، پێشبینیمان بۆ ژمارەی دانیشتوانی شاری کەلار کردووە بۆ (٢٠) ساڵی داهاتوو، بە پێی دوو ماوەی دە ساڵی، کە ڕێگەیەوە پێشبینی پێداویستی دانیشتوان بۆ خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانیەکان دەخەینەڕوو.

بە پێێ خشتەی (5) گەشەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بەم شێوەیەیە:

بە پێی گریمانەی گەشەی نزم بە ڕێژەی (٥ ,١٪) بۆ ماوەی ساڵانی (٢٠٣٠-٢٠٢٠) وا چاوەڕوان دەکرێت ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە بگاتە (١٨٦٣٩٩)، وە بە پێی گریمانەی گەشەی مامناوەند بە ڕێژەی (٣٪) بۆ هەمان ماوە چاوەڕوان دەکرێت ژمارەی دانیشتوان بگاتە (٢١٥٨٥٢) کەس، وە کاتێک تێکڕای گەشەی بەرز بە ڕێژەی (٥ ,٤٪) بێت ئەوا ژمارەی دانیشتوان دەگاتە (٢٤٩٤٢٩) کەس، هەروەها گەشەی دانیشتوانی ناوچەی لێکۆڵینەوە بەپێی گریمانەی گەشەی نزم بەڕێژەی (٥ ,١٪) بۆ ماوەی ساڵانی (٢٠٤٠-٢٠٢٠)، چاوەڕوان دەکرێت ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە بگاتە (٢١٦٣٢٤) کەس، وە بە پێی گریمانەی گەشەی مامناوەند بە ڕێژەی (٣٪) بۆ هەمان ماوە وا چاوەڕوان دەکرێت ژمارەی دانیشتوان بگاتە (٢٩٠٠٨٧) کەس، وە کاتێک تێکڕای گەشەی بەرز بە ڕێژەی (٥ ,٤٪) بێت ئەوا ژمارەی دانیشتوان دەگاتە (٣٨٧٣٥٥) کەس لە ساڵی (٢٠٤٠)دا.

خەمڵاندنی پێداویستی دانیشتوان بۆ هەندێک لە خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانییەکان
بۆ ساڵی ئامانج (٢٠٤٠-٢٠٢٠)

بە هۆی ئەو کاریگەریە ئەرێنیانەی کە خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان دروستی دەکەن لەسەر کۆمەڵگا لە ڕووی دەروونی و ئابووری و ڕۆشنبیری و پەروەردەیی و ژینگەییەوە، وای کردووە ڕۆژ بە ڕۆژ داواکاری لەسەر خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانیەکان زیاتر بێت، بێگومان لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی داینشتوان داواکاری و پێوستیەکان زیاتر دەبێت لە ڕووی چەندایەتی و جۆرایەتییەوە، لەم باسەدا مەبەستمانە بەدانانی ساڵەکانی (٢٠٤٠-٢٠٢٠) وەکو ساڵی ئامانج بە پێشبینیکردنی گەشەی دانیشتووان لەم ماوەیدا، پێداویستیە چاوەڕوانکراوەکان دەستنیشان دەکەین بەهەند وەرگرتنی بوونی جۆرە جیاوازەکانی خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانییەکان لە ئێستادا، بەپێی پێوەرە جیهانی و ناوخۆییەکانی پلانسازی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانییەکان.

پێوەرەکانی خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانییەکان لەسەربنەمای ژمارەی دانیشتوان بۆ هەرجۆرێکیان خراوەتەڕوو بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

خشتەی (6) پێوەرەکانی خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی

| ژ | جۆری خزمەتگوزاری | ژمارەی خزمەتگوزاری پێوست | ژمارەی دانشتوان | رووبەری دانراو بە مەتر دووجا |
|---|---|---|---|---|
| 1 | کتێبخانەی گشتی | 1 | 40.000 | 15.000 |
| 2 | یاریگای وەرزشی | 1 | 30.000 | 2000 |
| 3 | هۆڵی وەرزشی لەشجوانی | 1 | 10.000 | 4500 |
| 4 | هۆڵی شانۆ | 1 | 250.000 | ----- |
| 5 | مەلەوانگە | 1 | 40.000 | 16.000 |
| 6 | سینەما | 1 | 50.000 | 3500 |

سەرچاوە:کاری توێژەر بە پشت بەستن بە

1- علا لطفي مهدي، المؤشرات التخطيطية لتنمية الخدمات المجتمعية في مدينة الخضر، رسالة ماجستير، كلية الرتبية للعلوم االنسانية، قسم الجغرافية، جامعة المثنى،٢٠١٩، ص٣٦.

2- خلف حسين علي الدليمي، تخطيط الخدمات المجتمعية و البنية الحتية (اسس-معايير تقنيات)، مصدر صابق، ص٢٠٦.

3- بشير ابراهيم لطيف و اخرون، خدمات المدن (دراسة في الجغرافية التنموية)، مصدرالسابق،2009، ص١٤٤-١٤٦.

4- زين العابدين علي صفر، تخطيط المدن (اسس ومفاهيم وتطبيقات)، مصدر صابق، ص٣٤٥.

سەبارەت بە خزمەتگوزارییە ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان لەناوچەی لێکۆڵینەوە بۆ ساڵانی ئامانج، لەم خشتەی لای خوارەو خراوەتەڕوو:

خشتەی (7) خەمڵاندنی پێداویستی داهاتووی لە خزمەتگوزاری ناوەندەخۆشگوزەران بۆ ساڵانی (٢٠٣٠-٢٠٤٠) بەپێی گریمانەکانی گەشەی دانیشتوان

| ساڵ / جۆر ناوەند | 2020 | بری پێویست 2020 | 2030 | | | 2040 | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | نزم | مامناوەند | بەرز | نزم | مامناوەند | بەرز |

| مەلەوانگە | 4 | 4 | 5 | 5 | 6 | 5 | | 10 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شانۆ | 4 | 1 | 1 | 1 | 1 | 1 | 1 | 2 |
| سینەما | 0 | 3 | 4 | 4 | 5 | 4 | 6 | 8 |
| هۆڵی لەشجوانی | 20 | 16 | 19 | 22 | 25 | 22 | 29 | 39 |
| کتێبخانە | 2 | 4 | 5 | 5 | 6 | 5 | 7 | 10 |
| یاریگا | 7 | 6 | 6 | 7 | 8 | 7 | 10 | 13 |

سەرچاوە: کاری توێژەر بە پشت بەستن بە خشتەی (٥) و (6).

هەروەک لە خشتەی (7) دەردەکەوێت کە بە پێی گەشەی دانیشتوان پێوستیە خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانیەکان بەم شێوەیە:

1- مەلەوانگە: لە ئێستادا (٤) مەلەوانگە هەیە لە ناوچەی لێکۆڵینەوە، واتا هاوتایە لەگەڵ پێوستی دانیشتوان بە پێیَ پێوەر، بۆ ساڵی (2030) بۆ گەشەی نزم (5)، مامناوەند (5)، بەرز(6) مەلەوانگە پێوستە , بۆ ساڵی (2040) بۆ گەشەی نزم (5)، مامناوەند (7)، بەرز (10)، مەلەوانگە پێویستە.

2- شانۆ: لە ئێستادا لە شاری کەلاردا (4) هۆڵی شانۆ هەیە کە (3) هۆڵی شانۆ زیاترە لە پێویستی دانشتوان بە پیی پێوەر، بۆ ساڵی (2030) بۆ گەشەی نزم (1)، مامناوەند (1)، بەرز(1) شانۆ پێویستە , بۆ ساڵی (2040) بۆ گەشەی نزم (1)، مامناوەند (1)، بەرز (2)، شانۆ پێوستە.

3- سینەما: لە ئێستادا هیچ سینەمایەک لە شاری کەلاردا نیە، کە بە پێی پێوەر (3) سینەما پێویستە بۆ شارەکە، بۆ ساڵی (2030) بۆ گەشەی نزم (4) ، مامناوەند (4)، بەرز(6) سینەما پێوستە , بۆ ساڵی (2040) بۆ گەشەی نزم (4)، مامناوەند (6)، بەرز (8)، سینەما پێوستە.

4- هۆڵی لەشجوانی: لە ئێستادا (20) هۆڵی لەشجوانی هەیە، کە (4) زیاترە لە پێوستی دانشتوان، بۆ ساڵی (2030) بۆ گەشەی نزم (19) ، مامناوەند (22)، بەرز(25) هۆڵی لەشجوانی پێوستە , بۆ ساڵی (2040) بۆ گەشەی نزم (22)، مامناوەند (29)، بەرز (39)، هۆڵی لەشجوانی پێویستە.

5- کتێبخانە: لە ئێستادا (2) کتێبخانە بوونی هەیە، هەرچەندە بەپێی پێوەر بڕی (4) کتێبخانەی دیکە پێویستە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی دانیشتوان، بۆ ساڵی (2030) بۆ گەشەی نزم (5) ، مامناوەند (5)، بەرز(6) کتێبخانە پێویستە , بۆ ساڵی (2040) بۆ گەشەی نزم (5)، مامناوەند (7)، بەرز (10)، کتێبخانە پێویستە.

6- یاریگا: لە شاری کەلاردا لە ئێستادا (7) یاریگا هەیە (1) یاریگا زیاترە لە پێویستی دانیشتوان بە پێی پێوەر، بۆ ساڵی (٢٠٣٠) بۆ گەشەی نزم (6) ، مامناوەند (7)، بەرز (8) یاریگا پێویستە , بۆ ساڵی (٢٠٤٠) بۆ گەشەی نزم (7)، مامناوەند

(10)، بەرز (13)، یاریگا پێویستە.

جگەلە خەمڵاندنی پێداویستی داهاتووی لە خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانیەکان لە رووی ژمارەیانەوە، بەهۆی ناهاوسەنگی لە دابەشبوونیان وەک لە بەشی دووەمدا ئاماژەمان پێداوە، لێرەدا چۆنێتی دابەشبوونی ئەم پێداویستیانە لە داهاتوودا دەخەینەروو:

١- مەلەوانگە: هەرچەندە مەلەوانگەکان لە رووی ژمارەوە بە پێی پێوەری دانیشتوان گونجاوە، بەڵام لە رووی دابەشبوونەوە تا رادەیەک نا هاوسەنگە، چونکە لەو (4) مەلەوانگەیەی شارەکە (2) مەلەوانگە لە گەڕەکی رووناکیە لە بەشی باشووری رۆژئاوای شاری کەلار وەک لە نەخشەی (7)دا دیارە، لە کاتێکدا گەڕەکەکانی باکووری رۆژهەڵاتی شارەکە هیچ مەلەوانگەیەکی تیا نیە، کە ئەم ناوچەیە لە چەندین گەڕەک پێک هاتووە، پێوستیان بە هەبوونی مەلەوانگەیە لەم ناوچەیە.

٢- هۆڵی لەشجوانی: بەهۆی ئەوەی هۆڵی لەشجوانی لە رووی ژمارەوە لەگەڵ پیداوستی دانیشتوانە، بۆیە لە رووی دابەشبوونەوە تارادەیەک هاوسەنگە لە زۆربەی گەڕەکان هۆڵی لەشجوانی هەیە، هەروەها یەکێکی تر لە هۆکارەکان دەگەڕێتەوە بۆ زۆری داواکاری لەسەر ئەم هۆڵانە لەلایەن هاوڵاتیانەوە، کە ئەمەش لە نەخشەی (8)دا دیارە.

4- کتێبخانە: کتێبخانەکان لە شاری کەلاردا کە ژمارەیان (٢) کتێبخانەیە، نەخشە (5) دەردەکەوێت، دەکەونە ناوەندی شارەوە لە گەڕەکانی فەرمانبەران و سەرکەوتن، ئەمەش وای کردووە گەڕەکانی باکووری رۆژهەڵات و رۆژئاوا هیچ کتێبخانەیەکی تێدا نیە، لە گەڵ ئەوەشدا لە ئێستادا شارەکە پێوستی بە (٢) کتێبخانەیە بۆ پڕکردنەوەی پێداوستی دانیشتووان، هەرچەندە هەریەکە لە زانکۆی گەرمیان و پەیمانگاکانی شارەکە کتێبخانەی تایبەت بەخۆیان هەیە، بەڵام بەهۆی فراوان بوونی شارەکە و دروستکردنی گەڕەک و پرۆژە نشتەجێبوونە نوێیەکان و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، پیویستی بە دروستکرنی کتێبخانەیە ئەگەر لە شێوەی کتێبخانەی ئەلکترۆنی مۆدێرن بێت یان لە شێوازە باوەکەی کتێبخانەکان.

6-هۆڵی شانۆ: هەرچەندە وەکو ژمارە هۆڵی شانۆ زیاترە لە پێویستی شارەکە، بەڵام شێوازی دابەشبوونی نارێک و ناهاوسەنگە وەک لە نەخشەی (5) دا دیارە لە بەشی رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵات و باشور و هیچ هۆڵێکی شانۆ بوونی نییە.

## دەرئەنجام

دەکرێت گرنگترین ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە لەم خاڵانەی خوارەوە کۆبکرێتەوە:

١. خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان لە سەر ئاستی جیهاندا گرنگی زۆری پێدەدرێت، چونکە هۆکارێکی گرنگە لە پێشکەوتنی هەر ناوچەیەک یان دواوکەتنی لە کاتی نەبوون یان خراپی ئاستی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکاندا.

٢. دابینکردنی پێداوستی و خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانیەکان (ڕۆشنبیری و وەرزشییەکان) لە هەر شوێن و شارێکدا کاریگەری گەورە بە جێدەهێڵێت لە سەر ژیانی ڕۆژانەی دانیشتوان لە چەند ڕوویەکەوە لەوانە لایەنی (دەروونی، ئابووری، ڕۆشنبیری، پەروەردەیی، ژینگەیی).

٣. هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی شاری کەلار وایکردوە شارەکە ببێتە یەکێک لە قەزا گرنگ و ستراتیجیەکان، کە ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، هەروەها شوێنی ناوچەی لێکۆڵینەوە ڕۆڵی گرنگی لە قەبارە و ڕووبەری شارەکە هەیە لە ڕووی خێرا فراوان بوون و گەشەسەندنی چالاکیە ئابووریەکانیەوە.

٤. شوێنی جوگرافیایی شاری کەلار یەکێکە لە پاڵنەرە سەرەکی و گرنگەکان بۆ پێوستی شاری کەلار لە دامەزراندنی خزمەتگوزاریە خۆشگوزەرانیەکان لەلایەکەوە، هاتنی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی دەوروبەری کەلار وەکو سەردانیکەر بۆ دامەزراوە خۆشگوزەرانیەکانی شارەکە، کە لەم ڕووەوە بووتە خالێکی ئەرێنی گرنگ بۆ شاری کەلار.

٥. سەبارەت بە لایەنی ئابووری ناوچەی لێکۆڵینەوە، بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی شاری کەلار، نزیکی شارەکە لە مەرزی نێودەوڵەتی پەروێز خانەوە، کاریگەری گەورەی لەسەر جوڵەی بازرگانی لە شارەکە بە دۆزینەوەی هەلی کار بۆ بەشێک لە دانیشتوانی شارەکە و بەرزبوونەوەی داهاتیانەوە هەیە، کۆی گشتی ئەوانەی لەکەرتی حکومی و تایبەت و کۆمپانیا و شوێنکارەکانی ناو کۆمەڵگاکە کاردەکەن نزیکەی (٤٤٢٠) کەسن.

٦. لە ئامارێکی تردا لە ساڵی (٢٠١٢) ڕێژەی کرێنشینان لە شاری کەلاردا (٪ ١٦,٠) بووە، لە کاتێکدا لە (٪ ٨٠,٢) خاوەن خانووی خۆیانن، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئاستی بژێوی دانیشتوان تارادەیەک بەرزە.

٧. سەبارەت بە پێکهاتەی خوێندەواری لە شاری کەلار بە پێی داتاکانی بەڕێوەبەرایەتی ئاماری سلێمانی بۆ ساڵی (٢٠٢٠) کۆی گشتی ژمارەی خوێندکارانی شاری کەلار (٦٣٩٩٣) خوێندکارە،هەروەها دامەزراندنی زانکۆی گەرمیان لە (٢٠١٠/٧/٨) شاری کەلاردا، ڕۆلێکی گرنگی هەبووە لە بەرزکردنەوەی ژمارە و ڕێژەی خوێندەواری لە ناوچەکەدا، بۆ نمونە ژمارەی خوێندکار لە زانکۆی گەرمیان لە ئێستادا (٥١٨٩) خوێندکارە، کە لەو ژمارەیە نزیکەی (٢٦٢٣) خوێنکاری دانشتووی شاری کەلارە، ژمارەی مامۆستا لەم زانکۆیەدا (٤٠٢) مامۆستایە کە هەڵگری بڕوانامەی ماستەر و دکتۆران، ژمارەی فەرمانبەرانی زانکۆی گەرمیان (٦٦٤) فەرمانبەرە.

٨. لە شاری کەلاردا هۆڵەکانی لەشجوانی زۆرترین داواکارییان لەسەرە و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک سەردانی ئەم شوێنانە دەکەن لە هەردوو ڕەگەز، لە شاری کەلاردا (20) هۆڵی لەشجوانی هەیە، کە بەسەر گەڕەکەکانی کەلاردا دابەش بوون، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە دانیشتوانی شارەکە ئاستی هۆشیاریان بەرزە لەڕووی گرنگیدان بە جەستە

و تەندروستیان.

٩. بە پێی هەڵسەنگاندنی خزمەتگوزارییە خۆشگوزەرانییەكان لە ناوچەی لێكۆڵینەوە بۆ ساڵی (٢٠٢٠) گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

بەپێی داتاكانی ژمارەی دانیشتوان بۆ ساڵی (٢٠٢٠) دانشتوانی ناوچەی لێكۆڵینەوە (١٦٠٦١٤) كەسن. لە ئێستادا شاری كەلارسینەمای تێدا نیە، پێویستی شارەكە بە پێی پێوەرەكان دەبێت (٣) هۆڵی سینەما بوونیان هەبێت، وە بۆ ساڵی (٢٠٣٠) بەپێی رێژەی گەشەی دانیشتووانی (نزم و مامناوەند و بەرز) (٤، ٤، ٦) پێویستە بەدوای یەكدا، و بۆ ساڵی (٢٠٤٠) (٤، ٦، ٨ ) سینەما پێویستە بەدوای یەكد ا، لە ئێستادا (٢) كتێبخانە بوونی هەیە لە شارەكەدا ، هەرچەندە بەپێی پێوەر بڕی (٤) كتێبخانەی دیكە پێویستە بۆ پڕكردنەوەی پێداویستی دانیشتوان، وە بۆ ساڵی (٢٠٣٠) بەپێی رێژەی گەشەی دانیشتووانی (نزم و مامناوەند و بەرز) (٥، ٥، ٦) پێویستە بەدوای یەكدا، و بۆ ساڵی (٢٠٤٠) (٥، ٧، ١٠) پێویستە بەدوای یەكدا. چەندین ناوەندی خۆشگوزەرانی بە پێی پێوەرەكان لە ئێستادا لەبڕی پێویستی دانیشتوان زیاترن، بۆ نمونە (٣) هۆڵی شانۆ زیادە و (١) یارگا و (٤) هۆڵی لەشجوانی، سەبارەت بە مەلەوانگەكان لە ئێستادا (٤) مەلەوانگە هەیە لە ناوچەی لێكۆڵینەوە، واتا هاوتایە لەگەڵ پێویستی دانیشتوان بە پێی پێوەر.ۆنی گەورە بكرێتەوە، بەهەماهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەكانی پەروەردە و خوێندنی باڵا ئەم دامەزراوە ئەلكترۆنییە ببێتە سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوی پشتڕاستكراوەی زانیارییەكان.



## پێشنیار

١- هەوڵدان بۆ دروستكردنی پلانێكی ستراتیجی مامناوەند و درێژخایەن لە بواری خۆشگوزەرانی پشتبەستن بە گەشە و زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی شاری كەلار بە شێوەیەک كاربكرێت بۆ پڕكردنەوەی پێداویستییان بۆ خزمەتگوزارییەكان، سەرلەنوێ دابەشكردنەوەی خزمەتگوزارییەكان بۆ فەراهەمكردنی هاوسەنگی دابەشبوونی خزمەتگوزارییەكان لەسەرجەم ناوچەكانی شارەكەدا.

٢- بە مەبەستی پڕكردنەوەی پێداوستی شارەكە بۆ كتێبخانە، كە لە ئستادا كەمترە لە پێویستی دانیشتوان بە پێی پێوەرە، بیر لە دروستكردنی كتێبخانەی ئەلكترۆنی گەورە بكرێتەوە، بەهەماهەنگی لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەكانی پەروەردە و خوێندنی باڵا ئەم دامەزراوە ئەلكترۆنییە ببێتە سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوی پشتڕاستكراوەی زانیارییەكان.

٣- هاندانی كۆمپانیاكانی كەرتی تایبەت بۆ وەبەرهێنان لە بواری دامەزراندنی ناوەندە

خۆشــگوزەرانیەکان لــە ناوچەکــەدا، لــە ڕێگــەی لێخۆشــبوون و کەمکردنــەوەی بــاج و پێشکەشـکردنی ئاسـانکاری دامـەزراوە حکومییـەکان بـۆ وەبەرهێنـەر، ئەمـەش هۆکاریکـە بـۆ پێشــکەوتنی لایەنــی خۆشــگوزەرانی شــارەکە.

## تقييم الخدمات الثقافية والرياضية لأنشطة الترفيهية في مدينة كلار


**الملخص:**

تهـدف هـذه الدراسـة، التـي تحمـل عنـوان «تقييـم الخدمـات الثقافيـة والرياضيـة لأنشـطة الترفيهيـة فـي كلار»، الـى توضيـح الطريقة التي يتـم بهـا توزيع الخدمات الثقافية والرياضية فـي مدينـة كلار، وكذلـك تقييـم مسـتوى هـذه الخدمـات الآن وتقييـم احتياجـات المدينـة لهـذه الخدمـات فـي المسـتقبل. ولتحقيـق هـدف البحـث تـم فـي البدايـة عـرض الدوافـع التـي ادت الـى زيـادة عـدد الخدمـات الثقافيـة والرياضيـة فـي مدينـة كلار، ثـم الحديـث عـن التقسـيم الجغرافي، وتـم تقديـم الخدمات الثقافية والرياضيـة فـي المدينـة، تلتها تقييمات لمستوى هذه الخدمـات وتقديـرات للمتطلبـات المتوقعة وفقا للمعايير القياسـية لـكل منها. وخلصـت الدراسـة اخيـرا الـى ان غالبيـة الخدمـات الثقافيـة والرياضيـة فـي كالار اقـل ممـا تحتاجـه المدينـة وفقـا للمعاييـر الدوليـة، وانـه غيـر متـوازن الـى حـد مـا فـي توزيـع هـذه الخدمـات فـي المدينـة.


## Abstract


The aim of this study is to tolerate the heading of “The provision of cultural and architectural service in the city of kalar”, to clarify the way to achieve the value of the division of cultural and architectural service in the Kalar field, and to continue the provision of the service and to estimate the provision of the provision of the provisions of the service in the future. And the purpose of the discussion is to discuss the theme in the way of the offer of the al-Dawafi to the large number of cultural and mathematical service in the media of Kalar, then the hadith of the division of geography, and the tone of the offer The cultural and mathematical service in the world, the sermons of the service and the appreciation of the expected desires and the agreement of the research of all of them. And the shortness of the lesson is that most of the cultural

and logical service in the kalar is based on the provisions of the world and agrees with the state's agreements, and it is unbalanced to the point where we are in the division of the .service in the world

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم: سەرچاوە کوردییەکان

کتێب

١-بەرزنجی، یاسین قادر چەند بابەتێک سەبارەت بە کتێبخانە و زانیارییەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١.

٢-سەید قادر، شاهۆ عوسمان، کتێبخانەی قوتابخانە و خوێندنگەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی هەورامان، سلێمانی، ٢٠١٥.

٣-قەرەداغی، بورهان، ئەزموونی شانۆی گەڕۆک، ناوەندی ڕۆشنبیری بەدلیسی، چاپخانەی ڕوون، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧.

٤-محمد، جاسم، کەلار لە لادێوە بۆ شار، بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٥-حمید، ڕزگار حاجی، کەلار مێژوویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زندوو (١٩٧٠-٢٠١٢)، لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیایی مرۆیدا، چاپخانەی چوارچرا، چاپی یەکەم، کوردستان، ٢٠١٩.

گۆڤار

١-عەلی، خالد وەلی، دابەشبوون و ئاستی خزمەتگوزاری خۆشگوزەرانی لە شاری کەلاردا، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارە (٤)، بەرگی (٨)، ٢٠١٨.

٢-نۆرێ، سەردار، ڕۆڵی سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار لە پێشخستنی کایيە جیاوازەکانی ناوچەکەدا، بڵاوکراوەی (یادی کەلار) ، بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی ڕۆژی کەلار، ژمارە (٢) شوباتی ٢٠١٨.

نوسراو و بڵاوکراوە حوکمیەکان

١-بەڕیوبەرایەتی گشتی تەندروستی گەرمیان، بەڕیوەبەرایەتی خۆپاراستنی تەندروستی گەرمیان، بەشی مۆڵەت، داتای بڵاونەکراوە٢٠٢١.

٢-بەرێوەبەرایەتی وەرزش و لاوانی گەرمیان، داتای بڵاونەکراوە لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/٧.

٣- حوکمەتی هەرێمی کوردستان،وەزارەتی پلاندانان، بەڕێوبەرایەتی ئاماری سلێمانی، نەخشەی کارگێڕی پارێزگای سلێمانی، بەشی Gis، ٢٠١٢.

## دووەم: سەرچاوە عەرەبییەکان

کتێب

١-حسين , عبدالرزاق، عباس جغرافية المدن، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧٧.
٢-الهيتي، صبري و صالح فليح حسن، جغرافية المدن، مديرية دار كتب لطباعة و النشر، الوصل، ١٩٨٦.
٣-الحديثي، طة حمادي، جغرافية السكان، دار الكتاب للطبعة و النشر، جاميعة الموصل، بدون سنة طبع.
٤-صفر، زين العابدين على تخطيط المدن (اسس ومفاهيم وتطبيقات)، دار الوضاح للنشر، عمان، ط ١،٢٠١٥.
٥-الهيتي، صبري و صالح فليح حسن، جغرافية المدن، مديرية دار كتب لطباعة و النشر، الوصل، ١٩٨٦.

## ماستەر و دکتۆرا

١- علا لطفي مهدي، المؤشرات التخطيطية لتنمية الخدمات المجتمعية في مدينة الخضر، رسالة ماجستير، كلية الرتبية للعلوم االنسانية، قسم الجغرافية، جامعة المثنى،٢٠١٩..

سێیەم: چاوپێکەوتن و سەردانی مەیدانی

١-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (سەربەست ئەحمەد) سەرپەرشتیاری هۆڵی هونەر مامۆستا لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٤.
٢-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (شرين محمود علی) جێگری بەڕێوبەری کتێبخانەی گشتی کەلار، لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/٨.
٣-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (شەرمین عەلی) ، لێپرسراوی هۆبەی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی دەروازەی نێودەوڵەتی پەروێزخان، لە بەرواری ٢٠٢٢/٣/١.
٤-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (شەهلا کريم) سەرپەرەشتیاری کتێبخانەی سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار، لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٤.
٥-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (قەیس سعدالله)، سەرپەرشتیاری هۆڵی وەرزش و لاوان لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٦.
٦-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (کوردستان عسری) سەرپەرشتیاری بەشی ژنانی مەلەوانگەی سپۆرت سەنتەر لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٨.

٧-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (نەبەز ئەحمەد) بەڕیوبەری سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلار لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٢.

٨-چاوپیکەوتن لەگەڵ بەرێز (ئارا خان) سەرپەشتیار لە هەوارگەی ستی ئای لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/٢١.

٩-چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (ئەحمەد رحیم) لە بەشی ئەندازیاری بەرێوبەرایەتی رۆشنبیری لاوانی گەرمیان لە بەرواری ٢٠٢١/١٢/١٤.

**چوارەم: بەرنامەکۆمپیوتەرییەکان**

١-MARC GIS, ARC Map V. ١, ٨, ١٠

٢- Google earth pro ٢٠٢٠.

٣- IBM SPSS Statistics V. ٢٦

٤- وێنەی ئاسمانی لەڕێگەی بەرنامە sasplanet



ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم

# بەزۆر ڕاگواستنی گوندەکانی ناوچەی گەرمیان و رۆڵیان لەگەشەی دانیشتوانی ناوەندی قەزای کەلار دا

بێگومان چەندین هۆکار هەن دەبنە هۆی گەشەسەندن و زۆربوونی دانیشتوان لە هەر شوێنێکدا و دواجار و بەهەموویانەوە شارنشینی دێننە کایەوە، هەروەها ئاستی گەشەی شارنشینی پەیوەستە بە چەندین کۆڵەکەی سەرەکییەوە , لەوانە پێگەی جوگرافی و هێزی ئابوری و هێزی مرۆیی لەو شوێنەدا، بۆیە پێگەی شار گرنگە لە رووی هەبوونی سەرچاوەی ئاو، زەویی فراوان و تەخت و بەپیت، هەبوونی داهاتی سروشتی و مرۆیی، هەبوونی تۆڕی گواستنەوە و...هتد. لە لایەکی ترەوە و بەدرێژایی مێژوو گەلێک جار دروستبوونی شار بە هۆکاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بووە، بێگومان ئەم هۆکارانەش لە نێوان خۆیاندا کارتێکردنیان بەسەر یەکەوە هەبووە و بە شێوەیەک لە شێوەکان پەیکەری شاریان هێناوەتە کایەوە و گەیشتۆتە ئاستێکی وا کە ڕۆڵی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی خۆی بگێرێت.

بابەتەکەمان پەیوەندی بە شاری کەلارەوە هەیە کە لەڕاستیدا چەندین بڕیاری سیاسی بووە هۆی دروستبوون و گەشەکردنی ئەم شارە، لە سەرەتاوە هەر هاوکات لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ڕێککەوتنامەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی ئەوکاتە و دەسەڵاتی عیراقی لە ١٩٧٠/٢/٢٨ بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (١٣٧) کەلار لە گوندێکەوە کرا بە ناوەندی قەزا کەلار، لەو کاتەدا ژمارەی دانیشتوانەکەی تەنها (٨٢٦٧)کەس بوو[١]، لە سەروبەندی ئەو بڕیارەدا قەزای کەلار سەر بە پارێزگای کەرکوک بوو، بەڵام هەر زوو دەسەڵاتی عێراقی بە پێی بڕیارێکی ئیداریی سیاسی و بۆ مەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لە پارێزگای کەرکوک و کەمکردنەوەی رووبەری پارێزگاکە و بە پێی پلانێکی داڕێژراو بە مەرسومی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە ١٩٧٥/١١/٦ هەردوو قەزای کەلار و چەمچەماڵی لە پارێزگای کەرکوک دابڕی و خستیانیە سەر پارێزگای سلێمانی[٢].

دەسەڵاتی عێراق هەر لەدوای رێککەوتنامەکەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ و نسکۆی شۆڕشی کورد لە ئازاری هەمان ساڵدا، ئیتر دەستی کرد بە چەندین رێوشوێنی زۆر دژوار بەرانبەر بە گەلی کورد بەگشتی و بە دانیشتوانی ناوچەکانی گەرمیان بەشێوەیەکی تایبەتی و لەرێگەی دەرکردنی بڕیاری ئیداری بۆ دەستبەسەراگرتن و بە زۆر راگواستنی دانیشتوانی گوندەکانی سنووری ناوەندی قەزای خانەقین و ناحییەکانی قۆرەتوو و مەیدان و جەلەولا ... هتد , ئەوەش بێگومان بۆ سڕینەوەی مۆرکی کوردێتیی ناوچەکە، دواتر دەستی برد بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەزارەها پەیوەستی کشتوکاڵی دانیشتوانە کوردە رەسەنەکەی و هەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتیی سەدەها هەزار دۆنم موڵکی پەتیی خاوەن موڵکە کوردەکان و گۆڕینیان بۆ زەویی ئەمیری (حکومی) , ئەویش بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی بەناو سەرکردایەتی شۆڕش (کە ئەو کاتە هێزی یاسای هەبوو) بە ژمارە (٤٨٩) لە ١٩٨١/٤/٢١ هەموو ئەو زەویانە کرانە پەیوەست و لە تۆمارگە فەرمییەکانی دەسەڵاتی عێراقیدا کرانە ناو عەرەبی هاوردەوە (بەداخەوە ئەو بڕیارە تاوەکو ئەمڕۆ هەڵنەوەشاوەتەوە) , کە بریتی بوون لە هەزارەها خێزان لە چوارچێوەی ٣١ هۆزی عەرەبیدا و نیشتەجێی ئەو گوندانە کران کە دانیشتوانەکانی بەزۆر راگوێزرابوون[٣]، لە بەرانبەردا هەموو دانیشتوانی گوندەکانی ناحیەی قۆرەتوو کە ژمارەیان (٧٠)گوند بوو (بڕوانە خشتەی ژمارە: ١)، هەموو دانیشتوانی گوندەکانی مەیدان و بەمۆ کە ژمارەیان ٥٧ گوند بوو (بڕوانە خشتەی ژمارە : ٢) , زۆربەی هەرە زۆریان روویان کردە ناوەندی قەزای کەلار و لەوێ نیشتەجێبوون و بە هەزاران لەو گوندنشینانە لە دامودەزگاکانی قەزاکەدا دامەزران یان سەرقاڵی ئیش و کەسابەتی سەختی ئەو کاتەوە بوون، هەروەها لە هەمان ساڵدا دانیشتوانی (١٠) گوندی سنووری ناوچەی (شێخ باوە)ی سەر بە ناحیەی جەلەولا بەزۆر بارکران و بەرەو پارێزگای ئەنبار (رومادی) راپێچکران، بەڵام دەیەها لەو خێزانانە بە دزییەوە خۆیان گەیاندە ناوەندی قەزای کەلار و لەوێدا نیشتەجێبوون [٤]، بڕوانە (خشتەی ژمارە : ٣).

هەر لە چوارچێوەی هەمان شاڵاوی بەزۆر راگواستن و تەعریب کە دەسەڵاتی عێراقی بە پلان کاری لەسەردەکرد، لە ساڵی ١٩٨٧ز سەرجەم گوندەکانی ناوچەی (زەنگاباد: زەنگاوات)ی سەر بە ناحیەی کۆکس و گوندە کوردنشینەکانی ناحیەی جەبارە و قەرەتەپەی بەزۆر راگواست و عەرەبی هاووردەی خستە شوێنیان و دانیشتوانە کوردەکەی بەزۆر نیشتەجێی کۆمەڵگای زۆرەملێی (سموود)ی کردن , بێگومان زۆر لەو خێزانانە بەدوای بژێویدا پەنایان بۆ ناوەندی قەزای کەلار برد[٥].

بەزۆر راگواستنی دانیشتوانانی گوندەکانی سەر بە ناحیەی تیلەکۆ و ناوەندی قەزای کەلار بۆ کۆمەڵگەی زۆرەملێی (سموود) و پەنابردنی زۆر لەو خێزانانە بۆ ناوەندی کەلار و هەروەها ئەنجامدانی قۆناغی سێیەمی پرۆسەی بەدناوی ئەنفال لە ١٩٨٨/٤/٢٠ کە بە درندەترین قۆناغ هەژمار کراوە و لە چوارچێوەی نزیکەی ٥١٥ گوند ئەنجامدرا [٦] ، بێگومان ئەو خێزانانەی کە لەو پرۆسەیەدا قوتار بوون پەنایان بردۆتە ناوەندی قەزای کەلار، ئەم هەموو پرۆسانەی بەزۆرراگواستن و ئەنفال و روخاندنی گوندەکانی گەرمیان

هۆکارێکی سەرەکی بوون بۆ زیادبوونێکی خێرا و ناسرووشتی لە ناوەندی قەزای کەلاردا ، بۆ نموونە لە سەرژمێریی ساڵی ١٩٤٧ دانیشتوانانی ناوەندی قەزای کەلار(١٠٦٤) کەس بوونە، لە سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٥٧ز بریتی بووە لە (١٢٨٥) کەس واتا گەشەی ساڵانەی دانیشتوانان لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا تەنها بەرێژەی ٩ ,١٪ بووە، بەڵام گۆڕانکارییە گەورەکە لە گەشەی دانیشتوانانی ناوەندی قەزای کەلار لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا دەرکەوتووە (بڕوانە خشتەی ژمارە: ٤) کە ڕێژەی گەشەی ساڵانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٨٧دەگاتە ١ ,٢١٪ ئەمەش بێگومان زیادبوونێکی ناسرووشتییە[٧].

لە دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق و نەمانی ڕژێمی بەعسی دەسەڵاتدار , بەسەدەها خێزانی کوردی بەزۆر بارکراوی پارێزگاکانی خوارووی عێراق ڕوویان کردە ناوچەکانی هەرێمی کوردستان و ناوەندی قەزای کەلار لەو گەڕانەوەیەدا بەشی شێری بەرکەوت، هەروەها هەزاران خێزانی تر بەهۆی ناسەقامگیری ئەمنییەوە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٥ – ٢٠١٠ ڕوویان لە شاری کەلار کردووە، جگە لەوە هەر لە دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق ساڵی ٢٠٠٣ و ساڵانی دواتری و بگرە تاوەکو ساڵی ٢٠١٤، ساڵانە هەرێمی کوردستان بودجەیەکی باشی بۆ دەهات و شاری کەلار بووە ناوەندی ئیدارەی گەرمیان و چەندین دامەزراوەی فەرمی تێدا دروستکرا و بەو بودجە باشەی ئەو ماوەیە سەدەها پرۆژەی خزمەتگوزاری لە کەلار و دەوروبەری ئەنجامدرا ...هتد، ئەم جووڵەی بژێویە وایکرد دووبارە گەشەی دانیشتوانی لە ناوەندی قەزای کەلاردا گەشەیەکی خێراتر بەخۆوە ببینێت و لە ساڵی ٢٠١٢ ئاماری دانیشتوانانی ناوەندی قەزای کەلار بگاتە (١٣٢١٩٧) کەس[٨]. لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٤ ڕێکخراوی (داعش) بڕێکی زۆر لە خاکی عێراقیان داگیرکرد و تاوەکو گەیشتە سنوری ناوچەی گەرمیان و شاری (جەلەولا) کەوتە بندەستیان، ئەو ڕەوشە نالەبارە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ دەرچوونی هەزاران خێزان لە هەموو نەتەوەکان و پەنایان بردە بەر ناوچەکانی هەرێمی کوردستان بێگومان شاری کەلار یەکێک بوو لەو شارانەی کە ئاوارەیەکی زۆر ڕووی تێکرد و تاوەکو ئێستاش زۆربەیان هەر لەم شارەدا دەژین، ئەویش بەهۆی دەسکەوتنی هەلی کار و بەرقەراربوونی ئاسایش تیایدا. پێگەی شاری کەلار کە ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە و شوێنێکی ناوەڕاست و نزیکە لە زۆربەی شارەکانی کوردستان وعێراق و نزیکە لە سنووری ئێران و هەبوونی مەرزی نێو دەوڵەتیی پەروێزخان و هەبوونی دەیەها کۆلێج و پەیمانگای حکومی و تایبەت لەم شارەدا و چەندین هۆکاری تر وای کردووە ئەم شارە زیاتر گەشەی دانیشتوانی بەخۆوە ببینێت و ئاماری دانیشتوانانی لە ساڵی ٢٠٢٤ بگاتە ( ١٩٤١٦١ ) کەس[٩] , بەمەش شاری کەلار بۆتە چوارەم لە گرنگترین شارەکانی هەرێمی کوردستان .

لە کۆتاییدا بۆ مەبەستی زیاتر گەشەکردنی شاری کەلار و بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندێکی هێزی مرۆیی گەورە و شارنشینییەکی ستراتیجی لە باشووری هەرێمی کوردستاندا پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان کاربکەن بۆ پەرەپێدان بە هەرچی زووە پەرەپێدان بە هۆکارەکانی گەیاندن وەکو دروستکردنی جادەی دووسایدی لە نێوان شاری کەلار و شارەکانی سلێمانی و جەلەولا و خانەقین و مەرزی پەروێزخان ...هتد، سوودوەرگرتن لە سامانی

ئاوی رووباری سیروان بە دروستکردنی هەردوو بەنداوی بەردەسوور و باوەنوور، هێنانی کارگەی زەبەلاحی جۆراوجۆر لە رێگای وەبەرهێنانەوە بۆ بەرهەمهێنان لەبواری پیشەسازیی کشتوکاڵی، چونکە ئەم ناوچەیە خاوەن زەوییەکی بەرفراوانی تەخت و بەپیتە، بایەخدان بەگەشتوگوزار و پەرەپێدان بە خوێندنی باڵا و کایەی تەندرووستی لەم شارەدا ...هتد.

خشتەکان:

خشتەی ژمارە (١)

زانیاری دەربارەی ژمارەی خێزان لە گوندەکانی سەر بە ناحیەی (قورەتوو) کە لە ساڵی ١٩٧٥ بەزۆر ڕاگوێزراون

| ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان | ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان | ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | حەوش کورپوو | ١٥٠ | ٢٥ | سەید سخی | ٥ | ٤٩ | بانزەمین سعید محمد | ١٥ |
| ٢ | مەرکەز حدود | ٢٥ | ٢٦ | موسا عوسمان | ٤٠ | ٥٠ | بانزەمین سید کریم | ٣٥ |
| ٣ | مەرکەز شێخ | ٧٠ | ٢٧ | کەلایی میرە | ٣٠ | ٥١ | مەلا سلێمان | ٤١ |
| ٤ | دارەخورمای محمد سالم | ١٠ | ٢٨ | شێخ فەیزوڵا | ٦٠ | ٥٢ | سەنگەری خواروو | ٢٥ |
| ٥ | دارەخورمای سەید غەریب | ٣٠ | ٢٩ | چیاسورخ | ٢٥ | ٥٣ | سەرنگەری سەروو | ٢٤ |
| ٦ | کەنی زەرد | ٢٥ | ٣٠ | قەڵەمە | ٦٠ | ٥٤ | گۆرەشەلە | ٥٠٠ |
| ٧ | مەجید سالار | ١٥٠ | ٣١ | خەیاڵ | ٣٠ | ٥٥ | تازەدێی گۆرەشەلە | ٣٠ |
| ٨ | پەروێزخان | ١٢٠ | ٣٢ | ساڵح ئاغا | ٢٥٠ | ٥٦ | عەلی خاڵە | ٢٥ |
| ٩ | عەلی میر | ١٠٠ | ٣٣ | وەلی ئاغا | ٤٠ | ٥٧ | بانە بۆر | ٣٥ |
| ١٠ | مەحمود قەجەر | ٥٠٠ | ٣٤ | تازەشار | ٣٠ | ٥٨ | قەڵا تەپەی سەروو | ٢٠ |
| ١١ | سەرقزڵ | ٤٥ | ٣٥ | غەیدان | ٢٥ | ٥٩ | قەڵا تەپەی خوارو | ٣٠ |
| ١٢ | سەید کەوەن | ٢٨ | ٣٦ | دارخورمای مەلا حەسەن | ٢٠ | ٦٠ | کانی پەموو | ٣٥ |
| ١٣ | بەردی عەلی سەروو | ٤٠ | ٣٧ | کەرەپولە | ٤٠ | ٦١ | تەنورە | ٢٨ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | بەردی عەلی خواروو | ٤٥ | ٣٨ | هەنجیرە | ١٠ | ٦٢ | ڕەزوار | ٥٠ |
| ١٥ | تۆپ عەسکەر | ٣٠ | ٣٩ | پەلەچەفت | ٥٠ | ٦٣ | چوار کڵاوی سەروو | ٨٠ |
| ١٦ | پشت پەنگ | ٢٠ | ٤٠ | گەرمک قەیسەر | ٥ | ٦٤ | چوار کڵاو خواروو | ٨٠ |
| ١٧ | شێرەوەن | ٧٠ | ٤١ | فەرەج زۆرە | ١٥ | ٦٥ | سەید مستەفا | ٤٠ |
| ١٨ | گاکوڵ | ٨٥ | ٤٢ | سیاوڵەی نەجم | ١٠ | ٦٦ | کانی شیرینە | ٣٠ |
| ١٩ | سەوزبڵاخی گەورە | ١٣ | ٤٣ | سیاوڵەی ڕەشید | ٦ | ٦٧ | پەلە چەفت | ٥٠ |
| ٢٠ | سەوزبڵاخی بچووک | ٣٠ | ٤٤ | حەمە سەنگەری | ٥ | ٦٨ | سەرچەم | ٢٠ |
| ٢١ | خدری بچووک | ٣٠ | ٤٥ | قۆرەتوو | ٥٠ | ٦٩ | عەلی شەفی | ٧٠ |
| ٢٢ | خدری گەورە | ٥٠ | ٤٦ | قادر اغا | ٥٠ | ٧٠ | قادر جمعە | ٥٠ |
| ٢٣ | ئاوای گەورە | ١٥٠ | ٤٧ | باریکە | ٨١ | | | |
| ٢٤ | کانی ماسی | ٥٠ | ٤٨ | دەورە | ٧٠ | | | |

سەرچاوە: ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم، دەربارەی ڕاگواستن وتەعریب لە ناوچەی خانەقین، چ١، کەرکوک، لا: ٤٩-٥١.

### خشتەی ژمارە (٢)

### زانیاری دەربارەی ژمارەی خێزان لە گوندەکانی سەر بە ناحیەی (مەیدان) کە لە ساڵی ١٩٧٥ بەزۆر ڕاگوێزراون

| ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان | ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان | ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەیدان | ١٠٠ | ٢٠ | دەربەندی بێلولە | ٢٥ | ٣٩ | ئاوبار | ٧٠ |
| ٢ | کەوزیناڵی | ٦٠ | ٢١ | شاوازی | ٤٥ | ٤٠ | گەرمک | ٥٠ |
| ٣ | کونەقەل | ٢٠ | ٢٢ | باخەهەنارە | ١٥٠ | ٤١ | بانی بی | ٧٠ |
| ٤ | تۆڤگە | ٩٠ | ٢٣ | گاخۆری | ٦٥ | ٤٢ | کوێرەک | ١٢٠ |
| ٥ | قەسڵان | ٣٩ | ٢٤ | حاجیلەر | ١٥٠ | ٤٣ | خەلیفە ئەحمەد | ١٨ |
| ٦ | هۆرێن | ٣٠٠ | ٢٥ | دێسوتک | ٦٠ | ٤٤ | ناودێ | ٢٠ |
| ٧ | داریئیمام | ٣٠ | ٢٦ | چیا ڕەزا | ٦٠ | ٤٥ | پشتە | ٣٥ |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | خەرکنێ | ٣٢ | ٢٧ | کانی بۆر | ٢٠ | ٤٦ | کانی وەیسکی | ٢٤ |
| ٩ | کەمتاران | ٣٥ | ٢٨ | خورخورێ خواروو | ٢٥ | ٤٧ | کانی پاشا | ٣٠ |
| ١٠ | میشیاو | ٤٨ | ٢٩ | خورخورێ سەروو | ٥٥ | ٤٨ | تۆوشکی | ١٥ |
| ١١ | باقوبەرە | ٦٠ | ٣٠ | عەلی پەکان | ٧٦ | ٤٩ | گمە | ١٣ |
| ١٢ | کانی کرمانج | ٧٠ | ٣١ | قەرەچەم | ٦٥ | ٥٠ | بەرۆێن | ٣٠ |
| ١٣ | هۆمەرمل | ٢٥ | ٣٢ | گۆڕی گنوش | ٣٠ | ٥١ | گڵێجاڵ | ٤٠ |
| ١٣ | ئازادی | ٥٥ | ٣٣ | زەلکە | ٥٠ | ٥٢ | قەلب | ٢٠ |
| ١٥ | حەسار | ٢٠ | ٣٤ | جەبراوە | ٣٠ | ٥٣ | بەلەسۆی خواروو | ٣٠ |
| ١٦ | ناوماجک | ١٥ | ٣٥ | سۆلاوە | ٤٠ | ٥٤ | بەلەسۆی سەروو | ٢٠ |
| ١٧ | سەرتەک | ٤٠ | ٣٦ | سەراو | ٢٥ | ٥٥ | چواردااران خواروو | ١٩ |
| ١٨ | کانی ژاڵە | ٣٠ | ٣٧ | شمشێر کوڵ | ٧٢ | ٥٦ | چواردااران سەروو | ١٥ |
| ١٩ | بێلولە | ١٣٠ | ٣٨ | ژاڵەناو | ٤٦ | | | |

سەرچاوە: ڕەحیم حەمید عەبدولکەریم، دەربارەی ڕاگواستن وتەعریب لە ناوچەی خانەقین، چ١، کەرکوک، لا: ٥٥-٥٧.

خشتەی ژمارە (٣)

زانیاری دەربارەی ژمارەی خێزان لە گوندەکانی سەر بە ناحیەی (جەلەولا) کە لە ساڵی ١٩٧٥ بەزۆر ڕاگوێزراون

| ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان | ز | ناوی گوند | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەمین حەبیب | ١٥ | ٦ | کەنەسوور | ٢٢ |
| ٢ | عەلوەش | ١٦ | ٧ | بنەباخ | ٨ |
| ٣ | فەدعەە مەعروف | ٤٥ | ٨ | تەپەچەرموو | ١٥ |
| ٤ | سەرچەم | ٥ | ٩ | قەلا | ٢٥ |
| ٥ | ئاوایی گەورە | ٧٥ | ١٠ | پیانلو | ٢٩ |

سەرچاوە: شێخ باوە، سەرگوزەشتەی ناوچەیەک، چاپخانەی کارۆ، چ١، سلێمانی ٢٠٢٢، لا:٥١.

خشتەی ژمارە (٤)

زانیاری دەربارەی ژمارەی دانیشتوانانی شاری كەلار لەماوەی نێوان ١٩٤٧ — ٢٠٠٩

| ز | ساڵ | ژمارەی دانیشتوانان | ماوەی نێوان ساڵەكان | ڕێژەی گەشەكردنی ساڵانە٪ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٤٧<br>١٩٥٧ | ١٠٦٤<br>١٢٨٦ | ١٩٥٧-١٩٤٧ | ١,٩ |
| ٢ | ١٩٧٧<br>١٩٨٧ | ٩٢٧٤<br>٦٣١٠٢ | ١٩٨٧-١٩٧٧ | ٢١,١ |
| ٣ | ٢٠٠٩ | ١٣٧٤٢١ | ٢٠٠٩-١٩٨٧ | ٨,٠٩ |

سەرچاوە: د. ابراهیم قاسم درویش محمد پالانی، اثرالبیئة السیاسیة في التغیر الدیموغرافي في مدینة كلار، مجلة مركز الدراسات الستراتیجیة، عدد ٦٩، السلیمانیة، ٢٠١٣، ص:٣٧٠.

## پەراوێز و سەرچاوەكان :

(١) سەباح عەلی جاف، كەلار (١٩٢٧-١٩٧٥) لێكۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی سیاسی، كارگێڕی و رۆشنبیری، چ١، ٢٠٢٤، ل: ١٧٤ و ٣١٢.

(٢) ابراهیم قاسم درویش محمد پال□انی ، اثرالبیئة السیاسیة في التغیر الدیموغرافي في مدینة كلار، مجلة مركز الدراسات الستراتیجیة ، عدد ٦٩، السلیمانیة ، ٢٠١٣، ص٣٧٠. هەروەها لە چوارچێوەی هەمان پرۆسەدا بەپێی مەرسومی كۆماری ژمارە ٦٠٨لە ١٩٧٥/١١/٦ز ، قەزای كفری بەهەموو ناحییەكانییەوە لە پارێزگای كەركوكی دابڕێ و خستییە سەر پارێزگای دیالا، بڕوانە: سهیل خورشید عزیز ، الاطلس الاداري لجنوبي كردستان بین الاعوام ١٨٥٠-١٩٩٠، ط١، ٢٠٢١م , ص:١٦٣،١٦٠.

(٣) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ڕەحیم حەمید عەبدولكەریم ، دەربارەی ڕاگواستن وتەعریب لە ناوچەی خانەقین ، چ١ ، چاپخانەی كارۆ ، كەركوك ، ٢٠١٤، ل: ٣٩.

(٤) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە شێخ باوە ، سەرگوزەشتەی ناوچەیەك ، چاپخانەی كارۆ ، چ١ ، سلێمانی ٢٠٢٢ز ، ل:٤٢ و ل:٥١.

(٥) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی ڕاگواستن و تەعریبكردنی ناوچەی زەنگاباد بڕوانە: ڕەحیم حەمید عەبدولكەریم ، لە ناوچە دابڕێنراوەكانی لیوای كەركوك ، زەنگاوات وەكو نموونە ، گۆڤاری بانەڕۆژ , ژمارە ١٢٧ ، ئایاری ٢٠٢٣ز ، ل: ٣- ١٥ .

(٦) د. فاتح سەنگاوی , عمليات الانفال في كردستان العراق ، في ضوء مقاصد الشريعة والاتفاقيات والمواثيق الدولية ، ط٢ ، مطبعة كارو ، السليمانية ، ٢٠٢٣م ، ص: ١٢١.

(٧) د.ابراهيم قاسم درويش محمد، سەرچاوەی پێشوو ، لا:٣٦٩-٣٧٠.

(٨) مقداد شاكەلی ، شاری کەلار ، لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای شار ، چ١، چاپخانەی گەنج ، ٢٠١٦، لا:٨٥.

(٩) داتای بڵاونەکراوە لە (بەڕێوەبەرایەتی ئاماری گەرمیان) بەسوپاسەوە وەرمگرتوون.

# بارودۆخی ڕۆشنبیریی کەلار و گەرمیان و ڕۆڵی نووسەر و ئەدیبانی ناوچەکە لە گۆڤار و بڵاوکراوە کوردییەکاندا (١٩٢١- ١٩٧٥)



سەباح عەلی جاف

مامۆستا لەبەشی مێژوو- کۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی گەرمیان

کردنـەوەی مزگـەوت و قوتابخانـە لـە کـەلاردا، هـاوکات نزیکـی کـەلار لـە دوو شـاری ئاوەدانـی وەک (کفـری و خانەقیـن) کاریگـەری بەرچاویـان لەسـەر بارودۆخـی ڕۆشـنبیری هەبـووە، کەسـانی خوێنـدەوار لـە نێـو بنەماڵـەی بەگزادەدا هـەر لـە سـەرەتاوە بـۆ خزمەتـی ئـەم لایەنـە کاریانکـردووە، ئەویـش بەکردنـەوەی مزگـەوت و قوتابخانـە، لەگەڵیشـیدا بـۆ پەرەپێدانـی زیاتـری لایەنـی ڕۆشـنبیری و هۆشـیاریان بـەردەوام سـەردانی جێگـە ئاوەدانەکانـی ئەودەمـەی کوردسـتان بـە تایبـەت کفرییـان کـردووە.

مەحمـوود پاشـای جـاف وەک سـەرۆکی هـۆزی جـاف سـەرباری ڕاپەڕاندنـی ئیشـوکارەکانی هۆزەکـەی، بـۆ خـۆی خاوەنـی کەشـکۆڵێکی بـە بەهـا بـووە، کەشـکۆڵەکەی لـە دوو بەرگـدا لەلایـەن بنکـەی ژینـەوە بـە چاپگەیەنـراوە، مەحمـوود پاشـا بەشـێک لـە تەمەنـی خـۆی بەخشـیوەتە ئـەدەب و کەلەپـووری نەتەوەکـەی، بـۆ خۆیشـی دەسـتی نووسـینی شـیعری هەبـووە، لەگەڵیشـیدا گرنگـی بـە ئەدیب و شـیعری شـاعیران داوە , هـەر بۆیـە لـە کەشـکۆڵێکدا کۆیکردونەتـەوە و پەیوەنـدی بەتینشـی لەگـەڵ شـاعیرانی کـوردی سـەردەمی خۆیـدا هەبـووە، وەک: مەولـەوی (١٨٠٦-١٨٨٢)، شـێخ ڕەزای تاڵەبانـی (١٨٣٧-١٩٠٩)، پیرەمێـرد (١٨٦٧-١٩٥٠)، ئـەم کەشـکۆڵە گەنجینەیەکـی گـران بەهایـە، شـیعری گەلێـک شـاعیری کـورد و فارسـی تێـدا کۆکراوەتـەوە، بەشـێکی ئـەم کەشـکۆڵە بـە دەسـتوخەتی مەحمـوود پاشـا نووسـراوەتەوە، تەنانـەت بـاس لەوەیـش کـراوە، سـەرۆکاکانی جـاف کتێبخانـەی گەڕۆکیـان هەبـووە و لەکاتـی گەرمیـان و کوێسـتانی جافـدا لەگـەڵ خۆیانـدا گواسـتویانەتەوە (جـاف، ٢٠١٤، ل١٠، ٣٣، ٥١، ٥٣).

هەر لە نێو بنەماڵەی جافدا، دوو كەسایەتی تر خاوەنی دوو كەشكۆڵی بە پێزن تا ئێستا بڵاو نەكراوەتەوە، ئەوانیش هەریەك لە ڕەزا بەگی حەمە پاشای كەیخەسرەو بەگی جاف، دەستی نووسینی شیعری بەنازناوی (دانش) هەبووە و شیعری بڵاوكردەوەتەوە، ئەو خاوەنی گەلێك دەستنووس و كتێبخانەیەكی دەوڵەمەند بووە، جگە لە كەشكۆڵەكەی ئەوانی تر لەناو چوون، سەرباری ئەمەیش ڕەزا بەگ بۆ خۆی بەهرەی خەتخۆشی هەبووە، شیعری گەلێك لە شاعیرانی (كورد و فارس)ی لە دوو توێی (٣١٢) لاپەڕەدا بە خەتی (شكستە) لە كەشكۆڵەكەیدا نووسیوەتەوە (باوەڕ، ٢٠٢١، ل١٥-٢٠)، كەریم بەگی جاف كتێبخانەیەكی تایبەتی هەبووە، خاوەنی كەشكۆڵێكی گەورەیە، شیعری گەلێك لەشاعیرانی فارس و كوردی تێدا كۆكراوەتەوە، وەك (مەولەوی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، نالی...هتد)، جگە لەمەیش كەریم بەگ خاوەنی كتێبی (تەئریخی جاف)ە، ئەم بەرهەمە كاتی خۆی كەریم بەگ بە چوار نووسخە نووسیووەتەوە یەك لەو نووسخانەی بە عەباس عەزاوی (١٨٩١-١٩٧١) داوە (نەریمان، ١٩٩٤، ل٧٨ ؛ جاف، ١٩٩٥، ل٨-١٠).

هەر لە سنووری كەلار و دەوروبەریدا ژمارەیەك كەشكۆڵی تر هەبوون بەسەرهات و شیعری شاعیرانی تێدا كۆكراوەتەوە، لەوانە: كەشكۆڵی شێخ عەبدوڵلای قەڵاتۆپزان (؟-١٩١٦)، كەشكۆڵی مەلا ئەحمەدی دەككە (١٨٨٠-١٩٥٩)، كەشكۆڵی شێخ مەحموودی شێخ سلێمانی شاكەل (١٩١٩-١٩٤٥) (باوەڕ، ٢٠٢١، ل٢٠). هەریەك لە (هەردەوێڵ كاكەیی و كاروان عوسمان خەیات)یش بەرهەمێكیان بەناوی (كەشكۆڵی گەرمیان) چاپكردووە، ناوی ئەو كەسانەی لەسەر نییە كاتی خۆی بە كۆكردنەوە و هاتنە بەرهەمی ئەم كەشكۆڵە هەستاون، لەم كەشكۆڵەدا شیعری گەلێك شاعیری تێدا كۆكراوەتەوە بە تایبەت شیعری شاعیرانی گەرمیان، لەوانە: خەلیل منەوەر (١٨٧٩-١٩٢٣)، عەلی گریانی، شەوقی...هتد (كاكەیی، ڕێبین، ٢٠١٧، ل ١٦، ٢٥)، سەرباری بەرەو پێشچوونی ڕەوتی ژیان ، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا كەسایەتییەكی تری كەلار و دانیشتووی گوندی (پوقە) بە كاری كۆكردنەوە و بەسەرهات و شیعری شاعیرانەوە خەریك بووە و لە كەشكۆڵێكدا هەموویانی كۆكردوەتەوە، ئەویش حەمەی شاسواری پۆقە (١٩٣٠-٢٠٠٤) بووە (باوەڕ، ٢٠١٤، ل٨٩).

حەمە بەگی جاف لە خولی دووەمی هەڵبژاردنەكانی ئەنجوومەنی نوێنەراندا ئەندام بووە، سەرباری كاری سیاسی، بۆ خۆی پیاوێكی ڕۆشنبیر بووە و پێش ئەوەی ببێتە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەران، لە نووسینێكدا بەناوی (م. ج. پیرووەیس) , كە مەبەست محەمەد جافە لە گۆڤاری (زار كرمانجی) لەژێر ناوی (بۆ مەندوبەكانمان) وتارێكی نووسیوە، مستەفا نەریمانیش لە وتارێكیدا لە گۆڤاری ڕەنگیندا جەخت دەكاتەوە ئەو (م. ج. پیرووەیس)ی گۆڤاری زاری كرمانجی حەمە بەگی جاف بووە

(پیرووەیس، ١٩٢٨، ل٨؛ نەریمان، ١٩٩٤، ل١٩)، گۆڤاری زاری کرمانجی لە ساڵی دووەمی دەرچوونیدا بەهۆی خراپی ئامێری چاپکردنەوە توشی گرفت بووە , ئەمەیش وایکردووە بۆ ماوەیەک لە دەرچوون بوەستێت، بەڵام بە هەوڵی چەند کەسێک لە رووی داراییەوە هاوکارییان پێشکەشکردووە و گۆڤارەکە دەرچووەتەوە، حەمە بەگ لە کەلارەوە بڕی (٥) ڕوپیەی بۆ ئەو مەبەستە پێشکەشکردووە گۆڤارەکە بە کەسە باشەکانی کورد ناوی بردووە (زاری کرمانجی، ١٩٢٨، ل٢٣).

هەردوو مزگەوت و قوتابخانەی کەلار، سەرباری لایەنی پەروەردە، کاریگەری زۆریان لەسەر لایەنی ڕۆشنبیریش هەبووە بە تایبەت لە بواری ئەدەبی و هاندانی فەقێ و قوتابیان بۆ ناسین و خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی کورد، لە مزگەوت و حوجرەی کەلاردا، بەشی زۆری فەقێیەکان شارەزایی باشیان لە خوێندن و نووسینی کوردیدا هەبووە، ڕۆڵی گەورە و گرنگیان لە پاراستن و گەشەپێدانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا بینیووە، شیعری شاعیرانی کوردیان خوێندووەتەوە، مەلا حەمە نەجیب (١٩٣٢-١٩٩٦) خاوەنی دەنگێکی خۆش بووە لەکاتی وانە وتنەوە بە فەقێکانی شیعری بۆ خوێندوونەتەوە و بە سیاچەمانەیش قەسیدەی شاعیرانی بە ئاوازێکی خۆش وتووەتەوە (شاکەلی، ٢٠١٦، ل٧٣، ٧٨)، لە قوتابخانەی کەلاریشدا بەشێک لە مامۆستایان کاریگەریان لەسەر لایەنی ڕۆشنبیری قوتابیان , بە تایبەت پێناساندنی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بە منداڵان هەبووە، زۆرجار مامۆستایان قوتابیانیان لەسەر شیعری شاعیران ڕاهێناوە، قوتابخانەکەیش خاوەن کتێبخانەیەکی بچکۆڵە بووە کە مامۆستایان و قوتابیان سوودیان لێبینیوە (جاف، ٢٠١٦، ل٥٤).

کەسایەتییەکانی بەگزادەی جاف سەرباری کاروباری هۆزەکەیان , بۆ خۆیشیان خەڵکانی ڕۆشنبیریان تێدا هەڵکەوتووە و لەم ڕووەوە لە باشترکردنی ئەم لایەنەی کەلاردا ڕۆڵیان هەبووە، کەریم بەگی جاف دیوەخانەکەی بەردەوام خەڵکانی روناکبیر و ئەدیب و مەلا و مامۆستای لێنەبڕاوە و تێیدا کۆڕی شاعیر و ئەدیبان گرێدراوە، لەگەڵ ئەمەیشدا کەریم بەگ پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی ڕۆشنبیری سەردەمەکەیدا هەبووە چ لە ئاستی کوردستان یاخود عێراق، ئەوەتا عەباس عەزاوی پارێزەر و مێژوونووس لە درێژەی گەشتە زانستییەکانیدا , بەمەبەستی دەستخستنی دەستنووس و زانیاری لەسەر ناوچە و هۆزە جیاجیاکان , لە ساڵی (١٩٤٣)دا هاتووەتە سنووری گەرمیان و کەلار، عەباس عەزاوی زۆرتر ئەم گەشتەی تایبەت بووە بە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ کتێبی (عشائر العراق) , بە تایبەت بەشی دووەمی لە ساڵی (١٩٤٧)دا بڵاوکراوەتەوە، هەر لەو گەشتەدا عەزاوی سەردانی کەریم بەگی لە کەلار کردووە، پێدەچێت هەر ئەودەمە کەریم بەگ دەستنووسی (تەئریخی جاف)ی پێدابێت، عەزاویش لە کتێبەکەیدا (عشائر العراق) بەشی دووەمی تایبەتە بە هۆزە کوردەکان سوودی زۆری لەم دەستنووسە ڕەسەنە وەرگرتووە ( العزاوي، ١٩٤٧، ص٤٦؛ باوەڕ، ٢٠١٦، ل٧٧).

ژمارەیەك ڕووناكبیر و ئەدیب و هونەرمەند بەمەبەستی جۆراوجۆر هاتوونەتە كەلار، عەلادین سەجادی (١٩٠٧-١٩٨٤) چەند جارێك هاتووەتە گوندەكە و لە لایەن بەگزادەكانی جاف , بە تایبەت حەمە سەعید بەگی جافەوە پێشوازی لێكراوە، هەر لە كەلاردا سەجادی توانیویەتی خەڵكانی قسەخۆش و نوكتەباز لەناو جافدا كۆبكاتەوە و سوود لە بەسەرهاتەكانیان وەر بگرێت بەشێوەیەك لە دواتردا لە كتێبە بەناوبانگەكەی (ڕشتەی مرواری)دا بڵاویان بكاتەوە، هەر یەك لە ڕەفیق حیلمی و نوری ئەحمەد تەها و مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی و ئیبراهیم ئەحمەدیش بەهەمان شێوە چەند جارێك هاتوونەتە كەلار و لە دیوەخانی بەگزادەكاندا پێشوازیكراون، قانعی شاعیریش (١٨٩٨-١٩٦٥) سەردانی گوندەكەی كردووە و تێیدا ماوەتەوە (شاكەلی، ٢٠١٢، ل١٤٧؛ خەسرەو جاف، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن).





سەرباری ئەوەی ئەدیب و نووسەران سەردانی ناوچەكەیان كردووە، بە هەمان شێوە هونەرمەندانیش هاتوونەتە كەلار و دەوروبەری، هونەرمەندی ناوچەی هەورامان حەمە حسێن یوسف ناسراو بە (حەمە حسێن كەیمنەیی) لە ساڵی (١٩٥٠)دا هاتوەتە كەلار و (٩) ساڵ تێیدا ماوەتەوە، هەر لێرە ژمارەیەك گۆرانی ووتوە، دواتر بووەتە بەشێك لە مۆرك و هونەری ڕەسەنی دەڤەرەكە، لەوانە: ئەمنە هۆ ئەمنە، هەوری لەمل، خاوەر خاوەر و سەلە سەلە، ئەمەی دواییان زۆرتر ناوبانگی ڕۆیشتووە بەناوی (هۆ سەلە سەلە...)، هۆنراوەی گۆرانی (سەلە) هی داوود بەگی جاف بووە، سەلەیش مەبەست خاتوو سەلەی سەبری بەگی باوەنوورە كە ژنێكی سەلاری شۆخ و شەنگ بووە، بەڵام حەمە حسێن باسی لەوە كردووە، ئەم گۆرانی (سەلە)ی بۆ سەلە كەلاری (١٩٣٧-٢٠٠٧)ی وتووە (كەیمنەیی، ٢٠٢٠، چاوپێكەوتن؛ حەمە ساڵح، ٢٠١٧، ل٦). هەروەها هونەرمەند حەسەن زیرەك (١٩٢١-١٩٧٢) چەند جارێك هاتووەتە سنووری گەرمیان، لە گوندی ژاڵە لە كاتی شایی و زەماوەندا ڕووی لەو گوندە كردووە، لە (ئەیلولی ١٩٥٨)دا لە كاتی گەڕانەوەی بەرەو ئێران چووەتە گوندی تازەدێی باكووری

کەلار، هەر لەو هاتنەیدا ژمارەیەک گۆرانی پێشکەشکردووە (حاجی محمود، ٢٠٠٩، ل٤٣-٤٤).

نەورۆز وەک بۆنەیەکی نەتەوەیی لای کۆمەڵانی خەڵک مانای ئازادی و نوێبوونەوەی گەیاندووە، لە کەلاردا یادکردنەوەی ئاگری نەورۆز وەک بۆنەیەکی نەتەوەیی ساڵانە ژمارەیەک چالاکیی ڕۆشنبیری لەخۆگرتووە، بۆ یەکەمین جار لە (ئاداری ١٩٤٥)دا ئاگری نەورۆز کراوەتەوە , قوتابیان و مامۆستایانی کەلار سروودی نەورۆزیان وتووەتەوە (نەریمان، ١٩٩٤، ل١١٠). بەم شێوەیە ساڵانە ئاگری نەرۆز کراوەتەوە , بەڵام هەندێک ساڵ کردنەوەی ئاگری نەورۆز جیاواز بووە، ئەوەتا لە ئێوارەی (٢٠ی ئاداری ١٩٥٧) دا لە کەلار نەورۆزێکی جیاواز لە بەردەم ماڵی مستەفا بەگی جافدا کراوەتەوە، هەر لەم یادەدا فوئاد عارف (١٩١٣ — ٢٠١٠) بە میوانی لە کەلار بووە ئامادەی یادەکە بووە، چەند چالاکییەکی ڕۆشنبیری و هونەری پێشکەشکراون، لەوانە: وتنی سروودی خوایە وەتەن ئاواکەی، نەورۆز، نمایشی شانۆگەری میللی (کاوە و زوحاک)، هەڵپەڕکێی میللی ناوچەکە (قادر، ٢٠١٤، ل٧). لە (نەورۆزی ١٩٦٣)یشدا بە شێوەیەکی جیاواز لە لای چایخانەی حەسەن هەیەردا یادی نەورۆز کراوەتەوە و تێیدا ژمارەیەک چالاکی پێشکەشکراون، هەر لەو یادەدا چالاکی (دوانزە سوارەی مەریوان) نمایشکراوە، هونەرمەندی میللی کەلار حسێن هەیەر (١٩٣٠-٢٠١٧) چەند گۆرانییەکی میللی گەرمیانی وەک (شیرینێ خانم، کەنیلە کەنیلە، کەنشکە کاڵەکە)ی لەگەڵ (هۆرەی جافی) پێشکەشکردووە (ڕەشید، ٢٠٠٤، ل٣٨).

یادی نەورۆزی ساڵی (١٩٦٩) جیاواز لەوانی تر لە ئێوارەی (٢٠ی ئادار)دا بە ئامادەبوونی نزیکەی (٢٠٠٠) کەس لە کەلار و گەرمیان و کوردستان بە خوێندنی چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز دەستی پێکردووە، هەر لەم مەڕاسیمەدا ژمارەیەک وتار و چالاکی پێشکەشکراوە، عەلی مام ڕەزا وتاری ئامر هێزی کەلاری باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی پێشکەشکردووە، هەر لە مەڕاسیمی نەورۆزی ئەو ساڵەدا چەند چالاکییەک کەشێکی کوردەواریان بە یادەکە بەخشیووە، ژمارەیەک سروود لە لایەن قوتابیانی قوتابخانەی کەلارەوە بە سەرپەرشتی ئەحمەد کەلاری پێشکەشکراون، لەوانە: (ئەمڕۆژی ساڵی تازەیە، خوایە وەتەن ئاواکەی، جەژنە جەژنی نەورۆزە ...)، هەروەها ژمارەیەک گۆرانی و هۆرەی جافی لە لایەن هونەرمەندی میللی حسێن هەیەر و مەحموود حەمە ئەمینەوە بە دەنگێکی گەرمیانیانە وتراونەتەوە، لەوانەیش: (ڕاستەی خیابان، شیرینە و خانم، لۆرکێ لۆرکێ...هتد). هەروەها چەند شانۆگەریەکیش نمایشکراوە (کاوەی ئاسنگەر، سەرتاش، وەستا سەلیم)، ئەمە جگە لە خوێندنەوەی چەند پارچە پەخشان و هۆنراوە (النور، ١٩٦٩، ل٧؛ قادر، ٢٠٢١، ل٦).

نووسەر و ئەدیبانی كەلار لە گۆڤار و ڕۆژنامە كوردییەكانی چلەكان-حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا بەرهەمەكانی خۆیان بڵاوكردوەتەوە و ڕۆڵی بەرچاویان لەم ڕووەوە هەبووە، هەر لە سەرەتاوە ئەدیب و شاعیرانی كەلار لە پاش دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩-١٩٤٩) ڕۆڵی بەرچاویان تێیدا هەبووە، لەگەڵ دەرچوونی یەكەمین ژمارەی گۆڤارەكەدا هاوبەشی (ئیشتراك) لە سنووری كفری و كەلاردا هەبووە، گۆڤاری گەلاوێژ لە سنووری گەرمیان و خانەقیندا چەند باوەڕپێكراوێكی هەبووە، ئەوانیش سابیر حاجی فەتحوڵلا (١٩١٦- ١٩٨٦ لە كفری، هەریەك لە سەیید ئیبراهیم سەیید حەسەن (١٩١٠-١٩٨٤)، مەلا عارف مەلا یەحیا (١٩١٢-١٩٩٨) و عەزیز نوور محەمەد واتا عەزیز پشتیوان (١٩١٢-٢٠٠١) لە خانەقین (باوەڕ، ٢٠١٧، ل١٣٦)، لە كەلار گەلاوێژ ژمارەیەك ئیشتراكی هەبووە و زۆرتر لە ڕێگای باوەڕپێكراوی كفریەوە گەیشتوەتە خوێنەرانی، لە سنورەكە نزیكەی (٥٠) كەس هاوبەشی گەلاوێژیان كردووە (نەریمان، ١٩٩٤، ل١٠٩).

بەشێك لە ئەدیب و شاعیرانی سنووری كەلار لە گەلاوێژدا بەرهەمەكانیان بڵاو كردوەتەوە، ئەحمەد شاكەلی لەژێر ناوی (كەلار: ا شاكەلی)یدا یەكەمین شیعری (دوانێك لەگەڵ قەڵای شیروانە)دا لە ژمارە (٥)دا بڵاوكردوەتەوە (شاكەلی، ١٩٤٣، ل٣١-٣٢)، لێرە بەدواوە ئەحمەد شاكەلی (١٠) دەقی شیعری تری بڵاوكراوەتەوە، لەوانە: هۆنراوەی (بەهاران) لە كەلارەوە بۆ گەلاوێژی ناردووە و یەكێكە لە شیعرە جوانەكانی شاكەلی، شیعرەكە بەم شێوەیە دەستی پێكردووە: «بە هاران و ئێوارەی دەشتی سیروان، ببارێ جار بە جاری تاوی باران...» (شاكەل، ١٩٤٧، ل٣٧). لە ساڵی (١٩٤٩)دا ئەحمەد شاكەلی لە كەلارەوە زۆرترین دەقی شیعری بڵاوكردوەتەوە، بریتی بووە لە (٦) دەق، لە ژمارە (٣) ی خولی دەیەمی ساڵی (١٩٤٩)دا لەژێر ناوی (من و مناڵە كوردەكان)دا ئەو ساڵە یەكەمین دەقی بڵاوكراوەتەوە (شاكەلی، ١٩٤٩، ل٣٥)، هەر لە ساڵی (١٩٤٩)دا دوایین شیعری شاكەلی لە ژمارە (٨)دا بووە ئەویش پاش كۆچی دوای كەریم بەگی جاف، بە شیعرێك لە ژێر ناوی (لەبەر شینی كەریم بەگ) هاوخەمی خۆی دەر بڕیوە (شاكەلی، ١٩٤٩، ل٣٦).

لە گەلاوێژدا ژمارەیەك ئەدیب و شاعیری تر بەرهەمەكانیان بڵاوكراوەتەوە، ئەوەتا لە گوندی دەككەوە مەلا ئەحمەدی دەككە شیعرێكی بۆ كۆچی دوایی كەریم بەگ لە ژێر ناونیشانی (دیسان بۆ كریم بەگ)دا هۆنیوەتەوە (احمد، ١٩٤٩، ل٣٩)، بابا عەلی بێدار (١٨٩٤-١٩٤٩) چوار شیعری خۆی لە گەلاوێژدا بڵاوكردوەتەوە، لە ژمارە (٦)ی ساڵی (١٩٤٣)دا نووسراوە «لە خانقینەوە: كاك ب. ع. بیدار» شیعرێكی لەژێر ناوی (خۆشویستنی نیشتیمان) هاتووە و بڵاوكراوەتەوە (بیدار، ١٩٤٣، ل٢٩)، لە كفرییەوە (جیمو بێ ناو) كە مەبەست جەمیل مەلا ئیبراهیمی مەلا ئەحمەد (١٩١٠-١٩٨٢)ە دوو بەرهەمی بڵاوكراوەتەوە، لە ژمارە (١٢)ی كانوونی یەكەمی (١٩٤٣)دا وتارێكی لەژێر ناونیشانی (بەر بەرەكانی ژیان !)دا (بی ناو، ١٩٤٣، ل٥١)، وتاری دووەمی بە ناونیشانی

(کۆمەڵی پێشوو)دا بڵاوکراوەتەوە (بی ناو، ١٩٤٤، ل٢٢)، سابیر حاجی فەتحوڵلا لە کفریدا باوەڕ پێکراوی گەلاوێژ بووە، وتاری (سوپاس بۆ ئەم گەلاوێژە و خوینەوارانی) بڵاوکراوەتەوە، لە وتارەکەیدا باسی لەوە کردووە، کەریم بەگ لە کەلارەوە هانی خەڵکی داوە بۆ خوێندنەوە و ڕووتێکردنی گەلاوێژ , چونکە بە زمانی کوردی هەموو شتێکی گەیاندووە (فتح اللە، ١٩٤٦، ل٢٧-٢٨).

لە گۆڤاری گەلاوێژ لە (تەمووزی ١٩٤٣)دا هۆنراوەیەک لە ژێر ناوی (لایەلای) دا بڵاوکراوەتەوە، ئەم هۆنراوەیە لە کەلارەوە لە لایەن (ژنە جافێک)ەوە نێردراوە، هۆنراوەکە بەم شێوەیە دەستی پێکردووە «هەی لایەلایە حسن لای لایە. لە خوام گەرەکە بگەیتە پایە...» (ژنە جافیک، ١٩٤٣، ل٣٢)، ئەم ژنە جافە هۆنراوەی بۆ گۆڤارەکە ناردووە، حەبیبە کەریم بەگی جافە (١٩٢٤-١٩٩٧)، حەبیبە کەریم بەگ ژنێکی شۆخ و شەنگ بووە، هەر بۆیە بووەتە جێ سەرنجی خەڵکی و ناوی چووەتە نێو بەیتە شیعری فۆلکلۆری گەرمیانەوە، لە بەیتە شیعرێکی فۆلکلۆریدا هاتووە «حەبێ خان وەی حەبێ خان، گوڵ مەجلیسی ناو دیوەخان...»، ئەم بەیتە شیعرە فۆلکلۆرییە لە لایەن ژمارەیەک هونەرمەندەوە وتراوەتەوە، لەوانە هونەرمەندان حسێن عەلی (١٩٣٢-١٩٩١)، سەلاح داوودە ( ١٩٤١-٢٠١٣)، جگە لەو پارچە هونراوەیە، حەبە خان گەلێک شیعری میللی هەبووە لە بۆنەکاندا ووتویەتیەوە (باوەڕ، ٢٠١٧، ل١٣٦-١٣٩).

مستەفا نەریمانیش سێ بەرهەمی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە، لە ساڵی (١٩٤٤)دا هۆنراوەیەکی بەناونیشانی (هەژار و دەوڵەمەند) ناردووە (نەریمان، ١٩٤٤، ل٣٥)، لە ساڵی (١٩٤٦)دا نەریمان وتارێکی گلەیی ئامێزی بۆ گۆڤارەکە ناردووە , چەند هۆنراوە و چیرۆکێکی ناردووە و ئەوان پشتگوێیان خستووە، وتارەکەی (لەگەڵ تۆمە گەلاوێژ)دا بڵاوکراوەتەوە (نەریمان، ١٩٤٦، ل٥٧-٥٩)، لە (ئابی ١٩٤٨)دا مستەفا نەریمان هۆنراوەی (شێتیم خۆش ئەوێ)ی بڵاوکراوەتەوە، ئەم هۆنراوەیە دوا بەرهەمی نەریمانە لە گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە (نەریمان، ١٩٤٨، ل٣٩-٤٠)، مینە جاف لە ساڵی (١٩٤٤)دا دوو هۆنراوەی بڵاوکراوەتەوە، لە ژمارە (٢)دا لە بەشی (دیوانی گەلاوێژ دا کە تایبەت بووە بە بڵاوکردنەوەی هۆنراوەی شاعیرانی کورد، یەکەمین شیعری (نیشتمانی)ی مینە بڵاوکراوەتەوە (جاف، ١٩٤٤، ل٣١)، لە ژمارە (٥)ی (ئایار)ی هەمان ساڵدا هۆنراوەیەکی تری بەناوی (ئامۆژگاری) بڵاوکراوەتەوە، لە سەرەتای هونراوەکەدا نووسراوە «ئەم شعرانە اموزگاری (داوود) بەگی جافە بو (سەردار)ی کوڕی، کە مینە جاف هونیویەتەوە« (بەگ، ١٩٤٤، ل٣٩-٤١).

لە کەلارەوە جیاواز لەوانی تر محەمەد سەعید جاف ژمارەیەک بابەتی وەرگێڕدراوی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە، ئەو وەرگێڕانانەی حەمە سەعید بەگی جاف بۆ سەردەمەکەی کارێکی ناوازە و جیاواز بووە، هەموو بابەتە وەرگێڕدراوەکانی محەمەد

سەعید جاف لە ساڵی (١٩٤٨)دا بڵاوکراوەتەوە، هەر چەندە یەکەمین بابەتی لە ژمارە (٢)دا وتارێک بووە لەژێر ناوی (راستی خەتایە ؟!) کە وتارێکی ڕەخنە ئامێزە و تێیدا باسی کەسانی ڕاستگۆی لەو سەردەمەدا کردووە (جاف، ١٩٤٨، ل٤٨-٥٠)، یەکەمین دەقی وەرگێڕدراویشی لەژێر ناوی (مەستی بادەی گەنجی بووم چۆن هۆشیار بومەوە)ی نووسەر جەواد ئەرباب زادەی لە فارسییەوە کردوەتەوە کوردی و لەژمارە (٤)دا بڵاوکراوەتەوە (جاف، ١٩٤٨، ل٣١)، لە ژمارە (٥)دا وتارێکی تری وەرگێڕدراوی بەناوی (بانگی ئازادی) بڵاوکراوەتەوە تایبەت بە یەکێتی ئیتالیاوە (جاف، ١٩٤٨، ل١٥-١٦)، لە ژمارە (٦)دا لەژێر ناوی (خنکاویی نەخنکاو)دا بابەتێکی درێژی لە گۆڤاری (الهلال)ەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (جاف، ١٩٤٨، ل٥٢-٥٦)، دوایین وەرگێڕانی ئەم نووسەرە لە ژمارە (٨)دا بابەتێکە لەسەر کەسایەتی ئەمەریکی هینری والاس (١٨٨٨-١٩٤٥) (Henry Agard Wallace) کە بڵاوکراوەتەوە (جاف، ١٩٤٨، ل٦٠-٦٢).





یەکێکی دیکە لەو گۆڤارانەی ئەدیب و نووسەرانی کەلار و گەرمیان بابەتیان تێدا بڵاوکردوەتەوە گۆڤاری هەتاو (١٩٥٤-١٩٦٠) بووە، لە کەلارەوە محەمەد سەعید جاف چەند بابەتێکی وەرگێڕدراوی بۆ ناردوون، لەوانە: چیرۆکی (تەرازوو)ی ئەناتوڵ فرانسی (١٨٤٤-١٩٢٤) (Anatole France) لە فارسییەوە وەرگێڕاوە (جاف، ١٩٥٥، ل١٣-١٤)، لە ژمارە (١٢٢)ی (شوباتی ١٩٥٨)دا بابەتێکی تری لەژێر ناونیشانی «سەرنجی لە شاریکی کوردستان سابلاخ (مهاباد)» لە گۆڤاری (سبید و سیاە)ەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (جاف، ١٩٥٨، ل١-٣)، شێخ ئەحمەدی شاکەلیش لەم گۆڤارەدا لە (باخچەی بوێژان)دا شیعرێکی بڵاوکردووەتەوە بە ناونیشانی (بۆ دانیشتوانی شاری کفری)، شیعرەکەی باسی لە پێکەوە ژیانی نێو پیکهاتەکانی ئەو قەزایە بە تایبەت کورد و تورکمان کردووە (شاکەل، ١٩٥٩، ل١٤)، لە ژێر ناونیشانی (جەژنی نەورۆز)دا لە باخچەی بوێژاندا شاکەلی شیعرێکی تری نۆزدە بەیتی بڵاوکراوەتەوە (شاکەلی، ١٩٦٠، ل١١).

مستەفا نەریمانیش لە گۆڤاری هەتاودا ژمارەیەک بەرهەمی بڵاوکراوەتەوە، یەکەمین بەرهەمی لە ژمارە (٦)دا وتارێکی ڕەخنە ئامێز بووە، وتارەکەیش وەڵامی کەسێک بووە لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بەناوی کڵۆڵ بڵاوکراوەتەوە، نەریمانیش لەژێر ناونیشانی (وەڵامی ژین و کڵۆڵ)دا ئەو بابەتەی نووسیوە (نەریمان، ١٩٥٤، ل٤-٥)، دوایین بەرهەمی ئەم نووسەرە لە ژمارە (١١٨)دا بریتییە لە هۆنراوەیەکی غەمباری لەژێر ناونیشانی (شیوەن)دا بۆ کۆچی دوایی مەلا سەید حەکیمی خانەقینی هۆنیووەتەوە، ئەمەیش پاش ئەوەی کە مەلا سەیید حەکیم لە (١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٥٧) دا کۆچی دوایکردووە (نەریمان، ١٩٥٧، ل١٦)، ئەحمەد کەلاریش لە ژمارە (١٧٩) دا شیعرێکی بە ناونیشانی (بۆ شەهید کاک ئەمینی بانی) هۆنیوەتەوە (کەلاری، ١٩٦٠، ل١٨)، لە ژمارە (١٨٧)دا لە کەلارەوە کەسێک بەناوی (صابر عەلی بەگ) ەوە وەڵامی مەتەڵی ژمارەی پێشووی گۆڤاری هەتاوی داوەتەوە بە زنجیرەی پەنجاو چوار ناوی هاتووە (بەگ، ١٩٦٠، ل٤١).

نووسەر و ئەدیبانی کەلار لە گۆڤاری هیوا (١٩٥٧-١٩٦٣)یشدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە، لە کەلارەوە محەمەد سەعید جاف لە ژمارە شەشی ئەو گۆڤارەدا وتارێکی سیاسی گرنگی لە گۆڤاری (الفصول)ەوە لە ژێر ناونیشانی (ڕاپەڕینی ئاسیا)دا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (جاف، ١٩٥٧، ل٨٠-٨١)، هەر لە ژمارەی پاشتردا محەمەد سەعید جاف چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردی لەژێر ناوی (کاروان) دا بڵاوکراوەتەوە، زمانی نووسینی چیرۆکەکە لە ئاستێکی بەرزدایە بە شێوەیەک گەلێک وشەی کوردیی ڕەسەنی بەکارهێناوە (جاف، ١٩٥٧، ل٨٨-٩٢). لە ژمارە (٨) دا هاشم بەرزنجی لە ڕێگای وتارێکەوە چەند زانیارییەکی لەسەر کفری لە ژێر ناوی (مێژووی شاری کفری)دا خستوەتەڕوو (بەرزنجی، ١٩٥٧، ل٥-٦). بابەتێکی گرنگی مێژوویی لەژێر ناونیشانی (شەش پیاوی گەورەی مێژوو) ئەو وتارە وەرگێڕدراوەیە لە ساڵی دووەمی گۆڤاری هیوادا لە کەلارەوە محەمەد سەعید بۆی ناردوون، یەکێک لەو شەش ناودارانە جۆرج واشنتۆنە George Washington (١٧٣٢-١٧٩٩)، بەشێکی زۆری وەرگێڕانەی داگیر کردووە (جاف، ١٩٥٨، ل١٧-٢٤)، هەر ئەم ئەدیبەی کەلار لە ژمارەی چواری ساڵی دووەمدا چیرۆکێکی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، چیرۆکەکە هی نووسەری ڕووسی لیۆ تۆڵستۆییە بە ناونیشانی (بێ تاوان) لە گۆڤاری (تهران مصور)ەوە لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی، هەر لەگەڵ ئەم چیرۆکە وەرگێڕدراوەدا وێنەیەکی محەمەد سەعید جاف دانراوە (تولستون، ١٩٥٨، ل٦٦-٧٥).

گۆڤاری ڕۆژی نوێ (نیسانی ١٩٦٠-ئەیلولی ١٩٦١) یەکێکی ترە لەو گۆڤارانەی نووسەر و ئەدیبانی کەلار نووسین و بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆیانیان تێدا بڵاوکردوەتەوە، محەمەد سەعید جاف چیرۆکی (دیاری جەنگ)ی لە گۆڤاری (سپیر و سیا)وە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی (جاف، ١٩٦١، ل١٠٨-١١١). ئەحمەد کەلاری لە ژمارە یەکی ئەم گۆڤارەدا بروسکەیەکی پیرۆزبای بە بۆنەی دەرچوونییەوە ناردووە «پیرۆزبایی لە خۆم و هەموو کوردیکی خاوەن شەرەف ئەکەم» (کەلاری، ١٩٦٠، ل٧٦)، مستەفا نەریمان لە ژمارە دووی ڕۆژی نوێدا وتارێکی ڕەخنەیی لەژێر ناونیشانی (چەند ڕەخنەیەک لە نامیلکەی میر کچان) بڵاوکردوەتەوە، نامیلکەکە لە نووسینی (مچە) ناوێک بووە لە بەغداد چاپکراوە و نەریمانیش بە شێوەیەکی بابەتی چەند ڕەخنەیەکی لەو نامیلکەیە گرتووە (نەریمان، ١٩٦٠، ل٧٢-٧٤). لە کفرییەوە هاشم بەرزنجی وەک پەیامنێری ڕۆژنامەی خەبات پیرۆزبایی دەرچوونی گۆڤاری ڕۆژی نوێی لە ستافی گۆڤارەکە کردووە (بەرزنجی، ١٩٦٠، ل٨١).

ڕوناهی (١٩٦٠-١٩٦٢) یەکێکی ترە لەو گۆڤارانەی لە کەلارەوە محەمەد سەعید جاف بەرهەمەکانی خۆی تێدا بڵاوکردوەتەوە، پێش ئەوەی ئەم نووسەرە بابەت بۆ ئەم گۆڤارە بنێرێت لە ژمارە سێدا بروسکەیەکی پیرۆزبایی بەبۆنەی دەرچوونییەوە بۆ ستافی گۆڤارەکە لە بادینان ناردووە «خۆشنودیی خۆم پیشان ئەدەم بەرانبەر دەرچوونی ڕوناهی»، ستافی گۆڤارەکە هەر لەو ژمارەیەدا داوایان لە محەمەد سەعید کردووە بە بابەتە پڕ لە هەستە کوردایەتییەکانی بەسەریان بکاتەوە (جاف، ١٩٦٠، ل٧٦)، هەر ئەم لێخواستنەی گۆڤارەکەیش وایکردووە لە ژمارە (٧-٨)دا محەمەد سەعید جاف بابەتێکی مێژوویی بە ناونیشانی (لاپەڕیەکی پرشنگداری مێژوو، کەریم خانی زەند) ی لە گۆڤاری (خواندنیها)ی فارسییەوە کردووەتە کوردی (جاف، ١٩٦٠، ل١٢-١٥). لە ڕۆژنامەی کوردستان وەک ئۆرگانی پارتی (٤ی ئادار-١ی نیسانی ١٩٦١)دا، ئەحمەد کەلاری لە ژمارە دوودا وتارێکی بە بۆنەی دەرچوونی ڕۆژنامەکەوە لەژێر ناونیشانی «کوردستان هەڵهات لە کوردستان»دا بڵاوکردووەتەوە (کەلاری، ١٩٦١، ل٨)، خەسرەو جاف-کوڕی محەمەد سەعید جاف هەر ئەودەمانە لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن بە ناوی (کاکەی جاف) دەستی بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکانی کردووە (خەسرەو جاف، ٢٠٢٠، چاوپێکەوتن).

جگە لەو گۆڤارە کوردییانەی ناومان بردن، هەفتانە لە قەسری شیرینەوە ڕۆژنامە و گۆڤارە فارسییەکانی ئەودەمە وەک (تهران مصور، خوانندگان، اسیا جوان و ترقی) هاتوونەتە کەلار و گەیشتووەتە دەستی حەمە سەعید بەگی جاف , لە ڕێگای ئەم گۆڤار و ڕۆژنامە فارسییانەوە ژمارەیەک بابەتی بۆ گۆڤارە کوردییەکان وەرگێڕاوە و ئامادەی کردووە، لە پاشتریشدا محەمەد سەعید جاف لە ساڵانی (١٩٦٧-١٩٦٩)دا

بووەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (التاخي)، هەروەها سەرپەرشتی ڕۆژنامەی برایەتی كوردیشی كردووە، ئەمە جگە لەوەی خاوەنی گەورەترین كتێبخانەی تایبەت بووە، خوێندەوارانی ناوچەكە سوودی زۆریان لەم كتێبخانەیە وەرگرتووە، لە پێش شۆڕشی (١٤ی تەمووز)دا چەند جارێك ئەفسەرەكانی عیراق لە جەلەولاوە هاتوونەتە كەلار و سەردانی كتێبخانەكەی حەمە سەعید بەگیان كردووە، یەكێك لەوانە عەبدولكەریم قاسم بووە كە هاتوەتە كەلار «عەبدولكەریم قاسم هەر چەند ئەهات بۆ كەلار ئەچوو بۆ ژووری كتێبەكانی و بەشی زۆری كاتی لەوێ بە موتالاوە بەسەر ئەبرد» (جاف، ١٩٩٩، ل٦٨؛ بطي، ٢٠١١، ص٨٥٨؛ عەبدولواحید، ٢٠٢٠، ل٣٧-٣٨، ٦٤).

كاری ڕۆژنامەوانی لە سنوورەكە هەنگاوی گرنگی بەرەو پێشەوە ناوە، لە سنووری كفری و كەلاردا ژمارەك بڵاوكراوەی لۆكاڵی دەرچوون نووسەرانی ناوچەكە بۆ خۆیان ڕۆڵیان تێیدا هەبووە، یەكەمین بڵاوكراوەیش لە سنوورەكەدا بریتی بووە لە بڵاوكراوەی (شیلان) لە گوندی زەرداو لە ساڵانی (١٩٤٤ ١٩٤٥)دا شێخ عەتای تاڵەبانی وەك پارتی هیوا بە شێوەیەكی نهێنی نزیكەی (١٤-١٥) ژمارەی لێ دەركردووە، هەر لەو گوندەدا بڵاوكراوەی (هیوای ئازاد)یش دەركراوە، مستەفا نەریمان باسی لەوە كردووە، بڵاوكراوەی (شێلان) وەك بڵاوكراوی هیوا لە ئاوایی زەرداو لە لایەن شێخ عەتاوە بڵاوكراوەتەوە و ئەوانیش بابەتیان بە مەبەستی بڵاوكردنەوە پێداوە (نەریمان، ١٩٩٤، ل١٢٠؛ تاڵەبانی، ٢٠٠٦، ل٧٠)، لە (بەهاری ١٩٦٢)دا لە گوندی شاكەلی نزیك كەلار فەرهاد شاكەلی بڵاوكراوەیەكی دەستنووسی یەك پەڕەی بەناوی (لادێ)وە دەركردووە كە (٥٠-٦٠) لاپەڕە بووە، هەر شاكەلی لە ساڵی (١٩٦٣)دا (٣-٤)ژمارەی لە گۆڤارێكی تری دەستنووس بەناوی (بەهار) دەركردووە (باوەڕ، ٢٠١٣، ل٣١٨-٣١٩).

لە ساڵانی (١٩٦٥-١٩٦٦)دا لە گوندی (دێنە)ی نزیك كەلار لە لایەن ئەحمەد شاكەلییەوە بڵاوكراوەی دەستنووسی (هەللولیا) بە هەردوو زمانی كوردی و عەرەبی بڵاوكراوەتەوە، ناوی بڵاوكراوەكەیش لە وشەیەكی سەرنجڕاكێشی ناو ڕۆمانێكی بیانییەوە وەرگرتووە كە مانای (وریابوونەوە)ی داوە و (٨) ژمارەی لێدەركردووە، لە ساڵی (١٩٧٢)دا لە قوتابخانەی ناوەندی كەلار بە سەرپەرشتی ناسیح غەفووری پسپۆڕی زمانی عەرەبی دوو بڵاوكراوەی سەر دیوار بە ناوەكانی (تیشك) بە زمانی كوردی، (معرفة) بە زمانی عەرەبی دەركراوە ژمارەیەك بابەتی هەمەجۆری لەخۆی گرتووە، جگە لەمانەیش لە قەزای كفریدا ژمارەیەك بڵاوكراوە لە لایەن لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاكەلییەوە بە ناوەكانی (بەرزنجە، باوەشاسوار، شەپۆلەكان)ەوە بە شێوەی دەستنووس دەرچوون (باوەڕ، ٢٠١٣، ل٣٢٣-٣٢٣؛ ئەحمەد شاكەلی، ٢٠٢١، چاوپێكەوتن).

مامۆستا ئەحمەد شاکەلی لە ساڵانی (١٩٦٩ ١٩٧٠)دا لە هەردوو ڕۆژنامەی (النور، هاوکاری)یشدا بابەتەکانی بڵاوکراوەتەوە، ئەندامی یەکێتی نوسەرانی کورد بووە (ئەحمەد شاکەلی، ٢٠٢١، چاوپێکەوتن)، لەپاش ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ڕوانگە لە کەلارەوە لە بڵاوکراوەی ئەو گرووپەدا بەناوی (ڕوانگە) هەر یەک لە ئەنوەر (فەرهاد شاکەلی و ئەحمەد شاکەلی بە چەند بەرهەمێک بەشدار بوون، لە ژمارە یەکدا ئەنوەر شاکەلی بە شیعری (ون بوون لەناو وشەدا) تێکستێکی بڵاوکراوەتەوە (شاکەلی، ١٩٧٠، ل٣١-٣٤)، ئەحمەد شاکەلییش هەر لەو ژمارەیەدا بە چیرۆکی (ئاژاوەیە و دڵداری) بەشداری کردووە (ئەحمەد شاکەلی، ١٩٧٠، ل٧٤-٨١)، لە ژمارە (٢)یشدا ئەحمەد شاکەلی چیرۆکێکی تری بێ ناونیشانی بڵاوکراوەتەوە (ئەحمەد شاکەلی، ١٩٧١، ل٣٨-٤٢)، ئەمە جگە لەوەی هەر یەک لە (محەمەد شاکەلی، ئەمجەد شاکەل)یش دەستیان بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان کردووە.

فەرهاد شاکەلی و ئەحمەد شاکەلی لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٠)دا وەک دوو ئەندامی گرووپی کفری لەگەڵ لەتیف هەڵمەتی شاعیر کاریان کردووە، لە (١٤ی تەمووزی ١٩٧١)دا هەریەک لە (لەتیف هەلمەت، ئەنوەر (فەرهاد) شاکەلی لەبارەی نوێگەری لە شیعری کوریدا بەیاننامەیەکیان بڵاوکردوەتەوە (هەڵمەت، ١٩٩٦، ل٨-٢٠)، پاشتر فەرهاد شاکەلی لە ساڵی (١٩٧٣)دا یەکەمین دیوانە شیعری خۆی لەژێر ناونیشانی (پرۆژەی کوودەتایەکی نهێنی) چاپکردووە (کەلاری، ٢٠١١، ل٣٢٥)، هەر لەو دەمەدا کەلار شاعیرێکی لاوی لەئامێز گرتووە، ئەویش محەمەد پەژار (١٩٥٤-١٩٩١) بووە، لە گۆڤاری بەیاندا یەکەمین کۆپلە شیعری خۆی بەناونیشانی (ئاوارەیی) بڵاوکردووەتەوە (کەلاری، ١٩٧٥، ل٤٦؛ باوەڕ، ٢٠١٤، ل٢٤)، جگە لەوانەیش کەلار و دەوروبەری خاوەنی ژمارەیەک شاعیری میللی بووە، لەوانە: غالب (١٩٠٨-١٩٤٦)، حاجی برایمی شاتری (١٩١٩-٢٠٠٠)، بێ دەنگ گەرمیانی (١٩٢٠-٢٠٠٦)، مەلا حەمە نەجیب بەرلوتی (١٩٣٢-١٩٩٦)، بێ بەش گۆبانی (١٩٤٧-٢٠٠٠) ...هتد (نەریمان، ٢٠٠٧، ل٣٠٢-٣٠٣؛ هەلاج، ٢٠١٣، ل٣٣٥-٣٣٦).

# لیستی سەرچاوەكان:

## یەكەم// كتێب:

+ بەزمانی كوردی:


١. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠١٤)، دیوانی شەهید محەمەد پەژار ١٩٥٤-١٩٩١، پێشەكی: لەتیف هەڵمەت، چاپی نوێ، لە بڵاوكراوەكانی بەڕێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەری گەرمیان:كەلار

٢. تاڵەبانی، د .موكەڕەم (٢٠٠٦)، كەی هۆهۆ دەگەڕێتەوە بۆ زەرداو؟، چاپی یەكەم، بڵاوكراوەی ئاراس: هەولێر.

٣. جاف، خوسرەو (٢٠٠٠)، پرسە ئاهەنگی چلەی ماتەمینی خوالێخۆشبوو محەمەدسەعید بەگی جاف ١٩٩٦/٥/٩: بێ شوێنی چاپ.

٤. جاف، خوسرەو (٢٠٢٠)، لێرە ولەوێ، چاپی یەكەم: بێ شوێنی چاپ.

٥. جاف، د.حەسەن (٢٠١٤)، كەشكۆڵی مەحموود پاشای جاف، بەرگی یەكەم، لە بڵاوكراوەكانی بنكەی ژین، چاپخانەی شیمالی: بیروت.

٦. جاف، كەریم بەگی فەتاح بەگی (١٩٩٥)، تەئریخی جاف، لێكۆڵینەوەی: د. حەسەن جاف، پێشەكیی: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەكەم: بغداد.

٧. شاكەلی، محمد (٢٠١٢)، قەزای كفری .. شارەدێی كەلار لە پەنجاكاندا و پاسەكەی حاجی ١٩٦١-١٩٧٥، لەبڵاوكراوەكانی كۆمەڵەی ڕوناكبیری: كەركوك.

٨. شاكەلی، محەمەد (٢٠١٦)، پەروەردە و خوێندن لەگەرمیاندا .. ١٩٥٠-١٩٦٠، لەبڵاوكراوەكانی كۆمەڵەی ڕوناكبیری و كۆمەڵایەتی: كەركووك.

٩. عەبدولواحید، ئازاد (٢٠٢٠)، من و تۆ هەڤپەیڤینێكی فراوانە لەگەڵ خوسرەو جاف، چاپی یەكەم: هەولێر.

١٠. كاكەیی و ڕێبین، هەردەوێل، كاروان عوسمان (٢٠١٧)، كەشكۆڵی گەرمیان، چاپخانەی شوان: سنه.

١١. نەریمان، مصطفی (١٩٩٠)، دیوانی مینە جاف، پێشەكی:د. حەسەن جاف، مطبعة الجاحظ: بغداد.

١٢. نەریمان، مستەفا (٢٠٠٧)، ئەدیب و نووسەرانی كفری و دەوروپشتی، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كورد: بغداد.

١٣. نەریمان، مصطفی (١٩٩٤)، بیرەوەری یەكانی ژیانم، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی: بەغدا.

١٤. هەلاج، ساڵح (٢٠١٣)، مێژووی شیعر و شاعیرانی گەرمیان، چاپی دووەم، چاپخانەی گەنج: سلێمانی.

١٥. ب- بەزمانی عەرەبی:

١٦. بطي، د. فائق (٢٠١١)، الموسوعة الصحفية الكردية في العراق تاريخها وتطورها، دار المدى للطباعة والنشر والتوزيع: بيروت.

١٧. العزاوي، المحامي عباس (١٩٤٧)، عشائر العراق ٢ الكردية، مطبعة المعارف: بغداد.


دووەم// گۆڤار و ڕۆژنامە:


١. (١٩٢٨)، لیستەی ناوی اوو گەورانەی کە یاریدەیان داوین، زاری کرمانجی، ساڵی دووەم، ژمارە (٥).

٢. (١٩٦٠)، وەڵامەکانی مەتەڵی هەتاوی ژمارە ١٨٦، هەتاو، ساڵی حەوتەم، ژمارە (١٨٧).

٣. (١٩٦٩)، كەلار تستقبل عيد نوروز بمظاهر الحفاوة والتكريم، النور، العدد (١٣٤).

٤. احمد، مامۆستا مەلا (١٩٤٩)، دیسان بۆ کریم بەگ، گەلاوێژ، ساڵی دەیەم، ژمارە (٨).

٥. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠١٣)، مێژووی ڕۆژنامەوانی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی گەرمیان ١٩٣٩-١٩٧٢، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٧).

٦. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠١٤)، کەشکۆڵی حەمەی شاسواری پوقە لە گەرمیان، ڕامان، ژمارە (٢١٠).

٧. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠١٦)، عەباس ئەلعەززاوی لە گەشتێکیدا بۆ ناوچەی گەرمیان و کەلار ١٩٤٣، ڕامان، ژمارە (٢٣٥).

٨. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠١٧)، ژنە جافێک لەکەلارەوە: حەبیبە خانمی کەریم بەگی جاف ١٩٢٤-١٩٩٧، ڕامان، ژمارە (٢٤٣).

٩. باوەڕ، ئەحمەد (٢٠٢١)، ڕەزا بەگی جاف و ڕۆڵی ڕەزا بەگی جاف لەبواری ئەدەبیات و ڕووناکبیری کوردی دا ١٨٨٦-١٩٤٢، یادی کەلار، ژمارە (٥).

١٠. بەگ، محمد امین کریم (١٩٤٤)، امۆژگاری، گەلاوێژ، ساڵی پێنجەم، ژمارە (٥).

١١. بی ناو، جیمو (١٩٤٣)، بەر بەرەکانی ژیان !، گەلاوێژ، ساڵی چوارەم، ژمارە (١٢).

١٢. بی ناو، جیمو (١٩٤٤)، کومەلی پیشوو !، گەلاوێژ، ساڵی پێنجەم، ژمارە (٥).

١٣. بیدار، ب. ع (١٩٤٣)، خوشویستنی نشتمان، گەلاوێژ، ساڵی چوارەم، ژمارە (٦).

١٤. پیروەیس، م. ج (١٩٢٨)، بو مندوبەکانمان، زاری کرمانجی، ژمارە (١٢).

١٥. تولستون، لیون (١٩٥٨)، بی تاوان، وەرگێڕانی: محمد سعید جاف، هیوا، ساڵی دووەم، ژمارە (٤).

١٦. جاف، سەباح عەلی (٢٠١٦)، شاری کەلار و سیمای خوێندن ١٩٣١-١٩٨١، شیکار، ژمارە (١٤).

١٧. جاف، محمد امین کریم بگ (١٩٤٤)، نیشتمانی، گەلاوێژ، ساڵی پینجەم، ژمارە (٢).

١٨. جاف، محمد سعید (١٩٤٨)، بانگی ازادی، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٥).

١٩. جاف، محمد سعید (١٩٤٨)، خنکاویی نەخنکاو، بەشی دووەم، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٧).

٢٠. جاف، محمد سعید (١٩٤٨)، خنکاویی نەخنکاو، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٦).

٢١. جاف، محمد سعید (١٩٤٨)، ڕاستی خەتایە ؟!، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٢).

٢٢. جاف، محمد سعید (١٩٤٨)، هانری والاس، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٨).

٢٣. جاف، محمد سعید (١٩٥٧)، ڕاپەرینی اسیا، هیوا، ساڵی یەکەم، ژمارە (٦).

٢٤. جاف، محمد سعید (١٩٥٧)، کاروان، هیوا، ساڵی یەکەم، ژمارە (٧).

٢٥. جاف، محمد سعید (١٩٥٨)، سەرنجی لە شاریکی کوردستان سابلاخ (مەهاباد)، هەتاو، ساڵی چوارەم، ژمارە (١٢٢).

٢٦. جاف، محمد سعید (١٩٥٨)، شەش پیاوی گەورەی میژو، هیوا، ساڵی دووەم، ژمارە (١).

٢٧. جاف، محمد سعید (١٩٦٠)، پیرۆزبای، روناهی، ژمارە (٣).

٢٨. جاف، محمد سعید (١٩٦٠)، لاپەرەیەکی پرشنگداری میژو کەریم خانی زەند، روناهی، ژمارە (٧-٨).

٢٩. جاف، محمد سعید (١٩٦١)، دیاریی جەنگ، رۆژی نوی، ساڵی دووەم، ژمارە (١).

٣٠. جافیک، ژنە (١٩٤٣) لایەلای، گەلاوێژ، ساڵی چوارەم، ژمارە (٧) .

٣١. حاجی محمود، خەلیل عەبدوڵا (٢٠٠٩)، یادگارییەکی حەسەن زیرەک لە گوندی تازەدێی گەرمیان، وریزا، ژمارە (٥-٦).

٣٢. حەمە ساڵەح، شۆخان (٢٠١٧)، سەلە کەلاری ...، نەوژین، ژمارە (٣).

٣٣. رەشید، ئاڵا (٢٠٠٤)، دەنگێکی رەسەنی شار، کەلار، ژمارە (٣).

٣٤. شاکەل، احمد (١٩٤٧)، بە هاران، گەلاوێژ، ساڵی هەشتەم، ژمارە (٥).

٣٥. شاکەل، احمد (١٩٥٩)، بو دانیشتوانی شاری کفري، هەتاو، ساڵی پێنجەم، ژمارە (١٤٩).

٣٦. شاکەلی، ا (١٩٤٣)، دوانیک لەکەل قەلای شێروانە، گەلاوێژ، ساڵی چوارەم، ژمارە (٥).

٣٧. شاکەلی، احمد (١٩٤٩)، لە بەر شینی کریم بەگ، گەلاوێژ، ساڵی دەیەم، ژمارە (٧).

٣٨. شاکەلی، احمد (١٩٤٩)، من و منالە کوردەکان، گەلاوێژ، ساڵی دەیەم، ژمارە (٣).

٣٩. شاکەلی، احمد (١٩٦٠)، جەژني نەوروز، هەتاو، ساڵی شەشەم، ژمارە (١٧٤).

٤٠. شاکەلی، ئەحمەد (١٩٧٠)، ئاژاوەیە و دڵداری، روانگە، ژمارە (١).

٤١. شاکەلی، ئەحمەد (٢٠٢١/١/٢٤)، کەلار.

٤٢. شاکەلی، ئەنوەر (١٩٧٠)، ون بوون لەناو وشەدا، روانگە، ژمارە (١).

٤٣. فتح اللە، صابر حاجی (١٩٤٦)، سوپاس بو ئەم گەلاویژە و خویندەوارانی، گەلاوێژ، ساڵی حەوتەم، ژمارە (٧).

٤٤. قادر، عەبدوڵڵا حەسەن (٢٠١٤)، کەلاری کۆن و نەورۆز، گڕی نەورۆز، ژمارە (١٤).

٤٥. قادر، عەبدوڵڵا حەسەن (٢٠٢١)، نەورۆزی ساڵی ١٩٦٩ی کەلاری کۆن، گڕی نەرۆز، ژمارە (٢١).

٤٦. کەلاری، احمد (١٩٦٠)، بۆ شەهید کاک انور بانی، هەتاو، ساڵی حەوتەم، ژمارە (١٧٩).

٤٧. کەلاری، احمد (١٩٦٠)، پیروزبایی، روژی نوی، ساڵی یەکەم، ژمارە (١).

٤٨. کەلاری، پەژار (١٩٧٥)، ئاوارەیی، بەیان، ژمارە (٢٩).

٤٩. کەلاری، ئەحمەد (١٩٦١)، کوردستان هەلهات لە کوردستان، کوردستان، ژمارە (٢).

٥٠. مەلا احمد، مامۆستا (١٩٤٩)، دیسان بۆ کریم بەگ، گەلاوێژ، ژمارە (٨).

٥١. نەریمان (١٩٤٨)، شیتیم خوش ئەوی، گەلاوێژ، ساڵی نۆیەم، ژمارە (٨).

٥٢. نەریمان (١٩٥٤)، وەلامی ژین و کلول، هەتاو، ساڵی یەکەم، ژمارە (٦).

٥٣. نەریمان (١٩٥٧)، شیوەن، هەتاو، ساڵی چوارەم، ژمارە (١١٨).

٥٤. نەریمان (١٩٦٠)، چەند رەخنەیەک لەناميلكەی (میرکچان)، روژی نوی، ساڵی یەکەم، ژمارە (٢).

٥٥. نەریمان، م (١٩٤٤)، هەژار و دەولەمەند، گەلاوێژ، ساڵی پێنجەم، ژمارە (١١).

٥٦. نەریمان، مصطفی (١٩٩٤)، هەڵگری ئاڵای تێکۆشانی سیاسی حەمەبەگی جاف ١٩٠٤-١٩٣٤، رەنگین، ژمارە (٦٣).

٥٧. هەڵمەت، لەتیف (١٩٩٦)، لە (کفری)یەوە بۆ کۆتایی یەکان، مامۆستای کورد، ژمارە (٣٠-٣١).

٥٨. ئەحمەد شاکەلی (١٩٧١)، ......، روانگە، ژمارە (٢).

سێیەم// چاوپێكەوتن:

١. خەسرەو جاف (٢٠٢٠/١٠/٢)، هەولێر.

لە ساڵی (١٩٤٥) لە كەلار لەدایكبووە، ماستەری لە ئەندازیاری تەلارسازیدا بەدەست هێناوە، سەر لقی شۆڕشی ئەیلول بووە لە سنووری گەرمیان، ئێستا ئەدیبێكی ناسراوی كوردستانە.

٢. شاكەلی، ئەحمەد (٢٠٢١/١/٢٤)، كەلار.

لە ساڵی (١٩٤٨) لە گوندی دەككەی سەرچەم لەدایكبووە، خانەی مامۆستایانی تەواو كردووە و لەساڵی (١٩٧١) وەک مامۆستا دامەزراوە، لەماوەی ساڵانی (١٩٦٩ – ١٩٧٤) لە رۆژنامە و گۆڤارەكاندا نووسینی بڵاوكردوەتەوە، لە ساڵی (١٩٧٠)دا ئەندامی یەكێتی نوسەرانی كورد بووە.

٣. كەیمنەیی، حەمە حسێن (٢٠٢٠/٩/٢٤)، پەیوەندی تەلەفۆنی، ئێران.

لە ساڵی (١٩٢٣) لە گوندی كەیمنە لەدایكبووە، لەسەرەتای ساڵی پەنجاكانەوە هاتوەتە كەلار و نزیكەی نۆ ساڵ تێیدا ماوەتەوە، ئەم هونەرمەندە خاوەنی چەندین بەرهەمی ڕەسەنی گەرمیانیە.



مەلا ئیدریس ژاڵەیی

# پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان هاوڵاتییان هۆکاری سەرەکی گەشەکردن و بەرەوپێشچونە

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وبعد:**

## لە بری پێشەکی :

لەم چەن لاپەڕەیەدا باس لە ئەو پرەنسیپانە دەکەم کە بنەمای پێکەوە ژیان و یەکتر قەبوڵکردن دەکەنە فەرمانێکی خودایی و بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام « درودی خودای لەسەر بێت « پشتگیری بۆچونەکانم دەکەم و ئەوەیش ڕووندەکەمەوە کە دابینکردنی مافەکان مسۆگەری ژیانێکی ئارام و پڕ لە ئاشتی کۆمەڵایەتی دەکات کە ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی کۆمەڵگە لەهەموو ڕویەکەوە، دەڤەری گەرمیان و شاری کەلاریش بە تایبەتی نمونەنەیەکی جوان بوون بۆ پێکەوەژیان وتێکەڵەیەک بوو لە چین و توێژ و نەتەوە و زمان و ئاین و ئاینزای جیاواز , هەموو پێکەوە دەژیان و کاریان دەکرد بەبێ هەبونی هیچ کێشەیەک، ئەم بارودۆخەش کاریگەری هەبوو لە فەراهەمکردنی ئاشتی کۆمەڵایەتی و دەرەنجامیش گەشەکردن و فراوان بون.

بابەتەکەم دابەشکردووە بۆ پێشەکیەک و دوو تەوەر و کۆتاییەک، لە پێشەکیەکەدا گرنگی توێژینەوەم لەم بوارەدا بەوە سەلماندووە کە ئاشتی و پێکەوە ژیان تاکە ڕێگەیە مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن بۆ بەختەوەری و سەربەرزی و خوانەخواستە پەیڕەو نەکردنی بنەمای پێکەوەژیان و ئاشتی و لێبورن سەرەنجامی شەڕ و کوشتار وماڵوێرانی دەبێت، هەروەها لە تەوەری یەکەم دا باس لەوە دەکەم کە ڕەچەڵەکی مرۆڤەکان هەموو یەکن و بنەڕەت ئەوەیە کە هەموو پێکەوەبژین، تەوەری دووەمی توێژینەوەکەشم بۆ ڕونکردنەوەی چەند چەمکێک تەرخانکردووە کە پێویستە لەم بوارەدا زیاتر قسەیان لەسەربکرێت، کۆتاییەکەش پوختەی باسەکە و ئەو دەرەنجامەی کە لەم باسەوە پێیگەیشتین.

## پێشەکی

خودای گەورە هەموو مرۆڤایەتی لە پیاو و ژنێک دروستکردووە و بنەڕەتی هەموان یەکە، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} (الحجرات: ١٣)، هەروەها پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێت: «يا ايها الناس، الا ان ربكم عز وجل واحد، الا وان اباكم واحد، الا لا فضل لعربي على عجمي، الا لا فضل لأسود على احمر الا بالتقوى؟ الا قد بلغت ؟، قالوا: نعم قال: ليبلغ الشاهد الغائب» بەپێی تێگەیشتن لە قورئان و فەرموودە , دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بنەڕەت لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان ئاشتی و خۆشەویستی و یەکترناسین و برایەتیە و شەڕ و ناکۆکیەکانیش توشهاتێکی ناساز و نەشیاوە، جەنگ کە ڕێگەی پێدراوە تەنها بۆ پارێزگاریکردن لە گیان و ژیان و پیرۆزیەکانی مرۆڤایەتی یە بەهەموو ئاینەکانەوە، خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: {وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا} (الحج: ٤٠).

هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: {وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ} (البقرة: ١٩٠)، هەروەها دەفەرموێت: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ} (الحج: ٣٩).

بێگومان هەندێک جاریش ئەگەر ناکۆکی و نەگونجان و پێکنەهاتن لە نێوان مرۆڤەکان رویاندا ئیسلام بۆ شەڕوکوشتاریش یاسای تایبەت بەجەنگی داناوە و ڕێگری کردووە لە تێکدانی مەزرا و کێڵگەکان و کوشتنی خەڵکانی بێچەک و شەڕنەکەر و منداڵ و ئافرەت و پیرو بەساڵاچوان , قەدەغەی کردووە بەبیانوی جەنگەوە ستەم و ناپاکی بکرێت ، خودای گەورە دەفەرموێت: {وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ، وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَبَقُوا إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ} (الأنفال: ٥٨ — ٥٩).

## تەوەری یەكەم

## گرنگە ئێمە قسە لەسەر ئاشتی و پێكەوەژیان بكەین

مێژووی ئێمە پڕە لە نموونەی جوانی ئاشتی و پێكەوەژیانە، لە ساڵانی پێشودا خەڵك پرسیاری نەدەكرد كێ چیە و لەسەر چی ئاین و ئاینزایەكە.

كوردستان و بگرە ناوچەكەش پڕبوو لە پێكەوەژیانی ئاینی، لەلای خۆمان لە شاری كفری بازاڕ جمەی دەهات زۆربەی كاسبكارەكان جوو بوون كەس فتوای نەدەدا مامەڵەكردن لەگەڵیان حەرامە , شێخ مەحمودی نەمر، پیاوی تەكیە و سیمبولی ئایینداری بوو ئاینداراانی دیكەی وەك جوو و ئەوانیتر لە سایەیدا حەسانەوە.

ڕەنگە حاڵەت هەبووبێت جوو، مەسیحی، كاكەیی،ئێزیدی و زەردەشتی و ئەوانی دیكە خۆیان تێدا بە ستەملێكراو بزانن، بەڵام زۆرێك لەو ڕوداوانە هەمووان تێدا هاوبەش بوون واتە موسڵمان و جوو و ئایندارانی دیكە هەموو وەك یەك ستەمیان لێكراوە و زۆر كەم هەبووە ستەمەكە تەنها تایبەت بووبێت بە ئاین و ئاینزایەكی دیاریكراو.

لە مێژووی زۆر نزیكیشدا لە كوردستان جوداكاری نەكراوە لەسەر بنەمای ئاین و بیروباوەڕ , حیزبەكانی كوردستان بەمانای ئەمڕۆ حیزبی ئیسلامی سیاسی نەبوون , بەڵام دەنگی گەلێكی موسڵمان بوون بۆ ئازادی و ڕزگاری، هیچ جوداكارییەك بۆ وەرگرتنی ئەندام لەسەر بنەمای ئاین نەبووە بگرە بەرپرسانی باڵا لەهەردوو حیزبی سەرەكی كوردستان ناموسڵمانیان تێدایە و تاكو ئێستەش لە حكومەتی هەرێمی كوردستان بەرپرسی باڵا هەیە. لە سەر ئاستی گەرمیانیش زۆر پۆست هەیە نا موسڵمان بەڕێوەی دەبات و هیچ كێشەیەك نەبووە. لە دێهاتەكانی كوردستان دا مزگەوتەكان ماڵ و مەئوای هەژار و نەدار و ڕێبوار و پێشمەرگە بوون.

كەس ڕێگری نەدەكرد بە بیانووی موسڵمان نەبوون یان نوێژنەكردن و پیسی نەچنە ناو مزگەوتەكان , تەكیە و خانەقاكان مەئوا و شوێنی خواردن و حەسانەوەی خەڵكی جۆراوجۆر بوون، لە شاری كەلار شێخ هەبووە موریدەكانی كاكەیی بوون , بەڵام باوەڕیان بە وەزع و كەرامات و پاكی شێخ هەبوو و مورید و شوێن كەوتەی بوون.

شێخ و ئاینداری موسڵمان دەرگای واڵابوو بۆ هەركەسێ بەهرەمەند بێت لە ئاینداریەكەی ئەوی دیكەی ناموسڵمانیش هیچ ڕێی لێنەگرتووە كە واز لە شێخە موسڵمانەكەی بهێنێت. هەتاكو ئێستەش لە هەندێك لە شارەكانی كوردستان بە تایبەت لە شاری كەلار من دەیانناسم ماڵێك شیعەیە و لەترسی ئەوەی سونیەكانی عارەب نەیكوژن شارەكەی خۆی جێهێشتووە و دراوسێیەكەشی لەترسی ئەوەی شیعە نەیكوژێت شاری خۆی جێهێشتووە،

ئەم دوو ماڵە پێکەوە لە گەڕەکێکدا دراوسێن و پێکەوە دەژین و هیچ کێشەیەک لە نێوانیاندا نییە.

بەداخەوە ئەمڕۆ شەپۆلێکی یەکتر قەبوڵنەکردن و تێکدانی شیرازەی ئاشتی کۆمەڵایەتی هەستی پێدەکرێت , ئەم بیروڕایەش بەهۆی خێرایی هۆکارەکانی گەیاندن کە دونیای کردووەتە گوندێک بە زووترین کات هەموو جۆرە فەتوا و بۆچوونێک بە هەموو لایەکدا تەشەنە دەکات.

پێویست دەکات ئەم بابەتە گرنگی زۆر زیاتری پێبدرێت و هەموو کایەکانی پەروەردە و ڕاگەیاندن ئامادەکاری بکات بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی دەنگە ناسازەکان کە لەگەڵ سێبەری خۆشیدا ناگونجێت و سەرەنجام شەڕ و ئاژاوە و نەخۆشی و هەژاری و دواکەوتویی بەرهەم دەهێنێت.

لەبەر ئەم هۆکارانە ئەم توێژینەوەیە بەلای توێژەرەوە گرنگی خۆی هەیە و پێویستە زیاتر قسەی لەسەر بکرێت و ئەو چەمکانە ڕونبکرێتەوە کە کۆڵەکەی پێکەوەژیانی ئاشتیانە و یەکترقبوڵکردنن بە هەموو جیاوازیەکانەوە .



## تەوەری دووەم

## تێگەیشتن لە هەندێک لەو چەمکانەی بنەمای سەرەکین بۆ چەسپاندنی ئاشتی و پێکەوژیان

### ١-هاووڵاتیبوون

بیروبۆچونی زۆر هەیە لەسەر مانای تەواو و پڕ بە پێستی هاووڵاتیبوون، هەندێک بەلایانەوە وایە مانای پەیوەستبوونە بەو زێدەی لێی هاتوەتە ژیانەوە، هەندێکی تر مانایەکی فراوانتریان داوەتێ بە مانای پەیوەستبون بە نیشتمان، خاک، زمان و کلتورێکی تایبەتەوە.

(محمد شمخان — ٢٠١١ ویکیبیدیا، الموسوعة الحرة ص٤٦).

هاوشاریبوون یان هاووڵاتیبوون کارلێکی نێوان مرۆڤ و ئەو زێدەیە کە تێدا ژیان دەکات ئەمەش پەیوەندیەکی کارێکەری ڕێکخراوە لەنێوان دوو لایەندا کە کۆمەڵێک ماف و ئەرک دەچەسپێنێت، وەک ئەوەی هاووڵاتی ڕێز لەو وڵاتە بگرێت و ئینتیمای بۆی هەبێت و لە ئاستیدا بەرپرسیارێتی پارێزگاری شوناس، مێژوو،زمان،کەلتوور و بەها باڵاکان هەڵگرێت.

بێگومـان هـەروەک چـۆن نیشـتیمان مافـی لەسـەر هاوڵاتیانـی هەیـە , بەهەمـان شـێوە هاوڵاتیانیـش مافیـان هەیـە کـە ئازادانـە لـە شـار و وڵاتەکانـی خۆیـان بژیـن بەبـێ هیـچ هەڵاویـردن و جوداکاریـەک چ لەسـەر بنەمـای ئایـن یـان چیـن یـان ڕەنـگ و سـیما یـان بیروبـاوەڕ و مافـی یەکسـانبوونی هەمـووان لـە بەدەسـتهێنانی مافـە ڕامیـاری و کۆمەڵایەتـی و ئابوورییـەکان.

لـە ڕاسـتیدا وڵاتانـی ڕۆژئـاوا لـە دوای شۆڕشـی فەرنسـا بـە زاراوەکانـی هـەق و هقوقـی هاووڵاتیبـوون ئاشـنا بـوون , چونکـە پێـش ئـەوە بـاوی جیـاکاری لەسـەر بنەمـای ئاینـی نێوان کاسـۆلیک و پرۆسـتانت و نێـوان ڕەنگـی جەسـتە و چیـن و چەندەهـای دیکـە بـوو، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئـەو مافـە گرنگانـەی مرۆڤایەتـی لەگـەڵ دەرکەوتنـی ئاینـی ئیسـلام و دروسـتکردنی یەکـەم دەوڵەتـی ئیسـلامی لـە مەدینـە لـە سـەر دەسـتی پێغەمبـەری ئیسـلام (درودی خـودای لەسـەر بێـت) لـە سـاڵی یەکەمـی کۆچـی ٦٢٢ ی زاینـی دابینکـرا , بێگومـان بەهـای مـرۆڤ لـە دیـدی ئیسـلامەوە مرۆڤایەتیەکەیەتـی، لـە قورئانـی پیـرۆزدا دەفەرموێـت :﴿وَلَقَـدْ كَرَّمْنَـا بَنِـي آدَمَ﴾ (الإسـراء: ٧٠).

کەواتـە ڕێزگرتنـی خودایـی بـۆ هەمـوو مرۆڤەکانـە و ئەمـەش لەبـەر خاتـری مرۆڤایەتیەکەیـان نـەک هیـچ ئیعتیبارێکـی دیکـەی ئاینـی یان ڕەنـگ و نەتـەوە و چیـن، تاکـە پێوەرێـک کـە پلـەی مـرۆڤ بـەرز بکاتـەوە سـوودگەیاندنە بـە مرۆڤایەتـی کـە زانایـان بـە خۆپارێـزی لـە ئـازاردان یـان تەقـوا لێکیانداوەتـەوە.

خودای گەورە دەفەرمویێت ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: ١٣)، ).

٢- پێکـەوە ژیانی ئاشتیانە

ئـەم تێگەیشـتنە بێگومـان لـە دوو برگـە پێکدێـت و بەمەبەسـتی زیاتـر ڕونکردنەوەیـان و گەیشـتن بـە ئامانجەکەمـان هـەر برگـە و بەجیـا تیشـک دەخەینـە سـەریان :

یەکەم: پێکەوەژیان :

مـن لـەم باسـەم دا زیاتـر سـوودم لەسـەرچاوە عەرەبییـەکان وەرگرتـووە بۆیـە چەمکـی پێکـەوە ژیانـم لـە التعایش وەرگرتـووە کـە وەهـا پێناسـە کـراوە:

پێکەوەژیـان بارودۆخێکـی کۆمەڵایەتیـە (التعایـش) لـە (العیـش) وەرگیـراوە ، لـە کتێبـی (لسـان العـرب) هاتـووە.

«العيش: الحياة، لە كتێبی تاج العروس دەڵێت: «والتعايش: المعايشة: عاش معه، كقولهم: عاشره، والغالب في التعايش ان يكون بالفة ومودة».

لە كتێبی ( المعجم الوسيط ) دەڵێت: «تعايشوا: عاشوا على الألفة والمودة، ومنه التعايش، وعايشه: عاش معه، والعيش معناه الحياة، وما تكون به الحياة من المطعم والمشرب والدخل وغيره».

كۆی پێناسەكان لەوەدا یەكدەگرنەوە كە ژیان بەهرەیەكی خوداییە بە سەرجەم مرۆڤەكان و بونەوەرانی بەخشیوە و ئەم ژیانەش بە سەربەرزی تەنها مافی ئاین یان نەتەوەیەكی دیاریكرا نییە هەمووان مافیان هەیە بەسەربەرزی بژین و گوزەران بكەن.

هەروەها ووشەی پێكەوەژیان بەمانای هاوبەشیكردن لە ژیان بە سۆز و خۆشویستی دێت و پەیوەندیەكی هەمەلایەنەیە لەنێوان مرۆڤەكاندا.

التويجري كە یەكێكە لە زاناكان بەم شێوەیە پێناسەی دەكات: «اتفاق طرفين او عدة اطراف على تنظيم وسائل العيش، اي: الحياة، فيما بينهم وفق قاعدة يتم تحديدها وتمهيد السبل المؤدية اليها».

بە مانایەكی دیكە پێكەوەژیان پەیوەندی پتەوی نێوان مرۆڤەكانە كە تێیدا سود لە ئەزموونە مرۆڤایەتییەكان وەردەگیرێت ئەویش لە ئەنجامی پێكگەیشتن و بینین و بەدەم یەكترەوە چوون بە مەبەستی گەیشتن بە بەها باڵاكانی مرۆڤایەتی.

ڕونتر بڵێین كۆمەڵگە پێكەوەژیاوەكان ئەو كۆمەڵگەیانەن كە مرۆڤەكان سەرەڕای جیاوازی ئاین و ڕەگەز و نەتەوە و ڕەنگ و زمان پێكەوە دەژین و هیچ كێشەیەك لەنێوانیان لە ئەنجامی جیاوازیەكانیانەوە ڕونادات .

بە كوردی تر پێكەوەژیان واتە قەبوڵكردنی ژیان لەگەڵ جیاوازەكان بەبێ هەوڵدان بۆ سڕینەوە یان دروستكردنی شەڕ و ئاژاوە لەگەڵ ئەویتر كە ئەمەش پێویستییەكی ئەمڕۆی ژیانە لەم جیهانە بچوكە تێكەڵ و پێكەڵبووە هەمەجۆرەی نێوان ئاین و مەزهەب و نەتەوە و ڕەنگ و ڕووە جیاوازەكان.

بێگومان پێكەوە ژیان واتە بە ئاشتی ژیان و ناكرێت جیاوازی لەنێوان پێكەوەژیان و بە ئاشتی ژیان بكەین ، بۆیە لەسەر ئاشتی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە قسەدەكەین:

٣ : ئاشتی

السلام یەكێكە لە ناوە پیرۆزەكانی خودا ، مانای بێهەڵەیی و بێ ناتەواوی و دوور لە نەنگی و ناتەواوی،هەروها مانای سەلامەتی و دادگەری و بێوەییە .

خوای گەورە فەرمانەدەكات بە موسڵمانان هەمووان بە مانای ئیسلامی پڕ لە سەلامەتی و ئاشتی خوازی بن. لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ادْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً ولا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ): (البقرة: ٢٠٨)، واتە پەیوەست بن بە سەرجەم برگەكانی شەریعەتی ئیسلام و كاری پێبكەن و دوربكەونەوە لەهەموو ئەو كارانەی كە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامی ئاشتی خوازین.

خودای گەورە بەهەشتی بە ماڵی ئاشتی ( دارالسلام) ناو بردووە. دەفەرموێت : (واللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلامِ ويَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (یونس: ٢٥)، زانایان دەڵێن:»لەبەر ئەوەی لەبەهەشت هیچ كێشە و ناتەواویەك نیە ، كەواتە بەهەشتیش خانەی ئاشتی یە، سڵاوی موسڵمانان سەلامە و هێمای ئاشتیە بە مانای ئەوەی كاتێك كەسێك سەلام لە كەسێكی تر دەكات ئەوە نزای سەلامەتی بۆ دەكات لەدین و دونیای و سەلام كردن واتە ئەوەی سەلام دەكات ئەوە ئەمان و ئاشتی و پارێزراوی بەخشیوە بەو كەسەی سەلامی لێدەكات» .

٤- لێبوردن :

بیرۆكەی لێبوردەیی ئاینی و پێكەوە ژیانی ئاشتییانە، خواستێكی فیكریە و ڕەهەندی فیكری و ڕۆشنبیری شارستانی و كۆمەڵایەتیش لە خۆ دەگرێت و لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلامیشەوە بەو چاوە سەیر دەكرێت كە مانای ڕێزگرتن لە ئەویتر و ئازادییەكان و جیاوازی نێوان تاكەكان و قەبوڵكردنی جۆراوجۆریی كلتورەكان و تەنانەت كرانەوەش بە ڕووی فیكر و فەلسەفەی ئاینەكاندایە .

لێبوردەیی و پێكەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان ئاینەكان بابەت یان پرۆژەیەك نیە تەنها بۆ دەوڵەت یان كۆمەڵگەیەك گرنگ بێت , بەڵكو گرنگیەكی مرۆڤانەی هەیە لە دوای ئەوەی كە ئێستا جیهان گوندێكی گەورەیە و زۆر پێویستە كار لەسەر پێكەوە ژیانی دانیشتووانی ئەم گوندە بكرێت و بكرێتە بنەمایەكی گرنگ بۆ مرۆڤایەتی هەتاكوو لە سایەی ئەم ژیانەدا مرۆڤایەتی لە ڕێز و خۆشەویستی و تەندروستی و گەشە و بەرەوپێشچوندا بێت.

بێگومان ئەم پێكەوەژیانە پێویستی بە ژینگەیەكی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزی یەكترگرتن و لێبوردەیی هەیە .

بە چاوپۆشین لەوەی ئایا ڕەگەز یان ڕەنگی یان بیروباوەڕی چییە و چۆنە.

بەڕاستی ئاینی ئیسلام ئاینی لێبوردەیی و خۆشەویستی و پێکەوەهەڵکردنی ئاشتییانەیە، بیروباوەڕێکە ئەوەندە بەهێزە لە خۆگری هەموو کارە باش و ئاکارە جوانە کۆمەڵایەتی و بەها مرۆڤایەتیەکانە و لێبوردەیی سیمایەکی جوانی ئەم ئاینەیە، خۆری لێبوردەیی لە شارستانیەتی ئیسلامی لە سەردەم و چاخەکانی مێژوودا پرشنگی داوەتەوە و لە ناخی موسڵماناندا ڕەگی داکوتاوە و مەبەست و ئامانجی سەرەکی ئیسلامیش بەرپاکردنی لێبوردەییە و بنەمای پەیوەندی موسڵمانە لەگەڵ غەیری خۆیدا لە هەڵگرانی ئاینەکان و بیروباوەڕەکەیشی هەر لەم بنەمایەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە ئیمانی موسڵمان دانامەزرێت هەتاکو باوەڕی بە هەموو پێغەمبەرانی خاوەن پەیام و بەرنامە و ئاینەکانیان نەبێت، پێویستە جیاوازیش لەنێوانیان نەکات و دەمارگیری بۆ یەکێکیان بەتەنها نەبێت، هەر ئەم ڕەهەندە مرۆڤانەشە کە پانتاییەکی فراوانی بە لێبوردەیی لە ئیسلامدا بەخشیووە.

بەڵگە نەویستە کە لێبوردەیی واتە باوەڕبون بە جیاوازی و یەک ڕەنگ نەبوون، ئەمەش ئەو پەیوەندیە مرۆڤانەیەیە کە ئیسلام دەیەوێت و مایەی بەختەوەری مرۆڤەکانە و دەبێت ببێتە هۆکاری یەکتر ناسین و هاوکاری کردن و گونجان و پێکەوە هەڵکردن , هەروەها گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن و ڕێزلێگرتن لە نێوان هەردوولا , لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: [ ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (١٢٥) ].

پێویستی نزیکبوونەوە لە نێوان کلتوورەکان و کارلێکردن لە نێوان شارستانیەکان ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبێت بە تایبەت لە دوای شۆڕشی زانیاری و تەکنۆلۆجیا و پەیوەندیەکان کە هەموو ڕێگر و دیوارەکانی کات و شوێنی نێوان گەل و نەتەوەکانی هەڵگرت و ژن و ژنخوازی و هاوبەشی لە کارو کەسابەت و ژین و ژیان و خزمایەتی لەنێوان هەموو مرۆڤەکان درووست بووە لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵ و خێزان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، ئیدی باوی جیاوازیکردن بە کردەیی نەماوە و کارکردنیش بۆ ئەم مەبەستە خواستێکی ئەم سەردەمەیە و لادان لێی هەڵە و کەم وکورتییە.

بێگومان لێبوردەیی بەم مانایە هەوێنی ئاشتی کۆمەڵایەتی و پێکەوەژیانی پڕ لە ڕێزگرتنە و پارێزەر و زەمانی کۆمەڵگەکانە بۆ ژیانێکی ئارام و پڕ لە بەختەوەری و هۆکاری نەهێشتنی شەڕ و ناکۆکی و پێکهەڵکژانەکانە و ئەمەش مسۆگەری گەشەسەندنی بەردەوام و هەنگاو بە هەنگاوە (التنمية المُستدامة).

## كۆتایی

لە ئاینی ئیسلام دا بنەچە و دایک و باوكی مرۆڤەكان یەكە , خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} ، هەروەها پێغەمبەری ئیسلام «صلى الله عليه سلم» دەفەرمویت- (كُلُّكُمْ لِآدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَاب).

هاوڵاتییانی وڵاتێک جگە لە برایەتی مرۆڤایەتی ئەگەر ئاین و نەژادیشان جودا بێت پەیوەندی هاوڵاتێتی پێكەوەیان دەبەستێتەوە.

ئاینی ئیسلام ئاشتی و پێكەوە ژیان و ئاسودەیی و بەختەوەری بۆ سەرجەم مرۆڤەكان دابین دەكات {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ} هاتووە بۆ ئەوەی مرۆڤەكان دونیا برازێننەوە و پێشكەوتن و خۆشگوزەرانی دابین بكەن ئەمەش بە پێكەوە ژیان و ئاشتی كۆمەڵایەتی دەبێت.

پێغەمبەری ئیسلام (درودی خودای لێبێت) دەفەرمویت: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ)، ئاینی ئیسلام لە بنەرەتدا بۆ پاراستنی گیان و ئاین و سامان و هۆش و كەرامەتی مرۆڤ هاتووە بۆیە بە هیچ بیانویەك رێگە نادات بەناوی ئاینەوە دەستدرێژی بكرێتە سەر سەروماڵ و ئاین و هۆش و بیر كەرامەتی مرۆڤەكان ، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت : : {لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ}.

لە كوردستان مێژوویەكی پرشنگداری یەكترقەبوڵكردن و پێكەوەژیانی ئاینیمان هەیە , بەڵام لە حاڵی ئێستادا گوتاری ناكۆك و دژ هەیە كە كەراهیەت و بوغزاندن درووستدەكات. حاڵی ئێستا هاوشێوەی جاران كە دەمانگوت تەعریب و تەبعیس و تەرحیل ئێستەش تەكفیر و تەبدیع و تەفسیق هەیە. رێچكە و رێبازە جۆراوجۆرەكان هەریەكەیان تەنها خۆیان بە راست و ئەوانیتر بە كافر و گومڕا و نەزان دادەنێن. خوێنی هەندێک حەڵاڵ دەكەن، سڵاوكردن لە هەندێک حەرام دەكەن. بەشداری لە كۆڕو مەجلیسی ئەوی تر و خوێندنەوە و تەماشاكردنی كتێبێكی تری جگە لەخۆیان،بە دەرچوون لە رێگەی راست و دیاردەی ئەوەی لەگەڵمان بێت ئیماندار و لەسەر هەقە؛ ئەوەی لەگەڵم نەبێت و وەک ئێمە بیرنەكاتەوە و قیاسی ردێنی سانتیمێك لە ئێمە كورتتر و دەرقاچی شەرواڵەكەی كەمێک درێژتر و سیمای ئاوا و ئاوا نەبێت ئەوە دوژمنی خوا و پێغەمبەر و ئیسلامە. بێگومان ئەم بیر و بۆچون و رێچكە و رێبازانە هەموو موسڵمان و تەنانەت پەیرەوكارانی مەزهەبی

سونییشن و هەنێکیان خۆیان ئەهلی سونە و جەماعە و ئوسولی و ئیسلامی ڕادیکاڵن کە لەنێوخۆیان یەکتر قەبوڵ ناکەن،ئەوە ئاینزای شیعە هەر مەپرسە و ئاینی جیاواز و بیروبۆچونی جیاواز هەر جێگەیان نابێتەوە لە بازنەی ئیسلامی ئەواندا.

لە کۆتایدا ئەرکی هەمولایەکە بە حکومەت و حیزبەکان و ڕێکخراوەکان و کەسایەتی و ڕۆشنبیرانی سەربەخۆ و لایەنی زانستی ئەم دەڤەرە بەتایبەت زانکۆی گەرمیان وەک ناوەندێکی ئەکادیمی و مەعریفی گرنگی زیاتر بە ئەم بابەتە بدات و کۆلێژ و بەشی تایبەت بە خوێندنی ئەکادیمی و زانستە ئیسلامیەکان و زانستی ئاینەکان بە شێوەیەکی گشتی بکاتەوە و بە میتۆدی قووڵ و زانستیانە هاوسەنگی ئاینی بخوێنرێت و کۆنتاکی لەگەڵ کایە ئاینیەکانی ئەوقاف و زانایان و ناوەندە ئاینیە غەیرە موسڵمانەکان هەبێت بە مەبەستی برەودانی زیاتر بە پێکەوەژیان و لێبوردەیی نێوان هەموو توێژ و چین و ئاین و بیروباوەڕە جیاوازەکان.

## سەرچاوەکان

بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە جگە لە قورئانی پیرۆز و کتێبەکانی دەقی فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، سود لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە :


١- تەفسیری قورئانی پیرۆز ، وەرگێڕانی هەژار ،بەبێ چاپخانە و بەرواری چاپ .

٢-تەفسیری ئاسان، بورهان امین، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری تیشکی نوێ ٢٠٢٠ .

٣- فتح الباري بشرح صحيح البخاري/ ابن حجر العسقلاني-دارالرسالة العالمية، الطبعة الخامسة،٢٠٢٠.

٤-المنهاج في شرح صحيح مسلم بن حجاج / الامام النووي /مؤسسةالرسالة ناشرون ، ٢٠٢٠ .

٥- أسس العلاقات الودية بين الشعوب و الامم في القرآن الكريم/الدكتور مصطفى الزلمي، الطبعة الاولى ٢٠١٦ .

٦- تفسر الكريم الرحمن في تفسيرالكلام المنان ، تاليف : العلامةالشيخ عبدالرحمن بن ناصرالسعدي/دار السلام للنشر ٢٠١٠ التوزيع .

٧- احكام الذميين و المستأمنيين في دار الاسلام : عبدالكريم زيدان ، مؤسسةالرسالة ناشرون ، بيروت ، لبنات

٨- الاخر في القرآن : غالب حسن الشابندر، مركز دراسات فلسفةالدين، بغداد – العراق، الطبعةالاولى٢٠٠٥ م.

٩- الآخر و حقوق المواطنة ،محمد محفوظ، مركزالرايةللتنمية الفكرية، دمشق سوريا، الطبعةالاولى ٢٠٠٦م .

١٠- الاسلام دين السلام : عبدالصبور الشاهين، دار السلام للطباعة و النشر، القاهرة ،مصر ،الطبعةالاولى ٢٠٠٤ م .

١١- الاسلام والتفاهم والتعايش بين الشعوب ، هاني المبارك ، د.شوقي ابوخليل، دارالفكر دمشق، سوري الطبعةالاولى ١٩٩٧ م .

١٢-الاسلام والديقراطية: فهمي هويدي ،مركز الاهرام للترجمة و النشر، القاهرة، مصر ، الطبةالاولى، ١٩٩٣م .

١٣- الجهاد في الاسلام كيف نفهمه و كيف نمارسه : محمدسعيدرمضان البوطي،دارالفكرا لعاصر،بيروت،لبنات، الطبعةالثانية ١٩٩٧م .

١٤- الحوار من اجل التعايش :د. عبدالعزيز بن عثمان التويجري، دار الشروق،القاهرة، مصرالطبعة الاولى١٩٩٨م.

١٥-الرحيق المختوم :صفي الرحمن المباركفوري، دار الوفاء،المنصورة، مصر، الطبعةالسابعةالعشر ٢٠٠٥ م .

١٦-السلوك الاجتماعي في الاسلام: حسن ايوب، دارالندوة الجديدة، بيروت، لبنان ، الطبعةالرابعة١٩٨٣م .

١٧- ادب الاختلاف في الاسلام ،د. طه جابر العلواني ، المعهدالعالمي للفكر الاسلامي، فرجينيا، ط١ .

١٨-الحريات العامة في الدولة الاسلامية ، راشد الغنوشي، مركز دراسات الوحدةالعربية، بيروت ، ط١ .

١٩-اليهودية في القرآن الكريم ، عبدالفتاح طبارة، مؤسسةالرسالة .

٢٠اليهودوالدولة العثمانية ، د.احمد نوري النعيمي ، بغداد، ط١ ، ١٩٩١.

٢١- مقاصد الشريعة الاسلامية، د.احمد الريسوني ، المعهد العالمي للفكر الاسلامي ، ط١ .

٢٢-السيرة النبوية دروس و عبر ، د. مصطفى السباعي ، دار الرسالة.

٢٣- لسان العرب ، الامام جمال الدين محمد بن مكرم بن منظور ، دار الكتب العلمية - بيروت ، لبنان -١٤٣٠ه٢٠٠٩م

٢٤- المعجم الوسيط ، الطبعة الرابعة، مجمع اللغةالعربية دار الشروق الدولية ، مصر ، القاهرة ، ٢٠٠٨م ، ١٤٢٩ه

٢٥- تاج العروس من جواهر القاموس ،الامام محمد مرتضى الزبيدي الحنفي ، دار ابن الجوزي، القاهرة، المصر .

٢٦- السيرة النبوية ، على صاحبها افضل الصلاة و السلام ،عرض وقائع و تحليل احداث، الدكتور علي محمد الصلابي ، دار ابن الجوزي ، القاهرة .



ئەیوب کوێخا ڕۆستەم

# کەلار چۆن بوو بە زێد و ماوای دووەمم

مانگی تەمووزی ساڵی (١٩٧٧)، پاش تەواوکردنی خولێکی چوار مانگی لە پەیمانگای ڕاهێنان و ڕێنمایی کشتوکاڵی (ئەبوغرێب) بۆ ژمارەیەک لە فەرمانبەرانی هەرەوەزی، ماوەی سێ ڕۆژ بواریان دابووین و دەبوایە دوای ئەوە بۆ سەرۆکایەتی ناوچەی کشتوکاڵی سلێمانی بگەڕێینەوە، ئێمە کە نازر بووین چووین بۆ بەڕێوەبەرایەتی هەرەوەزی سلێمانی، لەوێ هەواڵێکی ناخۆشیان پێداین، گوایە جارێک کەسمان بۆ شوێنی خۆمان ناگەڕێینەوە و بە پێی پێداویستی لقە کشتوکاڵییەکان دابەشماندەکەنەوە. من و سێ هاوڕێی تر بە ناوەکانی: (هیوا حاجی ئیسماعیل، شەوکەت حاجی حەمەساڵح و مەهدی عەلی جافر) کە هەر سیانمان تەوێڵەیی بووین ناردمانیان بۆ لێژنەی وەرگرتنی گەنم لە (سەی سادق) بۆ ئەوەی هاوکارییان بکەین، دوای دە ڕۆژێک (شەوکەت حاجی حەمەساڵح) لە سلێمانی بوو بوو هات بۆ سەی سادق، دەستیکرد بەگیرفانیدا لەو کاتەدا من و مەهدی عەلی و هیوا وەستا بووین، وتی: فەرمانی دابەشکردنمان دەرچووە، دەستی ڕاکێشا بۆ من وتی: کەلار و بۆ مەهدی و هیوا وتی: ئێوەش سەنگاو. من وتم: گاڵتەدەکەیت فەرمانەکەی دایە دەستم، بینیم دابەشکردنێکی زۆر بێ ویژدانانەیە، هەرچی فەرمانبەری باش و وریا هەبووین بەتوانای خۆمان دڵخۆشبووین بەوەی لە شوێنی خۆماندا دەمێنینەوە، کەچی بۆ شوێنە دوورەدەستەکان دانرابووین و بە پێچەوانەوە خاوەن واستەکان خرابوونە شوێنە خۆش و نزیکەکانەوە.

یەکسەر من بۆ لقی کشتوکاڵی هەڵەبجە گەڕامەوە، بە (سەرۆکی لق)م وت: ئەمە مانای چییە؟ لە وەڵامدا وتی: هیچ نییە خۆم پێیان دەڵێم تۆ بمێنیتەوە، کەچی بۆ بەیانی کە چووم بۆ لق، دوای سەعاتێک وتیان سەرۆکی لق بانگتدەکات، چوومە ژوورەوە وتی: زۆر هەوڵمدا بتهێڵمەوە، دوێنی و ئەمشەویش قسەم لەگەڵ (ئوستاز جاسم) کردووە، ناوبراو

سەرۆکی ناوچەی کشتووکاڵی سلێمانی بوو، زۆر هەوڵم لەگەڵی دا بەڵام قایل نەبوو، وا وەڵامیدامەوە گوایا ئەمە تەنها بۆ یەک ساڵە و لەو شوێنانەدا پێویستمان بە فەرمانبەری باش و زیرەک هەیە.

ئیتر من هیچ ئومێدێکم بە مانەوە لە هەڵەبجە نەما، بۆ تەوێڵە گەڕامەوە و زۆریش بێتاقەتبووم، بەڵام لەبەرماڵەوە دەرمنەخست کە بەو شێوەیەم، شەو زۆرمان قسەکرد، وتم: بۆ دوو بەیانی دەڕۆم بۆ دەستبەکار بوون و بزانم چۆن دەبێت، من کە کەوتمەڕێ تەنانەت نەمدەزانی گەراجی کەلار لە کوێیە، کە چووم بۆ کەلار بۆ دەستبەکاربوون شوێنی حەوانەوە و پشوودانمان لە (دائیرەی بەیتەرە) بوو لای دوو برادەری ترمان کە زیاتر لە ساڵێک بوو لەوێ فەرمانبەر بوون، من تەنیا چەند ڕۆژێک لایان مامەوە، ئیتر لە ڕێی هاوڕێیەکی دائیرە بە ناوی (عەلی ئەمین خدر) لە کەلاری کۆن خانووی ژنبرایەکیم بە ناوی (حەمەمین ئەحمەد فەتاح) بەکرێ گرت کە پێشتر ئەندازیاری سەرپەرشتیاری شارێی نێوان (کەلار و کفری) تێدابوو، خانووەکە دوو هۆدە و هەیوانێکی کراوە و پاک و تەمیز حەمام و ئاودەستی تێدا بوون، لەناو حەوشەیەکی گەورە دا بوو، بۆ ئێمە کە ئەو کاتە (من و ناهیدەی هاوسەرم و گەردەی خوشکم و هەردی کوڕم) کە تازە کەوتبووە سەر پێ زۆر باش و گونجاو بوو، سەرەتای چوونم بۆ ئەو ماوا سادە و جوانەی ژیانی کوردەواری بۆم زۆر سەختبوو، مانگی تەمووز کەشوهەوا زۆر گەرم و وشکبوو، بۆ کەسێکی وەک من کە پەروەردەی ساباتی فێنکی باخەکانی تەوێڵەو فێری خەونی شەوانی ئەفسووناوی ژێر شۆڵەی مانگە شەوی سەربانە بەرزەکانی بووم، ژیان لەوێ جۆرێکی تر بوو، هەروەها بێجگە لە چەند هاوڕێیەکی دائیرە کەسم نەدەناسی.

یەکێک لەو بەڕێزانەی هەر لە سەرەتای چوونم بۆ کەلار ناسیم (خوالێخۆشبوو مامە سابیر کوێخا محەممەد شمشێرکوڵی) بوو، لە ناو بازاڕی کەلار بە پشت خانووەکەیەوە دوو دووکانی کردبووە یەک، سووچێکی دووکانەکانیشی کردبووە کتێبخانەیەکی خنجیلانە، بەشە خۆراکی ئێمە (بایعی) خرابووە لای ئەو، کە وەرەقەی دارایی کەلارم بۆبرد، زۆر بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنی کردم و پاش ئەوەی ناوەکەمی خوێندەوە، فەرمووی: خەڵکی کوێی؟ وتم: تەوێڵە و چەند ڕۆژێکە بۆ ئێرە گواستراومەتەوە، وتی: تۆ کوڕی کوێخا ڕۆستەمی تەوێڵەی، وتم: بەڵێ کوڕی ئەوم زۆر بەگەرمی لە ئامێزیگرتم و ماچیکردم فەرمووی: باوکت هاوڕێ و هاوخەباتمە، من هاتوومەتە ماڵتان و باوکیشت بۆ لای ئێمە تەشریفی هێناوە، تۆ برازای منی و ماڵ و دووکانم هینی کوێخا ڕۆستەمە، هەرچیت پێویست بێت ئامادەم، منیش زۆرم پێخۆشبوو بە گەرمی سوپاسمکرد، مام سابیر پیاوێکی جوان و قۆز و ڕێکپۆش، کردارو گوفتارو ئاکار شیرین، دڵسۆز و میوانپەزێر و بە هەڵوێست بوو، هاوکات خوێندەوارو بەردەوام کتێبی دەخوێندەوە، هانی خەڵکی دەدا بۆ کتێب خوێندنەوە و بەش بە حاڵی خۆم چەندین کتێبم لێوەرگرتووە و خوێندوومنەتەوە، هەر ئەویش هەواڵی دامێ کە کتێبی (شەرەفنامە) لە ئێرانەوە بە نهێنی هاتووە بۆ

خوالێخۆشبوو پیاوی مەرد و بەهەڵوێست (ئەحمەد كەلاری)، چووم بۆ خزمەتی كاك ئەحمەد لە (بەردەسوور) نەوەك هەر دەستی نەنا بە رووموەوە، بەڵكو كتێبەكەی دامێ و كە دوای خوێندنەوەی بۆم بردەوە، لێی وەرنەگرتمەوە و فەرمووی دیارییە بۆ تۆ، تا ئێستا وەك دیارییەكی بە نرخ لە كتێبخانەكەمدایە.

پاش تێپەڕبوونی چەند رۆژێك لە مانەوەمان لە كەلاری كۆن چەند بەڕێزێكم ناسین، لەوانە: (كوێخا حەمەساڵح عەزیز سەیموراد، مامۆ ئەحمەد فەتاح، كاك محەمەد رۆستەم، كاك عەلی سەلیم بەگ، كاكەی میللەت، كاك حسێن حاجی مەحیەدین، حاجی ئەحمەد حەمەموراد، حاجی ئەحمەد ئەوبەری، ئاسۆی مەحموود بەگ، مام سەمین دووكاندار... هتد) كە هەموویان پیاوی بەڕێز و دیار و رێكوپێكبوون، هەر دوای چەند هەفتەیەكی كەمیش، خەڵكێكی زۆرم لە كەلارییەكان و جووتیارانی ناوچەكە و ئەوبەرییەكان ناسی، ئەوبەرییەكان بەو خەڵكانەی سنووری قەزای خانەقین دەوترا كە بە زۆرە ملێ برابوون بۆ پارێزگای ئەنبار و هەندێك شاری باشووری ئێراق، پاشان بۆ سنووری قەزای كەلار گەڕێنرابوونەوە و زۆربەیان لە لقی كشتوكاڵی كەلار و باوەنوور وەك كرێكار دامەزرێنرابوون.

هەروەها گەنجێكی هاوتەمەنی خۆمم بە ناوی (حەسەن عەلی بەگ) ناسی، ناوبراو كوڕی خێزانێكی ناسراوی كەلاری كۆن و كەسێكی ڕوخۆش و هۆشیار بوو، لەگەڵیدا كەوتمە گفتوگۆ هەوڵبدەین كاری شانۆیی بكەین، زۆر خۆمان ماندووكرد و تەنانەت دەق و شوێنی پرۆڤەكردنیشمان لە قوتابخانەی سەرەتایی كەلار دیاریكرد، بەڵام هاوكاری ترمان نەبوون و ئێمەش هیچمان پێنەكرا.

وەك كارەكەشم لە لقی كشتوكاڵی كەلار بە (نازری بەرلووت) دانرام، ناوچەی چالاكی هەورەوەزیەكە گوندەكانی: (بەرلووت، تازەدێ، بەردەسوور_ شۆراوە، عەلەومەحە، حەسەن مەحە)ی دەگرتەوە، بارەگایەكی كاتی بۆ هەرەوەزییەكە لە بەرلووت بە تەنیشت شاڕێكەوە كە دێت بۆ دەربەندیخان لە دوو ژوور و هەیوانێكی قوڕ و دار دروستكرابوو، دەستەی بەڕێوەبردن لەم ناوانە پێكدەهات: (عەلی محەممەد عوسمان بیچان_ سەرۆك، محەممەد فەتاح رەحمان_ سكرتێر، ئەحمەد رەشید فەتاح_ ئەمینداری سندوق، عەلی عەبدولقادر سلێمان_ ئەندام، عەلی عەدە_ ئەندام، قادر محەممەد كەوەل_ ئەندام) بوون.هەموویان پیاوی باش و بێوەی بوون، رۆژانە بۆ دەوامكردن لە كەلاری كۆنەوە بۆ لقی كشتوكاڵ و لەوێشەوە بۆ بەرلووت دەچووم، كارەكان زۆر بوون و لە راستیدا هەرهەرەوەزییەك بۆ خۆی وەك دائیرەیەك وابوو، سەرپەرشتی كارەكانی (كێڵان و دروێنە)مان دەكرد كە لەو ساڵانەدا زیاتر بە ئامێری حكومیی و بەنرخێكی داشكێنراو دەكران، دەبوایە پارەكانمان لە جووتیاران بەرامبەر پێدانی پسووڵەی فەرمی وەربگرتایە و رادەستی (وێستگەی بەكرێدانی ئامێرە كشتوكاڵییەكان) لە سلێمانی بكرانایە، ئەم كارەش لە تۆماری فەرمی بەشێوەیەكی یاسایی تۆماردەكران، هەروەها پێویست بوو سەرپەرشتی كارەكانی وەرگرتنی خوری و

گەنم کە بە لێژنەی تایبەت وەردەگیران و ئێمە بمانکردایە و بۆ وەرگرتنیان لە لایەن لیژنەکانەوە پێویست بوو پشتگیری جووتیارەکانمان بە نامەی فەرمی مۆرکراو بکردایە، وەرگرتنی پێشینەش لە بانکی کشتوکاڵی هەر دەبوایە نازر زۆربەی کارەکانی بکردایە و دوای تەواوبوونی ماوەکەشی خەمی وەرگرتنەوەی و گێڕانەوەی بۆ سەرچاوەکەی خەمی نازر بوو، چەندین کاری تریش وەک نووسینی پشتگیری بۆ ئەو فەرمانگانەی کە بۆ ڕاییکردنی کارەکانیان جووتیاران ڕوویان لێدەکردن، هەر دوای ساڵێک وەرگرتنی پیکابی (داتسۆن و تۆیۆتا)ش هاتە سەر کارەکان کە کۆمپانیای بازرگانی ئۆتۆمبێل بە نرخێکی هەرزان بە جووتیارانی دەدان، من بە تەنیا بووم یاریدەدەرم نەبوو، تەنها دوو کارمەند وەک کارگوزار لە هەرەوەزییەکەدا بە ناوی (حەمید سابیر و محەمەد عەبدولقادر) کە هەم خاڵۆزا و پوورزا و هەم ژن و ژنخوازیشییان لە نێواندا هەبوو، زۆر دڵسۆزبوون بۆ کارەکەیان و بە ڕێکوپێکی دەوامیاندەکرد، ڕۆژانە جووتیارەکان بۆ ڕاییکردنی کاروباریان دەهاتن و ئێمەش ئەوەی پێمانبکرایە بۆمان جێبەجێدەکردن، لەبەر ئەوەی لە شوێنی کارەکەمەوە نزیکبم، ماڵم بۆ گوندی تازەدێ گواستەوە و لە ماڵی کاک عەلی عەبدولقادر سلێمان نیشتەجێبووین. ئیتر هەم لە کارەکەمەوە نزیکبووم و هەم لە ناو جووتیارەکاندا بووم.





پاش چەند مانگێک مانەوەم لە کەلار خەڵکێکی زۆرم لە جووتیارەکان، فەرمانبەرانی دامەزراوە حکومییەکان، هەروەها کرێکارە ئەوبەرییەکان ناسی و پەیوەندیم لە تەک خەڵکیدا گەرمبوو، لە تەک هەندێکیشیاندا هاتوچۆی خێزانیمان هەبوو، هەروەها بەردەوام کەس و کارسەردانیان دەکردین، ئیتر زۆر هەستمان بە بێتاقەتی نەدەکرد، ساڵی چەند جارێکیش بەسەردان بۆ لای کەسوکارمان دەگەڕاینەوە و ماوەیەکی خۆشمان لەگەڵیاندا دەگوزەراند، من لەبەر دەوام کەمتر دەمامەوە، بەڵام بواری (ناهیدە)م دەدا لەگەڵ هەردی زیاتر بمێننەوە.

لێرەدا باسی شتێک دەکەم سەبارەت بە دێی بەرلووت کە زۆر سەرنجی ڕادەکێشام، دیارە ئەم دێیە لە دامێنی گردۆڵکەیەکی بچووکدا هەڵکەوتووە و لەو ڕۆژانەدا تا ڕادەیەک کەمئاو بوو، دوو کانی ئاو هەبوون هەردووکیان لە پشتی دێکەوە بوون، یەکێکیان ڕاستەو ڕاست دەکەوتە کۆتایی بەرلووتەوە، ئەمەیان سەرچاوەی سەرەکی ئاویان بوو، هەر لەوێوە ئاوی مزگەوتەکەشیان دابیندەکرا، ئەوی تریان کەمێک لە ماڵەکانەوە دووربوو، هەروەها لە خواری دێکەشەوە بە نیو کیلۆمەترێک کانییەک بە ناوی (پەڵکانە) هەبوو، ئیتر هیچ سەرچاوەیەکی تری ئاوی لێنەبوو، بەلامەوە سەیر بوو بەڕێوەبەرایەتی ئاوی ژێر زەوی سلێمانی (بیری ئیرتیوازی) زۆر قوڵیان لە تەختی دێکەدا لێدا و بە ئاو نەگەیشت و ئیتر دایان پۆشییەوە.

دەچمە سەر ئەو باسەی بڵێم: ئەو دێهاتانەی کەلار کە دەکەونە سەر شارێی گشتی نێوان قەزای کەلار هەتاکو ناحیەی باوەنوور، بەتایبەت (بەرلووت، تازەدێ، قوولەسووتاو، چاڵەڕەش، عیسایی، ڕەند عەلی خان، قوولە بەرز، سەید مەحموود)، بەدەر لەوەی لە زەوییە دێمیەکانیاندا (گەنم وجۆ)یان بەرهەمدەهێنا، لە لێواری ڕووباری (سیروان)یشدا زەوی بەراویان هەبوو، لەو زەویانەدا سەوزەواتیان وەک: (تەماتە، بامیێ، باینجان، بیبەر، لۆبیا، شووتی... هتد)یان دەچاند، بەمانەیان دەوت (دالیە)، هەروەها (مەرەزە) و جۆرێک لە (کاڵەکە)یان دەکرد، شوێنی ئەو جۆرە کاڵەکە بە خڕپۆیسان بەناوبانگبوو، لەبەر ئەوە پێیدەچێت زۆرکەس شارەزای بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە کاکەکە نەبێت، باس لەوە دەکەم، لە ناو خڕی کەناری سیروان گۆلێکی کورتیان دروستدەکرد لەمسەر و لەوسەرییەوە دوو چاڵیان هەڵدەکەند، تۆوی ئەو جۆرە کاڵەکەیان دەخستە ناوییەوە و پەینی ئاژەڵیان تێدەکرد، باشترین و گەورەترین و بەتامترین جۆری کاڵەک لەو ناوچەیەدا ئەم کاڵەکانە بوون کە بۆخۆم کاڵەکی (١٨) کیلۆییم بینیوە و لێمخواردووە هێندەی هەنگوین شیرین بوو. بۆ تەرەکاڵ دوو شێواز لە کارکردنیان هەبوو بەم شێوەیەی خوارەوە:

هەر جووتیارێک بۆ خۆی، یان دوو سێ کەس هەندێک جاریش زیاتر پێکەوە کە زەوییەکانیان بە تەنیشت یەکترەوە بوو کاریان تێدا دەکردن و لە بەرهەمەکەدا شەریکبوون، یان هەموو جووتیارەکان پێکەوە لە کێڵگەیەکی فراواندا کاریاندەکرد، بەڵام (مەرەزە)

هەمیشە بە شێوەی هەرەوەزی بوو، ئەو کارە هەرەوەزییەش لەوەوە سەرچاوەیگرتبوو، ئاوی سیروان ساڵانە لە ئەنجامی زیادبوونی ئاو، یان لافاو ڕێڕەوی خۆی دەگۆڕی، ئەوەش پێویستی دەکرد جۆگەی نوێ بۆ ئاودانی ئەو زەوییانەی دەکرێت بەکاربهێنرێن و لێبدرێت، بەوکارەش (حەفر)یان دەوت، هەڵکەندنی جۆگەکان کارێکی زۆر گرانبوو، بە یەک و دووکەس نەدەکرا، هەر بۆیە سەبارەت بە گرانی کارەکە لە ناوخۆیاندا دەیانووت: لە جووتیاریان پرسیوە گرانترین کار چییە؟ وتویەتی: دروێنە وتوویانە ئەی (حەفر)؟ لە وەڵامدا وتویەتی: (تۆباسی مردن مەکە)، ئەمەش وەک ئیدیۆمێکی لێهات بوو.

مانگی (٢)ی ساڵی (١٩٧٨) لە مزگەوتی (تازەدێ)، من و خوالێخۆشبوو (کوێخا حەمەساڵح سەید موراد ڕۆغزایی) کە هەم کوێخای کەلاری کۆن و هەم ئەندامی لقی یەکێتی جووتیاران بوو، لەگەڵ هەموو ئەو جووتیارانەی لە کەناری سیروان زەوییان هەبوو، ساڵانە کاریان تێدا دەکرد کۆبووینەوە، لە ناو جووتیارەکاندا دوو ژن بەناوەکانی (میمکە ئامین و میمکە جەمە) ئامادەبوون، کە چەند ڕۆژێک پێشتر لەلامان سکاڵایان سەبارەت بەچۆنیەتی بەکارهێنانی زەوییە بەراوەکان کردبوو، پاش ئەوەی کۆمەڵێک قسەوباس لەڕووی چۆنییەتی بەکارهێنانی زەویەکان لە وەرزی بەهار و هاوین و پاییزی داهاتوودا کران، هەردوو ژنەکە وتیان: ئێمە هاوسەرەکانمان کۆچی دواییانکردووە، کوڕی گەورەمان نییە، ئەم جووتیارانە ناهێڵن لەگەڵیاندا کاربکەین و لە سوود وەرگرتن لە زەوییەکانمان بێبەشیان کردووین، ساڵانە خۆیان مەرەزە و دالیە و خڕبێسان دەکەن و بەرهەمی باشیان هەیە، ئێمەش هەر دەبێت لە دوورەوە سەیری دەستیان بکەین، پاش ئەوان چەند جووتیارێک قسەیانکرد و باسی ئەوەیان کرد ئێمە کاردەکەین و ڕۆژانە ئارەقە دەڕێژین، بە هیچ جۆرێک ئامادە نین بەری ڕەنجی خۆمان بەدەم ئەمانەوە بکەین، ناشکرێت دوو ژن بێن و لە ناو ئەو هەموو پیاوەدا کاربکەن، هەروەها کارەکە قورسە و بەوان ناکرێت.

لە خوالێخۆشبوو (محەممەد فەتاح ڕەحمان) کە هەم سکرتێری هەرەوزیی بەرلووت و هەم کوێخای (تازەدێ) بوو پرسیم: تۆ لەم بارەوە چی دەڵێیت؟ وتی: لە ڕاستیدا ئەم دوو ژنە هەژار و نەدارن، سەبارەت بە (ئامین) دوو کوڕی هەیە مێردمنداڵن و یەکێکیان پشتی تەواو نییە، (جەمە)ش تەنها کچی هەیە، هەم ئەمان هەقی خۆیانە و ئەوە ڕاستە دەیڵێن، هەم جووتیارەکانیش هەقی خۆیانە، چونکە بۆ ماوەی شەش مانگ زیاتر و ڕۆژانە کاردەکەن و ماندوو دەبن، لە ڕاستیدا نازانم چی بڵێم، ناوبراو پیاوێکی باشبوو نەیدەویست شتێک بڵێت هیچ کامیان دڵگرانبن، چەند کەسێک لە جووتیارەکان زۆر ڕەقبوون و دەیانوت: بە هیچ شێوەیەک نابێت ئەمانە شەریکمان بن، ئێمە بەری ڕەنجی خۆمان بە دەمیانەوە ناکەین، گوێم بۆ هەموو قسەکان گرت، ئیتر هاتبووە سەر ئەوەی منیش قسەی خۆم بکەم، ئەوەی ویژدانم ئاسوودە دەکات بیڵێم و بڕیار بدەم، سەرەتا بە هێمنی پێموتن: ئێمە کوردین کۆمەڵی کوردەواری بەوە ناسراوە کۆمەڵێکی لە خوا ترسە

و بۆ یەکتری دڵسۆز و میهرەبانە، دیارە ئەم دوو ژنە کەس و خزمی ئێوەن، من پێشتر یەک جار بینیومن کە هاتوونەتە ناو هەرەوەزییەکە و پسووڵەی بەشداربوونیان بڕیوە و سکاڵایان لەم دۆخە کردووە، ئەمە جاری دووەمە دەیانبینم، بەڵام پێتان دەڵێم: ئەمانە ئەگەر نەدار و برسین تاوانەکەی لە ئەستۆی ئێوەدایە، زەویان هەیە وەک ئێوە و بەڵگەی خاوەندارییەتیان هەیە، چۆن دەبێت ئێوە لە مافی خۆیان بێبەرییان دەکەن؟ (کوێخا حەمەساڵح)یش، پشتگیری قسەکانی منی کرد، یەکێکیان وەڵامیدایەوە وتی: با زەوی خۆیان بکێڵن و خۆیان بەرهەمی بهێنن، (کوێخا محەممەد)یش وتی: ئەوە چۆن دەکرێت ئێمە هەر ساڵەی لە شوێنێک و بە پێی گۆڕانی ڕێڕەوی ئاوی (سیروان) کاردەکەین، ڕاستە هەریەکەمان بە حیساب زەوی خۆمان هەیە، بەڵام کارەکە ساڵانە بە هەرەوەزی کراوە، بە هەر حاڵ چەند قسەیەکی تریش کران، پاش ئەوەی لەگەڵ (کوێخا حەمەساڵح) قسەمان کردە یەک، وتم: ئەگەر دەتانەوێ کێشە بۆ ئێمە وەک هەرەوەزی و بۆ خۆتان دروستنەبێت من دوو پێشنیار دەکەم، کامتان پێباشە دەتوانن ئەوەیان پەسەند بکەن، یەکەمیان ئەم دوو ژنە ڕۆژانە بێنە سەرکار وەک ئێوە ئەوەی دەتوانن لەگەڵتاندا کاربکەن، خۆ ئەگەر دەڵێن ناکرێت، ئەوان ژن و ئێمەش هەموو پیاوین وەک پێشتر وتتان، ئەوە کوڕەکانی میمکە ئامین و کچەکەی میمکە جەمە کە دەڵێن هەرسێکیان لە تەمەنی مێردمنداڵیدان، بێن لەوێ بەردەستیتان بکەن و خواردن و چاییتان بۆ ئامادە بکەن و ئەوەی پێیان دەکرێت بیکەن، دوو کەسیان کە دیاربوو کەمێک بە خۆیاندا دەیاننازی، وتیان: هەرگیز ئەوە ناکەین و نابێت شەریکمان بن.

ئیتر لێرەدا پێویستبوو بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکە بڕیار بدەم، هەر بۆیە بە کەمێک تووڕەییەوە، وتم: یان لەو دوو پێشنیارەی خستمە بەردەستتان یەکێکیان پەسەند دەکەن، یان ئێمە وەک دائیرە هەر لە بەیانییەوە ئەم کێشەیە ڕووبەڕووی یاسا دەکەینەوە و سکاڵا لە سەرتان تۆمار دەکەین، ئەو کاتە دادگا هەر بڕیارێکی دا ئەوە جێبەجێدەکرێت، هەستامە سەر پێ و وتم: ئەوە ئێمە کۆبوونەوەکە کۆتایی پێدەهێنین تەواو زۆر بەخێر بێن.

زۆر باش لە یادمە چەند جووتیارێکیان لەوانە: (کوێخا محەممەد، کەریم کاکەوڵا، عەلی حسێن سلێمان) وتیان: ئێوە زیز مەبن و دانیشن هەتا بزانین چۆن دەبێت و دەگەینە چی، منیش وتم: هەر ئەوە دەکەین کە ئێستا وتم کێشەکە دەخەینە بەردەم یاسا، کە زانییان من زۆر لەسەر بابەتەکە سوورم، ئیتر ئەوانەی زۆر توند بوون ساردبوونەوە و هیچی تریان نەوت، ماڵئاواییمان لێکردن، ئەگەرچی (کوێخا محەممەد) زۆر خولکی نانخواردنی کردین و بەڕاستی ناوبراوم خۆشدەویست و زۆر ڕێزم لێی دەگرت، بەڵام بۆ ئەوەی بڕیارەکەمان کاریگەر بێت نەچووین بۆ نانخواردن و بۆ بارەگای هەرەوەزی لە (بەرلووت) گەڕاینەوە.

بە درێژەیی، لە ساڵەكانی ( ١٩٧٨-١٩٨٢) كە من نازری ئەو شوێنە بووم، بەو شێوەیەی بڕیاردرا كاركردنیان بەردەوامبوو، ئیتر كوڕەكانی میمكە ئامین گەورەتربوون و خۆیان دەیانتوانی كاربكەن و سەبارەت بە میمكە (جەمەش) خۆی لەگەڵیان كاریدەكرد.

لە لقی كشتوكاڵی كەلار ژمارەیەك ئۆتۆمبێل هەبوون، لەوانە: تۆیۆتایەكی لاندكرۆز، دوو پیكابی شۆفەرلێت، یەك پیكابی هالی واكس، یەك پیكابی داتسۆن، دوو لۆری مارسیدس، دوو تانكەری ئاو جۆری سكانیا، ئەمەش وایكردبوو ژمارەیەك شۆفێرمان هەبن، من پەیوەندیم لە تەك زۆربەیاندا زۆر باشبوو، بەڵام زیاتر بۆ كاروبارێك كە پێویستی بە ئۆتۆمبێل بكردایە لە تەك یەكێكیان بە ناوی (ئەحمەد عەتیە) هاتوچۆمدەكرد، ناوبراو پیاوێكی (سادە، دڵسۆز، ڕاستگۆ و جێی متمانە) لەو ڕۆژانەدا لە تەمەنی باوكی مندا بوو، ئەوەندە تێكەڵبووین هاتوچۆی ماڵی یەكتریشمان دەكرد، زیاتر پیكابە داتسۆنەكەی لێدەخوڕی، لەگەڵ ئەو هەموو تەمەنەی كە بە شۆفێرییەوە بردبوویەسەر، هێشتا شۆفێرێكی باشنەبوو، جاری وا هەبوو دەیدا لە چاڵ و تاسەی وا سەرمی جووتی سەقفی پیكابەكە دەكرد، ئینجا دەیدا لە ئەستۆپ، دەموت ئەبو شەهاب ئەوە خێرە، دەیوت: (هەی هەی ئەی نەتدی تاسەیەك لە دواوە بی)، هەر لە ڕاستیدا زۆرم خۆشدەویست، هەندێكجار تووڕەش دەبوو، پێمدەوت كە خۆمان بین تووڕەیش ببیت ئاساییە، بەڵام لە ناو خەڵكدا وا بكەیت لێت زیزدەبم، یەكسەر باوەشی پیادەكردم و ماچی دەكردم و دەیدایە قاقای پێكەنین.



ڕازێکی زۆر خۆشی شۆفێری (مام ئەحمەد) دەگێڕمەوە، ڕۆژێکی هاوین لەگەڵ بانگی بەیانی هات بۆ ماڵمان کە بۆ سلێمانی بێین، نوێژمانکرد و نانی بەیانیمان خوارد و کەوتینەڕێ، هێشتا دنیا تاریکبوو گەیشتینە ئاستی قولەسووتاو، ئەوەندەم زانی مام ئەحمەد چووە ناو ڕانێکەوە کە لەسەر شارێکە دەپەڕییەوە و شوانەکەی دیار نەبوو، چەند سەرێک ئاژەڵی بەملاو ئەولادا خستن و ئۆتۆمبێل وەستا باشبوو وەرنەگەڕا، ئیتر لە ڕانەکە دەرچووین و شوان هەر دیار نەبوو، هاتین بۆ سلێمانی و ئیشوکاری خۆمان تەواوکرد، نانمانخوارد و چووین بۆ ماڵی خەزوورم و لەوێ پشووماندا، لەبەر ئەوەی وەرزی هاوین بوو کە دەهاتین بۆ سلێمانی دوای سەعات چواری پاشنیوەڕۆ ئینجا دەگەڕاینەوە، چونکە ئۆتۆمبێلەکان وەک ئێستا هەوای ساردیان تێدا نەبوو، کە ئێوارە بەرەو کەلار گەڕاینەوە، گەیشتینە شوێن ڕووداوەکەی بەیانی، هەشت سەر مەڕی مردارەوە بوو فڕێدرابوونە قەراخ شارێکە، لەگەرمادا فوویان تێکرابوو زۆر ئاوسابوون، یەکسەر (مام ئەحمەد) وتی: (هەی هەی ئەی بزگەلە کێ کوشتوونی)، منیش هەتا توانیم دامە قاقای پێکەنین وتم (ئەبو شەهاب لەگەڵ منیش) ئەی مەگەر ئەمە ئەنجامی فەتحەکەی بەیانی خۆت نییە؟ وتی وەڵا ڕاستدەکەی بیرم چوو بوو.

گەرمای ساڵی (١٩٧٩) تاقەتپڕووکێن بوو، لە کۆتایی مانگی حوزەیرانەوە ناهیدە و گەردە و منداڵەکانم بردنەوە بۆ تەوێڵە، خۆم هەفتەیەک لەوێ مامەوە ئیتر بۆ کەلار گەڕامەوە، یەکەم ئێوارە لە تازەدێ میوانی ماڵی کاک تۆفیق جاسم بووم کە چەند مانگێ بوو چووبووینە ماڵی ئەوان، کەش و هەوا زۆر گەرمبوو، تا درەنگانێکی شەو خۆمان بەقسەکردن و باس و خواسی جۆراوجۆر خەریککرد، شەو ویستم لەسەر قەرەوێڵە و لە حەوشەکەدا بخەوم، بەڵام گەرما بە جۆرێک بوو، هەتا سەعات چواری بەیانی خەوم لێنەکەوت، پاش نانخواردنی بەیانی چووم بۆ لقی کشتوکاڵی کەلار، ئەو نووسراو و نامانەی کە بۆ هەرەوەزییەکەمان هەبوون وەرمگرتن، نزیکەی سەعاتێک لەوێ بووم و بۆ بارەگای هەرەوەزی لە بەرلووت گەڕامەوە، زۆربەی ڕۆژ بەدەر لەو جووتیارانەی بۆ ڕاییکردنی کاروباریان دەهاتن، چەند بەڕێزێک هەبوون دەهاتن بۆلام و هەتا نزیکەی نیوەڕۆ

دەمانەوە، لەوانە: (فەرەج کوێخا سلێمان١، مامۆستا مەلا نەجیم، قادرحاجی حسێن، ئەحمەد ڕەشید فەتاح، حاجی ئەحمەد ڕەباتی، کوێخا جەبار و مەلا سدیق... هتد)، قسەوباس و دەمەتەقێ گەرم دەبوون و جۆرەها سەرگوزەشتە دەخرانەڕوو، ئەگەرچی ئەم مەجلیسانە هەندێک ڕۆژ کاتیان لێ دەبردم، بەڵام لە سوود بەدەرنەبوون. لەبەر ئەوەی هەفتەیەک بوو دەوامم نەکردبوو، هەر گەیشتمە شوێنی کارکردنم ئەم بەڕێزانەی ناومهێنان و چەندین جووتیاری تر هاتن بۆ بەخێرهێنانم و هەواڵپرسین، قسەوباس سەبارەت بە جوانی سروشتی هەورامان و کەش و هەوای فێنک و کانیاوی سارد و ژیری و سەلیقەی خەڵکەکەی کران.

ئەو ڕۆژە بۆ نانی نیوەڕۆ لە بەرلووت میوانیماڵی (قادر حاجی حسێن) بووم، زۆر هەوڵیاندا شەو لایان بمێنمەوە بەڵام نەمامەوە و بۆ تازەدێ گەڕامەوە، دەمویست بۆ خۆم شتێک بۆ ئێوارە ئامادە بکەم، کاک تۆفیق هات وتی: ئەوە چی دەکەیت و یەکسەر میللی سێ تەلاقەی ڕاکێشاو وتی: هەتا منداڵەکان دێنەوە ناهێڵم چاییەکیش لێبنێیت خۆ ماڵی من کاول نەبووە، شەوی (١٦-٧-١٩٧٩ز) هەواڵی وازهێنانی (ئەحمەد حەسەن بەکر) لە هەموو پۆستە حزبی و حکومییەکانی و دانانی سەدام حسێن لە شوێنی لە ڕادیۆی بەغدادەوە بڵاوکرایەوە. دوای شەش ڕۆژ لە وازهێنانی بەکر، ڕووداوی کۆبوونەوەکەی (هۆڵی خولد) و بڵاوکردنەوەی بڕیاری لادانی پێنج ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمایەتی حزبی بەعس لە ئێراق و دەستگیرکردنیان، هەروەها دەستگیرکردنی ژمارەیەک لە بەرپرسانی سەربازی حزبیی و حکومیی، بە بیانووی هەوڵدانیان بۆ کودەتا بەسەر سەدام و دار و دەستەکەیدا، ئەوەی دەرخست کە بڕیاری ئەحمەد حەسەن بەکر خۆویستانە نەبووە و بەڵکو ناچارکراوە بیدات، ئەوەبوو دادگایەکی تایبەت پێکهێنرا بۆ سزادانی ئەوانەی کە بە هەوڵەکە تاوانبارکرابوون. لە ئەنجامدا هەریەک لە: (محەممەد عایش، عەدنان حسێن، غانم عەبدولجەلیل، محەممەد مەحجووب و موحی عەبدولحسێن مەشهەدی) کە پێشتر

١ - کوێخا فەرەج کوێخا سلێمان، پیاوێکی ژیرو دونیا دیدە و وردبین بوو، لە دێیەکەی خۆیانەوە بە ناوی ئاوایی مەلاسلێمان کە دەکەوتە ئەوبەری زێی سیروان، ڕاستەو ڕاست بەرامبەر بەرلووت و لە سنووری قەزای (خانەقی)دا بوو بۆ بەرلووت گوازرابوونەوە، لەو ساڵەدا من بۆ گەرمیان گوێزرامەوە تەمەنی لە سەرووی شەست ساڵییەوە بوو، زۆربەی ڕۆژ بۆ لام دەهات، دەیان سەرگوزەشتە و ڕازی بە نرخی لا بوون، بە زمانێکی شیرین و بە وردی دەیگێڕانەوە، بەردەوام حەسرەتی بۆ ماواکەی هەڵدەکێشا کە بە زۆرەملێ لێی بەدەر نرابوو، دەیوت کە بەیانیان هەڵدەستم و نیگام دەکەوێتە سەر ئەوبەری سیروان، دەچمە دونیاکی ترەوە کە تیایدا سەدان یادەوەریم هەن، هەر بۆیە حەزم دەکرد کوێرببومایە و بەوشێوەی ئێستا بە بێدەسەڵاتی نەمروانیایەتە گوندەکەم کە دسداشە لەبەری باشوور تەراتێنی تێدا دەکەن، هەموو ئاواتی ئەوەبوو ئەگەر تەنها بۆ ڕۆژێکیش بێت بە ئازادی بڕواتەوە زێدی باب و باپیرانی (نووسەر).

بە بڕیاری سەدام لەسەرکردایەتی حزبی بەعس لادرابوون، لەگەڵ (١٧) کەسی تر لە ناویاندا (عەبدولخالق سامەڕایی)، کە ئەویش ماوەی پێنج ساڵ بوو لە زینداندا بوو، لە سێدارەدران و (٣٣) کەسیش دەستگیرکران (١٤) کەسیان لە ژێر دڕاندانەترین ئەشکەنجە لە زیندانی موخابەراتدا گیانیان لەدەستدا ١.

لە کۆتایی وەرزی پاییز لەناو قەزای کەلار و لە گەڕەکی بنگرد خانوویەکم بە کرێ گرت، خاوەنەکەی (دادە حەلاو) دایکی شێخ عەبدوڵڵا بوو، کە ساڵانێک جێگری ئیدارەی گەرمیان بوو، ماڵێکی هەتا بڵێیت شەریف و ڕێکوپێک و بەڕێز بوون، ماوەیەک پێکەوە بووین و وەک یەک خێزانمان لێهاتبوو، وەرزی بەهار زۆر باراناوی بوو، جارێکیان ئەوەندە بەلێزمە بوو لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا نزیکەی نەوەد میلم باری، دیارە کەلار بەشێوەیەکی گشتی دەشتایی و لەو کاتەشدا وەک ئێستا نەبوو، زۆربەی زەوییەکانی کرابن بە ماڵ و شوێنی نیشتەجێبوون بن، قوڕاو و بارانی (سەی خەلیل و کەلاری کۆن )هەمووی هات بەسەر کووچەکانی گەڕەکی (بنگرد)دا، ئاو چووە زۆربەی ماڵەکانەوە، ئەو ماڵەی ئێمەی تێدا بووین مەترێک زیاتر ئاوی تێچوو، لەبەر ئەوەی قوڕ و دار بوو، لەسەرەوە دڵۆپە و لە خوارەوە لافاو تەنگەتاویان کردین، بەناچاری ماڵمان بەجێهێشت و لەگەڵ ناهیدە کردمان بە منداڵەکاندا و لەناو قوڕ و لافاو دەرچووین، بۆ ماڵی ناسراوێکمان بە ناوی (حەمەعەزین)، لە هەمان گەڕەک کە ئەوان کەمێک لە ڕێڕەوی لافاوەکەوە دووربوون و ئاو نەچووبووە ماڵیانەوە ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ماڵەکە تەواو ماندووبووین و تا ئەژنۆمان لە قوڕدا بوو، کە ڕۆیشتینە ئەو ماڵە ژنی ماڵەکە جل و بەرگی خۆیانی بۆ هێنایین خۆمان گۆڕی، جلەکانی خۆمانی شتن و لەسەر سۆپا وشکیکردنەوە، شەو لە ماڵی ئەوان بووین، بۆ بەیانییەکەی هەندێک برادەر و دۆست کە بیستبوویان ئاو چووەتە ماڵمانەوە، هاتن بۆ لامان و لەگەڵ (بەکر قادر حاجی حسێن) کە پیکابێکی (داتسۆن)ی هەبوو، بەرەو بەرلووت چووین، ئیتر خۆی و دوو برای فەرش و نوێن و ئەو کەلوپەلانەی قوڕاوی بووبوون بە پیکابێکی دوو تەنی هەموویان هێنان بۆ بەرلووت، کچەکانی کاک قادر لە

---

١ - باسو خواسی شێوازی ئەشکەنجە و مامەڵەکردن لەگەل زیندانییەکان، لە چەند چاوپێکەوتنێکدا لە لایەن خودی زیندانیکراوەکانەوە خراوەتەڕوو، لەم بارەوە یەکێک لەو زیندانیکراوانە بەناوی (ئیحسان وەفیق سامەڕایی)، زۆر بە وردی باسی شێوازی ئەشکەنجەدان هەتا مردنی زیندانییەکان دەکات و لە چەند چاوپێکەوتنێکدا لەم بارەوە قسەی کردووە، یەکێک لە چاوپێکەوتنەکان بە چوار ئەڵقە لە کەناڵی فەلووجە لە لایەن (دکتۆر محەمەد) لە گەڵیدا ئەنجامدراوە، هەر لە ڕاستیدا کە گوێی بۆ بگرێت گومان لەلات دروستدەبێت، ئایا ئەو جەلاد و بەرپرسانە مرۆڤ بوون، یان دڕندە و لە بەرگی مرۆڤدا؟. ئەوەی بیەوێت زیاتر لەم بارەوە زانیاری وەربگرێت ئەوە چاوپێکەتنەکان لە (یوتیوپ) بە ئاسانی بەردەستدەبن (نووسەر).

کانیاوێک کە زەوی خۆشیان بوو بەناوی (پەڵکانە) هەموویان شتن، چوار ڕۆژ لە ماڵی ئەوان ماینەوە، (کوێخا حەمەساڵح سەی موراد) کە پیاوێکی بەڕێزو ناسراو وەک پێشتر وتم لە تیرەی ڕۆغزایی و کوێخای کەلار بوو، بیستبووی چووینەتە بەرلووت هات بۆ ماڵی کاک قادرو وتی: خۆتان دەزانن ئێمە حەوشەی گەورە و شوێنی باشمان هەیە و دەچین بۆ ماڵی خۆمان، دوو ڕۆژ دوای هاتنەکەی ئەو بۆ کەلاری کۆن گەڕاینەوە و لە ماڵی ئەوان نیشتەجێبووین.

ماوەی شەش مانگ پێکەوە بووین، ئیتر هاتینە سەر ئەو بڕیارەی لەوێ بڕۆین و بۆ بنگرد بگەڕێینەوە، ئەو کاتە بە بنگرد (قەزاکە)ش دەوترا، هەر چەندە ماڵی کاک حەمەساڵح پێیان ناخۆشبوو، بەڵام من پێموتن خۆتان دەزانن من ڕۆژانە دوو تاق دەوامدەکەم، هەم وەک نازری هەرەوەزی بەرلووت، هەم بۆ ئێواران لە قۆناغی نەهێشتنی نەخوێندەواری لەگەڵ چەند مامۆستایەکی قوتابخانەی بەرلووت لە تازەدێ مامۆستایەتی دەکەم، ناکرێت ئەوەندە لە نێوان کەلاری کۆن بۆ بنگرد و بەرلووت و تازەدێ و بە پێچەوانەوە هاتووچۆبکەم، ئیتر قایلمکردن و لە گەڕەکی بنگرد لە حەوشەیەکی گەورەدا کە خانووی ژنێکی بەتەمەن بوو خانووم بەکرێگرت، خانووەکە خۆشبوو دوو گەرماوی بچووک و دوو ئاودەستی تێدا بوون، بێجگە لە ژنەکە خۆی کە (نەنە حاجی)مان پێدەوت، ئێمە و ماڵی کوڕێکی پێنجوێنی بەناوی (وەستا ئیبراهیم) ئەوانیش خۆی و هاوسەرەکەی و یەک منداڵیان هەبوو تێیدا بوون، ئەو کاتە سەرەڕای هەموو کار و ماندووبوونم کە دەگەڕامەوە ماڵەوە شەوان کڵاشم دەچنی، (ناهیدە)ش بێجگە لە ئیشی ماڵ و منداڵ بەخێوکردن، هەم جل و بەرگی دەدوورین و هەم لە کڵاش چنیندا یارمەتی منی دەدا، ئەم کارانە پێکەوە وایان کردبوو بارودۆخی گوزەرانمان زۆر باشبێت.

(نەنە حاجی) زۆر ئێمەی خۆشدەویست، تەنیا کوڕ و کچێکی هەبوون، کوڕەکەی بەناوی (عوسمان) بەڕێوەبەری بانک و کچەکەی بەناوی (سەبری) مامۆستا بوو، هەردووکیان ماڵیان لە بەغداد بوو، بە منی دەوت عوسمان و بە ناهیدەی دەوت سەبری، هەمیشە نزای خێری بۆدەکردین و دەیوت: هەرچی کاردەکەن وا دەزانم پارەکەی دێتە گیرفانی منەوە، ناهیدە سەرەڕای هەموو ئەرکەکانی خۆی، هەموو هەفتەیەک گەرماوەکەی بۆی گەرم دەکرد و جلەکانی دەشۆری.

## وەرگرتنی خانوو گواستنەوە بۆ پێنج سەد ماڵەکە

پێشتر حکومەت لە گەڕەکەکانی (حەمەی کەریم، گازینۆ، بەردەسوور) وەک (کۆمەڵگەی نیشتەجێبوونـ مجەمەع) خانووی بۆ ئەو خێزانانە دروستکردبوو کە پاش گەڕانەوەیان لە شارەکانی باشوور و ناوەڕاستی ئێراق، زیاتر لە ناو کەپر و زنج و ڕەشماڵ و خانووی قوڕی زۆر سادەدا دەژیان، ئیتر خانووەکانی کۆمەڵگەکانیان بەسەریاندا دابەشکردن، هەروەها نزیکەی ساڵێک بوو کار لە دروستکردنی ئەو خانوانە دەکرا، کە پێنج سەد ماڵەکەیان پێدەوتن، ژمارەیەک لەو خانووانە بەسەر فەرمانبەرانی فەرمانگەکان دابەشکران، منیش یەکێک لەو خانوانەم بەرکەوت کە دەکەوتە ڕیزی یەکەم بۆ دیوی ناوەوە و سێیەم خانوو بوو، هەر خانوویەک لە دوو ژوور و چێشتخانە و گەرماو و ئاودەست پێکدەهات و لە زەوییەکی (٢٤٠) مەتریدا دروستکرابوو، ئێمە خانووی ژمارە (١٤)مان بەرکەوت و سەرەکەی دارو قوڕبوو، زۆربەی خانووەکان سەرەکەیان کۆنکرێت بوو، بەڵام بۆ هەردوو وەرزی زستان و هاوین ئەوانەی دار و قوڕ بوون باشتر بوون، چونکە بەزستان گەرم و بە هاوین فێنکبوون.

لە نەوای تازەمان لەگەڵ چەند ماڵێکدا بووین بە دراوسێ کە لەگەڵ زۆربەیان پێشتر یەکتریمان نەناسیبوو، هەندێکیشیان هەبوون وەک فەرمانبەر یەکتریمان ناسیبوو، بەڵام تێکەڵاوی خێزانیمان نەبوو، ئەوەی زۆر لەگەڵماندا تێکەڵاو بوو دراوسێی دەستی ڕاستمان (محەممەد غەفوور تەها فەتاح) بوو، کە هەر لە پۆلی یەکەمی ئامادەیی بەکرەجۆوە هاوڕێبووین، هاوسەرەکەشی بە ناوی (خاتوو نهایەت عومەر) لە بنەماڵەی گێڵدەرەییەکانی هەڵەبجە بوو، دراوسێی دەستی چەپمان (محەممەد مەلا ئەحمەد پیرخدری) بەرگدروو، باوکی ناوبراو بەرنوێژو گوتارخوێنی مزگەوتی گەورەی کەلاری کۆن بوو، هاوسەرەکەی بەناوی خاتوو سەمیرە، لەو کاتەدا چوار منداڵیان هەبوو، لە ماوەیەکی کەمدا ئەوەندە پەیوەندیمان لەگەڵیاندا گەرم بوو وەک یەک ماڵ وابووین، تا ئێستاش ئەو پەیوەندییەمان بەگەرمی بەردەوامە، بەرامبەرمان ماڵی (سەی تاهیر تۆفیق) خەڵکی کفری و لە نەخۆشخانەی کەلار برین پێچ بوو، هاوسەرەکەی ناوی خاتوو ڕووناک بوو، هەروەها (عەدنان) کە خەڵکی (کنگربان) بوو هاوسەرەکەی فارس و خاتوو (گوڵزار)ی ناو بوو، سەرەتا لەگەڵ ئەمانە و دواتریش لەگەڵ هەموو ماڵەکانی تر ناسراویمان پەیداکرد و ڕێزی بەرامبەر لە نێوانماندا هەبوو.

دراوسێیەتی ئەوسا وەكو ئێستا نەبوو، كاسە هاوسێ و هاتووچۆی یەكتری لە نێوانماندا گەرمبوو، شەوانە هاتوچۆی یەكتریمان دەكرد و خۆشی و ناخۆشیمان لە نێوانماندا بەشدەكرد، بە تایبەت لە تەک ماڵی كاك محەممەدە كەمجار شتمان بێ یەكتری خواردووە ، بەو پێیەی كەسوكارمان لێمانەوە دووربوون، ئێمە ساڵانە چەند جارێک بۆ لایان دەڕۆیشتینەوە و هەر جارە و هەفتەیەک، یان زیاتر دەماینەوە، بە هیچ جۆرێک خەمی ماڵمان نەبوو ماڵی كاك محەممەد وەک ماڵی خۆیان دەیانپاراست.

ئاشكرایە هەر لەسەرەتای شۆڕشی ئیسلامییەوە لە ئێران، پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێراق- ئێران ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو ئاڵۆزی دەچوو، هەردوو دەسەڵات لە یەكتری بەدگومان و دڕدۆنگبوون، ئەم بەدگومانییەش مێژوویەكی زۆر دێرینی هەیە و لە چەند سەردەمێكی جیاوازدا هەر جارەو لە ژێر ناوونیشانێک و بڕووبیانوویەكدا سەریهەڵداوەتەوە، لە ئەنجامدا شەڕ و ناكۆكی لێكەوتووەتەوە و خەڵكی هەردوو وەڵات تووشی زیانی گیانی و ماڵوێرانی بوون، ئەوەیان كە زۆر كاریگەربووە شكستی گەورەی سوپای ساسانییەكان بوو بەسەركردایەتی ڕۆستەم لە شەڕی (قادسیە)دا و كوشتنی ناوبراو بەدەستی (قەعقاع كوڕی عەمرو)، پاشان زنجیرە شاڵاوەكانی سوپای ئیسلام بۆ سەرهەرێمە جیاوازەكانی ئێران و دواجار كوشتنی (یەزدەگوردی جوارەم) بەدەستی ئاشەوانێک، دیارە ئەو زنجیرە شەڕ و لەشكركێشیانە دەسەڵاتی سەدان ساڵەی ساسانییەكانی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵكێشا.

دەگەڕێمەوە بۆ ناو باسەكە و دەڵێم: دیارە لە دەرهاویشتەی ئاڵۆزییەكاندا هەردوو وەڵات چۆن بۆیان بكرایە دژایەتی سیاسەتەكانی یەكتریان دەكرد، هەر وڵاتێكیان نەیارانی ئەوی تری لە ئامێزدەگرت و هاوكارییان دەكردن، سەبارەت بە هەندێک ناوچەی كوردستان بەتایبەت ئەوانەی لە سنوورەوە نزیكبوون هەر بەناو حكومەتیان تێدابوو، تەنیا لە ڕۆژدا دەسەڵاتی بەسەریانەوە هەبوو، لەم بارودۆخەدا دەرفەتێكی باش هاتبووە پێشەوە كە شۆڕشی كورد و دەسەڵاتەكەی بە جۆرێک لە جۆرەكان گەشەبكەن، ژمارەی پێشمەرگە و كادر و ئەندامەكانی حزبەكان و هەوادارانیان زیاتربن. لە گەرمەی ئەم بارودۆخەدا جەنگی نێوان ئێران و ئێراق بەرپابوو.



خوسرەو جاف

# کورتە بیرەوەری

گەرما هێڵەی دەکرد، دار گەزە بێ سێوەرەکان هێندەی تر گەرما هەڵوەراندبون، تەنکە سێوەرەکەیشی هەر وەک دەعبایەکی پەلاماردەر گڕ و قرچەی گەرما هەڵیدەلوشی، دارەکان ڕوتەڵ دەهاتنە پێش چاو، گەردەلول ئەژدیها ئاسا دەڕۆیشتە ئاسماندا و هاژە و لورەی تەماشاکەری دەتۆقاند، تاک و تەراک وڵاخی بەرەڵا لە سێوەری دیوارەکاندا سەر و لۆق و قەپۆزە شۆڕ، هەردو کونەلوتیان لەناو دو دەسیاندا بێ تاقەتانە جارە و بار سەریان بەرز دەکردەوە، سەگەکان بە دوای شوێن پای ئاوێکی ڕژاودا دەگەڕان تا بەسەریدا ڕاکشێن، هیچ باڵندەیەک بە ئاسمانەوە نەدەبینران لە ترسی هەتاوی پەلامار دەردا، لە پاسارەکاندا ئەوەی چۆلەکە بو لە کون و قوژبنەکاندا خۆیان شاردبویەوە، نە گارەی مریشکێک نە قولەی کەڵەشێرێک نە لە کۆڵانەکاندا نە لە ماڵاندا نەدەبیسرا، کۆڵانەکانی دێەی کەلاری ١٢٠ خێزان تاک و تەراکێک منداڵی چەموش و لاسار نەبێت کەمن یەکێک بوم لەوانە، بەو دوەزەخە تاو گردوەوە فیتەم دەهات لە کۆڵانەکاندا، من خوسرەو جافی لادیەی، لە ئاوا لادیەکدا هاتومەتە جیهانەوە بەناوی کەلار.

هەر لەو لادێ گڕ گردوەیدا سەرەتاییم تەواو کردوە، مامۆستاکانمان بە عەرەبی دەرسیان پێ دەوتین، ئێستا دەزانم هیچ کەسیان بە باشی عەرەبییان نەزانیوە، زۆربەیان تورکمان بوون و خەڵکی کفری و دوزخورماتو، بەدەگمەن مامۆستایەک لە دورەوە گوێزرابویتەوە قوتابخانەکەمان، مەگەر دورخراو بێتەوە لەبەر هۆکاری سیاسی یا هەر تۆمەتێکی تر وەک سزا گەیشتوبیتە لای ئێمە.

قوتابخانەکەمان لە چلەی زستاندا پەنجەرەکانی بێ شوشە و پۆلەکانمان بێ دەرگا، بای سارد و تەپووتۆز بێ پرس خۆیان پیا دەکرد و ئیمەیش لە سەرما وەکو (هینی) هەلاج دەلەرزین، من شانازی دەکەم لە ئاوا قوتابخانەیەکدا ئەلف وبا فێر کراوم، هەر ئەو قوتابخانە شرۆڵە بو بەهۆی ئەوەی کۆڵنەدەم و وڵات بە وڵات بە دوای خۆما وێڵ و سەرگەردان بم، سەیرەکە لەوەدایە تەمەنم گەیشتوەتە هەشتا ساڵ و دو مانگ، دوای لە چاپ دانی ١٩٨ کتاوی جۆراوجۆرم، وە جگە لە خۆم پێنج دکتۆرای فەخری زانکۆ ناسراوەکانی جیهان وەک زانکۆی کامبریج کە یەکێکە لە کۆنترین زانکۆکانی جیهان،



خوسرەو جافی لادیەی کەلار لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەدۆزنەوە و دکتۆرای فەخری پێدەبەخشن، سەیرەکە لەوەدایە دوای هەشتا ساڵ یەشتا وێڵم بە دوای خۆما و خۆم نەدۆزیەتەوە .

دۆستان، ئازیزانم ئێستا لەم تەمەنەیەدا کەلار بۆ من هەموو شتە، کەلار ئازیزترین کەسی منی تیا نێژراوە «ئەویش خێزانم» کە ٥٤ ساڵ پێکەوە ژیاوین، دەربەدەری، بێ وەتەنی، فەقیری و دەوڵەمەندی لەگەڵ مندا چێژاوە، مەزارەکەی لە کەلاردایە، ئەوە چوار ساڵ و یانزە مانگ و حەوت ڕۆژە کۆچی دوای کردوە، هەموو مانگێک ١٠٠٠کم لە هەولێرەوە تا کەلار دەبڕم تا بگەمە سەر مەزارەکەی و پێی بڵێم ئامۆزا گیان وا مەجنونەکەت هات بە قور پێوان، کەلار هەوارگەی یەکەم و دوا دوایشمە، وەسیەتم کردووە لە تەنیشت خێزانمدا بمنێژن کە لە کەلاردایە.

سەرتاسەری جیهان گەڕاوم، شارەکان و وڵاتان، دەریا و شاخ و ساختمانە هەوربڕەکان، میللەتانی جۆراوجۆری سپی و ڕەش و سور و زەرد، هوتێلە بەناوبانگەکان، یەشتا لەم تەمەنەیەما، سرکەوانەکانی کەلار و پەچەوانەکان و مۆڵگەی گاگەل، جۆگە ئاوە



تۆزاویەکەی کەلار کە وەک ڕەش مارێک لە سەید خەلیلەوە خۆی دەکردە ناو کەلاردا سەرداوی ئاو خواردنەوە کە ئاوت هەڵدەگۆزی سەدان قورپاقە بە لوتا خۆیان تێ دەهاویشت وەک وابێت پێشبڕکێیان هەبێت.

من منداڵیم لە ئاوا جێگە و شوێنێکدا بردوەتە سەر، ئێستا هەرچی بم شانازی بە سەردەمی منداڵیمەوە دەکەم، هەموو ئەو منداڵانەم لە بیرن کە لە گەڵما بەسەر تەختەی قوتابخانەی کەلاردا پێکەوە بوین، کەچی ڕوخسار و ڕوی پەری ئاسا و قەد و باڵا و سنگ و بەرۆکی کچانی شۆخ و شەنگی هاوکلاسیانی کۆلیژ و زانکۆم کەم لە بیر ماون، ئەویش بەخاڵی بێ وەفایی خۆم دەزانم، کەلار ڕوح و ڕەوانمی زاخاو داوە، لەبیرمە دوای هەروژنی عەبدولکەریم قاسم ١٩٦٣ لە بەغداوە خۆم گەیاندە کەلار و لەویدا یەکەمین هەنگاوی پیاوەتیم ناو و ڕو بە سەید خەلیل و ژور تر و ژورتر بەڕیکەوتم و چومە ڕیزی پێشمەرگایەتیەوە و سەر ئەنجام کرامە سەر لقی هێزی جاف، ئەو کاتانە خودی پێشمەرگە سەر لقی خۆی دەست نیشان دەکرد ئەمە بە فەرمانی ئیداری یان حزبی، ئەگەر ئەو کەسە شایستە نەبوایە پێشمەرگە قبوڵیان نەدەکرد وەک سەر لقی خۆی.

تا ئەم عومەرەم ڕۆژانە پێنج- شەش کاتژمێر دەخوێنمەوە و دەنوسم یان سەرگەرمی کاری هونەریم، بڕێک لە خزمانم لایان ناخۆشە کە دەڵێم لادێیم، ئەڵبەتە ئەوان کەوچانە و بەرزە دەماخانە فکر دەکەنەوە، لەوە گەڕێ مێژووی بنەماڵەکەم خۆی لە حەوت سەد ساڵ دەکوتێت، من خۆ دیناسۆر نیم مرۆڤم و عاشقی حەق و حەقیقەتم، بۆچی عەیب و شورەی بێت من بلێم لادێیم؟ نەک من تەواوی میللەتەکەم لادێین، ئەرێ بۆ نکۆڵ لەو حەقیقەتە بێ غەلوغەشە بکەم ؟ ئایا هەیە لە حەقیقەت جوانتر ؟ خۆزگە تازە پێکەوتوەکان تام وچێژی حەقیقەتیان دەزانی، ئەو کات کۆمەڵگایەکی شایانتر و پەسەند ترمان دەبو، حەیف مەست و مەدهۆشی خۆ بە زلزانینن.

٢٠٢٤/٥/٢٦



بۆ یادی ٥٤ ساڵەی بەقەزابوونی کەلار

# گوڵبژێرێک لە ڕووداو و یادەوەرییەکانی (١٥ ساڵ) ی ژیانم لە پایتەختی گەرمیان



حامد محەمەد عەلی

ساڵەکانی ژیانی من لە کەلار، تەنها ١٥ ساڵە ، لە (٦٤ ساڵ) ی کۆی تەمەنی منی بەندەی خوا.

واتە  کەمتر لە ٢٥٪ ی کۆی تەمەن و ژیانم لەو شار و دەڤەرە خۆشەویستە بەسەر بردوە، بەڵام چێژ و خۆشی و ناخۆشی و یادەوەرییەکانی ئەو ١٥ ساڵە و ڕوداوەکانی، تایبەت و کاریگەرن، ئەویش لەبەرچەند هۆکارێک، لەوانە :-

* (ژیانی گەنجێتیم) کە بۆ خۆی قۆناغێکی تایبەتە.

* (بوونم لەنێو خانەوادە و کەسوکار و دۆستان و هاوڕێیانی تەمەنم لەقۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی ) دا.

* هەر لەو قۆناغەی ژیانمدا لە کەلار، خوێندنی ئامادەیی , هەروەها زانکۆم لە  (بەغدا) بەسەرکەوتویی تەواوکرد.

* هەر لەو ماوەیەشدا بوو لە بەغدا لەزانکۆ بووم، دەستم بە نووسین کرد، ئەمەش بۆ خۆی خاڵێکی وەرچەرخان و دەسپێکی مومارەسەی نوسینم بوو لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی بەغدا بە  (عەرەبی و کوردی).

یەکەم بابەتیشم لە٢٢ی نیسانی ١٩٨٥ لە ڕۆژنامەی  (العراق) بەعەرەبی، لەسەر ڕۆژنامەی (کوردستانی میقداد مەدحەت بەدرخانی ساڵی ١٨٩٨ز) بڵاوکردەوە، کەیەکەمین ڕۆژنامەی

كوردیە لەمێژودا، هەروەها لەوماوەیەدا لەپاڵ چەندین بابەت و وتاردا، بابەتێكی كورتم لەبەشی كوردی هەمان ڕۆژنامە لەسەر مێژووی (قەڵای شێروانە) بڵاوكردەوە.

هەر لەو ساڵانەدا بوو لە كەلار پاش تەواوكردنی خوێندنی زانكۆ و خۆشاردنەوە لەسەربازیی، لەساڵی ١٩٨٩ واتە ساڵێك پاش كۆتایی هاتنی جەنگی نێوان ئێراق و ئێران، بەبڕیارەكانی ( ٧٣٦ و ٧٣٧) ی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕشی بەعس، لەگەڵ هەزاران گەنج و تەمەنداری كورد دا ڕاپێچی سەربازگەكان كراین بۆ خزمەتی سەربازیی، ئەوەبوو تا هێرشی یەكەمی ئەمریكا وهاوپەیمانان بۆ سەر ئێراق لەنیوەی دووەمی مانگی كانونی دووەمی ١٩٩١، واتە نزیكەی ساڵ و نیوێك لە (فایدە، بێجی، تاجی و ڕومادی) سەرباز بووم.

## كەلار لەكۆتایی حەفتاكان و سەرەتای هەشتاكان

### گەڕەكەكانی كەلار

كاتێك لە پایزی ساڵی ١٩٧٨دا واتا لە (٤/ ١٠ / ١٩٧٨) بەخێزانەوە لە كەربەلاوە گەڕاینەوە بۆ (كەلار)، جگە لە (گوندی كەلاری كۆن و گەڕەكەكانی بنگرد، بەشێك لەفەرمانبەران، حەمەی كەریمی كۆن و گازینۆ)، كەلار گەڕەكی دیكەی ئەوتۆی تێدا نەبوو، بەڵكو چەند كۆمەڵگەیەكی زۆرەملێی تێدا دروستكرابوو، یان خەریك بوو بۆ نیشتەجێ كردنی خەڵكی ئاواییە ڕاگوێزراو و تەعریبكراوەكانی قەزای خانەقین و ئەو خێزانانەی پاش گەڕانەوەیان لەئاوارەیی ئێران و دوورخرانەوەیان بۆ ناوچەكانی ناوەڕاست و باشوری ئێراق (عائدون) گەڕانەوە بۆ كوردستان، دروست كرا بوون.

ئەو كۆمەڵگایانەش بریتی بوون لە :- (١٠٠ خانو) ی سەبەكانی حەمەی كەریم و ( ٦٠٠ خانو)ی كۆمەڵگەی حەمەی كەریم ( سەركەوتنی ئێستا)و دووكۆمەڵگەی گازینۆو بەردەسور و كۆمەڵگەی ٥٠٠ماڵەكە) لەسەرجادەی كەلاری كۆن.

### قوتابخانە و ناوەندەكانی خوێندن

لەو سەردەمەدا كەلار تەنها (خوێندنگایەكی ناوەندی تێكەڵاو)ی تێدا بوو، كە خوێندنی كوردی و عەرەبیشی لەخۆگرتبوو لە كوڕان و كچان، بەناوی (قوتابخانەی ناوەندی كەلار) كە (مامۆستا محەمەد ئەحمەد فەتاح خەڵكی كفری ) بەڕێوەبەری بوو، دواتر (مامۆستا كەریم ئەحمەد) بوو بە بەڕێوەبەری.



ژمارەی بینای قوتابخانە سەرەتاییەكانی كەلار لەو كاتەدا، جگە لە قوتابخانەی (شێروانەی كەلاری كۆن)، تەنها پێنج قوتابخانە بوو، ئەوانیش قوتابخانەكانی (الوحدە لە خوار قایمقامیەت) و (الرسالە – لەیلا قاسمی ئێستا) و (ئەڵوەن و الحریە پێكەوە) لە گەڕەكی حەمەی كەریم و (گەرمیان لە گازینۆ) و قوتابخانەی (زۆرك لە كۆمەڵگەی ٥٠٠ماڵەكە)، شایانی باسە، زۆربەی هەرە زۆری مامۆستاكانی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییش لەكەلار، خەڵكی هەردوو شاری دێرینی گەرمیان (خانەقین و كفری) بوون، كە هەندێكیان نیشتەجێی كەلار بوون و تائێستاش خێزانەكانیان لەكەلار ماونەتەوە، هەندێكیشیان ڕۆژانە هاتوچۆیان دەكرد.

هەر لە بواری خوێندندا پێم باشە باسی ئەوە بكەم، تاكو ساڵی خوێندنی ١٩٧٨-١٩٧٩ كە ئێمە لەپۆلی سێیەمی ناوەندی بووین (٩ی بنەڕەتی ئیستا)، كەلار خوێندنی ئامادەیی تێدا نەبوو، ئەوەبوو لەگەڵ دەرچونی ئێمە بۆ پۆلی چوارەمی گشتی (پۆلی دەیەمی ئێستا)، ئیتر هەر لە بینای ناوەندیەكە خوێندنی پۆلی چوارەمی گشتی یان ئامادەییان بۆ كردینەوە، ئێمەی قوتابیانی خوێندنی عەرەبی كە دەرچووی سێیەمی ناوەندی بووین، ژمارەمان زۆركەم بوو، لە (١٠-١٢ قوتابی) تێپەڕی نەدەكرد، بۆیە سەرەتا وتیان بۆ ئێوە قۆناغی ئامادەیی ناكەینەوە، بەڵام دواتر وەك هاندانێك بۆ خوێندنی عەرەبی، شان بەشانی قوتابیانی خوێندنی كوردی، پۆلی چوارەمی گشتی- دەیەمی دواناوەندییان بۆ كردینەوە، دواتریش بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٨٠- ١٩٨١ بینای قوتابخانەی دواناوەندی (الثورة) نزیك مزگەوتی شێخ ئیبراهیم بۆ خوێندنی عەرەبی تێكەڵ ( كوڕان و كچان) كرایەوە.



ناوەڕاستی هەشتاکان گوندی قولەبەرز
م.سەلاح، حامد ،مام زەمان

لەو دواناوەندیە دا، پۆلەکانی (١١ و١٢)م لەگەڵ (مامۆستا ئەحمەدی برام) و چەند هاوپۆلێکم کە ژمارەیان لە پەنجەکانی دوو دەست تێنەدەپەڕی خوێند و ئامادەییمان تەواوکرد، بەو شێوەیە ئێمەی خوێندکارانی ئەو قۆناغە، ساڵی خوێندنی ١٩٨١-١٩٨٢ پۆلی شەشەمی ئامادەییمان تەواوکرد، یەکەم خولی دەرچووی قۆناغی ئامادەیی شاری کەلاربووین، واتە پێش ئێمە لە کەلار پۆلی شەشەمی ئامادەیی نەبوو و نەخوێنراوە.

جێی ئاماژەپێدانە لە خولی ئێمەدا بۆ تاقیکردنەوەکانی وەزاری (بەکالۆریا)ی سێیەمی ناوەندی و شەشەمی ئامادەییش، لەبەر کەمی ژمارەی قوتابیان لە کەلار هۆڵی تاقیکردنەوەمان بۆ نەکرایەوە، بۆیە لەقۆناغی سێیەمی ناوەندی هەموومان (خوێندنی کوردی و عەرەبی) لە قەزای دەربەندیخان لە هۆڵی قوتابخانەی دواناوەندی (زمناکۆ) تاقیکردنەوەمان ئەنجامدا، لە قوتابخانەی (بەمۆ) ی سەرەتایی لە کەمپی خوار دەماینەوە و دەخەوتین.

لە قۆناغی شەشەمی ئامادەییش، ئێمەی قوتابیانی خوێندنی عەرەبی لە دواناوەندی (شۆڕش) لە سلێمانی تاقیکردنەوەی بەکالۆریامان ئەنجامدا.

لە قۆناغی ناوەندی و ئامادەییش- سوپاس بۆخوا- لەسەر قوتابخانەی خۆمان یەکەم و لە شەشەمی ئامادەییش لەسەر پارێزگای سلێمانی- بەشی ئەدەبی دووەم بووم و (کاتژمێرێکی دەستی)م بەدیاری لە پەروەردەی سلێمانی وەرگرت، تائێستا لەلام ماوە و پاراستوومە.

## مزگەوتەکان

لەو سەردەمەدا (کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان) کەلار بچووک بوو، بۆیە تەنها چەن مزگەوتێکی کەمی تێدا بوو، ئەوانیش بریتی بوون لە (مزگەوتی گەورە لەسەنتەری کەلار، مزگەوتی شافیعی لەحەمەی کەریم، مزگەوتی سەڵاحەدین لە گەڕەکی گازینۆ، مزگەوتی غەزالی لە کۆمەڵگەی گازینۆ)، دیارە لە ئاوایی کەلاری کۆنیش هەر لە کۆنەوە مزگەوت هەبووە.

## وەرزش و تیپە وەرزشییەکان

لە ساڵی ١٩٧٨ وە کە ئێمە هاتینە کەلار، دێی کەلاری کۆن تیپێکی وەرزشی تۆپی پێیان هەبوو، ژمارەیەک یاریزانی باش یارییان تێدا دەکرد، ئەوانەی لەبیرم مابن (بەهرۆز حەمەڕەشید، بەرزان حەمەی مینا و عاسی شێخ ئیکرام) خوالێیان خۆشبێ و (جیهاد کەریم، حەسەن ڕەشید، ئومێد و کاوە ...هتد، وەک لە وێنەیەکدا کە (د. حەسەن کەریم بەگی جاف) بڵاوی کردۆتەوە، لەسەردەمی پاشایەتییەوە لە کەلاری کۆنی بەگزادە نشین تیپی وەرزشی هەبووە.



هەروەها لە بنگردی سەنتەری شاری كەلاریش، لەناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی پێشووەوە، تیپێكی تری تۆپی پێ هەبوو، لە یاریزانە ناسراوەكانی (كەریم ڕەفعەت، خەلیل و جەلیل برای، محەمەدی حاجی مەحمود و كامەران برای، ئەمیر جەلیل بەگ و سەلاح خالد ئامۆزای، فەریق تەوفیق، ڕزگار ڕەزا بەگ- مەشەیێ، خۆشناو حەسەن، حەسەن ساڵح- حەسەن عەرەب- سەلمان كەریم و ئەنوەر حاجی محەمەد. ...هتد).

ئێمە لە گەڕەكی حەمەی كەریمی ئەمبەر و ئەوبەریش، سەرەتا تیپی تۆپی پێمان نەبوو، لەگەڵ چەن كەسی تردا، زیاتر حەزمان لەیاری (تۆپی باڵە) بوو، لە حەوشەی یەكێتی لاوان (اتحاد شباب)، تۆڕ و گۆڕەپانمان لەنزیك گۆڕەپانی تۆپی پێ بۆ دانابوو، ئێواران باڵەمان دەكرد، دواتر لەسەرەتای هەشتاكان، ئێمەش چەند گەنجێكی قوتابی ئامادەیی و ناوەندی دانیشتوی گەڕەك، لەوانە (ئیبراهیم عەبدولڕەحمان، حامد محەمەد عەلی، بەرزان حەمید و سەلاح برای، یونس ئەحمەد و شەهاب برای، جەلال محەمەد عەلی، فەرهاد تەوفیق، جەلال حاجی محێدین، ڕزگارعەبدوڵا، ئەحمەد كەریم خەیات، یەحیا محەمەد سەعید، نەوزاد فەرەج، محەمەد قادر، عەبدوڵڵا ئەولكەریم و داود حاجی ساڵح ...هتد)، پێكەوە تێپێكمان پێكهێنا و ناومان لێنا (تیپی ئازادی)، هەر لە مەیدانی پشت كتێبخانەی گشتی ئێستا، لەسەروی گەرماوەكەوە، گۆڕەپانێكمان سازكرد و ڕاهێنان و یاریشمان لەگەڵ تیپەكانی تردا تێیدا دەكرد.

من زۆر بەشداریی یاری تۆپی پێم نەدەكرد، بەڵكو تەنها وەكو بەڕێوەبەرو هەڵسوڕێنەرێكی تیپەكە بەهاوكاری هاوڕێكانم كارم دەكرد، هەروەها هەندێ جاریش (داوەریی- تحكیم) م بۆ یاریەكان دەكرد، دوای ئەوەی من چومە زانكۆ لەبەغدا، تیپەكە بەردەوام بوو، ئیتر نازانم تاكەی و چۆنی لێهات.

شیاوی باسە فەرمانبەرانی فەرمانگەی كشتوكاڵی كەلاریش، لەو ساڵانەدا تیپێكی وەرزشی تۆپی پێیان هەبوو، كوڕێكی چالاكی خەڵكی سلێمانی بەناوی (فەرەیدون ڕەسول) كە فەرمانبەری كشتوكاڵی كەلار بوو، سەرپەرشتی دەكرد.

## كارگەكانی بلۆك و جێبە ڕوبعە و گەڵابەی مان

خەڵكی كەلار كە بریتین لە كۆبونەوەی زۆرینەیەكی دەربەدەر و دەركراوی قەزای خانەقین و دانیشتوانی كۆنی شارەكە و دواتریش گوندەكانی دەوروبەری، خەڵكێكی زیرەك و كاسبكارن، زۆربەی خەڵكەكەشی بەهۆی ئاوارەیی ئێران و باشوری ئێراق و دابڕانیان لە خوێندن و قوتابخانە بێ وەزیفەبوون، هەربۆیە ڕوویان لە چەندین پیشە و كاری جیاجیا كردووە، لەوانە دانانی دەیان و بگرە سەدان (كارگەی بلۆك)ی دەستیی لەسەر ڕوباری سیروان، كارگەی لم و چەوی لێ بوو، هەر كارگەیەك دوو بۆ سێ كەس كاریان لەسەر

دەکرد، ئەو کاتە هێشتا کارگەی گەورەی بلۆکی کارەبایی نەبوو، دواتر کارگە گەورەکان دانران، کارگە دەستیەکان داخران، وەک وتراوە (ماسیە گەورەکان، ماسیە بچوکەکان دەخۆن).

لەوماوەیەدا ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵک لە گەنج و تەمەنداری کەلار (جێبی وازی رووسی )یان کڕی و هێنایانە کەلار بۆ گواستنەوەی خەڵک لەسەنتەری شارەوە بۆ گەڕەکەکان و بەپێچەوانەوە، هەروەها بۆ گواستنەی کەلوپەلی ماڵان لەباتی ئۆتمبیلی جۆری پیکاب و دووتەنی، بەو شێوە ئەو (جێب)انە بوونە هۆکارێک بۆ بژێوی ژیانی چەندین خێزان، هەروەها بەشێک لە سیماو تایبەتمەندییەکانی کەلارو بە (جێبە ڕوبعە) ناسرابوون، چونکە جێبێک بە ڕوبعە دینارێک بەکرێ دەگیرا و کرێی نەفەریش ئەوکاتە تەنها (پەنجافلس-درهەمێک) بوو.

شانبەشانی جێبەکان، بەشێک لە دانیشتوانی کەلارلە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان، ڕوویانکردە هێنانی ئۆتۆمبیلی جۆری (گەلابەی مان) بەقیست، کە دیارە ئەو کاتە نرخی زۆر گران نەبوو، ئەو کارەیش زیاتر پەیوەندی بە بوونی کارگەکانی چەوولم و بلۆکی سەر ڕوباری سیروانەوە هەبوو، ئەو گەلابانە زۆرتر خەریکی گواستنەوەی ئەو کەرەستانە بوون بۆ سلێمانی و دەوروبەری، یان هەر شار و شوێنێک پێویستیان بایە، ژمارەیەکی باش و بەرچاو لە خێزانەکانی کەلار ژیان و بژێوییان لەسەر ئەو کارو پیشانە بوو کە ئاماژەم پێکردن.



## بواری تەندروستی و بینای نەخۆشخانەی گەورەی کەلار

کەلار وەک قەزا و شارۆچکەیەکی نوێ، تاکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی پێشوو، کە ژمارەی دانیشتوانی کەم بوون، تەنها (بنکەیەکی تەندروستی) تێدا بوو، لە ریزی قوتابخانەی الوحدە و قایمقامیەت، لەسەرەتای ساڵی هەشتادا دەسکرا بەدروستکردنی نەخۆشخانەی سەرەکی کە ئێستا بە نەخۆشخانەی شەهید هەژار ناسراوە، من بۆخۆم لە پشوی هاوینی ١٩٨٠ لەوێ بەشێوەیەکی کاتیی وەکو چاودێری کار (مراقب عمل) کارم کردووە، لە رۆژی ٢٢ ی ئەیلولی ١٩٨٠ رادیۆیەکی بچوکم پێ بوو لەوێ گوێم لە یەکەم بەیاننامەی سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئێراق بوو تایبەت بە هەڵگیرسانی جەنگی ئێراق- ئێران، بەوشێوە لەساڵانی سەرەتای ئەو جەنگەدا، نەخۆشخانەی سەرەکی کەلار تەواوکرا و خرایە بواری خزمەتەوە.

## حەمامەکەی حاجی تالیب کۆکزیی

شیاوی بیرهێنانەوەیە، لەوسەردەمەدا، کەلار گەرماو-حەمامێکی- گەورەی پیاوانیشی تێدابوو لەسەنتەری بازار، هی (حاجی تالب) بوو، لە بنەچەدا خەڵکی کۆکز بوو، بەڵام لەدەربەندیخان دادەنیشت، حەمامە کە پێدەچێ لەدوای ١٩٧٥ دروستکرابێ، تاکۆتایی هەشتاکان و کاتی راپەرین مابوو.

لە گەرمەی ئیشیدا لە هەشتاکان، رۆژانە دەیان کەس لەو گەرماوەدا خۆیان دەشوشت، دواتر ئەگەر هەڵە نەبم لە سەرەتای نەوەدەکاندا گەرماوێکی دیکە دروستکرا، کەوتۆتە سەر جادەی کتێبخانەی گشتی، پێدەچێ هێشتا لەکاردا بێت.

## نەورۆز و ئاگرکردنەوە لەسەر قەڵای شێروانە

لەو ساڵانەدا لە ئێوارەی نەورۆزدا، لەبەر ئەوەی قەڵای شێروانە بەرزترین خاڵ و شوێن بوو لەکەلار، ژمارەیەک لە گەنج و لاوی شارەکە چەند تایەیەکی کۆنیان کۆدەکردەوە و دەیانبردە قەڵای شێروانە و بە زەحمەتێکی زۆر و بەشەوقەوە بە قادرمە تەسک و رێک و توشەکاندا سەریان دەخست بۆسەر قەڵاو لە هەرگۆشەیەکی قەڵاکە چەند تایەیەک لەسەر یەک دادەنران و ئاگریان تێ بەردەدرا، بەوشێوە ئاگری نەورۆز لە بەرزترین شوێنی شار دەکرایەوە، منیش جارێک یان چەند جارێک بەشداریی ئەو کارەم کردووە.

# گرنگترین ڕوداوەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٩١

لێرەدا بەکورتی ئاماژە بەگرنگترین ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەی ئێراق و کوردستان دەدەم، کە کاریگەربوون لەسەر کەلار و خەڵکەکەی :-

١- هەڵگیرسانی جەنگی ئێران و ئێراق لە ٢٢ /٩ / ١٩٨٠

سەدان گەنجی کەلار لە دووسێ ساڵی یەکەمی ئەو جەنگە نەگریس و وێرانکەرەدا، تێیدا بوونە قوربانی یان کەمئەندام و بریندار بوون، یان بەدیل گیران یان بێسەروشوێن بوون، لە ١٩٨٢ و ١٩٨٣ وە زۆربەی زۆری سەربازانی کورد سوپای ئێراقیان بەجێ هێشت و هەڵهاتن و هەندێکیان چوونە شاخ بۆ ناو هێزەکانی پێشمەرگە و لادێکان، زۆریشیان هەر لە کەلار پەیوەندییان بە (فەوجە خەفیفەکان)ەوە کرد و بەناسنامەی ئەو فەوجانە دەسوڕانەوە، هەندێکیشیان دەوامیان ئەکرد و بەفەرمان و سەرپەرشتی موستەشارەکان، تەنانەت بەشدارییان لە شەڕی دژی پێشمەرگەشدا کردووە و دواتر لە پرۆسەکانی بەناو ئەنفالیشدا دیسان زۆریان بەشداربوون.

٢ — هەردوو هەڵبژاردنی ساڵانی ٩٨٠ و ١٩٨٤ی ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و ئەنجومەنی نیشتمانی ئێراق، هەرلەسەرەتاوە ئەنجامەکانیان دیاربوو، خەڵکی بڕوای پێی نەبوو، بەتایبەتی لەوەی ١٩٨٤ دا، خەڵکی کەلار زۆربەیان نەدەچونە سەرسندوقەکانی دەنگدان، بەوەش بەرپرسانی حکومەت تووڕە بوون و کەوتنە گوشاردروستکردن لە ڕێگەی فەرمانەدەی لیوا (بارق حاج حنطە)وە و لە بڵنگۆی مزگەوتەکانەوە هەڕەشەی توندیان لەخەڵک کرد، ئەگەر بەشداریی دەنگدان نەکەن، ئەوەبوو پیرەمێردو پیرەژن و خەڵکانی کەفتەکارو نەخۆشیش بەناچاری ڕوویان دەکردە بنکەکانی هەڵبژاردن بۆ دەنگدان.

لەو ڕۆژەدا منیش وەکو خەڵکی تر چوومە بنکەی دەنگدانی (قوتابخانەی ئەلوەن) ی نزیک خۆمان، بەڵام نەمدەویست دەنگ بدەم، خواوڕاسان (ا، ف) م بینی، وەک یاساناس لەسەر سەندوق بوو، داوام لێکرد مۆرێک لەدەستم بدا، ئەویش بەخۆشحاڵیەوە مۆرێکی لەسەر دەستم دا کە گوایە دەنگم داوە، ئیتر دەنگم نەداو هاتمە دەرەوە.

٣- دانوستانی ساڵی ١٩٨٤ی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حکومەتی بەعس، کە چەندین گەڕ و جەولەی خایاند، بەڵام دواجار شکستی هێناو هیچی لێ نەکەوتەوە، لەو ماوەیەدا لە کەلار لە گەرەکی سەرکەوتنی ئێستا، خۆپیشاندانێکی میللی بەڕێوەچوو، دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعس بەزەبری هێز دایانمرکاندەوە و بەداخەوە کەسێکی خەڵکی ئاواییمان شەهید بوو بەناوی (جومعە ڕۆستەم قادر) و چەند کەسێکیش بریندار بوون .




٤- ڕووداوە دڵتەزێنەكانی تاوانی (بەناو ئەنفال) لەبەهاری ١٩٨٨دا كە بەچڕی و خەستی ناوچەكانی گەرمیان و قەرەداغی گرتەوەو دەیان هەزار ژن و منداڵ و گەنج و پیری ئەم ناوچەیە تێیدا بەركەوتن و ڕاپێچی بیابانەكانی نوگرەسە لمانی باشوری ئێراق كران و زۆربەیان كۆمەڵكوژكران، ئەو ڕووداوە ڕەوشێكی یەكجار سەخت و خەماوی و پڕ ئازاری بۆخەڵكی گەرمیان و ناوچەكە خوڵقاند، هەر لەوماوەیەشدابوو لە ١٦ /٣/ ١٩٨٨ تاوانی كیمیابارانی هەڵەبجە ئەنجامدرا.

٥- دەرچوونی هەردوو بڕیاری (٦٣٦ و ٦٣٧)ی بەعس لەپاش پرۆسەكانی ئەنفال، بەهۆیەوە لەكۆتایی ساڵی ١٩٨٩وە دەسكرا بەسەر لەنوێ ڕاپێچكردنی گەنج و لاوانی كورد، تەنانەت لەدایكبوانی ساڵی ١٩٤٥ یش بۆ بنكە سەربازیەكان، كەئێمەمانانیش بەركەوتین و لەگەڵ سەدان كەسی خەڵكی كەلار ڕاپێچكراین بۆ ئەركی سەربازیی و سەرەتا ئێمە براینە سەربازگەی ( فایدە)ی موسڵ و دواتریش (بێجی) و پاشان (ڕومادی).

لەو كاتانەشدا بوو لە ٢ ی ئابی ١٩٩٠ سوپای ئێراق وڵاتی كوەیتی داگیركرد، بەوشێوە سەربازانی كورد كە پێشتر لەبەرەكانی جەنگی ئێران- ئێراق هەڵهاتن، لە جەنگی داگیركردنی كوەیتدا بەشدارییان پێكراو تا هێرشی بەرفراوانی هاوپەیمانان بۆ سەرئێراق لەشەوی ١٧ی كانونی دوەمی ١٩٩١، بە شكستی گەورەی سوپای ئێراق كۆتاییهات ماینەوە و دواتر ئەوانەی بەسەلامەتی دەرچوون، سەربازگەكانمان بەجێ هێشت، دیارە لەجەنگی كوەیتیشدا وەكو جەنگی ئێران، سەربازانی خەڵكی كەلار و كورد بە گشتی قوربانییان دا.

٦- راپەڕینی جەماوەری خەڵکی کەلار لە بەرەبەیانی  ڕۆژی ٩ ئازاری ١٩٩١ و راماڵینی دامودەزگاکانی حکومەتی ئێراق، لەچوارچێوەی ڕاپەڕینی مێژوویی خەڵکی باشوری کوردستان، یەکەم چەخماخەی ڕۆژی ٥ ی ٣ / ١٩٩١ لەشاری ڕانیەوە لێدا، ئێوارەی ٩ / ٣ / ١٩٩١ هێزەکانی پێشمەرگەی لایەنە کوردستانیەکان گەیشتنە کەلار و بنکەو بارەگایان دانا، ڕۆژی دوایی ١٠ / ٣ شاری کفریش ئازاد کرا و پاشان لەڕۆژی ١١ی ئازاردا هێزەکانی پێشمەرگە و جەماوەری گەرمیان چوونە ناوشاری خانەقینەوە، بەڵام بەداخەوە پاش ژمارەیەک قوربانی، نەتوانرا بەتەواوی کۆنترۆڵی شارەکەو دەوروبەری بکرێ و ناچار هەموولا پاشەکشەیان کرد، هەروەکو دواتر لە ڕۆژی نەورۆزدا لەشاری کەرکوکیش ئەو حاڵەتە ڕوویدا.

٧- پەلاماری هێزەکانی ( موجاهیدین خەلق) بەتانک و زرێپۆش بۆسەرشاری کەلار، لە بەرەبەیانی ٢٥ /٣/ ١٩٩١ کە بەهۆیەوە ژمارەیەک شەهید و بریندار لێکەوتەوە، بەڵام هەمان ڕۆژ هێزەکانی پێشمەرگەی لایەنە کوردستانیەکان-بەتایبەت بزوتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی نیشتمانی- بەهاوکاری خەڵکی کەلار، توانییان پەلامارەکە شکست پێ بێنن و تانک و زرێپۆشەکان تێک بشکێنن و چەکدارەکانی موجاهیدینیش بکوژن.

٨- هەڵگیرسانی دوو شەڕی دڵتەزێنی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان، لە ٣٠ تەموزی ١٩٩٢ لەکەلار، لە کۆتاییەکانی کانونی یەکەمی ١٩٩٣ لەکفری و کەلار، دواتر بەداخەوە فراوان بوو و هەموو ناوچەکانی هەرێمی گرتەوە، ئەم ڕوداوانەش دیسان بۆ گەرمیان یەکجار ناخۆش و خەمناک بوون، چونکە قوربانی و ناسۆری زۆری لەهەردولا لێکەوتەوە و ئاسەواری ناخۆشی بەجێ هێشت.

## کەلاری دوای ٢٠٠٣ و ئێستا، هۆکار و بنەماکانی گەشەکردن و فراوانبوون

کەلار لە ٢٠ ساڵی رابوردودا لە هەموو بوارەکاندا گەشەکردنێکی بەرچاو، هەروەها گەورە بوونێکی باشی بەخۆیەوە بینیوە و دیارە بەردەوامیشە لە فراوانبون و گەشەکردن، بێگومان ئەم گەشە کردنە خێرایەش بۆ چەند هۆکارو بنەمایەک دەگەڕێتەوە، کە تایبەتن بەکەلار و دەڤەرەکەوە.

گرنگترینی ئەو هۆکار و بنەمایانەش ئەمانەن :-

١- زیندویەتی و لێهاتویی کەلاریەکان خۆیان و جموجوڵ و کرانەوەیان بەڕووی دەرەوەدا.

٢- هەڵکەوتەی جوگرافی شارەکە و پێگە جیاوازەکەی، کەوتۆتە نێوان هەرێم و ئێراق و سەر ڕێگای سلێمانی بەغدا.



٣- نزیكی ڕوباری سیروان و گرنگی لەچەند ڕوویەكەوە، لەوانە بۆ كشتوكاڵ، بەتایبەتی بۆگوندەكانی ئەوبەری ڕوبارەكە (بنكۆرە) وگوندەكانی باشوری كەلار، هەروەها وەك سەرچاوەیەك بۆ كەرەستەی بنەڕەتی بیناسازی (چەو و لم) سودێكی گەورەی لە سیروان بینیوە وچەندین كارگەی شوشتنی چەو و لم، دەیان ساڵە لەسەر ڕوبارەكە دامەزراون، ئەو كەرەستانە بۆ پارێزگای سلێمانی و دەوروبەری دابین دەكەن.

٤- بوونی دەروازەی نێودەوڵەتی (پەروێزخان) سەرچاوەیەكی گرنگی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی كاڵا و كەلوپەلە لەنێوان ئێران و هەرێمی كوردستانیش، ئەم دەروازەیە جموجوڵ و هەلی كاری بۆ سەدان خێزانی ناوچەكە ڕەخساندووە سەدان بارهەڵگر و تەنكەری بەگەڕخستوە، شیاوی ئاماژە پێدانە بوونی هەردوو دەروازەی نێودەوڵەتی (مەنزەریە- خەسرەوی) لە باكوری ڕۆژهەڵاتی شاری خانەقین و هەروەها دەروازەی (پشتە) لە دەڤەری بەمۆ، دیسان بە جۆرێك و ئەندازەیەك، لێكەوتە و كاریگەریی ئەرێنی لەسەر كەلار و گەرمیان بەگشتی وخەڵكەكەی هەیە.

٥- دۆزینەوەی نەوت لە كێڵگەكانی (حەسیرە) لە نێوان كەلار و كفری و دەرهێنان و بەبازاڕ كردنی نەوتەكەی، ئەویش دیسان خزمەتی بەخەڵكی كەلار و كفری و ناحیەكانی دەوروبەری كردوە، وەك سەرچاوەیەك بۆ هەلی كار و بەكارخستنی دەیان تەنكەر و شۆفێرو خاوەن كارو كرێكارو پاسەوان.

جێی وەبیرهێنانەوەیە نەوت لە دەوروبەری خانەقین و نزیک گوندی (چیاسورخ- ئیدارە)، لەدێرزەمانەوە هەیە و ئێستا بەرهەمەکانیان هەنارده دەکرێ.

٦- بوونی کەلار یاخود گەرمیان بە ئیدارەیەکی سەربەخۆ و بنیاتنانی ژێرخانی ئیداری و دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکان و تەرخانکردنی بوودجەی سەربەخۆ بۆ ئیدارەکە ... هتد، هەموو ئەمانە ڕەنگدانەوەی دیار و باشی هەبووە لەسەر گەشەکردنی کەلار وەک ناوەندی ئیدارەی گەرمیان و سەنتەری دەڤەرێکی فراوان.

٧- کردنەوەی زانکۆی گەرمیان لە کەلار، چەند کۆلیژێکیشی لە هەردوو شاری خانەقین وکفریدایە، هەروەها کردنەوەی زانکۆی پۆلی تەکنیکی گەرمیان لە کفری لەمساڵدا، لەگەڵ بوونی چەند پەیمانگەیەکی حکومی و ئەهلی لە دەڤەرەکە، بێگومان ئەم ناوەندە زانستی و ئەکادیمیانە خزمەتی بەرچاو بەدەڤەرەکە و خەڵکەکەی دەکەن.

## دوا وتە و پێشنیاز

کەلار و گەرمیان بەگشتی، پاش تێپەڕبوونی ٣٦ ساڵ بەسەر مەرگەساتەکانی ئەنفالدا، هێشتا ئە وزامە قووڵە ساڕێژ نەبووە، یاخود ساڕێژ نەکراوە و ئەو تەم و دوکەڵەی نەڕەویوەتەوە، چونکە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، هێشتا چاوەڕێ دەکەن هەردوو حکومەتی هەرێم و فیدراڵ، چارەنووسی قوربانیان دەسنیشان بکەن و ڕوفاتی قوربانیانیان لە بیابانەکانی سەماوەو نوگرە سەلمانەوە بۆ بهێننەوە بۆ زێدی خۆیان لە کوردستان، زۆر گرنگە دەسەڵاتداری هەرێمی کوردستان، ئەو ئەرکە لەئەستۆ بگرێ و لە هەمانکاتدا کاری جددی بۆ قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفال بکات.

خاڵێکی تر بەلامەوە گرنگە ئاماژەی پێ بکەم، ئەوەیە نابێ ڕێگە بدرێ بەبێ پلان و بەرنامەیەکی زانستی تۆکمە، کەلار فراوان بکرێ و زەوی زارەکانی هەموو بۆ پرۆژەی نیشتەجێکردن و بازرگانی تەرخان بکرێت، بەڵکو پێویستە ماستەرپلانێکی زانستیانەی وا بۆ شارەکە دابنرێت ڕەچاوی هەموو ڕەهەندەکانی داهاتوی شارەکە وەک ناوەندی گەرمیان بکات.

پێویستە کاری جددی بۆ تەواوکردنی ڕێگەی نێوان کەلار- سلێمانی بکرێ و هەموو گوشار و ڕێگەیەکی مەدەنیانە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بگیرێتە بەر.

گرنگە بووجەی پێویست بۆ تەواو کردنی بەنداوەکانی ناوچەکە تەرخان بکرێ، بەتایبەت پرۆژەی هەردوو بەنداوی (باوەنور و بەردەسوور) لەسەر روباری سیروان، رۆڵی گەورەیان دەبێ لە کۆکردنەوە و دابینکردنی ئاوی پێویست بۆ کۆی ئێراق و زیاتر بوژانەوەی دەڤەرەکە، لەڕووی کشتوکاڵی و ئابوری و گەشتیارییشەوە.

پێویستە دڵسۆزانی کەلار و گەرمیان لەبەرپرسانی ئیداری، هەروەها کۆمەڵگەی مەدەنی، بەو رۆحیەتەوە کاربکەن لەداهاتودا گەرمیان بکرێتە پارێزگایەک و ئەم پاشکۆیەتیەی بەتەواویی کۆتایی پێ بێت، ئەمەش وادەخوازێت ژێرخانی ئیداری و ئابوری و رۆشنبیری دەڤەرەکە و شاری کەلار بەتایبەتی پتەوترو بەهێزتر بکرێت.

لەکۆتاییدا ئومێدی گەشەکردن و پێشکەوتنی زیاتر بۆ شاری کەلار و تێکرای دەڤەری گەرمیان و گەرمەسێر دەخوازم، هیوادارم لەژیانی خۆمدا گەرمیان بە پارێزگا ببینم و بنیاتنانی (فرۆکەخانەی کەلار) یشی بەدوادا بێت.

دەسخۆشی لە سەرپەرشتیارانی رێورەسمی ساڵیادی بەقەزابوونی کەلاردەکەم، بەتایبەتی سەرپەرشتیارانی ئەم گۆڤارە ناوازەیە، بەدڵنیاییەوە بابەت و ناوەڕۆکی ژمارەکانی دەبنە بناغەیەک بۆ زانین و دارشتنی مێژوی ناوچەکە و دانانی (ئینسکلۆبیدیایەک) بۆ شار و شارۆچکەکانی گەرمیان، کەنەوەکانی داهاتوو ،سوودی لێ وەردەگرن.



تەها سلێمان

# کەلارییات

## پێش کەلار

پێش کەلار ڕەنگە سێ تا چوارجار شارم دیبێ، بیرم تێ دووجار ڕۆیشتمەتە خورماتوو، جاری یەکەمیان خوالێخۆشبوو باوکم بەخێزانی بردمانی بۆ خورماتوو، تا ناسنامەمان بۆ دەربکات و جاری دووەمیش ڕێگای شار داخرابوو، بەشێکی زۆر لەپیاوەکانی ئاوایی (قەڵاچەرمەڵە) بەڕێگای قاچاخ و بەناوچەی داوێی سەرچەما، بەتراکتۆرەکەی جەباری حەمید شووشە (ئامۆزای باوکم) بەمەبەستی کڕینی شتومەک و پێداویستی ڕۆیشتن بۆ خورماتوو، باوکم منیشی لەگەڵ خۆی برد.

جاری سێیەم هێشتا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، باوکم و ئەحمەد مامەلی ڕێککەوتن (من و برایم)ی کوڕی ئەحمەد مامەلی بنێرن بۆ کفری، بۆ ئەوەی هەندێ پێداویستی ماڵ بکڕین و هەمان ڕۆژ ئێوارەکەی بەئۆتۆمبێلەکەی حوسێنی عەلی کوێخا (خەڵکی ئاوایی عەزیز قادر) گەڕاینەوە.

دووەمین جاریش بۆ کفری، بەسەردانێک بۆ ماڵی خاڵم (حاجی کەریم) کە ئەوکات خاڵۆم ئازاد خوێندکاری شەشی ئامادەیی و خاڵۆم بەختیار خوێندکاری ئامادەیی پیشەسازی بوو.

لەو چوار جارەدا کە (خورماتوو و کفری)م بینی، هیچم لەبارەی شارەوە نەدەزانی (سەردانەکان سەرەتای هەشتاکان بۆ پێش ناوەڕاستی هەشتاکان) بوو. واتە ئەوکاتە تەمەنی من لەدەوروبەری ( ٩ بۆ ١٠) ساڵێک دەبوو، لەڕاستیشدا بەبینینی دیمەنی شار و خەڵکەکەی واقم وڕمابوو، باشیشم بیرە پێشوو تر و لەکاتی سەردانەکان پێم وابوو، خەڵکی شار مەخلوقێکی جیاوازترن لەئێمە و لەهەموویشی ناخۆشتر خەریک بوو زەندەقمان لەمناڵەکانیان دەچوو، چونکە بەسروشت مناڵی شار لەمناڵی ئاوایی هاروهاجتر بوون.

## بەرەو کەلار

ساڵ گەیشتە هەشتاوسێ؛ ئێمە لەقوتابخانەکەی ئاوایی (قەڵاچەرمەڵە) کە لەڕووی کارگێڕییەوە سەربە قەزای کەلاربوو، لەکۆی ئەو (٤٣) خوێندکارەی لەپۆلی یەکەوە نێردرابووینە بەرخوێندن کومەڵێکی کەم مابووینەوە (خالد سلێمان، خەلیل عەبدوڵڵا، تەها سلێمان، جیهاد عەزیز ئاغا، نەجات مەحمەد برایم، براهیم ئەحمەد، ناسیح مەحمود، ئەحمەد مستەفا) و چەند کەسێکی تر. لەم کۆمەڵە خوێندکارەش کەس ئامادە نەبوو مناڵەکەی بنێرێ بۆ تاقیکردنەوەی وزاری (بەکالۆریا) لەشاری کەلار، تەنیا باوکم بڕیاریدا (خالدی برام و من) و کاکە ئەولای ئامۆزاشی بڕیاریدا (خەلیل) واتە سێ کەس بچین بۆ تاقیکردنەوە بۆ کەلار.



سەرەڕای ئەوەی کەمناڵ بووین، هاوکات متمانەی ئەوەشیان پێمان نەبوو بەتەنیا بچین بۆ کەلار، بۆیە بڕیاریاندا (کاکە ئەولا) بمانبا بۆ کەلار، بەیانیەکی زوو لەگەڵ کازیوەی خۆر کەوتنا، لەناو ئاوایی خۆمان سواری تراکتۆرەکەی (حوسێنی مام عەزەدینی قەواڵی) بووین (ناو عارەبانەکەی) هەڵتەک هەڵتەک بەناو ئاوایی (عەزیز قادر، توکن، فەتاح ئۆمەر و سەیدجەژنی) هەتا گەیشتینە سەرجادەی قیر(کفری-کەلار) تەنیشت شارۆچکەی سەرقەڵا و لەوێشەوە سواری گلابەیەک (لۆری) دیسان لەگلابەکەی و لەدواوە بەرەو کەلار.

بێگومان گەیشتن بەکەلار بۆ یەکەمینجار، هەم خەون و هەمیش چێژێکی تایبەتی و هەمیش ترس و دڵەڕاوکێ و لەولاشەوە ئەرکی تاقیکردنەوەی وزاری و سەرووی ئەمانەش قوتابخانەکەی ئێمە تەنیا ژوورێکی قوڕین و ئێستا ئەچینە قوتابخانەیەک بۆ ئێمە و یەکەمجارە و بینینی وەک کۆشکی پاشایەتی وایە.

لەكەلار دابەزیمان و كاكە ئەولا ئێمەی تەسلیمی ماڵی میمكم ئەسمەر (خوالێخۆش بوو سەید قاسم) كرد، خۆی و خەلیلیش ڕۆیشتن بۆ ماڵی (خوالێخۆش بوو حەمید غێدان) چونكە خەدیجەی خێزانی مام حەمید خوشكی كاكە ئەولا بوو.

## قوتابخانەی شێروانە

قوتابخانەی سەرەتایی شێروانە دەكەوتە ناوەڕاستی كەلاری كۆنەوە، باش بیرم دێ دیوارەكەی بە گەچ و قایە كرابوو، لەڕووی پێشەوەی دەرگایەكی دوولایی مام ناوەند لێوەی دەچویە ژووری و دیوی پشتەوەی حەوشەیەكی گەورە بەسیاجێكی نزیكەی دوومەتر بەرز دەور درابوو.

ڕۆژی دوای گەیشتنمان؛ بەیانیەكەی هەڵساین و دانی پێدا دەنێم بەترس و لەرزەوە، بەپێ دەشتەكەی نێوان (گەڕەكی شۆڕش كە پێیان دەوت لیواكە و كەلاری كۆن)دا كەوتینەڕێ بۆ قوتابخانەی شێروانە، بۆ ئەوەی ناوەكانمان بدۆزینەوە بزان لەچ ژوور و پۆلێدایە. بەڕێكەوت ناوی من لەتەنیشت كچێك بەناوی (سروە) ناوی باوكیم بیرنەماوە، نەك لەناو ژوور بەڵكو لەڕاڕەوی سەرەكی بەردەم ژوورەكاندا بوو.

گەڕاینەوە و خۆمان ئامادكرد بۆ سبەی و تاقیكردنەوەی یەكەم وانە، كە بەیانیەكەی گەڕاینەوە قوتابخانە چ حەشاماتێك بوو، جگە لەخوێندكارەكانی شەشی سەرەتایی (هی شار و ئاواییەكانی دەوروبەری كەلار) بەسەدان و بگرە زیاتریش منداڵ لەچواردەور و سەردیواری سیاجی قوتابخانەكە كۆ ببوونەوە. یەكێك هاواری دەكرد، یەكێك فیكەی دەكێشا، یەكێك بەردی هەوا دەدا، یەك جنێوی دەدا، فەوزایەك بوو مەپرسە. ئینجا خالد و خەلیل لەبەر ئەوەی لەمن گەورەتربوون كەمتر، بەڵام من هەموو ڕۆژێك ترسی ڕێگای نێوان كەلاری كۆن و گەڕەكی شۆڕش (لیواكە)م هەبوو، چونكە منداڵەكان دەیانزانی ئێمە لەئاواییەوە هاتووین و سەروسیماشمان لەدوورەوە هاواری دەكرد، بۆیە تەشقەڵەیان پێدەكردین و ڕێگایان لێدەگرتین.

ئەو هەشت نۆ ڕۆژەی تاقیكردنەوەمان بەحاڵێك لێ ڕۆیی مەپرسە، چونكە هەم ناشارەزا و هەم ترسی منداڵی شەڕانی و ئەركی تاقیكردنەوەش لەولاوە بوەستێ!

## ئێواران

ئـەوەی زۆر بـۆ ئێمـە خـۆش بـوو، کەپێـش نیـوەڕۆ لەتاقیکردنـەوە دەهاتینـەوە (وەرز هاویـن بـوو) پشـوومان دەداو (سـەید قاسـم) یـادی بەخێـر دەیبردیـن بـۆ بـازاڕ، پیاسـەی پێدەکردیـن، شـرینی و ئایسـکرێم و چلـورەی بـۆ دەکڕیـن، ڕۆژێکیـان وتـی بـا بتانبـەم وێنەتـان بگـرم، چوینـە لای وێنەگـری شـێروانە (بـازاڕی سـەوزەفرۆشـی کۆنـ-سـەرمەشـروعەکە). لەڕێـگا فێڵێکیـان لەمـن کـرد و وتیـان:

-ئەوە چیە بەدەستەوە؟

-کتێبی پەروەردەی ئاینی..

-جا خۆ ئەوە مەمنوعەو بەدەستەوە بیبینن دەتگرن!

تـرس ماخولانـی بـۆ هێنـام و چـی بکـەم و چـی نەکـەم! وتیـان لەژێـر بلوسـەکەی بەرتـا بیشـارەوە، منیـش کتێبەکـەم کـردە دوو تویـی پزیـی شـەرواڵەکەمداو بلوسـەکەی بـەرم دابەسـەریدا. کاتێـک چوینـە ژوورەوە بـۆ لای وێنەگرەکـە (کاک حوسـام) خەریکـی ڕێکخسـتنمان بـوو، دەسـتی دای لەکتێبەکـەو پرسـی:

-ئەو ڕەقە چیە؟

-ڕەنگم زەرد هەڵگەڕاو زمانم هاتە یەکا..

سـەید قاسـم دای لەقاقـای پێکەنیـن و وتـی: وەڵا ئـەوە مـن ترسـانوومە و ئەگـەر کتێـب بەدەسـتەوە بگـرن و ببینـن، دەتگـرن و دەتبـەن بـۆ سـجن، بۆیـە ئەویـش لەوێـدا شـاردویەتەوە.

### دووکانەکەی سەید ئەحمەد

سـەید ئەحمـەد سـەید سـەمین؛ لـەو خێزانانـە بـوون (کۆمەڵێـک خـزم) لەئاوایـی گەرمکـەوە (ناوچـەی داوێ) لەناوەڕاسـتی هەفتاکانـەوە هاتبوونـە شـاری کـەلار، لەنێویانـدا (حاجـی سـەید عەبـاس) دوکانـی چاککردنـی ئامێـری تەلەفزیـۆن و ڕادیـۆی هەبـوو، بـەڵام (سـەید ئەحمـەد) دوکانێکـی وردواڵـە فرۆشـی (پسـکیت و بیبسـی و چلـورەو ئایسـکرێم)ی بەتەنیشـت دەرگای سـەرەکی ماڵەکـەی خـۆی کـە لەسـەر جـادەی (کـەلاری کۆنـ-نـاو بـازاڕ) بـوو.

بۆ ئێمە و ئەوکاتە ئەم دووکانە جگە لەشرینیەکان، دووسێ شوێنی دانیشتنی بەتەختەدار دروستکراوی تیا بوو، وەک ئەوە وابوو لەڕیستۆرانت و کافییەکانی ئێستای ڤیەنا و پاریسدا دابنیشین. بەتایبەت کە بیبسییەک و پسکیتێکت داوا دەکرد و لەسەریەکێک لەتەختەکان دادەنیشتی و دەتخوارد.

ئەم دووکانە نەک تەنیا بۆ ئێمە بەڵکو بۆ هەموو مناڵەکانی ئەو گەڕەکە (لیواکە)و دەوروبەری هەم تام و هەم چێژی هەبوو، چونکە فێنکی دەکردینەوە، ئیتر دوکانەکە جمەی دەهات لەگەنج و جەوان و هەندێ جاریش نەک تەنیا گەنجەکان بەڵکو پیاوە بەتەمەنەکانیش دەهاتن لێی دادەنیشتن و کۆڕی قسە و گفتوگۆیان گەرم دەبوو.

## دە دینارو سیانزە پەنجا فلسی

وەک ئێستا بیرمە؛ کە لەماڵ کەوتینەڕێ باوکم یەک و پێنج دیناری دا بەمن و خالد، ئەوکاتە بڕیارەکە وابوو هەر خوێندکارێک لەئاواییەوە (دەرەوەی شار) بۆ تاقیکردنەوەی وزاری بهاتایەتە شار، حکومەت هەریەکەو پێنج دینارو سیانزە پەنجا فلسی پێدەدا. لەڕۆژی دووەمدا لەلایەن لیژنەیەکەوە پارەکەیان پێماندا، بەسەریەکەوە یەکی بووینە خاوەنی دە دینارو سیانزە پەنجایی. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو ماڵە خزمانەی کەبانگمانیان دەکرد بۆ نانخواردنی ئێواران یان نیوەڕوان، شتێک پارەیان دەداینێ وەک دڵخۆشکردن، واتە بەردەستمان پڕبوو بۆ خەرجی ڕۆژانەمان.

ڕۆژێکیان بێ پرسی ماڵ میمکم ئەسمەر (سەید قاسم) سواری جێبە ڕوبعە بووم و چووم بۆ بازاڕ، لەهەر شوێنێکەوە ڕۆیشبام شتێکم دەکردە نیشانە بۆ ئەوەی وێڵ نەبم. چوومە بازاڕی سەرمەشروعەکە و دواتر دوکانی کەمالیاتەکان و پاشان گەڕامەوە بۆ لای گەراجی جێبەکان، پێش ئەوەی بگەمە گەراجی لای جێبەکان، لەبەردەم کتێبخانەکەی مام سابیری مەکتەبە لامدا، سەیری کتێبەکانم دەکرد، پێشووتریش باوکم لەشارەوە داستانەکانی خورشید و خاوەر، ڕۆستەم و زۆراب، لەیل و مەجنوون و لەو بابەتانەی بۆ دەهێنایین.

کوڕێک لەخۆم گەورەتر بوو، دیاربوو بەڕووخسارو جل و بەرگا، تێگەیشتبوو کە من خەڵکی شارنیم، بۆیە خۆی لێم نزیک کردەوەو وەک ئەوەی بمناسێ، کە مێک خلافاندمی و قسەی خۆشی بۆم دەکرد، کاتێکم زانی دەستی لەناو گیرفانی شەرواڵەکەمدایە و هێندەی نەمابوو، گشت پارەکەم ببا.

## كەلارم خۆش گەرەكە

ڕەنگە لێرەدا نەتوانم سەربوردەی ئەو دووهەفتەیە وەک خۆی بگێڕمەوە، بەڵام بەهەموو ترس و دڵەڕاوكێكانیەوە خۆشترین دووهەفتەی ژیانی ئەوكاتی تەمەنم بوو. دووساڵ دوای ئەو سەردان و تاقیكردنەوەیە، ئیتر كەلار نەک بۆ من، بەڵكو بوو بە شوێنی نیشتەجێبوونی خێزانیمان. لەو كاتەوە ڕێک لەساڵی هەشتاو پێنجەوە، كەلارم دوور لەشارچێتی وەک چاوم خۆش گەرەكە.

ئێستا كە ئەم دێرانە دەنووسم درۆ نیە بێژم (من لەم پەڕی دنیا و كەلار لەو پەڕی دنیا) كەچی شەو نیە خەونی پێوە نەبینم و تاسەی نەكەم. ڕێک و ڕەوان قەسیدەی (دەچمەوە بۆ كەلار) خۆشەویستی كەلار سەرچاوە و هەوێن و مامانەكەیەتی...

خۆشم دەوێی كەلاری ئاوەدان و ئاوەدانیی هەمیشەیی.



لاله فایەقی کەماڵەیی

# یادەوەرییەکی کورت لەسەر مزگەوتی کەلاری کۆن

مـەلا سـمایلی برایـم وەڵـی لـەلای مـەلا مسـتەفا لەمزگەوتـی کـەلاری کـۆن وەک فەقـێ خوێندوییەتـی، ئـەم چەنـد دێـڕەی وەک بیـرەوەری کاتـی خوێندنـی خـۆی بـۆ باسـکردم، منیـش پێـم خـۆش بـوو وەک خـۆی بۆتانـی بگێڕمـەوە:

لەخـوار مزگەوتەکـەی کـەلار، ماڵـی حاجـی محەمـەد حەسـەن سـەرۆکی عـە شـیرەتی کەماڵەیـی هەبـوو، خێزانـی حاجـی محەمـەد نـاوی ئاهـوو کەریـم فەتـاح بـوو (خـوا لێیـان خـۆش بێـت).

حاجـی محەمـەد، ژنێکـی لێهاتـووی ژنانـەی سـەخی تەبیعـەت و پێکەوتـووی بەشەخسـیەتی هەبـوو بەنـاوی میمکـە ئاهـوو، بـۆ ناسـینی زیاتـری میمکـە ئاهـوو، بـرازای حاجـی براحەمـە بـوو، هەرچـی ئەرکـی فەقـێ بـوو لەئەسـتۆی خۆیانـی گرتبـوو، وەک دۆ و شـیر، جگـە لەوەیـش زۆربـەی شـەکر و چـای لـە ماڵـی ئەوانـەوە بۆمـان ئەهـات، هۆکارەکەشـی بەرچـاو ڕۆشـنی و سـەخاوەتی میمکـە ئاهـوو بـوو.

ژیانـی فەقـێ بەوجـۆرە بـوو، بەیانـی و ئێـوارە (ڕاتبە)بیـان ئەکـرد، ئەچـوون بـو ماڵـەکان و لەدەرگایـان ئـەدا، بانگیـان ئەکـرد، ڕاتبەیـی فەقێیـە ڕەحمەتتـان لێبـێ (ماڵەکـە ئـاگادار ئەبوونـەوە و ئیتـر نانێکیـان ئەهـاورد بـۆ فەقێکـە)، ئەمـە بەیانیـان، ئێوارەیـش بـەر لەبانگـی مەغریـب فەقێیـەک بـۆ ئاوایـی و فەقێیەکـی تـر بـۆ ماڵـە بەگزادەکان دەچـوون، زۆرتـر ماڵـە

بەگزادەکان چێشتیان هەبوو، بەتایبەتی چێشتی فەقێی مزگەوت جیابوو، خواردنی ئەو سەردەمە هەژارانە بوو، بۆ نمونە برنج زۆر کەم بوو، فەقێکەی تر ئەوە نانی ڕاتبەی ئەهاوردەوە.

فەقێ خۆی دوو جۆر بوو:

سوختە: ئەو فەقێیەی منداڵە و سەرەتا خوێندنیەتی.

موستەعید: بەو فەقێیەیان دەووت کەپلەی خوێندەواری بەرزتر و خەریکی خویندنیشە و تەماشای دەرس خوێندنەوەی سوختەشی کردووە.



بورهان محەمەد فەرەج

# گەشتی منالّیم بۆ نیشتمانی دایک

ئەو سالآنەی کە کەلار تەنها دوو سەد مالّێک دەبوو، لەڕۆخی سیروانیش دێی بنگرد« مەکینەکە»ش چل مالّێک ، دێی حمەی کەریم دە مالّێک و عەلەومحەش پێنج مالّێک دەبوون، وەک ئێستا شارێکی گەورە و جوان نەبوو.

چمکی کەواکەی دایکم پەلکێشی دەکردم، وەک چۆن گالیسکەیەک لەژێر پێمدا بمهاژوێت، ئەویش کەمەنکێشی مالّە باوانی بوو، جارجارە ورە و ئازایەتی باوکم لە هەڵهەڵەی ڕوباری سیروان بوارێکی ئەدۆزییەوە، هەندێک جار بە سواری چارەوا بۆ ئەوبەری روبارەکە ئەپەڕینەوە و ئەگیشتینە پێدەشتی بنکورە، بەتایبەت لەوەرزی بەهاردا چڕی دار و دارستان و بۆنی بەلەگ و دیمەنی سەوزی دلّڕفێنی مرۆڤی سەرسام دەکرد، پاشتر ملی ڕێگەمان بەرەو بانڕاسایی دەگرت، لەوێندەرێوە لەملەی بانڕاسییەوە ڕووەو مەرکەز حدوود شۆڕ ئەبوینەوە، وەختێک دەگەیشتینە نیشتیمان و سەر کانی و ئاوەکەی ئۆخژن دەبووین، ئیتر لەوێ لەتەک دایکم بە باوانی و خزمانی دایکم شاد ئەبووینەوە.

ئەو دێیە، مەرکەزی پاشا حەمودییشیان پێ ئەگووت، دێیەکی بەردەلآنیە و تەنها سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی کانییەک بوو، بەلآم ئەو کانیاوە لەقولآیی زەوییدا دەبێتە کارێز و لەشێوەی تونێلێکدا بەرەو مەرزی ئێران دەڕوات، ئەو دێیە پڕ لە قەل بوو، بەیانیان لە عیوە عیوەی قەل لە سەربان بەخەبەر ئەهاتین، دێکە دەکەوێتە نزیک مەرزی قەسری شیرینەوە، زۆرێک لە دانیشتوانەکەی سەیدی بەرزنجیین و کەسوکاری دایکم بوون و ئەوانیتریش هەر وەکو کەسوکاریان لێهاتبوو.



مەرکەز بۆ منداڵی من مەملەکەتێک بوو، دونیاک یادگاری ئەفسوناوی و خەونی ڕەنگاوڕەنگ و تاڵ و شیرینیم وەک تابلۆیەک بە دیواری بیرەوەریەکانمدا هەڵواسیوە، پێگەی کەلاری دووەمی زێدە ئازیزی باو باپیرانم بوو، خۆشەویستی ئەو دێیە لای دایکم کاریگەری گەورەی لەناخی ئێمەشدا ڕواندووە، ساجا، کەش و هەوا هەرچۆنێک بوو بایە، زستان بایە یان تاوسان، با یان باران، لافاوی سیروان یان گڕەو گەرمایی هاوینی گەرمیان و گەرمەسێر، هەر دەبوایە وەک فەرز ساڵی جارێ یان دووجار سەردانی ئەوێندەرمان کردبایە، هەندێک ساڵ گەشتەکەمان بەسواری چارەوا دەکرد، بەسەر دێهاتەکانی بنکورە و جموردا گوزەرمان دەکرد و ئەوانیش سەرانە، واتە باجیان لەبری ڕاگوزەریمان بە خاک و موڵکی ئەواندا لێ وەردەگرتین، بەتایبەت لەساڵانی ١٩٦٦ و پاشتر ناکۆکی نێوان باڵی (م س) واتا جەلالی و ساڵح ئاغای ڕۆستم خان، بەشێک بوو لە ناکۆکی نێوان جەلالی و مەلایی، کاریگەری نەرێنی لەسەر ژیان و گوزەرانی خەڵکی ناوچەکە بەگشتی هەبوو، بارودۆخەکە تاقەت پڕوکێن بوو، بەگشتی خەڵکی ئەو مەملەکەتە ماندوو کرا بوون، بەو بۆنەیەوە توشی ناڕەحەتی و نەهامەتی و چەرمەسەری زۆر بوو بوون، هەندێک وەرز و هەندێک جار بەسواری کەڵەک لەبەرامبەر قەڵای شێروانەوە دەپەڕینەوە بۆ ئەوبەری سیروان.

جارێک لەگەڵ خاڵۆ شێخ ئەنوەر، جارێکیتر لەگەڵ خاڵۆ ئەحمەد نەجمە جارێکیش لە بەردەسوورەوە لەگەڵ حاجی ئەحمەد خەسرەو لە ڕوباری سیروان پەڕینەوە، ئەو وەرزەی باوبۆران و لافاوی گەورە هەبووایە و زستانەکەی سەخت بوایە، ڕێڕەوی گەشتەکەمان ئەگۆڕی و چمکی کەواکەی دایکمم توند توند دەگرت و بە پاسە دارینەکە حاجی ئەحمەد حەمە موراد کە پێیان دەگووت دەگولنەجەف کە ئەو جۆرە پاسانە هۆیەک بوو بۆ گواستنەوەی مسافیر و هەموو شتێکیتریش، بەوشێوە دەچوینە قەرەخان (جلولاء) شەوێک لەماڵە خزمێک ڕۆژمان دەکردەوە و سبەی بەرەبەیان دەچوینە وێستگەی شەمەندەفەرەکە، ئەو دەم هێڵی شەمەندەفەر لەبەغداوە بۆ قەرخان و خانەقی و کفری و کەرکووک دەهات، جا ئێمە لەوێستگەی قەرەخانەوە بۆ وێستگەی خانەقی سەردەکەوتین و مەقەسچی فارگۆنەکانی شەمەندەفەرەکەی دەپشکنی و مەقەسەکەی دەستی هێندە سەرنجی ڕادەکێشام، بۆ وێناو دیمەنێکی دڵڕفێنی ناوازە و کەم وێنە، جا بۆ منداڵە جوتیارێکی لادێی وەک من گەشت بەشەمەندەفەر خەونێکی خۆش و دونیایەکی تەواو جیاواز بوو، هەنێک جار دایکم سەرزەنشتی دەکردم بۆ ئەوەی دانیشم و نەگەڕێم و دەستم لە پەنجەرەکانەوە وەدەر نەنێم، منیش شتی وام نەبینیبوو!!! ئۆقرەم لێ بڕابوو و توشی حەپەسان بوو بووم و هەر دەجولام و دوو بارەم دەکردەوە. کێچ چوبووە کەوڵم، دانیشتنم نەبوو.

هەموو کۆڵ و بوخچە و پریازگمان ئەخستە سەر ڕەفەی سەرەوە و گوێم لە دەنگی قولەی قیتارەکە ئەگرت و دەنگی گالیسکەکەی زۆر چێژ بەخش بوو!! تائێستاش ئەو جەزبەی سواری قیتار منی بەرنەداوە و هەمیشە کە سەردانی ئەوروپا دەکەم زیاتر گەشتم بەشەمندەفەر لا خۆشترە و ئاسوودەتر دەبم، بەراورد لە گەڵ گەشت بە فرۆکە...،





لە کاتی خۆ ئامادەکردندا دەیقولاند بە بۆقی و بڵند گۆ، شانتینی دەکرد، واتە بۆ خۆ سازدان و بزاووتن، کە لە وێستگەی قەرەخان دەجولا بەسەر پردی حەلوانا و دێهاتەکانیدا گوزەری دەکرد و لەزۆربەی دێکان دەوەستا و موسافیری سەردەخست، بەتایبەت ئەو جوتیارە عەرەبانەی کە بەربوومی شیرەمەنیان دەبرد بۆ ساغ کردنەوە و فرۆشتن لە بازاری خانەقیدا، قوولەی قیتار میوزیکی دڵخوازی منە و لە نەستمدا هەڵکۆڵراوە، خۆشترین کاتی من ئەو کاتە بووە کە ئەگەیشتینە وێستگەی خانەقی و دادەبەزین.

خانەقی شارێکی کوردەواری جوان و دڵرفێن و پڕ لە گوڵ و دار و باخی هەمەجۆر بوو، بەشێوەیەک ڕێگاوبان و ماڵەکان هەموو سەوزی پۆشی بوو، بۆن و بەرامی گوڵ و دار و دارستانی ئێجگار سەرسوڕهێنەر بوو، ئەو ڕێگەی ویستگەکە و پاشا کۆپری بەیەکەوە دەبەست، بە قەراغ جۆگە ئاوی باڵەجۆدا ڕەت دەبوو کە ئەمبەرو ئەوبەری سەوزایی بوو، لەقەراخ ڕێگەکە ژنە عەرەب دادەنیشتن و دەستیان بە قەیماغ فرۆشتن دەکرد تا دەگەیشتە چایخانەکەی «ئەبو شوکور» بەرامبەر بەتەنیشت وێستگەی بەنزیخانەکە و یەکسەر «شاکیرە کوێر» م ئەبینی و خژڵی بارکردنی بەرمیلی نەوت بوو لە پاسەکانی قۆرەتوو و بنکورە و بناری بەمۆ و دێهاتەکانی تر.

هەندێک جار لە وێستگەکە ئەسپ و عارەبانە وەستا بوون، کاری تاکسیان بۆ ناوشار دەکرد، ئەویش دیمەنێکی سەرنج ڕاکێش و زۆر دەگمەن و جوانی هەبوو، شەوێکیش لە ماڵی خزمان لە خانەقی دەماینەوە، لە ناو باخچەی بلوارەکانی شاردا یاریمان دەکرد، ئەو دیمەنە تائێستاش مۆتیڤێکە بۆ خۆشەویستی خانەقی لای من، بەیانی پێش نیوەڕۆ بە پاسەکەی «حەمە پەڕۆ» دەکەوتینە ڕێ لە تۆڵە فرۆش کە دێیەکی قەراغی شار بوو، خاڵی پشکنین هەبوو، هەرکەسێک شتێک لە شەکر و چا و خواردن یان نەوتی هەڵگرتایە قەدەغەبوو لێیان وەرئەگرت و دەستیان بەسەردا دەگرت.

پشکنینێکی تاقەت پڕوکێن بوو، بەردەوام گەماڕۆی ئابووری لەسەر دێهاتەکان بوو، لە گەڕانەوەشماندا بەسەر قەرەخاندا بە هەمان شێوە لە بازگە و سەیتەرەکانی بەعسدا زۆر زۆر ئەزێتیان ئەداین، لەدوای پشکنیین لەملەوکونار و بەسەر گوندی کاکەییەکان، موسا وەسمان، دارە خورما، سەوزبلاخدا دەڕۆشت تا دەگەشتە دێی مەرکەز حدود، هەڵبەت پاسەکە تا دێی پەلە چەوت و هەندێکیان تا ناحیەی قۆرەتو و پەروێزخان و بناری بەمۆش دەڕۆیشتن.



عەبدوڵڵا حەسەن قادر

# یەکەم ناوەندی کەلار
# لە کەلاری کۆن
## ساڵی خوێندنی ١٩٧٠- ١٩٧١

پۆلێ قوتابی پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووین لە کەلاری کۆن، دوایی دەرچوونمان لە ئەزموونی وەزاریی ساڵی خوێندنی ١٩٦٨- ١٩٦٩ ڕوومان کردە شارۆچکەی (جەلەولا) بۆ تەواوکردنی خوێندن، هەرچۆنێک بوو بە کوێرەوەریی و کولەمەرگی ساڵی خوێندنی ١٩٦٩- ١٩٧٠ مان گوزەراند و ئەنجامی ئەو ساڵەمان وەرگرت، لە کۆی ئەو (١٠) قوتابییەی جەلەولا (٨)مان دەرچووین، (٢)نیش مایەوە.

خوێندن لە دەرەوەی کەلار بۆ ئێمە زۆر سەخت بوو، بەهۆی گرانی باری گوزەرانەوە، بۆیە بیرمان لەوە کردەوە، داوایی کردنەوەی پاشکۆیەک لەگەڵ قوتابخانەی کەلاردا بکەین، بۆ ئەو مەبەستە سەردانی قوتابخانە سەرەتاییەکەمان کرد، بەڕێوەبەر و مامۆستایان ئامادەی بەڕێوەبردنی پاشکۆکە و وانە ووتنەوەییان دەربڕی، دوایی ئەوە، دوو لیستمان بەناوی قوتابیانی پۆلی یەکەم و دووەم ئامادە کرد، لەوانەی پۆلی شەشەمیان تەواو کردبوو، بەهۆی هەژارییەوە نەیانتوانی بوو درێژە بە خوێندن بدەن، لەگەڵ قوتابیانی دەرچوو و دەرنەچووی جەلەولا و کفری، هەروەها قوتابیانی دێهاتەکانی: شێخ لەنگەرەکان، گردەگۆزینە، بنگرد، سەیدە، دێنە و گێژەکان، سەرەڕای ئەوانەیش ژمارەیەک ناوی زیادەیشمان نووسی بوو، کە بوونیان نەبوو، هەر بۆ ئەوەی پاشکۆمان بۆ بکەنەوە.

پاشتر مەزبەتەیەکمان بەناوی باوکی قوتابییانەوە کردەوە و بردمان بۆ خوالێخۆشبوو (جەلال بیلال) قائیمقامی ئەو کاتەی کەلار، ئەوانیش بە پێنج وێنە نوسراویان بۆ

كردین بۆ پەروەردەی كەركووك، ئێمەی قوتابییانی كەلاری كۆن كە پۆلی دووەم بووین لە جەلەولا هەستاین بە ئەو ئەركە، كە ئەمانە بووین:

١-شێركۆ محەمەد ڕۆستەم، ٢- محەمەد محەمەد ئەمین مەحموود كەلاری، ٣-حەسەن عەلی سەلیم، ٤- عەدنان ڕەشید محەمەد، ٥- هیدایەت ئەحمەد كەریم، ٦- عەبدوڵڵا حەسەن قادر.

لە جەلەولاوە بە شەمەندەفەر بۆ كەركووك چووین، نامەیەكی خوالێخۆشبوو (عەلی بەگی سەلیم بەگ) مان پێبوو بۆ كاك عوسمان سەعید- لێپرسراوی لقی دووی پارتی دیموكراتی كوردستان بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات لە ڕێگەی مامۆستا (فاتیح محەمەد ئەمین)ەوە كە یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەی كەركووك بوو، ناوبراو تەلەفۆنی بۆ یاریدەدەری پەروەردە كرد بۆ ئەو مەبەستە، حەسەن عەلی سەلیم و ئێمە بۆ بەیانی سەردانی پەروەردەمان كرد، چووینە لای مامۆستا فاتیح، نووسراوەكانمان پیشاندا و وەزعی خۆیشمان باسكرد، ڕێزی لێگرتین، سەردانی بەڕێوەبەری كرد و حەسەن و شێركۆیشی لەگەڵ خۆیی برد، بەڕێوەبەری قایل كرد، مامۆستا فاتیح زۆر یارمەتی داین، هەر خۆی ژوور بەژوور فەرمانی كردنەوەی پاشكۆیەكی پۆلی (یەكەم، دووەم) ی دەركرد، دەوام دەستی پێكرد و مامۆستا (كەمال فارس عەزیز) كە بەڕێوەبەری سەرەتاییەكە بوو، بوو بە بەڕێوەبەری پاشكۆكەیش، مامۆستایانی سەرەتایی دەرسیان پێدەوتین، لەوانە: مامۆستایان حسێن كەلاری، ئەفراسیاو ئەحمەد خدر، كەمال فارس عەزیز، حیلمی نوری (یاریدەدەری پزیشك)، سەباح سەعد و شكور محەمەد غەفور.

دوای ماوەیەك یەكەم مامۆستای بیركاری بەناوی مامۆستا نەوزاد محەمەد ساڵح كە خەڵكی كەركووك بوو هات، پاش ئەویش مامۆستا جەمال حمد عەلی كە پسپۆڕی جوگرافیا بوو، مامۆستای ناوبراو خەڵكی كۆیە بوو، دوای ئەوان مامۆستا ناسیح سەعید محەمەد- پسپۆڕی زمانی عەرەبی پەیوەندی كرد، دوای ئەویش مامۆستا حەسەن ڕەسوڵ قادر- پسپۆڕی زمانی ئینگلیزی دەست بەكار بوو، ساڵی ١٩٧١- ١٩٧٢ پاشكۆكە بوو بە ناوەندی، مامۆستا ناسیح بوو بە بەڕێوەبەر، پاش ماوەیەك مامۆستا نەوزاد گوازرایەوە، مامۆستا ڕەفعەت توركمان بوو هاتە شوێنەكەی، مامۆستا جەمالیش گۆڕیەوە لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل سەمەد بۆ كۆیە و ئەم بۆ كەلار، پاش مامۆستا ناسیح، ئینجا مامۆستا حەسەن ڕەسوڵ قادر بوو بە بەڕێوەبەر لە ساڵی ١٩٧٣- ١٩٧٤.

**بۆ نووسینی ئەم بابەتە سود لەم بەڕێزانە وەرگیراوە:**

محەمەد محەمەد ئەمین مەحموود کەلاری

شێرکۆ محەمەد ڕۆستەم

حەسەن عەلی سەلیم

هیدایەت ئەحمەد کەریم

م. شکور محەمەد غەفور

تۆماری ناوی قوتابیانی پاشکۆ و ناوەندێکە

زۆر سوپاسی بەڕێز م. ئەبوبەکر بەڕێوەبەری قوتابخانەی ڕاپەڕین دەکەم کە کار ئاسانی بۆ کردم بۆ پیشاندانی تۆمارەکان، نموونەی زۆر بێت.



مستەفا سەعید عەلی

# چەند یادەوەرییەک لە پۆلی سێیەمی ناوەندی ١٩٨١- ١٩٨٢

ساڵی خوێندنی ١٩٨١- ١٩٨٢، پۆلی سێیەمی ناوەندی بووین لە (ثانویة الثورة) لە کەلار، چەند ڕووداوێکی خۆش لە پۆل و قوتابخانەکەماندا ڕوویانداوە بۆ ئەوەی وون نەبن دەیانگێڕمەوە.

## یەکەم

نزیکەی دوو مانگێک بەسەر خوێندنی ئەو ساڵەدا تێپەڕی بوو، قوتابییەکمان لە بەغدادەوە بە نەقڵ بۆ هات، یەکەم ڕۆژی دەوامکردنی مامۆستای ئاین هاتە ژوورەوە، یەکەم کەس ئەو کوڕەی هەستاند، ئادەی ئایەتەکەی دەرسی پێشوو پێتانم دابوو لە سینە بۆمی بخوێنەوە.

- مامۆستا من ئەمڕۆ بە نەقڵ هاتووم.

- کەواتە، فەرموو دانیشە.

هەفتەی داهاتوو مامۆستا هەمان قوتابی هەستاندەوە و هەندێک پرسیاری لێکرد.

- مامۆستا تازە هاتووم.

- فەرموو دانیشە.

هەفتەی سێیەم، مامۆستا هەمدیس هەمان قوتابی هەستاندەوە و پرسیاری لێکرد.

- مامۆستا تازە هاتووم.

مامۆستا سەیرێکی قوتابییەکەی کرد و پێی ووت: دانیشە تا چلەت دەچێت، ئەوجا هەڵتدەسێنم.

## دووەم

مامۆستای زانستمان کچێکی خەڵکی سلێمانی بوو، ڕۆژێکیان لە کاتی دەرس ووتنەوەدا لەگەڵ یەکێک لە قوتابییەکان لێیان بوو بە دەمەقاڵە، ئەلحەق قوتابییەکە هەم زیرەک و هەمیش بە ئەدەب بوو، بەڵام ئەوەی هەبوو هەندێک تورەیی لەگەڵ بوو، قوتابییەکە وا تورە بوو مشتێکی بە کورسییەکەی لەسەری دانیشتبوو کێشا و ووتی: مامۆستا بەخوا هەستم دەتخنکێنم، ڕاستی مامۆستایش هیچ کاردانەوەیەکی خراپی نەنواند و ئاسایی درێژەی بە دەرس ووتنەوە دا.

هێندەی نەبرد لە دەرگا درا، مامۆستا دەرگای کردەوە، باوکی ئەو قوتابییە بوو.

- فەرموو مام حاجی.

- من باوکی .... م، هاتووم بزانم کوڕەکەم چۆنە ؟

- وەڵڵا، مام حاجی کوڕەکەت هەم زیرەک و هەمیش موئەددەبە، ئەوە نەبێت جار جار لێمان تورە دەبێت و دەیەوێت بمانخنکێنێت، دەنا عەیبی تری نیە.

## سێیەم

مامۆستا (سهيلة يحيى حسين)، خەڵکی مووسڵ بوو، دەرسی (الرياضيات)ی پێ دەوتینەوە، (الرياضيات) دوو کتێب بوو، (جبر و هندسة)، بابەتێک لە کتێبی جبر دا هەبوو پێیان دەووت (الحصاء)، زۆر بابەتێکی قورس و گران بوو، مامۆستا نەیتوانی هەموو کتێبەکە تەواو بکات و بۆیە بابەتی (الحصاء)ی پێ نەوتینەوە و ڕۆیشتەوە بۆ مووسڵ.

كەچووینە تاقیكردنەوەی بەكالۆریاوە پرسیارێكی (٢٠) نمرەیی تەواو لە بابەتی (الحصاء)دا هاتبووەوە.

قوتابییەكان دەستیان كرد بە ناڕەزایی و بە بەڕێوەبەری هۆڵیان ووت: مامۆستا ئەم بابەتەمان نەخوێندووە، شتی وا چۆن دەبێت، ئیتر دەنگە دەنگ دروست بوو.

- بەڕێوەبەر: من نازانم، خۆمن پرسیارم دانەناوە، وا باشترە بێدەنگ بن و وەڵام بدەنەوە، با كاتەكەتان نەچێت. سوودی نەبوو، قوتابییەكان هەر بەردەوام بوون، قوتابییەكمان كە بەهەزار ئەملاو ئەولا داخڵی بەكالۆریا كرا بوو و چاك دەیزانی دەرناچێت، هەستایە سەر پێو، ووتی: مامۆستا ڕاست ناكەن خوێندوومانە.

- بەڕێوەبەر: ئافەرین قوتابی زیرەك خۆی دیارە، كەواتە خوێندووتانە، وا باشترە ئیتر بێدەنگ بن، بەو جۆرە قوتابییە تەمەڵەكە هەمووانی بێدەنگ كرد.

## چوارەم

مامۆستاییەكمان لەگەڵ قوتابییەكی پۆلی چوارەمی ئامادەیی نهێنیەكیان لە نێواندا بوو، هیچ كەس لە ئێمە نەماندەزانی چیە ؟ ڕۆژێكیان پۆلەكەی ئێمە (سێییەمی ج) دەركرا بووینە دەرەوە و لە گۆڕەپانی قوتابخانە بووین، ئەو مامۆستاییەی نهێنی لەگەڵ قوتابییەكە هەبوو هات بۆ لامان و بەیەكێك لە قوتابییەكان كە ناوی (صدیق) بوو، ووتی: بڕۆ فلانم بۆ بانگ بكە، واتا ئەو قوتابییەی كە نهێنی لەگەڵدا بوو، بزانن ئێستا بە بەرچاوتانەوە چی لێدەكەم.

(صدیق) هەر زوو چوو قوتابییەكەی هێنا، قوتابییەكە هەر لە دوورەوە بە مامۆستای ووت: مامۆستا... بەخوا دەزانم بۆچی ناردووتە بە شوێنمدا، واللە تەنها دوو جگەرەم پێیە، ئا ئەوە یەكێكیان بۆ تۆ و ئەوی تریشیان بۆ خۆم.

مامۆستایش دەستیكرد بە پێكەنین و هیچی نەووت.

## پێنجەم

مامۆستاییەکی وانەبێژیان بۆ هێنایـن دەرسـی (عەرەبـی)ی پێدەووتینـەوە، یەکێـک لـە قوتابییـەکان، ووتـی: ئـەم مامۆسـتاییە لـە پۆلـی پێنجەمـی سـەرەتایی لێیـداوم، ئەمـڕۆ حەقـی خۆمـی دەکەمـەوە.

هەرکـە دەرس تـەواو بـوو، لەکاتـی چوونـە دەرەوەیـی مامۆسـتا، قوتابییەکـە تەباشـیرێکی تێگـرت و دایـی لـە گوێـی مامۆسـتا، دونیـا زسـتانێکی سـارد بـوو، گوێـی مامۆسـتا تەزیـی، مامۆسـتا تەنهـا بەرێکـی کـردە دواوە و هیچـی نـەووت، دەمانزانـی ئـەم کـردارە بـێ سـزا نابێـت، کـە پشـوو تـەواو بـوو هاتینـەوە نـاو پـۆل، بەڕێوەبـەر (عبدالهـادی) ڕەشـێکی بـاڵا بـەرزی، خەڵکـی بەسـرە بـوو، ئـەوەی لـە دەمـی هـات لـە قسـەی ناشـیرین پیـی کردیـن، دواجـار ووتـی: بەخـوا بزانـم کام قوتابییـە بـەم دەمانچەیـە دەیکـوژم، هەمـوو فزەمـان لـە خۆمـان بـڕی بـوو کـەس نەیگـووت کێیـە، هەرچـی هەوڵیـدا بکـەر نادیـاری بـۆ نەدۆزرایـەوە، بـۆ ئـەوەی بـە دەسـتی بەتـاڵ لـە پـۆل نەچێتـە دەرەوە، قوتابییەکـی بـێ تـاوان سـێ ڕۆژ فەسـڵ کـرا، ئەویـش زۆر پیـاو بـوو نەیگـووت مامۆسـتا مـن نیـم و فـڵان قوتابییـە.

## شەشەم

مامۆسـتاییەکی خەڵکـی بەغدادمـان هەبـوو، دەرسـی جوگرافیـای پـێ دەووتینـەوە، کاتـی خۆیـی لـە ئۆتۆمبێـل وەرگـەڕا بـوو، زۆر جـار شـتی لـە بیـر دەچـووەوە، وە دەکەوتـە دۆخێکی تایبەتـەوە، ڕۆژێکیـان لـە دەرسـدا کوڕێکـی هەسـتاند، ئادەیـی فـڵان بابەتـم بـۆ باسـکە.

قوتابییەکەیـش نزیکـەی پێنـج دەقیقـە بەباشـی بابەتەکـەی بـاس کـرد، تومـەز مامۆسـتا ئاگایـی لـە پـۆل نیـە.

کـوڕ لـە قسـەکردن وەسـتا، لـە پـڕ مامۆسـتا هۆشـی هاتـەوە، کـوڕم بۆچـی تەحزیـرت نەکـردووە و نەتخوێنـدووە؟

- مامۆستا یەعنی چی نەمخوێندووە، ئەوە پێنج دەقیقەیە قسە دەکەم.

- ئاوا، زۆر باشە، کەواتە فەرموو دانیشە.




# شکانی زریپۆشەکەی کەلار

لەبەهاری ساڵی ١٩٧٤ لە شۆرشی ئەیلولدا , شەوێک چەند پێشمەرگەیەک مینێکی گەورە لە سەر ڕێگای کفری- کەلاری کۆن دادەنێن لە سەرپردەکۆنەکەی خرِی حاجی , مینەکە بەیانی زوو بەکاروانێکی سەربازیدا دەتەقێتەوە و زریپۆشەکە تێک دەشکێنێ , کاروانەکە لە چەند ئوتۆمبێلێکی تریش پێک هاتبون , ئیدی سەربازەکە بەناوی ئەیاد بەر پرسی یەکەمی کاروانەکە دەبێ , بریار دەدات هەموو کەلاری کۆن ماڵ بەماڵ بپشکنێ.

ئەو کاتە کۆمەڵێک گەنج ناویان هاتبوەوە بۆ سەربازی و نەچوبون تاخزمەتەکەیان تەواو بکەن , کۆمەڵێک بوو چوبون , بەلام هەڵ هاتبون لەسەربازیەکەیان، زۆر لە گەنجەکان چوبون بۆ پێشمەرگایەتی , ئیدی ماڵ نەبوو لایەنگری پێشمەرگە و شۆرش نەبوبێ، هەرلەگەڵ دەنگی گەورەی تەقینی بۆمبە چێنراوەکە , زۆر لە خەڵکی دێ هاتنە لای خۆر ئاوای دێی کەلار , تەنیشت چایخانەکەی مام حەسەن حیدەر تا لە شکانی زریپۆشەکە و کاروانەکە ببینن، بەلام کێ لەو سنورەدا بوو یان نزیک دەبوەوە لە ڕووداوەکە ئازاریان دەدان.

سەرباز و سەرقافلەکە کە ملازم ئەیاد ناوێکی عەرەب بوو , تەمەنی زۆر گەنج بوو , ئیدی باوکم , حاجی محەمەد لە مەبەستی کاروانە سەربازیەکە گەیشتن , زانییان بۆچونی باش نیە و ئازاری خەڵک دەدەن , بابم بریار دەدات نەچێتە پێشەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە هەموو منداڵەکان و چەند لە خزم و دۆستێک بانگ دەکات , دەڵێت: ئەم هێزە خەیاڵیان باش نیە، بە منداڵەکان و دۆستەکانی دەڵێ بڕۆن لە نێو دێدا مریشک و هێلکەیەکی زۆرم بۆ بکڕن و چەند ژنێکی دراوسێش ئاگادار دەکرێنەوە بۆ نان کردن , پاشان لە

ماڵەوە و بە پەلە خواردن لێدەنێن و دەیخەنە سەر چەند عەرەبانەیەکی دەستی و حاجی محەمەد دەکەوێتە پێشی عەرەبانەکان و دەگاتە لای هێزەکە , ئەوانیش زۆر سەریان سور دەمێنێ بە زمانی عەرەبی لەگەڵیان دەدوێ , وەڵامیان دەداتەوە ئەڵێ ئەمە چیە؟ ئەویش دەڵێ خواردنە بۆ ئێوە و هێزەکەتان، ملازم ئەیاد ئیدی بۆچونی دەگۆڕێ هەموو خەڵک لە وڕاستایەدا ڕیز کراوە و ملازم ئەیادیش دەمانچەکەی بە دەستەوەیە بە پشتی خەڵکەکەدا هاتوچۆی کردووە وەک ئەوەی کە لە فیلمی عومەر موختاردا دەبینرێ، پاشان هەر دوای ڕووداوەکە ملازم ئەیاد بە حاجی دەڵێ: دێم بۆ ماڵتان کە دەچێتە ژوری میوان و لەسەر قەنەفەیەک دادەنیشێ و سەیری فەرشە کاشانەکەی ژوری میوان دەکات و دەڵێ ئەم فەرشە جوانە، ئیدی حاجی دەڵێ: ئەوە دیاری تۆیە , ئەویش دەڵێ فەرشی ئێران قەدەغەیە , حاجی دەڵێ من وای لێدەکەم بتوانی بیگەیەنیت و نەبینرێ، بەرمیلێکی نەوتی بەتاڵ دەهێنن , سەرێکی بە تەور هەڵدەهێنن و فەرشەکەی تێدە ئاخنن , حاجی پێی دەڵێ بیخەنە ناو جێبەکە و سەرەو نگون دایبنێ و بێژە گازی تێدایە بۆ کاروانەکە بارکراوەو پێویستمانە.

فەرشێکی کاشانی ئەو کاتە نرخی ٣٠٠ دینار بووە لە ساڵی هەفتاو چوار کردی بەدیاری، سەربازەکە بۆ ئەوەی خەڵکەکە ئازاد بکرێن، ئیدی حاجی محەمەد داوای لێدەکات کە خەڵک هیچ گوناهێکی نیە و باش وایە ئازاد بکرێن کە چەند کەس لە گەنجی دێ گیرابون کە لە سەربازی هەڵهاتبون یان هەر دەفتەری خزمەتیان نەبوو , ملازم ئەیاد بەڵێن بە حاجی محەمەد ئەدا هەوڵ دەدات کە زیان بە کەلار و خەڵکەکەی نەگەیەنرێ، لە وەڵامدا دەڵێ: بە لاسلکی پەیوەندیم کردوەتە گەورە و سەرووی خۆمەوە , دەبێ کارێک بکەم کە زیانتان پێ نەگا تاهەموو خەڵکەکە ئازاد دەکەم , بەڵام حەوت کەس هەردەبێ لەگەڵ خۆمدا ببەم , چونکە سەروی خۆم داوام لێ دەکات، بەڵام دڵنیات دەکەمەوە بە سەلامەتی دەیان نێرمەوە، ئیدی حەوت کەسی لەخەڵکی دێی کەلاری برد بە هۆی تەقینەکەوە , بەڵام بەڵێنی خۆی جێ بەجێ کرد و دوای هەفتەیەک ناردیانیەوە نامەیەکی بۆ باوکم ڕەوانە کردبووکە تێیدا بەڵێنکەی جێ بەجێ کردوە , هەموو ئەو کەسانەی گرتبووی بەرەڵای کرد و ناردیانیەوە.



حاجی محەمەدی ڕۆستەم لە ١٩٨٨/٢/٢٦ ڕۆژی هەینی ماڵ ئاوای لەژیان کردوە.

ناوی گیراوەکان پارێزراوە.

# کەلار، ئاسۆیەکی ئەرخەوانی



جەمیل عنایەتی،
خەڵکی لێلاخ و سنە، مامۆستای گرێبەست
لە زانکۆی گەرمیان

بۆ یەکەم جار لە ڕۆژێکی مانگی گوڵانی ساڵی ٢٠١٣ لە نێوان عەسر و ئێوارە، لە جادەیەکی باریک لە ئاراستەی سلێمانییەوە بە تەنیشت ڕوباری سیرواندا، هاتمە ناوشاری کەلارەوە، من نەمدەزانی ئەو دیمەنە تۆزاوییە، کە بە تەواوەتی جیاوازە لەگەڵ زەوییە ئاشناکانم و کەشوهەوای شاخاوی و فێنک و ساردی سنە و دێگوڵان، دەبێتە پاشخانی ژیانێکی پڕ لە مانای هەبوون، زیاتر لەوەی کە خەیاڵم بۆ دەکرد.

سەرەتای هاتنە ژوورەوەم بۆ ناو کەلار، سەرەڕای نەبوونی ئەو سەوزایی و خزمەتگوزارییە ئاوەدانییەی کە لە ئێستادا هەیە، دڵنشینی و هەستێکی یەک ڕەنگی و سادەیی لە نێوان خەڵکەکەی دڵخۆشی کردم، زۆربەی جادەکان و کۆڵانەکان وەک خەڵکەکەی سادە و خاکی بوون، بیرم نەچێت هەر ئەو ڕۆژە کە خۆر ئاوا بوو ئاسۆیەکی ئەرخەوانیی زۆر جوان سەرنجی ڕاکێشام کە تا ئێستاش ئێواران زۆربەی ڕۆژەکان لە بەرزایی بەردەسوورەوە دادەنیشم بە دیار تەماشای خۆرئاوابوونە جوانەکەی کەلار.

کەشوهەوای کەلار جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە لەوەی کە من پێشتر لە زێدی خۆم لەگەڵی ڕاهاتووم، بە پێچەوانەی چوار وەرزی جیاوازی سنە و لێلاخ، کەلار تەنیا دوو وەرز ئەزموون دەکات، بەهار و هاوین. نەبوونی بەفر و سەرما و بەستەڵەک کەلاری لە زستانی بە مانای زستان بێ بەش کردووە و نەبوونی گەڵا ڕەنگاوڕەنگەکان و گەڵا کەوتووەکان تایبەتمەندی پایزی لێ بزر کردووە، بەڵام دەتوانم بڵێم گەرمی چڕ و پڕ و



بارانە بەخوڕەکانی کەلار ئەو شارە تایبەتتر دەکات و ئەوە دەهێنێت کە زستان و پاییزی نەبێت، تا لە بیرم نەڕۆیشتووە با باسی بیناسازی و پلاندانانی شار لە ڕووی گەرمیەوە بکەم کە دەتوانرێت چاکسازیی تێدا بکرێت بە باشترکردنی تەلارسازی شارەکە و دیزاینی شارەکە بە بەکارهێنانی گڵ و بەرد و خشت و تابوغە، ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆ فێنک ڕاگرتنی ناوەوە بە کەمترین بەکارهێنانی وزە.

لە دەرەوەی دیمەنەکان، سەرەتای بەریەککەوتنەکانم لەگەڵ خەڵکی کەلار بە هەمان شێوە دڵخۆشکەر بوون، من بە مەبەستی کارکردن وەکو مامۆستا لە بەشی فیزیک بۆ زانکۆی گەرمیان هاتبوم، لەلایەن مامۆستایانی زانکۆ و بەشەکەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردم و بە ئامێزێکی گەرمەوە وەریانگرتم، هەر زوو سادەیی و میهرەبانی و بەها ئاینییە بەهێزەکانیان بە قووڵی هۆگری ئەم شارەی کردم و تێکەڵی هەموو چینەکانی خەڵکی کەلار و گەرمیان بووم، چی لە زانکۆ و چی دەرەوەی زانکۆ.

خەڵکی ئێرە کوردانی گۆران، بە زاراوە و دەستەواژەکانی نزیک بە سنە و زیاتریش لێلاخن و هەست ئەکەم لە ڕابردوودا باپیرانمان گەرمیان کوێستانیان کردووە و ڕۆحێکی هاوبەشمان هەیە لە کلتور و زمان و هەست و تەنانەت خواردنە کوردەوارییەکان، خەڵکی کەلار خاوەنی تایبەتمەندییەکی ناوازەی میوانداریین و شەبەنگێکی سەرسوڕهێنەر لە جیاوازی زمان و ئایین و بیرکردنەوە لەم شارەدا نیشتەجێن کە زۆربەیان بە میوانی هاتوون و ئێستا ئێرەیان بە ماڵی خۆیان هەڵبژاردووە، لە نێوان خەڵک و دانیشتووانیدا

جیاوازییەکی جوانی تێڕوانینە هزری و ئایینی و سیاسییەکان هەیە و خەڵک لەگەڵ هەموو ئەو جیاوازییانە پێکەوەژیانێکی زۆر جوانیان هەیە، یەکێک لە دیاردە هەرە سەرنجراکێشەکان ئەوەیە هەندێک جار فرۆشیارێکی سادە یان ڕێبوارێک لە سەر شەقام هەمان ئەو ڕەفتار و گوفتارە تێرامانە پێشکەشت دەکات کە مرۆڤ چاوەڕوانی دەکات لە مامۆستایەکی زانکۆ ببینێت، یاخود لە بەردەم چاخانەیەک گفتوگۆیەک دەکرێت کە چاوەڕێ دەکرێت لە کۆنفرانسێکی زانستی یاخود لە دانیشتنێکی پەرلەمان بکرێت، ئەم وێنە کۆمەڵایەتییە سەرنجراکێشە هەستێکی پەیوەندی ڕاستەقینەی لام خولقاند کە منی لە شوێنکەوتنی پیشەیی تێ پەڕاند و تێکەڵاوی ناخ و بنچینەی کۆمەڵگە و بازاڕیشی کردم بە دەر لە ژینگەی زانکۆ.

خەڵکی کەلار بە درێژایی مێژوو سەختییەکی بێ ئەندازەیان بەسەر بردووە، هەر لە بەرگەگرتنی ئەو گەمارۆ دڕندانەیە کە بەسەر عێراقدا سەپێنراو تا ڕووبەڕووبوونەوەی ململانێکانی نێوان ڕژێمی بەعس و کورد، هەتا ئەزموون کردنی ململانێی ناوخۆیی، خۆڕاگرییان بەڕاستی جێگەی سەرنجە، زۆرێک لە دانیشتوانی هاوتەمەنی من لانیکەم دوو ئاوارەبوونیان بەسەر بردووە، شایەتحاڵی وێرانبوونی ماڵ و زێدی خۆیان بوون، ئازیزانیان لە دەست داوە یاخود کەسێک لە ئازیزانیان کەوتووەتە ڕێگەی پڕ لە مەترسی لە ڕێگاکانی کۆچکردن بۆ ئەورووپا، ئەم ئەزموونانە لە یادەوەریی بەکۆمەڵی کەلاردا چەسپاوە، نزیکەی هەموو بنەماڵەیەک شوێنەواری ئەو جۆرە کارەساتانەیان هەڵگرتووە.



ڕەنگە خەمبارترین ڕووداو هەڵمەتی ئەنفال بووبێت، کە هەڵمەتێکی جینۆساید بوو لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە کە کوشتن و زیندوبەگۆڕکردنی دڕندانە و بێشوماری ژن و پیاو و منداڵی کوردی بە خۆیەوە بینی، سەرەڕای ئەم سەختییانە، ورە و بەهێزیی خەڵکی کەلار ڕەنگدانەوەی خۆڕاگرییەکی قووڵ و سەبر و لێبوردەیی و ڕۆحێکی نەگۆڕە، ئەوان نەک هەر لە ژیاندا ماونەتەوە، بەڵکوو گەشەیان کردووە، شارێکی بەهێز و زیندوویان دروست کردووە،

ژیان لە کەلار تابلۆیەکی زیندوو لە ئەزموونە کۆمەڵایەتی، ئایینی، هونەری و کولتوورییەکان پێشکەش دەکات، چایخانەکان شوێنی گردبوونەوەی دۆستانە و وتووێژ و تەنانەت یاری شەترەنجن لەگەڵ دۆمنە و کۆنکان، لە کاتێکدا کتێبخانە گشتییەکەی سیمینار و کۆڕ و کۆبونەوەی ئەدەبی و زانستی و بابەتی جیاوازی تێدا ڕێک دەخرێ، نابێت لێرەدا فەرامۆشی بکەین ئەم وێنا جوانەی کەلار بەدەر نیە لە هاوبەشی خەڵکانی چواردەوری خۆی لە کفری و خانەقین و باوەنووریشەوە.

یەکێک لە لایەنە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی کۆمەڵگای کەلاری، سروشتی یەکسانیخوازانەی خەڵکەکەیە، کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان پلەبەندییە پیشەییەکان تێ دەپەڕێنن. مامۆستایانی زانکۆ و بازرگانان و شۆفێران و کرێکاران بە یەکسانی بەریەک دەکەون، هاوسەرگیری لەسەر بنەمای ڕێزگرتن و خۆشەویستی یەکتر باوە و گوێ بە جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکان نادرێ لەسەر بنەمایی چینایەتی، مامۆستایانی زانکۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەن بێ سەیرکردنی هاوپیشەیی یان دۆخی مادی یان تەنانەت ئەوانەی بێکارن، ئەم ئاستە لە یەکگرتنی کۆمەڵایەتی جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەوەی شایەتی بووم.

شارەکە بە ڕۆحێ کراوە ڕێگەی داوە بە هەموو جۆرە چالاکییە سیاسی، ڕێکخراوەیی، ئایینی و کلتوری و هەروەها لە وەڵامی ڕووداوە ناوخۆیی و جیهانییەکان کۆبوونەوە و تەنانەت خۆپیشاندان بە شێوەیەکی ئاشتیانە بەڕێوە دەچێت کە ئەمە لە زۆر شوێن بەم شێوازە ئاسان و ئاسایی ئەنجام نادرێت.

یەکێ لەو چالاکییە وەرزشییانەی کە لێرەدا هەیە تۆپی پێیە، تۆپی پێ بە ئاستێکی بەرز خولیای هەموانە وەک ئەوەی لە وڵاتانی وەک بەڕازیل و ئیسپانیادا هەیە، یاریگاکانی تۆپی پێی گەڕەکەکان شانەیەکی بەردەوامی چالاکییەکانن و یاریزانانی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە پێکەوە خۆشەویستی خۆیان بۆ یارییەکە هاوبەش دەکەن، ململانێیەکی زۆر سەیر لە نێوان هەوادارانی یانە بەناوبانگە جیهان لە کەلاردا هەیە کە



شەقام و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەهەژێنێت بە ئاستێک کە تەسەوڕ ناکەم لە خودی ئەو وڵاتانە بەو شێوە گشتگیر بێت.

یەکێک لە نەریتە سەرنجڕاکێشەکانی کەلار و گەرمیان بریتییە لە دروست کردنی کونجی و خورما لە شەوانی زستاندا، ئەم چالاکییە کە پڕە لە جەنجاڵی و گەرمی، وەک ڕێگەیەکە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی خێزانی و پاراستنی خۆشەویستی لەناو خێزانەکاندا، سەرەڕای ئەوەش، خواردنێکی ناسک و جیاوازی ناوخۆیی بریتییە لە دۆمەڵان، لە ژێر زەویدا لە کۆتایی زستان و سەرەتای بەهاردا دروست دەبێت، ئەم خواردنە دەگمەن و تێچووی زۆرە کە هاوشێوەی قارچکە، بە چەندین تایبەتمەندی سوودبەخش ناسراوە. هیچ لەو دوانە لە خنوری سنە و لێلاخدا نییە.

سەرنجی شتێکی ترم داوە لەناو شاردا دەسبڕی و دزی زۆر کەم و دەگمەنە، لێرەدا ئەتوانیت بە بێ خەم سەیارەکەت جێبێڵی گەر جامەکەشی کراوەبێت و پارە و موبایلیشی تێدا بێت، هەروەها دەرگای ماڵەکان زۆربەی جار کراوەن یان تەلێکی پێوەیە کە دەرگاکە دەکرێتەوە بۆ من ئەمە نامۆترین شتێک بوو کە لە هیچ شوێنێک نەمدیوە.

زۆرجار سەیر دەکەی لە زۆر شوێنا نەماوە ئەو شێوازە کارکردن بە قست و قەرز کە دوکاندار تەنیا لەسەر متمانە بە کەسەکە بەبێ چەک و هیچ دڵنیاییەکی ڕەسمی دوکاندار شت بە قەرز بدات بە خەڵک و خەڵکیش بە کاتی خۆی پارە بگەڕێننەوە، ئەو شێوازە متمانە کە لەناو خەڵکەکە هەیە زۆر شتێکی جوانە یەکێک لە گرینگترین فاکتەرەکانە لە بەرەو پێشچونی ئەم شارە بە ئارامی و ئاسودەیی و هەست نەکردن بە کێشە ئابوریەکان وەک ئەوەی لە شارەکانی تر هەیە.

ئێستا كەلار لەچاو دوانزە ساڵ پێش ئیستا گەشەیەكی باشی لەڕووی ئاوەدانیەوە بەخۆیەوە بینیوە زیادبونی ڕوبەری شوێنی نیشتەجێبوون و پرۆژەی بیناسازی و جادە و دوساید و فروانكردنی سەوزایی و دروستكردنی شوێنە حكومی و تایبەتەكان، هەم نەخۆشخانە هەم پەیمانگا و... هتد، لەچاو شوێنەكانی تر وەك گەشەكردنێك كە بەخۆیەوە بینیویەتی، بەتایبەتی لە شەش ساڵی ڕابردوودا، گەشەی ئاوەدانی و بیناسازی شاری كەلار خێراییەكی زۆری بڕیووە وە ئەمە لایەنی باشی و خراپیی خۆی هەیە، بەڵام ئەبێ گەشبینانە سەیری بكەین، ئێمەش وەك مامۆستایانی زانكۆ و كەسانی ئەكادیمی و خوێندەوار هەوڵ بدەین كە لەڕووی كلتوری، زانستی، تەكنەلۆجیایی و مەعریفیشەوە گەشەی خۆمان و كۆمەڵگەكەمان خێراتر بكەین و بیگەیەنینە ئەو ئاستەی كە لە گەشەسەندنی ڕوبەر و ڕواڵەتدا هەیە.

پەیوەست بە زانكۆوە شتێك كە سەرنجم داوە و دەمەوێ ئاماژەی پێ بدەم، زانكۆ وەك هەر دەزگایەكی تر ئەتوانێ گەشەیەكی باش بە كۆمەڵگا بدات، بەڵام ئەوەی دیومە تا ئێستا كۆمەڵگە و شەقام كاریگەرییان زۆر زیاترە لەسەر زانكۆ تا ئەوەی زانكۆ كاریگەریی هەبێت لەسەر شەقام، ئەمەیش ئەتوانێت وەكو هەلێك بگوازرێتەوە بۆ سوود بینینی هەردوولا، بۆیە پێشنیار ئەكەم تا ئەوەی بازاڕ و كەرتی تایبەت بۆ چارەسەری كێشە و گرفتە پیشەییەكانیان، هەروەها بۆ جێ بە جێكردنی ئیش و كاروباری خۆیان ڕوو لە مامۆستایان و خوێندكارانی زانكۆ بكەن هەم وەكو توێژەر هەم وەكو هێز و سەرچاوەی مرۆیی، هەروەها، زانكۆ زیاتر خوێندكاری دەرەوەی كەلار و تەنانەت دەرەوەی وڵات وەربگرێت، تەنانەت مامۆستایانی زانكۆی خەڵكی شارە دورەكان هەتا دەرەوەی وڵات گرێبەست یاخود تەعیین بكرێت بۆ ئەوەی جیاوازی دورست ببێت لە ئاستی زانستی و كلتوری و هزری، چونكە جیاوازی دەبێتە هۆی ڕەكابەری و پێشكەوتن.

شتێكی تریش هەر دەربارەی زانكۆ ئەوەیە زۆر خوێندكار دەبینی كە خاوەن تواناو بەهرەیەكی تایبەتن و ئەتوانن لە داهاتوودا ببنە كەسێكی سەركەوتوو لە بوارە جیاوازەكاندا، بەڵام ئەبینم خوێندكاری وا هەیە بە كۆنمرەی زۆر بەرز و هێنانی بەشی زۆر باش لە شارە دوورەكان، بەتایبەت بۆ كچەكان هەرچەن بۆ كوڕانیش ئەو دۆخەم بینیوە، لە ماڵەوە ناهێڵن بڕواتە ڕێی دوور، هەر لە كەلار دەمێنێتەوە ئەوكاتە ناچارە بڕواتە بەشێ كە زۆر حەزی لێی نییە وە ئەو توانایە ئەفەوتێ ئەوەیش زۆر دۆخێكی ناخۆشە بەهیوام بكرێت خێزانەكان بهێڵن منداڵەكانیان بڕۆنە شوێنە دوورەكان و لەو بەشانەی كە حەزیان لێیەتی بخوێنن.

بابەتێ تریش گرینگیداتە بە بەشەکانی زانکۆ بەتایبەت بەشە وێژەییەکان کە بیرکردنەوەیەکی وا باوە کە ئەو بەشانە بەکەڵک نایەن، دەبێ دابخرێن ئیتر خوێندکاری بۆ ناچێ کە ئەوە بیرکردنەوەیەکی زۆر هەڵەیە، دەبێ بەشەکانی کارپێکەری بەتایبەت بواری نەوت و ژمێریایی و ئیدارە و بەشە پزیشکییەکان لە زانکۆ بکرێتەوە، بەڵام بەڕاستی کۆمەڵگە زۆر پێویستی بە بەشە وێژەییەکان هەیە لە واقیعدا ئاستی مەعریفی کۆمەڵگە بەرەو پێش ئەبەن پێویستە ئەم بەشانە گەشەی زیاتری پێ بدرێ نەک دابخرێت.

شتێکی سەرنجڕاکێش و گرنگیتر کە لە تایبەتمەندییەکانی خەڵکی گەرمیان و بە تایبەتی شاری کەلارە، ڕۆحی خێرخوازی و کۆکردنەوەی هاوکاری ماددی و پارە... هتد بۆ هەژاران، هەروەها بنیاتنانی مزگەوت و چالاکییە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانە، سەرەڕای ئەوەی کە ساڵانە بڕە پارەیەکی باش لە کەلاردا بۆ خستنە خزمەتی ئەو بابەتانەی ئامارژەم پێ کرد خەرج دەکرێت، بڕێکی زۆریش پارە کۆ دەبێتەوە بە هۆی نەبونی سیستمێکی خوێندنەوە بۆ کراو، بە ناچار تەنها لە کەرتی خزمەتگوزارییە ئایینییەکاندا خەرج دەکرێت، لە کاتێکدا لەگەڵ پێویستی ئەو کەرتە بەو پاڵپشتە داراییانە، کەرتی زۆریتریش وەکو دوروست کردنی کارگە و قوتابخانە و ئەنجامدانی پڕۆژەی زانستی و توێژینەوەی زانستی، هەروەها یارمەتیدانی خوێندکارانی بنەماڵە هەژارەکان بۆ تەواوکردنی خوێندنیان زۆر بە پێویست دەزانم، بۆیە دەکرێت لەلایەن بەرپرسان و خەڵکانی جێ متمانە و خۆشناوی شارەکە پارەی خێرخوازی بە شێوەیەکی باش بە سەر چەندین جۆر کەرتی جیاوازیتریش بڵاو ببێتەوە.

شتێکیتر کە لەم شارەدا جێی دڵخۆشیی زیاترە ئەوەیە کە خەڵک بەچاوی کەمەوە سەیری هیچ پیشەیەک ناکەن بۆیە ئیشکردن لەم شارەدا ئاسانترە سەرەڕایی ئەوەی دامەزراندنیش نەبێت خوێندکار هەیە کە عارەبانەی پێیەو ئیش دەکات یان لە فرۆشگایەک ئیش ئەکات هیچ خۆی بە کەم نازانێت ڕێزێکی باشیی کۆمەڵایەتیی لێ ئەگیرێت وە ئەمەیش لایەنێکی زۆر زۆر باشە، بۆیە ئەو هەستە زیندوییەی لە دەرونی گەنجانا ئەبێ هەست پێ بکرێت تا ڕادەیەکی باش ماوەتەوە لەم قەیرانەی کە ڕوبەڕوی هەرێم بۆتەوە لە زۆر لە شارەکانی ترا گەنجان بەتایبەتی خوێندکارانی زانکۆ توشی خەمۆکی ئەکات، لەبەر ئەوەی کە ئیشیان دەسناکەوێ یا کە ئەگەر ئیشیان دەسکەوێ لەو ئیشەیا هەست بە کەمیەک ئەکەن هەستەکەن ئیشەکە لە ئاستی ئەوانا نیە یان ڕێزێکی وەک پێویست لە ئاستی کەسایەتی وەک خاوەن بڕوانامەیەک ناگیردرێت، بەڵام لەم شارە وا نیە هەمووکەسێ ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە بەدەر لەهەر ئیش و بڕوانامەیەک کە ئەمە

شتێکی باشە لەم شارە بەدی ئەکرێت، هەرچەن تا ڕادەیەک خەمۆکیەک ئەبینین لەناو خوێندکارەکانا بە نمونە خراپی دۆخی مادی وائەکا نەتوانن ئاسان پرۆسەی هاوسەرگیری پێک بێنن یان کچان بەتایبەت کە دوای تەواوکردنی زانکۆ ناتوانن زۆر ڕێگەیان پێ نادرێ کە وەک جاران تێکەڵی کۆمەڵگە بن یا ئاسان بێنە دەرەوە و لە چالاکییە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتی، هونەری، وەرزشی و ئەکادیمیەکاندا بەشدار بن، داوا دەکەم هیچ نەبێت بنەماڵەکان بواری زیاتر بە کچان بدەن کە ئیش بکەن لە دەرەوە یان بەشداری چالاکیان ببێت لە پرسە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەکەیان.

لە کۆتاییدا، پاش دوانزە ساڵ کە لە شاری کەلارم ئەوەندە تێکەڵاویی خەڵکی ئەم شارە بووم، هۆگری ئەم شارە بووم، ئەوەندە لایەنە چاکیەکانی ئەم شارە زۆرە کە چیتر خۆم بە خەڵکی ئەم شارە ئەزانم بە میوانی سەردانی زێدی خۆم ئەکەم تەنانەت لەوێش بنەماڵە و کەس و کارم زۆر جار پێم دەڵێن هەروەک میوانێ سەیرت ئەکەین کە دێیتەوە بۆ سەردانێکی سنە و دێگولان و دەگەڕێیتەوە بۆ گەرمیان و کەلار، گەرمیان و کەلاریش وەک ئەندامێ لە خەڵکی ئەم شارە منی لە ئامێز گرتووە وە زۆر دڵخۆشم بەمە، منیش تا پێم بکرێت خزمەتم کردوەو خزمەتی دەکەم، هەستم کردوە و هەست ئەکەم کە کەلار شاری خۆمە.



د. حەسەن جاف

# ڕەزا بەگی فەتاح بەگی

## حەمە پاشای جاف

## کەسایەتیەکی خوێندەوارو و ژیری بنەماڵەی بەگزادەکانی جاف کە کەم خراوەتە بەر باس

ڕەزا بەگ لە ساڵی ١٨٨٦ ی زایینیدا کاتێ کە عێلەکەی کۆچەری بوونە لە مەریوان لە دایک بووە (١)، مرۆڤێکی هۆشیار و ڕەوشت بەرز و زیرەک بووە پابەندی ئایینی ئیسلام و لەخوا ترس بووە، چوار زمانی زانیوە، فارسی، تورکی، عەرەبی، کوردی، ڕەزا بەگ خۆشنووسێکی زبر دەست و بەتوانا بووە، کاتێ کەریم بەگی فەتاح بەگی برا گەورەی کە کتێبی تەئریخی جافی نووسیوە داویەتیە ڕەزا بەگ کە پاک نووسی کات، ئەویش بە خەتێکی جوان نوسیویەتیەوەو لەم قۆناغەدا کتێبی تەئریخی جاف کە کەریم بەگ داناوە سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکییە بۆ هەر مێژوو نووسەرێک دەربارەی عێلی جاف بنووسێت و زانیاریەکی ڕاست بەدەست بهێنێ (٢).

خوالێخۆش بێت حەمە سەعید بەگی حەمە بەگی جاف کە نووسەرێکی ناسراوە , گێڕایەوە کە ڕەزا بەگ ڕۆمانی کەمانجە ژەنی لە فارسیەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی پێش مەحوی و پیرەمێردی نەمر.

ئینگلیزەکان دوای داگیرکردنی عێراق لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ١٩١٤-١٩١٨ بۆ

---

١ - دایکی ڕەزا بەگی فەتاح بەگ ناوی پیرۆز خانمە کە دەکاتە خوشکی ئەو ڕەحمان ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی بلباس، ئەو ڕەحمان باوکی حەمە ئاغایە, پیرۆز خانم دەبێتە پوری حەمە ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا، خوا لێخۆشبێت حەمە ئاغا باوکی شاسوار ئاغا نعمەت خانم و نازدار خانم و کاک سالار ئاغاو سەردار ئاغایە نازدار خانم هاوسەری مەرحومی ئیدریس بارزانی و دایکی ڕێزدار نێچیروان بارزانیە.

٢ - تەئریخی جاف، د. حەسەن جاف، لێکۆڵینەوەی بۆ نووسیوە، ساڵی ١٩٩٥ز، لە بەغدا بەچاپ گەیشتووە.

بەڕێوەبردنی كاروباری ناوچەكانی وڵاتی دوو ڕووبار لەهەر ناوەندی لیوایەكەدا ئەفسەرێكی سیاسی یان دادەنا كە لە ئەفسەرانی سوپا بوون، هەندێ لە مێژوو نووسان دەستەواژەی ئەفسەری سیاسییان لا پەسەندتر بوو لە حاكمی سیاسی چونكە لە ئینگلیزیدا بە (Poltical officer) هاتووە (١)، لەكۆتاییەكانی جەنگ لە ٢٦ ی تشرینی یەكەمی ١٩١٨ ولسن جێگری حاكمی گشتی ئینگلیز لە عێراق (مێجەر نوئیل) ی بە حاكمی سیاسی ناوچەی لیوای كەركوك دامەزراند ئەو ناوچەیە نێوانی زێی گەورە و ڕووباری سیراون كە ناوچەی كەركوك بوو ئەگرتەوە (٢)، پیلانەكانی نوئێل لە هەنگاوی یەكەمدا لە ساڵی ١٩١٩ دامەزراندنی ئەنجومەنێكی كارگێڕی بوو لە كەركوكدا ئەركی ئەو ئەنجومەنە هاوكاری فەرمانڕەوایانی سیاسی بەریتانیا بوو لە ناوچەكەدا، ئەنجومەنەكە لە (١٢) ئەندام پێك هاتبوو بەم شێوەیەوە بوو (٦) ئەندامی نوێنەری كورد بوون (٣) ئەندامی نوێنەری توركمان بوون، عەرەب و مەسیحی و جوولەكە هەریەك تەنها (١) ئەندام نوێنەریان هەبوو، لەو شەش نوێنەرەی كورد سێ نوێنەریان خەڵكی ناوچەی كفری بوون، كە بریتی بوون لە (جەمیل بەگی بابان دانیشتوی كنگربان و سەید عومەر ئاغا دانیشتوی كفری وە ڕەزا بەگی فەتاح بەگی جاف دانیشتوی كەلار بوو (٣)، وەكو حەمە سەعید جاف برازای ڕەزا بەگ دەیگێڕاوە ئینگلیزەكان دەیانویست ڕەزا بەگ بكەنە قایمقامی كفری , بەڵام ڕەزا بەگ لەبەر خراپی باری تەندرووستی خۆی ئەو پلەیەی ڕەت كردبووەوە، ئەوەبوو خالدی كوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە یەكەمین قایمقامی شاری كفری دەستنیشان كرا.

ڕەزا بەگ لەسەرەتای لاویدا ڕاوچیەكی بەتوانا بووە، تەنانەت لە ساڵی ١٩٣٨ كاتێ مێجەر ئەدمۆنس فەرمانڕەوای سلێمانی ئینگلیز بۆ دیدەنی كەریم بەگی سەرۆكی عێلی جاف دێتە كەلار بەگزادەكان پێشوازییەكی گەرمی لێدەكەن، وێنەی ئەو پێشوازییە لە قەڵای شێروانەدا، بەدی دەكرێ.

---

١ - عومەر عەلی شەریف، لەیاد نامەی كەركوك و گەرمیانەوە، چاپخانەی ئارابخا كەركوك، ٢٠٠٦، ل٨٦.

٢ - میجەر نوئێل E.W.Noel ، ناوی تەواوی (ئەدوارد ولیام نوئێل)ە، یەكێك بووە لە ئەفسەرە سیاسیەكانی ئینگلیز، ماوەیەك بەر لە جەنگی یەكەمی جیهانی لە ئێران كاری كردووەو زمانی فارسی و كوردی زانیوە، لە دەورانی یەكەم حكومەتی شێخ مەحموودی حەفید لە یەكی كانوونی دووەمی ١٩١٩ ڕوی كردوەتە ڕەواندوز بۆ ئەوەی ئەو ناوچەیە بخاتە ژێر حوكمداری شێخ مەحمود، دوای چەند هەفتەیەك گەڕایەوە، كاتێك ئینگلیز لە بەڵێنەكانی بەهۆی چەندین هۆیەوە پاشگەز بووەوە، نەخشەی سیاسەتی خۆی لە كوردستان گۆڕی، بە بڕیاری وڵسن Wilson مێجەر سۆن خرایە جێگای و حسێن احمد جاف، حسێن عوسمان نێرگزەجاڕی، بەغدا ١٩٨٤، ل٧، و. سدیق ساڵح سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٥.

٣ - د. حوسین ئیسماعیل خان دەلۆ، ناوچەی كفری لە نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٤٥ كەركوك ٢٠١٠ ، ل٥٥، هەروەها كامل ساڵەیی، موجز فی تأریخ كركوك، كركوك، ٢٠٠٥، ل١٥.



ئەدمونس زۆر حەزی لە راو کردووە، کەریم بەگ و ڕەزا بەگ بەرنامەیەکی ڕاوی بۆ دەڕەخسێنن، ئەدمونس کێبڕکێیەک لە نێوان ڕاوچییەکاندا دەهێنێتە کایەوە، بەراوچییەکان دەڵێ هەر کامێکتان توانیتان دوو (زرەپوور) ڕاو بکەن ئەم تفەنگە (B-S) بی ئیسەمی خەڵات دەکەم لەگەڵ پاکەتێک فیشەکی ڕاویدا، بۆ زانیاریتان زرە پور بە عەموودی هەڵدەفڕێ کوشتنی زۆر گرانە و زۆر تیژ ترە لە هەڵفرینیدا لە پۆری ئاسایی، ڕەزا بەگ لەو کێبڕکێیەدا دوو زرە پوور دەکوژێ و براوە دەبێت و خەڵاتەکە دەباتەوە، لە وێنەکەیدا کە ڕەزا بەگ لەگەڵ براکانی گرتوویەتی کە ئەدمونس ئەو وێنەیەی گرتووە، ڕەزا بەگ ئەو تفەنگەی بەدەستەوەیە ئەو تفەنگە ماوەیەک لای مەحمود بەگی ڕەزا بەگ بوون ماوەیەکیش لای مامۆستا محەمەدی کوڕی سەرئەنجام لەلایەن میری یەوە داگیرکراو برا.

ڕەزا بەگ مرۆڤێکی ئەمین و ڕاستگۆ بووە وە کەسانی ڕاستگۆ و ئەمینی خۆشویستووە، ئەم ڕووداوە کە دەیگێڕنەوە بەڵگەی ئەمانەتی ئەوو خوالێخۆش بوو حەمە ڕەشیدی خەیات دەنوێنێ، بێگومان پاڵەوانی ئەم ڕووداوە حەمە ڕەشیدی خەیاتە، کە ئەو کاتە شاگردی وەستاساڵحی خەیات بووە، کە ڕەزا بەگ لەلای کەواو سەڵتەی جل و بەرگی حەمە ڕەشیدی وەستا زۆرابیش لەو قۆناغەدا هاوکار و شاگردی وەستا ساڵح بووە، ڕەزا بەگ دەڕوات بۆ دوکانەکەی وەستا ساڵحی خەیات بۆ پەراوی کەوا و سەڵتەکەی لەهەمان کاتدا حەمە ڕەشید دێتە دوکانەوە و کیسەیەکی بەدەستەوە دەبێ لێی دەپرسن ئەم کیسەیە چیە بەدەستەوە دەڵێ ئەم کیسەیەم لە ڕێگادا دۆزیەوە کاتێ کیسەکە دەکەنەوە سەیر دەکەن حەوت لیرەی تێدیە وتوبیان دەتزانی کیسەکە پارەی تێدایە؟ وتی بەڵێ زانیم ,




العـــدد ١٨٠٠

دفتر النفوس

ان ............ بن ............

لكونه حائز على الجنسية العراقية وسجل في سجل النفوس قد اعطي له هذا الدفتر في ١٩٤٠/٩/١ سنة ١٩

بەڵام ویستم لەبەردەم وەستا ساڵح دا بیكەمەوە و بۆ خاوەنەكەی بیگێڕمەوە، ڕەزا بەگ لە ئەمانەت و دینداری حەمە ڕەشید سەرسام دەبێت و لە حەمە ڕەشید دەپرسێ خۆ تۆ دەتوانی بێ ئەوەی كەس بزانێ كیسەكەت ببردایە، وتوبووی ڕەزا بەگ ڕاست دەفەرمووی , بەڵام خوای گەورە پێمی دەزانی كەمن ئەو كیسە پارەیەم دزیوەو نەم داوەتەوە خاوەنەكەی.

ڕەزا بەگ پێی ووتبوو ئافەرین بۆ ئەمانەت و دینداریت هەر ئێستا لە میكروفۆنی مزگەوتەوە بڵاوی بكەنەوە كە كیسەیەك دۆزراوەتەوە هەر كەسێ خاوەنیەتی بۆ دوكانی وەستا ساڵح بەرگدروو بەم ناونیشانە بێت، دوای بانگەوازەكە سەیر ئەكەن كابرایەكی ڕووتەل پەیدا ئەبێت بە ڕەزا بەگ دەڵێ قوربان من لە بناری جافەوە هاتووم بۆ حەیوان سەندن ئەو كیسەیەم لێ وون بووە، ڕەزا بەگ پرسیاری لێ دەكات ئەو كیسەیە چی تێدایە ئەڵێ قوربان (٧) حەوت لیرەی تێدایە، ڕەزا بەگ دەڵێ كەواتە ئەم كیسەیە هی تۆیە، كە كیسەكەی دەدەنە دەست ئەبا لیرەیەك بداتە حەمە ڕەشیدی وەستا زۆراب،

حەمە ڕەشید دەڵێت كاكە من دەمتوانی هەر حەوت لیرەكەم ببردایە بێ ئەوەی كەس بزانێ لە ترسی خودا ئەو كارەم نەكرد، لیرەیەكی تۆ من دەوڵەمەند ناكات بێگومان تۆ ئەو پەڕی نیازت بەو لیرەیە هەیە كە دەتەوێ بیدەیتە من بڕۆ خوات لەگەڵ، دوای ئەم ڕوداوە حەمە ڕەشیدی وەستا زۆراب دەبێتە باوەڕپێكراو و موعتەمەدی بنەماڵەی بەگزادەكانی جاف بەتایبەتی ڕەزا بەگ و ئەم دۆستایەتی و خۆشەویستیە لە نێوان حەمە ڕەشید و بەگزادەكانی جافدا شۆڕ بووەوە بۆ مناڵەكان و تا ئەم قۆناغەیش هەر بەردەوامە.

ڕەزا بەگ لە سی یەكاندا گورگێكی هار رووی كردە كەلار ئەویش بۆ نوێژی بەیانی بەرەو مزگەوت دەڕۆیشت گورگەكە (١)، پەلاماری ڕەزا بەگ و چەند نوێژكەرێكی تریدابوو بە سەختی زامداریانی كردبوو، ڕەزا بەگیان بە پەلە گەیاندبووە بەغدا، چل ڕۆژ لە بیمارستاندا دەمێنێتەوە و چل دەرزی دژە هاری لێ دەدەن و خاس دەبێتەوە، بەلام ئەو ڕووداوە كاریگەریەكی نەرێنی بەسەر تەندرووستییەوە جێدەهێلێ.

ڕەزا بەگ (٢)، لە تافی پیاوەتیدا ساڵی ١٩٤٣ لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا كۆچی دوایی كردووەو لە شارۆچكەی قەزرەبات بەنەخۆشیەكی سەخت دوای خوێن هەڵهاوردنەوە وەفات دەكات و لە مزگەوتی مەحموود پاشای مامی بەخاك ئەسپێردرێ و ڕۆحی شاد.

١ - ئەم گورگە ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ فەرەنجییەكی كردبوە بەر بە قەمەیەك كوشتبووی.

٢ - ڕەزا بەگ دوو جار هاوسەرگیری كردووە، یەكەمیان فەهیمە خانمی كەیخوسرەو بەگی مەحموود پاشای جاف كە دەبێتە دایكی ئەم زاتانە: خالد بەگ، ئامینە خانم، مەحموود بەگ، عەفیفە خانم، عەلی بەگ، حەپسە خانم، خێزانی دووەمی مەحبوبە خانمی سەلیم بەگ بووە كە لە بەگزادەكانی وەلەدبەگییە لەویش ئەم زاتانەی لێبووە: ڕەعنا خانم، جەمیل بەگ، خەدیجە خانم، نهایەت خانم، قادر بەگ، ثریا خانم، پەروین خانم، بارام بەگ، لە ئێستادا دوو منداڵی ماوەتەوە، پەروین و ثریا.



م. عەلی

# کاکە حەمەی وەلی لە چەند وێستگەیەکدا

* کـەم کـەس هەیـە ناوبانگـی کاکـە حەمـەی وەلـی نەبیسـتبێ، تەنیـا کەڵـە مرۆڤـەکان ناوبانـگ دەردەکـەن، ئەوانـەی ناویـان دەچێتـە تۆمـاری مێـژووەوە، هەمـوو کەسـێک ناوبانـگ دەرنـاکات، کـە ناوبانگیشـی پەیداکـرد مـەرج نییـە گـەورە بـێ، کاکـە حەمـەی وەلـی لـە کەسـە هەڵکەوتووەکانـی گەرمیـان و کوردسـتانە، لەگـەڵ بزاڤـی کوردایەتییـدا ناوبانگـی بڵاوبوویـەوە.

* هەرچەنـدە نەخوێنـدەوار بـوو، تێکەڵـی سیاسـەت بـوو، ئـەو لەحیزبایەتییـەوە دەستیپێکرد، ئـەو دەمـە کەوتـە نـاو ململانێـی نێـوان نەتەوەیـی و نانەتەوەیـی، ئازاریشـیاندا، زیندانییـش کـرا، هـەر سـووربوو لەسـەر هەڵوێسـتەکانی خـۆی.

* کـە باسوخواسـی شۆڕشـی بەرگـوێ دەکـەوێ رووەدەکاتـە شـاخ و تفەنگەکـەی بـۆ ڕزگاریـی کـورد هەڵدەگـرێ، پیاوێکـی کەڵەگەتـی جوانخـاس، کـە ڕەزن و فیشـەکلغەکەی لـە خـۆی دەبەسـت و بڕنـەوە حەقدەکـەی دەکـردە شـانی پتـر دەکەوتـە بـەردڵان.

* تـا نەبـووە پێشـمەرگە نەیزانـی لـە هـەردە و هەڵەتەکانـی شۆڕشـدا چـی دەگـوزەرێ، لـەوێ هەسـت بـە ناتەباییـەک لـە دیـد و بۆچوونەکانـدا دەکات، ناکۆکییەکانـی سـەرکردایەتی لاشـەی شۆڕشـی تەنیبـوو، بیـری جیـاواز، دیـدی ناکـۆک، هەڵوێسـتی دژیـەک وەکـو ئاگـر لـە پـووش دەکـەوت، دوو بـاڵ دەرکەوتـن کـە دانوویـان بەیەکـەوە نەدەکـوڵا، دەیزانـی دۆخەکـە بـەلای میـل هێنانـەوەی چەکەکانـدا ڕایدەکێشـێ، هەرگیزیـش نەتوانـرا ئـەو بـارە

لارە ڕاستبكرێتەوە تا بە لێكترازان گەیشت، ئەمەش سەدانی وەكو كاكە حەمەی دڵتەنگ كرد.

* كەس نییە شەڕی پێخۆشبێ، بەڵام كار گەیشتە ئەوەی تەنیا ئاسۆی بەرژەوەندییەكان ببینرێ، ئیتر تفەنگەكان دەشریخێنن، گولەكان جەستە ماندووەكان دەسمن، گۆمی خوێن هاژەی دێ، لەشەڕدا ژیان نامێنێ تەنیا مردن بۆ قۆستنەوەی ڕۆحەكان دێ، مرۆڤەكان لەتەنوورەكەیدا دەسووتێن، كاكە حەمە لەبەرخۆییەوە دەڵێ: ئاخۆ ئەمانە بۆ سێرەیان لەیەكترگرتووە؟ كە هیچ وەڵامێكی دڵپەسەندی چنگ ناكەوێ، نایەوێ ببێتە بەشێك لەو مێژووە ئازاراوییە، ئەو دژی شەڕی یەكتركوژیی و لێكترازان وەستایەوە، ئەگەر سیاسییەكان گەشبینانە بیانڕوانیبایە كێشەكان و بیانزانیبایە چۆن یەكتر قبوڵدەكەن ئەوە لە دۆزەخی شەڕ دووردەكەوتنەوە، بەڵام تێنەگەیشتنەكان سەختبوو، دەستی دەرەكیش دەمارەكانی كرژكردبوو، نەدەویسترا گرێكوێرەكان بكرێنەوە، ئەو كەسێكی هەست ناسك بوو، هەرگیز نەیدەویست كوردێك لوولەی تفەنگەكەی لە براكەی بكات، نەفرەتی لەو فیشەكانە دەكرد بەرانبەر یەكتریی دەتەقێنران، ئەم دۆخە بۆ كاكە حەمە نەچووە سەر، ناچار ماڵاوایی لە هاوڕێكانی كرد، بەڵام سەنگەری پەیوەندیی چۆڵنەكرد، چونكە شۆڕش و خەبات بۆ ئەو مەسەلەی مان و نەمان بوو.

* شكستی شۆڕشی ئەیلول ڕۆحی ئەوی لوولدا، لەچاو ترووكانێكا هەموو شت بوو بە ڕابردوو، هێز هەرەسیهێنا، لوولەی تفەنگ خواركرا، بەیەكجار كورد پەشۆكا، خەمێكی گەورەی دایە كاكە حەمە، ئەو دەیزانی گەر كورد بێدەنگبێ و نەجووڵێ دوژمن دەیهاڕێ! كە لەنزیكەوە ئاگای لە پلانە ڕەشەكانی بەعس بوو، كە تەڵەی مەترسیداری بۆ پاشەڕۆژی كورد دادەنا، گەرەكی بوو هەستی نیشتمانپەروەریی لەڕەگوڕیشەوە هەڵكەنێ، جگە لە ئوممەی عەرەبی كەس لەعێراقدا بەپێوە نەمێنێ.

* كە شۆڕشی نوێ هەڵایسا هەموو نەخشەكانی بەعس كاڵبوونەوە، لە ناخی كاكە حەمەشدا كانیاوێكی سازگار تەقییەوە، وەكو گوڵێكی ژاكاو بووژایەوە، لەكەناڵێكەوە لەگەڵ هەنگاوەكانی شۆڕشدا پەیوەستبوو، ئەوە ڕۆژێكی بەهاریی بوو لەژیانیدا هەستی بە زیندووبوونەوەی سەرلەنوێی گیانی كوردایەتی دەكرد، دەیوت: كورد گەلێكی بێناسنامەیە دەبێ دیواری مێژووەكەی بە قوربانیدان ڕەنگین بكرێ، ئەگەر ئەو چوار تفەنگە بەشاخەوە نەبن، ئەگەر لەشاردا ئێمە پشتیوان نەبین تیادەچین!



* لەئەنفالدا کورد کۆستی گەورەی کەوت، بە بەرچاوی جیهانەوە بەناوی ئایینەوە کورد بۆ توونی مەرگ برا، نەک قۆشەنی بەعس بەڵکو ئۆردووی جاشی کورد لەسەر لاشەی شۆڕش هەڵدەپەڕین، مژدانەیان بە سەرۆکە خوێنرێژەکەی عروبە دەدا، ئەو تاوانە چەندە گوناهی ڕژێمی بەعس بوو ئەوەندەش کورد ڕۆڵی تیا دەبینی، کوردپەروەرانی وەکو کاکە حەمەش کە لەوبەر قەقرەبڕێژی تاوانەدا لەحەیبەتا دەکوڵان و حەجمانیان نەمابوو، لەمێشکیاندا پلانێکی نوێیان بۆ بەرەنگاربوونەوە دادەڕشت.

* ئەو ڕۆژەی کاکە حەمە بیستی پارتیزانەکان مەتەڕێزیان چۆڵ نەکردووە دەلاقە تیرێژێک لەڕۆحیدا کرایەوە، ئۆخژنێکی ئاسوودەیی پیاهاتەوە، ئەو نائومێدییەی بەسەر دڵ و دەروونیەوە پەپکەیکردبوو ڕەوییەوە، دەیزانی ئیتر سوپای دوژمن ناحەوێنەوە، هەمیشە لە گورزی پێشمەرگە دەتۆقن، ئیتر کاکە حەمە بە ئەرکی دەبینی لەشاردا وەکو پارتیزان کۆڵەپشتی خەمخۆریی هەڵبگرێ و لەو کایەدا پشکێکی هەبێ.

* ئەگەر دەوروبەری دەواجینەکەی کاکە حەمە بپشکنرێ شوێن پێی پارتیزانە ماندوونەناسەکان دەدۆزرێتەوە، بۆنی تکەی ئارەقەی ناوچەوانیان دەکرێ، هەستدەکرێ ئەو دار و دیوارە بێزمانانە مێژوویەکیان ڕازاندووەتەوە، کە دێرەکانی بە پەرەمووچی دەستی پێشمەرگەکان ڕەنگین کراوە و پەراوێزەکانی بە هەڵویستیی کاکە حەمە و حەسەنی برای و عوسمانی باوەنوور و حسێنی ئایش و مام زۆراب نەخشێنراوە، ئەوانە بە بێدەنگیی تاڵە جوانەکانی خۆبەختکردنیان دەچنی، دار و دیواری زیندانەکان گەواهیی چاونەترسییان بۆ دەدەن..



* تا لەناکاوێکدا لەگەڵ هاورێکانیدا کەوتنە تۆڕی پیلانێکی دەزگا تۆقێنەرەکەی ئەمنەوە، لەزیندانیشدا بەرەنگاری مەرگ بوونەوە، دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر دەروویەکیان لێکرایەوە و دەرگای زیندانیان بۆ ئاوەڵابوو، ئەو ڕۆژە چی بەختەوەرییەکی کەسوکاریان بوو ئەو کۆمەڵە مرۆڤە مەردە ئازادکران، کەچی ئەوان بۆ سەیید محەممەد و حاجی سیروان دڵتەنگبوون کە بە پەتی قەنارەی بەعسدا دلێرانە هەڵزنابوون، کاکە حەمە تا سەرینایەوە بەردەوام ئاڵهای چارەنووسی سەیید محەممەد و حاجی سیروانی دەکرد.

* کاکە حەمە بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیوەتەوە، پشکی خۆی لەپێشمەرگایەتییدا گێڕاوەتەوە، هەرچەند لەباسەکانیدا ڕەق و توندبوو، دڵنیام دەیان سەربوردە و بیرەوەری تری مابوو بەلایانا بچێتەوە، بۆ ئەویکی نەخوێنەوار ئەوپەڕی پرکێشیی بوو ئەو ڕۆژگارە تاڵانە لەبیرنەکات کە ژیانی میللەتەکەیەتی.

* کە بیر لە کاکە حەمە دەکەمەوە ڕۆحم لەبەرپێی هەڵوێستەکانیدا هەڵدەقرچێ، ئەو لەعەزرەت ناسۆرییەکانی نیشتمان ئۆقرەی نەدەگرت، بەو تەمەنەوە گوێی بە مردن نەدەدا، لە سامانەکەی نەدەترسا، هەمووی دەکردە قوربانی ساتێکی هەناسەیەکی شۆڕش و پێشمەرگە، ئەو ژیانێکی پاک ژیا، ناوبانگێکی بێگەردی هەبوو، تەنانەت مردنەکەشی ڕووسوورانە بوو.

شایانی باسە کاکە حەمەی وەلی، لە گوندی جلەوگیرەی ناوچەی عەللایی خانی کوردستانی ڕۆژهەڵات ساڵی ١٩٣٢ پێی نایەناو کەلاوەکانی ژیانەوە، مەخابن لە ڕێکەوتی ٢٥-١-٢٠٢٤ کۆچی دوایی کرد.



دادوەر. بورهان ئەحمەد مەحموود

# ئەزموونی پارێزەرایەتیی دادوەر د. فەرهاد حاتەم و هەوڵەکانی لە پێناو پەرەپێدانی دەزگای داواکاری گشتی

خەڵکێک هەن بە مردنیان کۆتاییان دێ، یان هەندێک جار نەشمردوون , بەڵام لەبەر ئەوەی لە پەراوێزی ژیاندا دەژین و لە شانۆی ژیان غایبن و لە ئامانجە باڵاکەی ژیان نەگەیشتوون و تەنها بۆبەشە مادی و ئاژەڵیەکی ژیان دەژین حیسابی مردوویان بۆ دەکرێ ، بەڵام خەڵکێکیش کەزۆرکەم و دەگمەنن هاوشێوەی د. حاکم فەرهاد دوای مردنیشیان لەبەر ئەوەی تەنها بۆ خۆیان نەژیاون وخاوەنی پەیام وریسالەیەک بوون ، ژیانیان دوای مردنیشیان بۆ دەیان وسەدان ساڵ درێژەو ئیمتیدادی دەبێ وەک لە فەرموودەی پیغەمبەری ئیسلام ( درودی خوای لەسەر بێت ) هاتووە ((إِذَا مَاتَ ابنُ آدم انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أو عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ )) ئەگەر مرۆڤ مرد ئیتر کردەوەی نامێنێ جگە لە سەدەقەو چاکەیەکی بەردەوام و زانستێک دوای خۆی سوودی لێ ببینرێ و نەوەیەکی ساڵح نزای بۆ بکات . خوالێخۆشبوو حاکم فەرهاد لەبەر ئەوەی پاش مردنی میراتێکی زانستی وئەکادیمی وپاسایی لە نووسین و هەڵویستی جوامێرانە ومەردانە لەبەرگری وپارێزگاری لە مافی مرۆڤ و ماف و موڵکی گشتی و دژایەتی گەندەڵی و گەندەڵکاران وفاسیدان بەجێ هێشتووە ، یەکێکە لە سونبولە جوانەکانی مەیدان و گۆڕپانی دادوەری وداواکاری گشتی و پارێزەرایەتی ، لەو کەسانەیە هەموو خەڵک بە موڵکی خۆیی دەزانی و تەنها موڵک وکەسی خێزان و خانەوادە بەرێزەکەی نەبوو .




د. حاکم فەرهاد ساڵی ١٩٩٦ ی سەدەی ڕابردوو لە دادگای بەرایی کەلار کە جێگاکەی لەسەر جووت سایدی کەلار سلێمانی دەکەوتە بەرانبەر یاریدەرێتی ئاسایشی کەلار و بینایەکی بچکۆلەی مالان بوو وە خوالێخۆشبوو دادوەری بە تواناو بەئەزموون (سالار احمد عبد العزیز) کە دواتر بوو بە جێگری سەرۆکی دادگای پێداچوونەوەی هەرێم ئەو کات دادوەر بوو وەکوو پارێزەرێکی گەنج کە ئەو کات ژمارەیان زۆر کەم بوو کە منیش یەکێک بووم لەو پارێزارانە ، دەستی بەکارو پیشەی پارێزەرایەتی کرد ، بە حوکمی ئەوەی نزیکەی (١٠) ساڵ پێکەوە پارێزەروهاوپیشە بووین وەمن ( ٦) ساڵ پێش ئەو پارێزەر بووم و هەنێک جار پێکەوە و بەهاوبەشی داوامان دەگرت و هەندێک جاریش بەرانبەر کارمان دەکرد ولە ساڵی ( ٢٠٠٢) لە نێو بازاڕی کەلار و لە نزیک مزگەوتی گەورەی کەلار لە شوققەیەکی مامۆستا عوسمانی جامچی لە نهۆمی سەرەوە بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێک نوسینگەی پارێزەرایەتیمان هەبوو پێکەوە ، وە لەنزیکەوە دەمناسی و ئاشنای بووم دەتوانم بۆ مێژوو کۆمەڵە سیفەت و ئاکارێکی خوالێخۆشبوو کە هەندێکی کەسی و هەندێکی بۆ ماوەیی بوون وە لەپارێزەرانی تر تا ڕادەیەکی زۆر جیای دەکردەوە ئامارژە بە گرنگترینیان بکەم :

## ١/ سیقەو متمانەیەکی زۆری بە خۆی هەبوو :

هۆکارەکەشی ئەو گەنجینەو مەخزوونە زانستیە بوو کە هەیبوو لە بواری یاسدا ، هەر ئەمەش وای کردبوو شان بەشانی ئێمەمانان کە چەندین ساڵ پێش ئەو بووین وە ئەزموونمان زیاتر بوو کار بکات و لەبەرانبەرمان داوا بگرێ و سەرکەوتووبێ لە ئیدارە دانی داواکانی دا بێ ئەوەی کەسێک هاوکاری بکات ، بەشێوەیەک هەندێک لە پارێزەران گومانیان دەبرد پارێزەری تری بە ئەزموون لە بەر بەهێزی ئاستی تیانووسەکانی کە پێشکەشی دەکرد بۆی دەنووسێ بەتایبەت ئەو کات تیانووس بە زوبانی عەرەبی بوو وە خوالێخۆشبوو عەرەبی زانێکی زۆر باش بوو لە قسە کردن و دارشتن و نووسیندا .

## ٢/ جدیەت و ئیتقان لە ئەنجامدانی کارەکانی :

کەسێک بوو ماندووبوونی نەدەزانی ، سەرەڕای ئەوەی برا گەورە بوو وە ئەرکێکی قورسی ئیدارە دان و بەڕێوەبردنی کارەکانی باوکی خوالێخۆشبووی کە پیاوێکی دەوڵەمەندی کەلار بوو وەخاوەنی کارگەی بلۆک بوو کە ئەو کات نە خۆش بوو لە سەری بوو ، داواکانی کاردارانی بە ئەمانەت و جدیەت و دڵسۆزیەوە رادەپەڕاند ، بەشێوەیەک پارێزەرەکەی بەرانبەری ماندوو دەکردوو تا کۆتا سات مکووڕ بوو داواکە لەبەرژەوەندی کارداری بباتەوە ، وە دادوەرەکەشی ناچار دەکرد بە گرنگیەوە گوێی بۆ بگرێت وزۆر جار لە رێگای تیانووسەوە دفووعاتەکانی پێشکەش دەکرد و گەر داواکەش لەبەرژەوەندی کارداری نەبوایە داوای پێداچوونەوە یان تێهەڵچوونەوەی پێشکەش دەکرد وسیقەی هەبوو کە داواکە لە بەرژەوەندی خۆی دێتەوە ، بە هۆی ئەم سیفەتەی وە لەبەر ئەوەی بەرگری سەرسەختی لەبریگرتەی دەکرد لە لایەن هەندێک لە خەسمەکانی تووشی هەڕەشەو جارێکیان هەوڵی کوشتنی درا لە رێگای بۆمبێکی دەستیەوە کە تەنها زیانی مادی هەبوو ، دوای ئەوەی رێگای تەرغیب و تەماح لە گەڵی سوودی نەبوو بۆ ئەوەی دەست بەرداری داوای کارداری بێت رێگای تەرهێب وتۆقاندنیان گرتە بەر ، بەڵام ئەو مکووڕ بوو لە بەرگری وداواکردنی مافی بریگرتەی بەردەوام بێت .

## ٣/ پەیام داری وریسالی بوون :

راستە کاری پارێزەر سرووشتی وایە بۆ هەر داوایەک برە پارەیەک وەکوو ماندووبوون لە بریگرتەت وەردەگری ، بەڵام ئەو کەسێک بوو قەناعەتی وابوو مەبادئ وبەهاو قیەم لە سەرووی پارەو ماددەیە ، پارێزەرایەتی لای ئەو پێش ئەوەی پیشەیەک بێت ، قەزای واقیف و پەیام داری بوو ، بۆیە هەموو داوایەکی قبووڵ نەبوو ، یان داوایەک بیزانیایە لە رووی یاساییەوە بنەمای نیەو لاوازە خاوەنەکەی تێدەگەیاند کە پارەی تیادا سەرف

نەکات لە کاتێکدا دەیتوانی پارەکەی لێوەرگرێ و بڵێ داواکات ئەنجامی نەبوو ، وە ئەو هەمیشە لە خزمەتی کەس وکاری ئەنفال وشەهیدانی سەربەرز بە تایبەت کە زۆربەیان لە رووی ماددیەوە کەم دەست بوون بێ بەرانبەر کاری دەکرد و بەردەوام هاوکاری دەکردن .

## ٤/ خاوەنی کتێبخانەو ئەرشیفێکی دەوڵەمەندو گەورە بوو :

خوالێخۆشبوو کتێب دۆست و خوێنەرێکی زۆرباش بوو وە خاوەنی ئەرشیفێکی دەوڵەمەند بوو لە کتێبی یاسایی و سەوابیقی قەزایی و بڕیارو مەبادیئی دادگاکانی پێدا چوونەوەو تێهەڵچوونەوە ، وە لە کاتی پێویست سوودی لێ دەبینی وە بێ ئاگا نەبووە لە تازەترین ئاڕاستەکانی دادگای پێدا چوونەوە ، وەکەسێکی ئەکادیمی و ئەرشیف کارو بڕیارەکانی خۆی و هەر بڕیارێکی جۆری دادگا دەست دەخست و دەیپاراست ، لە کاتی پێشکەش کردنی تیانووس ولائیحەکانی بۆ دادگا پاڵپشت وتەعزیزی دەکرد بەو بڕیارانە و تەسبیبی راو بۆچوونەکانی پێ دەکرد .

## ٥/ پیشەیی بوون لە مامەڵەی لە گەڵ هاوپیشەکانیدا :

لە گەڵ پارێزەرانی هاوپیشەو زەمیلی لە کاتی دادبینی و دادگایی کردن ، پیشەییانەو دوور لە میزاجیەت مامەڵەی دەکرد وشەرمی جگە لە هەق لە کەس نەبوو ، وەلە کاتی دەرچوونی لە هۆڵی دادبینی یان دادگایی وەکوو هاورێیەک مامەڵەی کردووە و هیچ جۆرە بردنەدڵ لەوەی لە ژوورەوە ووتراوەو بەرانبەری کراوە پەرچەکردارو رق وقین وحەساسیەتێکی نەبوو ، جارێکیان بریگرتەیەکی من کە ئافرەت بوو حاکم فەرهادیش بریکاری مێردە تەڵاق دەرەکەی بوو ، وە داواکان لەسەر ئەو مافانەی ژن لە پاش تەڵاق لە سەرد مێردەکەیەتی وەکوو خەرجی رابردوو و عیدەو هتد بوو وە لەبەر ئەوەی ژنە تەڵاق دراوەکە لەبارێکی دەروونی خراپدا بوو وەکوو پەرچە کردار بەرانبەر بە حاکم فەرهاد زۆر بە شێوازێکی ناشیرین رەفتاری نواندو قسەی نابەجێی کرد بە شێوەیەک دادوەرەکەی توورەکردو دەری کردە دەرەوە ، بەڵام د: فەرهاد زۆر بە سنگ فراوانی هەڵسوکەوتی کردو لە زەردەخەنەیەک زیاتر بەرچەکرداری نەبوو .

## ٦/ خەم خۆری وهەستی بەرپرسیارێتی :

د: فەرهاد لەسەردەمی پارێزەرایەتی تەنها لە خەمی خۆی نەبوو ، ئەو بەردەوام لە خەمی دەوروبەری بوو وە هەوڵی دەستەبەری مافەکانیانی دەدا ، بۆیە کاتێک بۆ چەند ساڵێک بەرپرسی ژووری پارێزەرانی کەلار بوو هەوڵی جدی دەدا بۆ ئەوەی شان بەشانی فەرمانبەرانی تر مافەکانیان لە وەرگرتنی زەوی وەرگرن ، هەربۆیە بە جهوودو هەوڵە

بەردەوامەکانی لە ساڵی (٢٠٠٤) هەشت لە پارێزەران و فەرمانبەرانی دادگای کەلار کە شایستەبوون و سوود مەند نەبوون وبەندە یەکێک بوو لەوانە لە لایەن شارەوانی کەلار پارچە زەویمان بۆ تەرخان کرا ، هەروەها توانی لە رێگای سەندیکای پارێزەرانەوە پارەی پێویست بۆ نۆژەن کردنەوەی ژووری پارێزەرانی کەلار لە ساڵی ( ٢٠٠٢ ) تەرخان بکرێ و نۆژەنن بکرێتەوە .

### ٧/ کەسێکی کراوەو قسەخۆش ودەم بە خەندە بوو :

سەرەڕای ئەوەی کەسێکی زۆر جیدی و ئەکادیمی بوو ، کەسایەتیەکی داخراو نەبوو ، بەڵکوو کەسێکی کۆمەڵایەتی گفت خۆش و قسە خۆش و دەم بەزەردەخەنە بوو ، وە زەردەخەنەو پیکەنینی دەخستە سەر لێوی هاورێیانی ، هەمیشە مەجلیسی لەلایەن هاورێیانیەوە لە ژووری پارێزەران لە کۆتایی دەوام قەرەباڵغ بوو ، وە لە دانیشتن لە گەڵی بێ تاقەت نەئەبووی ولێی زیزو عاجز نەدەبووی تەنانەت ئەگەر قسەشی لەسەر خودی خۆت بکردایە ! جارێکیان موەکیلێکی من حاکم فەرهاد وەکیلی خێزانەکەی بوو کە داوای جیابوونەوەی بە هۆکاری (عنە ) واتا ( نەبوونی توانای پیاوەتی ونەکردن بە ژن ) لەسەری تۆمار کردبوو لە ناکاو لە کۆتایی دەوام خۆی کرد بەژووری پارێزەراندا کە من و کاک فەرهاد و چەند کەسێکی تری لێ بوو ، ئەو کاک فەرهادی نەدەناسی بە تووڕییەوە ووتی کێ محامی فەرهادە ، کەس وەڵامی نەدایەوە ، دەستی کرد بە قسە کردن وووتی فەرهاد چۆن ئێژێ من پیاو نیم؟ با بمنێرێ بۆ فەحس بزانە وایە تەحەدای ئەکەم ، ئیتر دوای تۆزێک ڕۆیشت ، کەسەکە پیاوێکی قەڵەوی خرەڵە بوو کاک فەرهاد بە پیکەنینەوە ووتی: خۆ خەریک بوو زیرە بکەم ووتم ئێستا بەکەلەیەک ئەمکوژێ ، ئیتر ئێمەش هەموومان دامان لە قاقای پێکەنین .



## ٨/ خاوەنی خەون وتمووحی گەورە بوو :

حاکم فەرهاد کەسێک بوو خاوەنی خەونی گەورە وتمووحی گەورەی هەبوو ، لە گەڵ ئەوەی مومارەسەی پیشەی پارێزەرایەتی بەسەرکەوتووی دەکرد ، پلانی هەبوو بۆ ئایندەی ، بە جدیش هەوڵی بە دەست هێنانی دەدا ، بۆیە هەر لەو کاتەداو لە ساڵی ( ٢٠٠٤) ولە کاتی دادگایی کردنی سەدام وسەرانی ڕژێمی بەعس دەستی بە خۆ ئامادەکردن کرد بۆ بە دەست هێنانی بڕوانامەی ماستەر و ماستەرنامەکەی کە شاکارێکە بە نێونیشانی ( المسؤولیە المدنیە الناشئە عن عملیات الانفال ) کە لەساڵی ٢٠٠٧ بە پلەی نایاب بە دەستی هێنا ، جێی شانازییە بۆ هەموو گەرمیانیەک وکوردێک ، وە خزمەتێکی گەورەو پڕکردنەوەی کەلێنێکی گەورە بوو لە کتێبخانەی یاسایی و ئێستاو بۆ ئایندەش مەرجەع و سەرچاوەیەکی سەرەکی دەبێ بۆ پسپۆرانی ئەو بوارەو سوودی لێ دەبینن و بۆی دەگەڕێنەوە .

پاش (١٠) ساڵ لە مومارەسەی پیشەی پارێزەرایەتی وبەرگری لە مافی بریگرتەکانی و قەزائی واقیف دا و بەو پێشینە پاکەو بەو سیفاتو ئاکارە جوانانەی ، بەو ئەزموون و گەنجینەو مەخزوونە زانستی و ئەکادیمیەی وازی لە پیشەی پارێزەرایەتی هێناو سەنگەری گواستەوە بۆ گۆڕەپان و مەیدانێکی فراوانتر و تەحەدیاتو ئالەنگاری قورستر و گەورەتر ، کە ئەویش مەیدان و دەزگای داواکاری گشتی بوو .

حاکم د: فەرهاد لە ساڵی (٢٠٠٦) وەکوو ئەندامی داواکاری گشتی بڕیاری دامەزراندنی لە فەرمانگەی داواکاری گشتی سلێمانی بۆ دەردەچێ و دادەمەزرێ و چەند ساڵێک لە گەرمیان لە دادگاکانی لێکۆڵینەوەو کەتن و باری کەسی و بەرایی وەکوو ئەندامی داواکاری گشتی خزمەت دەکات کە ئەو کات تا ساڵی (٢٠١١) لە گەرمیان فەرمانگەی داواکاری گشتی تایبەت بە خۆی نەبوو ، دواتر لە ساڵی (٢٠١١) لەبەر تواناو لێهاتوویی وەکوو بەڕێوەبەری فەرمانگەی داواکاری گشتی سلێمانی دەست بەکار دەبێ و ماڵەکەشی دەباتە سلێمانی ، ئەو لەو چەند ساڵە کە بەڕێوەبەری فەرمانگە بوو سەرەڕای قورسی ئیدارەدانی فەرمانگەیەک بە ئاست وقەبارەی پارێزگای سلێمانی و ئەو هەموو ئاڵەنکاریانەی ڕووبەڕووی دەبویەوە ، وەکوو هەستی بەرپرسیارێتی جگە لەئەرکی ئیدارە لە دادگای بەرایی سلێمانی وبۆ بەرگری لە مافی گشتی و بەدواداچوونی کە ئەو جۆرە داوایانە لە پارێزگای سلێمانی زۆر زۆر بوون لەو داوایانەی دەوڵەت داواکارە یان داوای لەسەرکراوە

ئامادە دەبوو . وەلەبەر پسپۆڕی لە بواری یاسای شارستانی و ئەكادیمی بوونی توانی زۆرێك لەو داوایانە بباتەوە و دەیان ملیار دینار بۆ گەنجینەی دەوڵەت بگێڕێتەوە ، جگە لەزەوی داگیركراو وكرێی هاوتاو گرێبەستەكانی بانەوانی و هتد بباتەوە ، وەنوێنەری یاسایی دامودەزگاكانی حكومەت بەزۆری پشت بە تیانووس و ڕاوێژەكانی ببەستن لە كاتی ئامادەبوونیان لە دانیشتنەكانی دادبینیدا، وەپارێزەرێكی سەرسەخت بوو لە بەرگری لەمافی گشتی و ئەركی خۆی بە ئەمانەتەوە جێبەجێ دەكرد و هەمووكەس ئەو شایەتیەی بۆ دەدا .

وە پاش مردنی ئێستا ئەو تیانووس و لائیحانە لە بوارە جۆراوجۆرەكان ولەبەردەم دادگای بەرایی سلێمانی و دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی سلێمانی و دادگای كارگێری سلێمانی و دادگای تاوانەكانی سلێمانی لە كتێبێكی ( ٥٥٧) لاپەڕەیی لەلایەن هەردوو بەڕێزان دادوەر / ڤینۆس بەكر حمە علی هاوسەری و ڕاوێژكاری یاسایی ( عبد القادر صالح عبدول ) خۆشبەختانە كۆكراوەتەوە و سوودێكی زۆری هەیە بۆ دادوەرانی ئەندامی داواكاری گشتی و نوێنەری یاسایی فەرمانگەكانی حكومەت وماف پەروەران ، وە ئەم كتێبە گەواهی دڵسۆزی ماندووبوونی ئەو دادوەرە بەڕێزە دەدەن كەسەربازێكی وون بوو بۆ بەرگری لە مافی گشتی و بە گڕا چوونی گەندەڵی و پێشەنگ و قودوە بوو بۆ هاوپیشەكانی لە ئەندامانی داواكاری گشتی و ماف پەروەران و نوێنەرانی یاسایی دام ودەزگاكای دەوڵەت .

بیگومان ئەم كارەی بەڕێزیان هەروا كارێكی سووك وئاسان نەبوو وە ڕێگاكەی بەگوڵ نەچێنرابوو ، بەڵكوو ئاڵەنگاری زۆری لە پێش بوو وەشەو نخوونی زۆری دەویست وە پێویستی بە پشتگیری و پاڵپشتی سەرەوە لە وەزارەتی داد و سەرۆكایەتی داواكاری گشتی هەبوو ، بۆیە دادوەر د: فەرهاد كە هەمیشە هەوڵی پەرەپێدانی ئەم دەزگایەی دەدا وە داواكاری بەردەوامی هەبوو بۆ ئەوەی بتوانێت لە گەڵ هاوپیشەكانی لە ئەندامانی داوكارانی گشتی لە فەرمانگەی سلێمانی لە ئاستی ئەو بەرپرسیارێتیە قورسە بێت كە خراوەتە ئەستۆیان ، بۆیە كاتێك هەست دەكات وە بەهۆی لاوازی پشتگیری و بە دەمەوە نەهاتنی سەرەوە وەكوو پێویست بۆ جێبەجێكردنی داواكارییەكانی كە داواكاری شەخسی نەبوون وە ناتوانێت لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتیە قورسە بێت كە خراوەتە ئەستۆی لە ساڵی (٢٠١٥) نوسراوی دەست لەكاركێشانەوەی لە ئەركی بەڕێوەبردنی فەرمانگەی داواكاری گشتی سلێمانی پێشكەش دەكات و لەسەر داواكاری خۆی وئیلحاحی خۆی وازنامەكەی لەلایەن وەزیری دادو سەرۆكی داواكاری گشتیەوە قبوول دەكرێ و ئەركەكە بە یەكێكی تر دەسپێردرێ . پلەو پۆست لای حاكم فەرهاد وەكوو ئەمانەت




تەماشا دەکرا وە کاتێک پۆست گرنگە بتوانی وەکوو پێویست مافی بدەی بۆیە کاتێک هەستی کرد ناتوانێ لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە مافی تەواوی بدات لای گرنگ نەبوو دەست بەرداری بێت وتەنانەت خۆی داوای وازنامە پێشکەش بکات کەئەم ئاکارە دەگمەنە لە هەرێمی کوردستان وکەم کەس بەم شێوەیەی حاکم فەرهاد دەست بەرداری پۆست وپلە بووە و ئیستیقالەی کردووە ، حاکم فەرهاد لە ئەرکی خۆی وەکوو داواکاری گشتی بەردەوام دەبێ و لەدادگای تاوانی سلێمانی و کارگێڕی و بەرایی و دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی سلێمانی بەردەوام دەبێ ، وەبەندە بۆ خۆم لە کاتی تەنسیبم لە سلێمانی لە ساڵی ( ٢٠١٩ و ٢٠٢٠) بۆ چەند مانگێک کە ئەو کات بەڕێزیان نەخۆش کەوت وتووشی جەڵتە بوو بەرپرسیارێتی ڕاپەڕاندی هەندێک لە کارەکانیم خرایە ئەستۆ وەکوو ووردبینی وڕادەربڕین لە داوای پێداچوونەوەکانی دادگای تاوانی سلێمانی .

قەناعەتی حاکم فەرهاد وابوو دەزگای داواکاری گشتی بەم یاسایەی ئێستا کە یاسای ژمارە ( ١٥٩) ی ساڵی (١٩٧٩) یە بۆ ئەم قۆناغەی ئێستا گونجاو نیە و ناتوانرێ لە سایەیدا پەرپێدان بە دەزگای داواکاری گشتی بدرێ ، بۆیە یەکێک لە خۆزگەو ئاواتەکانی کە هەمیشە هەوڵی بۆ دەداو باسی دەکرد هەموارکردنەوەی ئەو یاسایە بوو بەشێوەیەک لەئاستی سەردەم بێ و دەسەڵاتەکانی زیاد بکرێ وسیستمی نیابی کە لە وولاتەکانی وەکوو میسرو فەرەنساو لوبنان وولاتی تر پیادە بکرێ و دەزگای داواکاری گشتی سەربەخۆبێ و سەربە وەزارەتی دادو دەسەڵاتی جێبەجێکردن نەبێ وەکوو ئەوەی لە هەرێمی کوردستان / عیراق هەیە .

ئەو پێی وابوو ئەستەمە بتوانرێ لە سایەی یاسایەكی ئاوادا كە لەژێر سایەی حكوومەتی بەعس و بۆ بە دیهێنانی ئامانجەكانی تەشریع كراوە بتوانرێ وەكوو پێویست چاكسازی بكرێ هەرچەند هەمواریش بكرێ ، وە بتوانرێ وەكوو پێویست چاكسازی و دژایەتی گەندەڵی لەسایەیدا بكرێ و وەكوو دەزگایەكی گرنگ وسەربەخۆ بتوانێت ئەركەكانی وەكوو پێویست راپەڕێنێت ، بۆیە لەگەڵ چەند دادوەرێكی بە توانای داواكاری گشتی رەشنووسێكیان بۆ یاسایەكی پێشكەوتووی سەردەمیانەی سەربەخۆی داواكاری گشتی گەڵاڵە كردبوو وە لە چەندین وەرشەو سیمینار گفتوگۆی چڕ بۆ تاوتوێ و دەوڵەمەندكردنی ئەنجام دراو منیش یەكێك بووم لەوانەی زیاد لە جارێك لەو ۆورك شۆپانە لەسلێمانی وهەولێر ئامادەییم هەبوو ، وە چەندین جار بەرێزیان لە كەناڵەكانی راگەیاندن ئەم بابەتەی باس دەركردو تیشكی دەخستەسەرو گلەیی هەبوو لە پەرلەمانی كوردستان پشت گوێ خراوەو ئامادەنین خوێندنەوەی بۆ بكەن ، بەلام مەخابن هەوڵ وجوهدەكانی سەری نەگرت و رەشنووسەكە چاوەڕێیە هاوپیشەكانی لە دادوەرانی ئەندامانی داواكاری گشتی بە ئەنجامی بگەیەنن و رۆشنایی ببینێ و ئاواتی بەڕێزیان بهێنێتە دی .

د. فەرهاد سەرای نەخۆش كەوتنی بە ماوەیەك پێش وەفاتی وە پێویستی بە پشووی زیاتر ، بەلام دەروون و هیممەتی بەرزی ڕێی نەدان لە ماڵدا بمێنێتەوە و مۆڵەتی زیاتر وەرگرێت ، بۆیە گەڕایەوە بۆ بەردەم دادگای بەرایی سلێمانی و ئەركی بەرگری لە مافی گشتی كە تیایدا پسپۆری هەبوو درێژە پێ بدات ، بەلام مەخابن دیارە ویستی پەروەردگار لەسەرو هەموو ویستێكەوەیە وە مانەوەو نەمری تەنها بۆ خوای پەروەردگارە و لەتەمەنی ( ٤٨) ساڵیداو لە رێكەوتی ( ٢/٩/ ٢٠٢٢) رووح ورەوانی پاكی بە پەروەرگاری سپارد .

دادوەر د فەرهاد سەرەرای ئەوەی پارێزەرێكی بە ئەزموون و دادوەرێكی سەركەوتوو بوو نووسەرێكی بە تواناو كەسێكی ئەكادیمیش بوو لە ساڵی (٢٠٠٧) وە بەتایبەت لە رۆژی ٤/١٤ ی ئەو ساڵە كەرۆژی یادی ئەنفالە بروانامەی ماستەری بە دەست هێناوە بە پلەی نایاب بە ناونیشانی ( المسؤولیه المدنیه الناشئه عن عملیات الانفال _ دراسه تحلیلیه مقارنه بالشریعه الاسلامیه ) وە لەساڵی (٢٠١٢) بروانامەی دكتۆرای لەیاسای تایبەت بە دەست هێناوە بە پلەی نایاب ، وەبەشداری چەندین كۆڕو كۆبوونەوەی یاسایی كردووە لە ناوەوەو دەرەوەی هەرێم ، هەروەها وانەبێژی بابەتەكانی یاسای ( سەلماندن ، جێبەجێكردن ، سزاكانی تایبەت ، دادوەری كارگێڕی كرداری ، بنەمای دادگەرییە سزاییەكان ) بووە لە هەردوو زانكۆی جیهان و گەشەپێدانی مرۆیی .

**دادوەر د. فەرهاد خاوەنی شەش پەرتووكی چاپ كراوە بە زمانی عەرەبی كە ئەمانەن :**

١ عوارض المسؤولية المدنية

٢ المسؤولية المدنية الناشئة عن عمليات الانفال .

٣ شرح قانون الادعاء العام رقم ١٥٩ لسنة ١٩٧٩ النافذ في اقليم كوردستان / العراق .

٤ الوجيز في شرح قانون التنفيذ رقم ( ٤٥) لسنة ١٩٨٠

٥ عمليات الانفال في كوردستان العراق وفق منظور الشريعة الاسلامية والقانون الدولي والداخلي

٦ اعلان حالة الطوارئ في العراق واقليم كوردستان في ضوء احكام الدستور والقوانين العراقية .

دادوەر د. فەرهاد و ئەوانەی وەكوو ئەون بە جەستە تەنها لە ناومان كۆچ دەكەن ، بە هەڵوێستەكانیان بە پێشەنگیان لە بواری بەرگری مافی گشتی و دژایەتی گەندەڵی و چەسپاندن وبەرجەستە كردنی دادگەری ، بە بەبەرنامەو دیدارەكانی ، بە نووسینەكانی لەسەر جینۆسایدی ئەنفال و بەرگری لە مافی كەس وكاری سەربەرزیان بە هەمیشەیی لە نێومان بە زیندووی دەمێنێتەوە ، د : فەرهاد توانی بە تەمەنێكی كورت مێژوویەكی پرشنگدار بۆخۆی تۆماركات ، توانی ببێتە سونبول و ڕەمزێك لە ڕمووزی دادپەروەری لە هەرێمی كوردستان وعیراق .

داواكارین خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی دایپۆشی و لە گەڵ دادپەروەران حەشری كات .



گوڵاڵەی گەرمیان

# کاریگەریەکانی تاوانی ئەنفال لە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی لە باشوری کوردستان

بە پێناسەیەکی کورت .ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستان , ژیانی کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی لادێنشین بوەو بابەتی شارستانیەت و پێشەسازی و ژیانی چڕی شار نشین کەمترین و کورت ترین مێژویان هەیە لە ڕابوردوی دوور و نزیکدا هەتا نیوەی دوەمی سەدەی ڕابوردو.

ئەوەی لە بارەی خەڵکی کوردستانەوە باسدەکرێت بە کوردو کەمەنەتەوەکانی ترەوە پێناسەو گێڕانەوەی کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵیە. ئەو شارانەش هەبوون شاری گەورەی پیشەسازی نەبوون .

ئەو دووکاندار و بازرگانانەش لە شارەکان ئەژیان پەیوەست بوون بە لادێکانەوە کەمترین سنور بڕی دەرەکی هەبووە بۆ وولاتانی دراوسێ.

ئەمەش وایی پێویست ئەکرد دانیشتوانی لادێ زیاتر پشت بەستو بن بە خۆیان و هێزی بەرهەم هێنەری پێداویستیەکانی شارەکانیش بن. بە پێی ڕاپۆرتێکی وەزارەتی کشتو کاڵی عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ لە ٦٨٪ پێداویستی دانیشتوانی عێراق لە دانەوێڵە لە کوردستانەوە بەرهەم هاتووە.

لادێی کوردستان خاوەنی سیستەم و پەیڕەوی پەروەردەی خۆی بووەو پشتی بە دەوڵەت نەبەستوە ، لە کردنەوەی حوجرەی فەقێ و سوختەخانە و مزگەوت و تەکێکانیدا ، بەڵکو وەک پێویستیەکی ژیاری خۆی لە کۆنەوە خاوەنی ئەو فێرگانە بووەو ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەر بنیاد ناوە . بە هەرچ تێبینیەکەوە لە سەر ئەو شێوازی پەروەردەیە بەڵام

بەرهەمەکەی سەدان زانا و دانایی ڕۆشنبیری کوردە کە مێژوی ئەدەبی و سیاسی و ئاینی ئێمەی لەسەر بنیاد نراوەو بوونەتە بەشێک لە سامانی هزری مرۆڤایەتی.

نیشتەجێبون و گەشەکردنی گوندەکان پێگەی جوگرافی کوردستانی زیاتر گرنگ کردوە , دەڵەمەندی سنوری ناوچەکە و کارامەی تاکی کورد لە بوارەکانی ژیانی کشتوکاڵی و مەڕداری و ڕستن و چنین و کەرەستەکانی تری پێویستی ژیان ئەوەی سەلماند کە ئەگەر شەڕو داگیرکاری لێگەڕێ دەتوانرێت لە بەرهەمی سروشت و هێزی بازو و , بە ڕەنجی خۆت بژیەیت و چاوی پاوان خوازی و داگیرکردنی نیشتمانی کەسانی تر لە هزری کوردا بوونی زۆر کەمە. هەڵکەوتەی جوگرافی کوردستان وایی کردوە دوژمنان بەردەوام لە هەوڵی داگیر کردن و پارچەپارچەکردنیدا بوونە. دەرەنجامی هەوڵی ئەوان و خۆش باوەڕی خۆمان لە کۆن و نوێدا زیانی گەورەی لێکەوتوەتەوە . سروشت و یاساکانی ژیان پێچەوانەی ئەوەن بە خووی مەڕ و میانڕەویەوە لە ناو جەنگەڵی گورگ و شێردا بژیت.

مێژوو دەڵێ کورد هەمیشە بەرگری کار بوە نەک داگیر کەر. ئەمە بۆ ئێستاش وایە بەڵام بۆ نابێت جارێک ماڵ و ئاسایشی داگیرکەرانیش بکەونە مەترسیەوە تا لە مەترسی و ئازاری ژێردەستەکان تێبگەن.؟






لە دروست بوونی دەوڵەتی بەناو عێراقەوە لە دوایی نەمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕێکەوتنامەی سایکس بیکۆ لە ساڵی ١٩١٦ و پەیمان نامەی لۆزان لە ساڵی ١٩٢٣ کە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ سەد ساڵ زیاتر تێپەڕیوە .

کورد لە هەر چوارپارچەی کوردستان بە بەردەوامی گۆڕەپانی کیشەکانی نێوان نەتەوە سەردەستەکانی خاوەن سنوری وولاتان بووە , کورد و ئەوانەش لە گەڵ کورد دا لەم سەر زەسەمینە ئەژین لە شەڕی مان و نەماندان. لە مێژویەکی دوورە وە تا ئێستاشی لە گەڵدا بێت ئارامی و ئۆقرەی درێژ خایەن لە کوردستان نەبووە بە ئەندازەی ئەو چەند ساڵەی دوایی ڕاپەڕین لە هەرێمی کوردستان بە هەموو تێبینیەکانەوە . دەکرێت بڵێین هەین و دەکرێت باشتریش بین....

لە شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمرەوە تا دروست بوونی ڕژێمی بەعس شەڕو پێکدادانەکان لە نێوان کورد و حکومەتە یەک لە دوایی یەکەکانی ئێراقدا تا ڕادەیەک هاوسەنگی هێز هەبووە و شارەکان مەیدانی ڕووبەڕووبونەوە بوون , بەڵام بەپێی گۆڕانی سەردەمەکان و لە دوایی ڕژێمی پاشایەتی و دواتر بە هاتنی بەعس , گۆڕانی هاوسەنگی هێز و تەکنەلۆژیایی سەربازی دۆخەکە دەگۆڕێت و لادێکان دەبنە لانکەی سەرهەڵدانی شۆڕش و بەرگری و هێرشی بەردەوامی داگیر کەران. ئەگەر بەووردی تەماشایی ڕوداوەکانی ساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابورد و بکەین لە گەڵ هاتنی ڕژێمی سیاسی بەعس بۆ دەسەڵات بیری عەرەبی شۆڤینیزمیش لە گەڵیا گەشە ئەکات و کلتوری بیکوژە و تاڵانی بکە لە خێڵە عەربیەکانەوە بە ناوی (حەرەس قەومیە)کانەوە تەشەنە ئەکاتەوە.

پەلاماری دێهاتەکانی کوردستان ئەدەن و مەڕو ماڵات و دانەوێڵەیان بە تاڵان ئەبەن ,جوتیار ئەکوژن. لادێنشینی کوردستان ناچار بەوە ئەکەن خۆیان بەرگری لە خۆیان و بەرهەمەکانیان بکەن و ئەو هێزە سیاسیانەش دروست ئەبێت لە کوردستان دژ بە داگیرکەران بە پاڵپشت و هاوکاری خۆیان بزانن لەو ئەنجامەوە شۆڕش و لادێ نشین دەبنە دوانەیەکی هاوسەنگ تا کار گەیشتە ئەوەی ڕژێمی لە ناوچوی بەعس بێ ئاوڕدانەوە لە پێشینەی خۆی ئەنفالی کردە دوا ناسنامەی تاوانەکانی کە کاریگەری و زیانەکانی پێناسە ناکرێن. بەڵام دەرەنجامیش بە بەردەوامی خەباتی ڕەوایی گەلی کوردستان ئەو ڕۆژگارەشمان بینی ڕاپێچی دادگا کران و بە چارەنوسی ڕەشی خۆیان گەیشتن.

## بەعس و لادێیەکانی کوردستان:

لە هەرکوێ ستەم هەبێت پشکۆی بەرگری ئەگەشێتەوە. تا بەعس ستەمی زیاتر ئەبوو بەرگری زیاتر ئەبوو شۆڕش لە دوایی شۆڕش تا کار گەیشتە ئەوەی ڕژێمی بەعس پێشمەرگە و لادێ نشین وەک یەک تەماشا بکات و ئەنفال ببێتە ناسنامەی چوار هەزار و پێنج سەد گوند. ئەنفال لە ڕاگواستنی گوندەکانی سەرسنورەوە دەستی پێکرد تا نزیکی شارەکان و بە زیندە بە چاڵکردنی هاو نیشتمانیانی کۆتایی هات. ئەنفال تەنها وێرانکردنی کوردستان و داماڵینی لە دانیشتوانەکەی و لە ناوبردنیان بە دڕندانە ترین شێوە نەبوو. ئەنفال ئەو سیاسەتە نەگریسەی دوژمن بوو کە تەواوی ژیانی کۆمەڵگەی کوردەواری گۆڕی لە سنور ی باشوری کوردستاندا و سیستەم و ڕێساو یاساکانی ئەوانی لەبەر یەک هەڵوەشاندەوە , جارێکی تر گەر مەحاڵ نەبێت ئەستەمە بیگەڕێنەوە سەر ئەو شێوە ژیانەی پێشوو کە تاک بروایی بە هێز و بازووی خۆی بێت و پەنایەکیش بێت بۆ پشتگیری کەسانی تر و بەڕێوەبردنی دەوڵەت مەداری.

ئەنفال ئەگەر مێژوەکەی لە ١٩٨٨ کۆتایی هات کاریگەریەکانی ماونەتەوەو ڕەنگدانەوەی هەیە لە ژیانی هەموو ماندا. ئەنفال کلتور و کەرەستەی مێژوی سەدان ساڵەی لە ناو برد.

ئەنفال شێوازی ژیانی گۆڕین لە ڕیز بەندی لادێ و جوتیارە وە بۆ کارمەندی ناکارا و تێکەڵاوی خێرایی شێوازی لادێ و شار کە هەردوکیانمان لێوون بووە.

ئەنفال و کاریگەریەکانی لە سیستەمی حوکم ڕانی ئێستایی کوردستانیشدا ڕەنگدانەوەی هەیە بەوەی بوینەتە بازاڕی کڕیاری کەرەستەی دراوسێ و لە دوورەوە سەیری ڕەز و باخ و کێڵگەی لادێکان ئەکەین و ناتوانرێت هاوسەنگیەک دروستبکرێت لە نێوان

ژیانی تاک لە لادێ و شارەکاندا کە بەڕێوەبردن و پێویستیەکانی ژیان پێویستی بە هەردوو ژینگەی شار و لادێیە بۆ هاوسەنگ ڕاگرتنی تەواوی پێویستیەکانی ژیان لە شوێنی نیشتە جێبوونەوە تا دەگاتە ئاسایشی دابین کردنی بژێوی و خۆراک کە لادێکان سەرچاوەی بنەڕەتیی ئەو سامانەن.

ئەنفال ڕەنگدانەوەی هەیە لەسەر شێوازی بیرکردنەوەمان و خێرایی بە دەستهێنانی شتەکان وایی کردوە کەمتر بەرگەی قەیرانەکان بگرین.

بە پێی ئەو ئامار و زانیاریانەی بەدەست هاتوون لە ڕێگەی دانیشتوانی ئەو حەوت گوندەی گەرمیان کە لە شێوەی کتێبدا لە گەڵ گێڕانەوەی ڕوداوەکاندا تۆمارم کردون ,لە سنوری پارێزگایی کەرکوک ئەنفال کاریگەری خراپی جێهێشتوە.

١- لە دێی کانی عوبێد لە سنوری ناحیەی ڕزگاری سەر بە قەزایی کەلار. لە کۆی ٤٥ خێزان پێش ئەنفال ٤١ خێزانیان شەهیدی ئەنفالیان هەیە و چەند خێزانێک هیچ کەسیان لێدەرنەچوە بە تەواوی تیاچوون.١٨١ کەس بێسەروشوێنە . لەو ژمارەیە ٩٧ کەسیان لە ڕەگەزی مێ , ٨٤ کەسیان لە ڕەگەزی نێر.

٢- لە شارە دێی زینانەی خوارو لە سنوری ناحییەی نەوجول سەر بە قەزایی دووز لە کۆی ٨٠خێزان ٦٨ خێزان بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتوون، ٢١٣ کەس ئەنفالکراوە و بێسەر و شوێنە لەو ژمارەیە ١٣٦ کەس لە ڕەگەزی مێ , ٧٧ کەس لە ڕەگەزی نێر.

٣- لە دێی زینانەی ژوور .لە کۆی ٧٠ خێزان ٥٣ خێزان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون ٢٠٢کەس ئەنفالکراوەو بێسەروشوێنە .لەو ژمارەیە ١٠٩ کەس لە ڕەگەزی مێ , ٩٣ کەس لە ڕەگەزی نێر لەو ژمارەیە ٩٣ کەسیان خوار تەمەنی ١٨ساڵە.

٤- لە دێی تاڵاو لە سنوری ناحیەی نەوجول لە کۆی ٥٠ خێزان ٤٧ خێزان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون . لە ئەندامانی ئەو خێزانانە ١٠٣ کەس بێسەروشوێنە کە ٢٢کەسیان لە ڕەگەزی مێ , ٧١ کەسیان لە ڕەگەزی نێر. لەو ژمارەیە ٣٥ کەسیان خوار تەمەنی ١٨ ساڵین.

٥- لەدێی توکن سنوری ناحیەی سەرقەڵا قەزایی کفری لە کۆی ١٢٠ خێزان ٨٧ خێزان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون .لەو ژمارەیە ١٤ خێزان کەسیان لە شوێن نەماوە. لەو ژمارەیە ٣٤٥ کەس بێ سەروشوێنە. لەو ژمارەیە ١٦٧ کەسیان لە ڕەگەزی مێیە , ١٧٨

کەسیان لە ڕەگەزی نێر.

٦- لە دێی عەزیز قادر لە سنوری ناحیەی سەرقەڵا لە کۆی ٦٥ خێزان ٥٠ خێزان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون . لێرەش ١٤ خێزان کەسیان لە شوێن نەماوە. لەو ژمارەیە ٢٣٠ کەس بێسەرو شوێنە. لەو ژمارەیە ٨٤ کەس لە ڕەگەزی مێ , ١٤٦ کەسیان لە ڕەگەزی نێر.

٧- لە دێی قەڵاقۆچاڵی لە کۆی ٥ خێزان , ٤ خێزان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون لەو ژمارەیە ٨کەس بێسەروشوێنە کە ٢کەسیان لە ڕەگەزی مێیە , ٦ کەسیان لە ڕەگەزی نێر .

لە کۆی دانیشتوانی ئەو حەوت گوندە ١١٨٢ کەس بێسەرو شوێنە. لەو ژمارەیە ٦٠٧کەسیان لە ڕەگەزی مێیە , ٥٧٥کەسیان لە لە ڕەگەزی نێر , ئەمەش ئەوە نیشان ئەدا کە ڕێژەی نزیکەی لە ٧٠ ٪ قوربانیەکان لە ڕەگەزی مێن. زۆربەشیان لە خوار تەمەنی ١٨ ساڵیەوەن.

ئەمە دەرخەری ئەوەیە کە ئەنفال و تاوانەکانی داگیرکەران کاریگەری سەختیان بووەو هەیە لە سەر پێکهاتەی خێزان و شیرازەی کۆمەڵایەتی ناوچە زیان لێکەوتوەکان.

ئەو گوندانە لە ئێستا چەند خێزانێکی کەمی لێ نیشتە جێیە نەبوونەوە بە لادێ پڕ جوڵە و بەرهەمدارەکانی جاران.

ڕێژەی دانیشتوان کەمی کردوەو پێکهاتەی خێزان ژمارەی کەم بوەتەوە وەک جاران وەچەناخەنەوە.

ئەگەر لە دوایی ڕاپەڕینیشەوە بە هۆی ئابڵوقەی ئابورییەوە خەڵکانێکی زۆر گەڕانەوە لادێکان , گەڕا نەوەیان شتێکی کاتی بوو لە گەڵ کەم بوونەوەی قەیرانەکان هاتنەوە شارەکان و بوونەوە بە بەشێک لە بەکار بەر لە بری بەرهەم هێن.

ئەنفال تەنها ژمارەیەک قوربانی و چەند ڕوداوێکی شەڕ نیە کە لە زۆر شوێنی جیهان ڕوو ئەدات و بە نەمانی ئەو دۆخە ئاسایی بوونەوە ڕوو لە ناو چەکە بکات. ئەنفال تاوان و کردەوەیەک بوو ماوەیەکی درێژخایەن تێپەڕی لە نێوان دابڕانی قوربانیەکان لە شوێن و کلتوری پێشویان. هەموو ئەوانەی ئەنفال کران بە پیاو و ژن و مناڵیشەوە

شـێوازی ئاخاوتـن و جـل و بەرگیـان مۆرکێکـی نەتـەوەی بـوو , دوایـی ئەنفـال زاراوەکان گۆڕان ,کلتـور گـۆڕا , شـێوازی جـل و بـەرگ گـۆڕا شـێوازی ژیـان بەگشـتی جۆرێکـی تـرە .

- گرفتێکـی تـری لادێکان بـە تایبـەت ناوچـەی گەرمیـان گرفتـی خاوەندارێتـی زەوی یـە کـە زۆر کێشـەی یاسـایی و کۆمەڵایەتـی هەیـە و حکومـەت وەک پێویسـت یەکلایـان ناکاتـەوە و بوەتـە هۆکارێکـی تـر بـۆ نەگەڕانـەوەی خەڵـک بـۆ زێـدی خـۆی یـان چەندیـن ڕووداوی کوشـتنی لێکەوتوەتەوە .

## ئەرکی ئەم قۆناغە.

لـە دوایـی ئەنفـال و ئـەو ڕووداوانـە ئەوانـەی بەسـەختی بـەر ئـەو زەبـرە کەوتـوون لـە دۆخێکـی سـەختی دەرونـی پـڕ ئـازاردان بـە ژن و پیـاوەوە , ئەنفـال ڕووداوێـک نیـە بـە تێپـەڕ بوونـی کات لـە بیـر بکرێـت . جینۆسـاید کێشـەی گـەورەی کۆمەڵایەتـی لـە کۆمەڵـگە دروسـت ئەکـەن. لـە بیـر کردنـی قوربانـی و چارەسـەر نەکردنـی کێشـەو داواکاریەکانیـان نـا سـەقامگیری سیاسـی و ئابـوری لـێ دەکەوێتـەوە . سیسـتەمی سیاسـی و ئابـوری و پـەروەردەی ئەگـەر کار لـە سـەر لێکەوتەکانـی شـەڕ و قوربانیەکانـی نـەکات ناسـەقام گیـری بـەردەوام دەبێـت کـە هۆکارێکـە بـۆ کـەم بوونـەوەی بیـری نەتـەوەی و دزەکردنـی دووژمـن بـۆ نـاو کۆمەڵگـەو دەسـتکەوتەکان .

ئەرکی دامەزراوەکان و ڕێکخراوەکانە ئەو لایەنە کۆمەڵایەتیانەی ئەم قۆناغە لەبەر چاوبگرن .




د.ڕێبوار محەمەد صالح

مامۆستای زانکۆ


# ڕەهەندە یاساییەکانی تاوانی ئەنفال

تاوانی ئەنفال یەکێکە لە تاوانە کۆمەڵکوژییەکان کە بەرامبەر گەلی کورد ئەنجام درا لە ساڵی ١٩٨٨، کەبریتی بوو لە وێرانکردنی هەزاران گوند و ڕاگواستنی زۆرە ملێی خەڵک و لێک جیاکردنەوەی دایک و مندال و چەندین تاوانی تر کە دواجار بە کوشتن و زیندەبەچاڵ کردنی زیاتر لە ١٨٢٠٠٠ مرۆڤی بێتاوانی کورد کۆتای هات.

سەرەتایی دەستپێکردنی تاوانی ئەنفال بە دانانی (عەلی حەسەن مجید) دەست پێدەکات بە بەرپرسی سەربازی لە کوردستان، بە بڕیاری ژمارە (١٦٠) لە بەرواری (١٩٨٧/٣/٢٩)، دوابەدوای ئەوە ناوبراو بڕیاری ژمارە (٤٠٠٨) لە (١٩٨٧/٦/٢٠) دەرکرد کە دەکرێ بە بڕیاری جینۆسایدی گەلی کورد دابنرێت.

## ئەنفال وجینۆساید:

دەتوانین تاوانی ئەنفال بە جینۆسایدی کورد ناوببەین، چونکە هەروەک دەزانین جینۆساید لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای لەناوبردنی ڕەگەزی گەل و نەتەوەیەک دێت، ئەم مانایەش لە تاوانی ئەنفالدا ڕەنگی داوەتەوە، پاشان بە پێی چەندین دەق و بنەمای یاسایی نیودەوڵەتی ئەنفال تاوانی جینۆسایدە، لەوانە مادەی (٢ و٣) لە (ڕێکەوتنامەی قەدەغەکردنی جینۆساید ١٩٤٨)، و مادەی (٣) لە (ڕێککەوتنامەی ژنێف ١٩٤٩) و مادەی (٦) لە دەستوری (داگای تاوانکاری نیودەوڵەتی ١٩٩٨).

سەرەڕای بوونی ئەو بنەما یاساییانە، بەڵام تا ئێستا کۆمەڵگای نێودوڵەتی لە ئاست بە جینۆسایدناساندنی ئەم تاوانەدا بیدەنگ بووە، ئەمەش مانای کەمتەرخەمی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە بەرامبەر گەلی کورد لە ناساندنی ئەنفال وەک تاوانێکی جینۆساید، هەوەک چۆن لەکاتی ئەنجام دانی ئەم تاوانەدا بێدەنگ و بێهەڵوێست بوو، هۆکاری ئەمەش بە پلەی یەکەم ئەوەیە کە بە شێوازێکی زانستی کار لەسەر دۆسیەی ئەنفال نەکراوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی , بەڵام جێگەی باسکردنە کە هەندێک دەوڵەت لە ئاستی پەرلەماندا دانیان ناوە بە جینۆسایدی گەلی کوردا وەکو سوید و نەرویج بریتانیا لەساڵی ٢٠١٣ .

لەسەر ئاستی نیوخۆی عێراق ئەنفال بە جینۆساید ناسینراوە، ئەمەش بەپێی بڕیاری ژمارە (٢٦) ی پەرلەمانی عیراق لەبەرواری ٢٠٠٨/٤/١٤ دەریکردووە، هەروەها دادگای باڵای تاوانەکان پشت بەست بە یاسای ژمارە ١٠ ی ساڵی ٢٠٠٥ و بە دەرکردنی بریاری ژمارە ١ ی سالی ٢٠٠٧ دانی ناوە بە تاوانی ئەنفالدا وەک تاوانێکی جینۆساید، هەروەها لەسەرئاستی کوردستان دیسان تاوانی ئەنفال بە جینۆساید ناسێنراوە بە پیی یاسای ژمارە ٩ ی سالی ٢٠٠٧ ی پەرلەمانی کوردستان .

## کەیسی ئەنفال لە دادگا:

بەپیی یاسای ژمارە ١٠ ی ساڵی ٢٠٠٥ دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق پیکهات و دەسەڵاتی بینینی ئەو تاوانانەی پیدرا کە لە نیوان (١٩٦٨/٧/١٧ بۆ ٢٠٠٣/٥/١) ئەنجامدرا بوو، بەم پێیە تاوانی ئەنفال خرایە ژێردەسەڵاتی دادگای ناوبراو.

یەکەمین کەیس کە دادگا کاری لەسەرکرد کەیسی دوجێل بوو کە تیایدا سەدام حسین دادگای کرا لەسەر کوشتنی ١٤٨ کەس لە خەلکی دوجێل کە هەموویان شیعەمەزهەب بوون، لە ئەنجامدا دادگای ناوبراو سزای لە سێدارەدانی بۆ ناوبراو دەرکرد و لە ڕۆژی جەژنی قوربانـدا لە سیدارە درا بەبێ ئەوەی بیرلەوە بکرێتەوە کە لەسەر تاوانەکانی گەلی کورد دادگایی بکرێت، لە کاتێکدا بەپێی بنەمایاساییەکان تۆمەتبار لەسەر سەرجەم تۆمەتەکانی دادگایی دەکرێت و دواتر قورسترین سزای بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، ئەتوانین ئەمە بەخاڵێک دانێین لەوەی کە کەیسی ئەنفال وەک پێویست تائێستاش کاری لەسەر نەکراوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لەسەر ئاستی عێراقیش لە بابەتی قەرەبوودا کە دواتر باسی دەکەین.

سەبارەت بە کەیسی ئەنفال، دادگای باڵای تاوانەکان لە دوای (٦١) دانیشتن لەئەنجامدا بە بڕیاری ژمارە (١)ی ساڵی (٢٠٠٧) سزای لە سێدارەدانی بۆ چەند تاوانبارێک دەرکرد، لەوانە (عەلی حەسەن مەجید، سوڵتان هاشم و چەند تاوانبارێکی تر)، هەروەها بە بڕیاری ژمارە (١٠) لە بەرواری (٢٠٠٧/٦/٢٤) بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ ٤٢٣ تۆمەتبار دەرکرد کە لەو ژمارەیە ٢٥٨ کەسیان کورد بوون .

بڕیاری دەستگیرکردنی تۆمەتباران نێردرا بۆ هەرێمی کوردستان بۆجێبەجێ کردن، هەروەها ئەنجومەنی دادوەری هەرێمی کوردستان بە بڕیاری ژمارە (٩٤٣) لە (٢٠١١/٥/٥) فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ ئەوتۆمەتبارانە دەرکرد کە لە بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکاندا ناویان هاتبوو، بەهۆی ئەوەی کە تۆمەتباران دەستگیرنەکران بۆیە جارێکی تر ئەنجومەنی دادوەری بە بڕیاری ژمارە (٢٧٠) لە (٢٠١٥/٥/٧) بۆ جاری دووەم فەرمانی دەستگیرکردنی بۆ تۆمەتباران دەرکرد، بەڵام مایەی نیگەرانیە کە تا ئێستا داواکراوان دەستگیرنەکراون، ئەمەش خۆی بۆخۆی کاریگەری لەسەر بەجینۆسایدناساندنی تاوانی ئەنفال هەیە لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا، خۆ ئەگەر پاساوی دەستگیرنەکردنیان ئەوەبێت کە پێشتر فەرمانی لێبوردنیان بۆدەرکراوە، ئەوە پاساوێکی نارەوا و نایاساییە، چونکە لە تاوانەکانی جینۆسایدا هیچ جیهەتێک مافی لێبوردنی گشتی نیە لە تۆمەتباران پشت بەست بە ڕێکەوتنامەی قەدەغەکردنی جینۆساید ١٩٤٨ و ڕێکەوتنامەی مافە مەدەنی و سیاسیەکان ١٩٦٦، واتە دەرکرنی هەرجۆرە لێبوردنیک لەو تۆمەتبارانە لەڕووی یاساییەوە هیچ هێزێکی یاسای نیە و پوچەڵە، هەربۆیە پێمانوایە ئەرکی پەرلەمانی کوردستانە بەدواداچوونی یاسایی وورد بۆ ئەم کەیسە بکات.

سەبارەت بە گەیاندنی کەیسی ئەنفال بۆ دادگای تاوانکاری نێودەوڵەتی، دەتوانین بڵێین ئەم دادگایە دەسەڵاتی بینینی تاوانی ئەنفالی نیە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: یەکەم لەبەرئەوەی عێراق ئەندامی ڕێکەتنامەی دروستبوونی دادگا نیە و لە کاتی دروستکردنی دادگای ناوبراودا بە نەخێر دانگی دا، دووەم لەبەرئەوەی دادگای ناوبراو دەسەڵاتی بینینی ئەو تاوانانەی هەیە کە لە ٢٠٠٢/٧/١ بەدواوە ئەنجام دراون .

## قەرەبووی قوربانیانی ئەنفال :

بەشێوەیەکی گشتی هەموو تاوانێک دەرئەنجامێکی زیانبەخشی لێ دەکەویتەوە، کەسی زەرەرمەند مافی بەرزکردنەوەی داوای قەرەبووی هەیە لەسەر ئەوکەسەی تاوانەکەی ئەنجام داوە، بەمەرجێ پایەکانی بەرپرسیارێتی بێتەدی کە بریتیە لە (هەڵە و زەرەر و پەیوەندی هۆکاری نێوانیان) .

لە بنەڕەتدا دوو جۆر قەرەبوو هەیە كە بریتین لە قەرەبووی مادی بۆ زیانە مادییەكان، قەرەبووی ئەدەبی بۆئازارو زیانە ئەدەبییەكان، لیرەدا مەبەستمانە بڵێین تاوانی ئەنفال زیانی مادی و ئەدەبی زۆری لێ كەوتوەتەوە، ئەویش بە سوتاندنی ماڵ و موڵك و گوند و بەرووبومی كشتوكاڵی و مەڕوماڵات و گۆڕینی دیمۆگرافی ناوچەكان، پاشان كوشتنی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار خەڵكی بێتاوان، دەكرێ بڵێین قەرەبووی ئەو زیانانە بە ملیارەها دۆلار مەزەندە دەكرێ.

لە تاوانە نیودوڵەتییەكاندا وەكو تاوانی ئەنفال دووجۆر بەرپرسیاریتی درووست دەبێت، ئەویش بەرپرسیارێتی تاوانكاری نێودەوڵەتی و بەرپرسیارێتی مەدەنی نێودەوڵەتیە، یەكەمیان دەكەوێتە ئەستۆی كەسی تاوانكار وەكو سەدام وهاوكارەكانی، دووەمیان ئەكەویتە ئەستۆی ئەودەوڵەتەی كە تاوانەكە لە سایەیدا ئەنجام دراوە كە دەوڵەتی میراتگرە پشت بەست بە بنەمای (مبدا التوارث الدولة)، كە لە تاوانی ئەنفالدا دەوڵەتی ئێستای عێراق دەگریتەوە بە پێی مادەی ٢٦ لە پرۆژەی بەرپرسیارێتی دەوڵەتان بەرامبەر كارە نارەواكانیان، بەڵام تا ئێستا دەوڵەتی عێراق بەم ئەرك و پابەندییەی خۆی هەڵنەستاوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی كە مادەی ١٣٢ ی دەستووری عێراق هاتووە، ئاماژەیە بۆ بەرپرسبوونی دەوڵەتی عێراق بە قەرەبووكردنەوەی سەرجەم زەرەرو زیانەكانی قوربانیانی ئەنفال.

جێگەی ئاماژە بۆ كردنە كە دادگای باڵای تاوانەكان دەبوایە لە بڕیاری ژمارە ١ی ساڵی ٢٠٠٧دا لە خەزینەی گشتی عێراق قەرەبووی كەس وكاری قوربانیانی ئەنفالی جێگیربكردایە، بەڵام لە بری ئەمە مافی داوە بە زیان لێكەوتوان كە بگەڕێنەوە بۆ دادگای تایبەتمەند بۆ داوای قەرەبوو، ئەمەش لەتاوانە ئاساییو نێوخۆییەكاندا دروستە بەپێچەوانەی تاوانە نێودەوڵەتیەكانەوە، واتە دادگای باڵای تاوان لەبابەتی بڕیاردان لە قەرەبووی كەیسی ئەنفالدا وەك پێویست نەبووە و دادپەروەری بەدی نەهێناوە، سەرەرای ئەوەی كە سكاڵاكاران لەبەردەم دادگادا داوای قەرەبوویان كردووە و وەكو لە ووتەی یەكێكیان دا هاتووە كە ئەڵێ ((هەموو سامانی دونیا قەرەبووی پەنجەیەكی باوكم ناكاتەوە، بەڵام بەمافی یاسایی خۆمی دەزانم كە داوای قەرەبوو بكەم))، ئەمەش پێشێلكردنی مافی یاسایی كەسوكار و زیانلێكەتوانی تاوانی ئەنفالە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە و پێشلكردنی مادەكانی ٢١٩ و ٢٠٢ و ٢٠٣ و ٢٠٤ و ٢٠٥ لە یاسای شارستانی

عێراقی، ئەمە جگە لەوەی کە لە خەزێنەی گشتی عێراق قەرەبووی زیانەکانی کەیسی دوجێل کرایەوە، ئەمەش خۆی بۆخۆی جیاکاریەکی نایاسایی و نادەستوریە لە نێوان هاوڵاتیانی عێراق دا .

ئەوەی کە پەیوەندی بە حکومەتی هەرێمەوە هەیە لەم کەیسەدا ئەوەیە کە دەتوانین بڵێین وەک پێویست و بەشێوەیەکی زانستی کاری لەسەر کەیسی ئەنفال نەکردووە، هەرچەند کۆمەڵێ هەوڵ دراوە لەوبارەیەوە، بۆ نمونە لە ساڵی ٢٠١٣ وە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی هەرێم کاری لەسەر پرۆژەیاساییەک کرد تایبەت بە ناچارکردنی حکومەتی عێراق بە پێدانی قەرەبووی تاوانەکانی ئەنفال، بەڵام ئێمە پێمان وایە بابەتی قەرەبووی قوربانیانی ئەنفال پێویستی بە یاسای نوێ نیە و ئەو دەق و بنەما یاساییانەی باسکرا بەڵگەی تەواون لەوبارەیەوە، خۆ ئەگەر باسی ئەو پاداشتە مانگانەیەی بکەین کە حکومەتی هەرێم بە پێی یاسا دەیدات بە کەسوکاری سەربەرزی ئەنفال کراوان ئەوا دەڵێین ئەو پاداشتە بە قەرەبوو دانانرێت، چونکە قەرەبوو لەسەر ئەولایەنەیە کە هەڵە و تاوانەکی ئەنجام داوە کە دەوڵەتی عێراقە .

لە دۆخیکی وادا کە دەوڵەت بە ئەرکی یاسایی خۆی هەڵناسێ بەرامبەر بە قوربانیان، ئەرکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیە بە بڕیارێکی تایبەت پابەندی دەوڵەتی عێراق بکات لە پێدانی قەرەبووی شایستەی زیانلێکەوتوان، وەکو چۆن بە بڕیاری ژمارە (٩٨٦/ ١٩٩٢) عێراقی پابەند کرد بە قەرەبووی زیانەکانی داگیرکردنی دەوڵەتی کویت، کە تا ئەم ساڵانەی دوایی ساڵانە لە بوودجەی عێراق ڕێژەیەکی بۆ قەرەبووی کویت تەرخان دەکرا، هەموو ئەو بنەما یاساییانەی کە باسکرا وەک دەرەچەیەکی یاسایی بۆ وەرگرتنی قەرەبوو لە خەزێنەی گشتی عێراق دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ.

قەرەبووی قوربانیانی ئەنفال تەنها قەرەبووی مادی ناگرێتەوە، بەڵکو قەرەبووی ئەدەبیش دەگرێتەوە، قەرەبووی ئەدەبی و مەعنەوی ئەمەیان پارەی ناوێ و پێویستە لەسەر دەوڵەتی عێراق بە فەرمی داوای لێبوردن لە گەلی کورد بەگشتی و کەسوکاری ئەنفالکراوان بە تایبەتی بکات، ئەم جۆرە لە قەرەبوو کاریگەری هەیە لەسەر لایەنی دەروونی کەسوکاری ئەنفالکراوان، جگە لەوەش بۆ بڕیاردان لەسەر قەرەبووی مادی و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش کاریگەری دەبێ.

ماوەتەوە بڵێین کە ئەو دووجۆرە بەرپرسیارێتیەی لە تاوانی ئەنفالدا دروست بووە بە تێپەڕبوونی کات بەسەرناچێ، بە مانا یاساییەکەی تقادم ناکات، هەربۆیە دەکرێ لە

دادگای بەرایی داوای قەرەبووی تاوانی ئەنفال بەرزبکرێتەوە و ئەو بەڵگانەش کە بەردەستن و بڕیاری دادگای باڵای تاوانیش پابەندی دادگا دەکات بە دەرکردنی حوکمی قەرەبوو و پابەند کردنی حکومەتی ناوەند بە بژاردنی زیانەکان و کەسوکاری قوربانیان لە بوودجەی گشتی عێراق، بەڵام ئەمەش ڕێگەیەکی ئاسان نیە و پێویستی بە لێکتێگەیشتینی سیاسی هەیە، هەر بۆیە پێشنیاردەکەین بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد لەکاتی دانووستان لەسەر پێکهێنانی حکومەتی نوێ بیرێک لەمافی کەسو کاری ئەنفالکراوان بکەنەوە و لە گفتۆگۆکان دا بەهەند وەری بگرن .



پ. د. ئومێد بەرزان برزو
بەڕێوەبەری سەنتەری جینۆساید

# سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان و هەنگاوانان بەرەو خزمەتێکی نەتەوەیی و نیشتمانی بە پرسی تاوانی کۆمەڵکوژیی کورد

پێشەکی:

کۆمەڵکوژی (جینۆساید) یەکێکە لە سیما دیارەکانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی، ئەم تاوانە بەدرێژایی سەردەمە مێژووییەکانی مرۆڤایەتی لە کات و شوێنی جیاجیا بەرانبەر بە گروپە نەتەوەیی و نەژادی و ئاینی و مەزهەبییەکاندا بەکارهاتووە .

شالاوی بەدناوی ئەنفالیش وەکو تاوانێکی جینۆساید دژ بە نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەمەبەستی قڕکردن و زیندەبەچاڵکردنی خەڵکی بێتاوان و خاپوورکردن و وێرانکردنی لادێکان و ڕووخاندنی ژێرخانی ئابووری و سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی و مێژوویی و کەلتوری و جوگرافی کوردستان ئەنجامدرا، وێڕای خراپی کاریگەرییەکانی لەسەر کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، ئەمەش تاوانیکی مرۆییە، کە دەرهەق بە گەلی کورد کراوە، بۆیە ئێمەی کوردیش بەدرێژایی مێژوو خاک و نیشتمانمان داگیرکراوە و بە هەموو شێوەیەک لەلایەن دوژمنانەوە هەوڵدراوە، نەخشەی سیاسیی وڵاتەکەمان بشێوێنن و پارچەپارچەی بکەن، لە هەمان کاتیشدا نەتەوەکەمان پەرتەوازەبکەن و زمانەکەمان لێ قەدەغەبکەن. ئەمانە هەمووی سیاسەتی ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکان بووە بەرانبەر بە نەتەوەی کورد، باشترین نموونەش بۆ ئەمە، سیاسەتی حکومەتی شۆفێنی عێراقی بوو بەرانبەر بە نەتەوەی کورد لە باشووری کوردستان تا پرۆسەی ئازادیی عێراق، ئەویش بەپیلان و سیاسەتی بەعەرەبکردن و بەبەعسیکردن و ڕاگواستن




و ئاوارەبوون و دەربەدەرکردن و پاکتاوکردن و وێرانکردنی لادێ و ناوچە کوردنشینەکان و قەدەغەکردنی خوێندن و نووسین بە زمانی دایک و تاڵانکردنی ماڵی خەڵکی و داگیرکردنی زەوی و زاری جوتیاران و بەهەدەردانی سامانی نەتەوەیی لە خزمەت سەربازی و ...تد بووە.

لە ساڵیادی ئەنفال (٢٠١٠/٤/١٤)، زانکۆی گەرمیان وەک یەکێک لە گرنگترین دەستکەوتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دەڤەری گەرمیان دامەزرێنرا. لەم زانکۆیە ساڵانە چەندین چالاکیی زانستی و ڕۆشنبیری و هونەری لە یادەکانی کیمیابارانی هەڵەبجە و جینۆسایدی نەتەوەی کورد و هەروەها دەرکردنی بڵاوکراوە ئەنجامدراون، پاشان خۆشبەختانە بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی ژمارە (١٥٩٢٢) لە (٢٠٢٣/٨/٢١) سەنتەری جینۆساید لە زانکۆمان کرایەوە، ئەم زانکۆیە وەک ناوەند و دامەزراوەیەکی زانستی و ئەکادیمی لە ناوچەکەدا بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت لە ڕێگەی ئەم سەنتەرەوە خزمەت بە نەتەوەکەی و دەڤەرەکەی بکات لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی کەیسی تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال لە گەرمیان و کوردستاندا، بۆیە چەندین پلانی درێژخایەن و کورتخایەن لە بەرنامەی کارو چالاکییەکاندایە، لێرەوە جێگەی خۆیەتی سوپاس و پێزانینی خۆمان ئاراستەی زانکۆ و هەموو ئەو کەس و توێژەر و ڕێکخراو و لایەنانە بکەین بەتایبەت لیژنەی چالاکییەکانی زانکۆمان، کە دڵسۆزانە و خەمخۆرانە لە خزمەت کارو چالاکییەکانی زانکۆمان بوون چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی زانکۆ، هەروەها کردنەوەی سەنتەری جینۆسایدی زانکۆمان بوون، لە کۆتایدا سەری ڕێزو نەوازش بۆ گیانی پاکی شەهیدان و ئەنفالکراوان دادەنوێنین.

## ناساندن و ئامانجی سەنتەرەکە:

سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان بریتییە لە ناوەندێکی ئەکادیمی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەرجەم ئەو بوارو لایەنانەی کە تایبەتن بە تاوانەکانی جینۆساید چ لەسەر ئاستی نێوخۆیی چ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ڕوویانداوە، کە دژ بە گەلی کورد و گروپە نەتەوەیی و ڕەگەزی و نەژادی و ئاینییەکانی تر ئەنجامدراون.

زانکۆی گەرمیان وەک دامەزراوەیەکی زانستی و ئەکادیمی لە ناوچەکەدا بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت لە ڕێگەی ئەم سەنتەرەوە خزمەت بە نەتەوەکەی و دەڤەرەکەی بکات لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی کەیسی تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال لە گەرمیان و کوردستاندا.

ئەم سەنتەرە بەپێی فەرمانی وەزاری/ دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری/ بەڕێوەبەرایەتی جۆری و متمانەبەخشین ژمارە (١٥٩٢٢) لە (٢٠٢٣/٨/٢١) دامەزراوە و بەپێی فەرمانی زانکۆیی ژمارە (٣١٨) لە (٢٠٢٤/١/١٧) وەک یەکەم بەڕێوەبەری دەستبەکاربووم.

## گرنگترین ئەرک و ئامانجی سەنتەرەکە:

١. بەجیهانیناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد لەسەر ئاستی عێراق و نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان.

٢. ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی بەڵگەنامەکان تایبەت بە تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال دژ بە گەلی کورد و مرۆڤایەتی لەپێناو پاراستن و مانەوەیان لەلایەک و لەلایەکی ترەوە ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی و کتێب و بڵاوکراوەکان لە بارەیانەوە.

٣. خستنەگەڕی هەموو توانا زانستییەکان لە ناوەوە و دەرەوەی زانکۆ بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی جۆراوجۆری وەک لە بوارەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و مێژوویی و زمانی و کەلتوری و ...هتد لە سەرجەم ڕەهەندە جیاوازەکانی تاوانی ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورددا.

٤. هۆشیاركردنەوە و زیندووڕاگرتنی ئەم تاوانانە لە بیر و هزری تاكی كورد و مرۆڤایەتییدا، هاوكات چەسپاندن و دانانی پرۆگرامی تایبەت بەم تاوانانە لە ناوەندەكانی خوێندن لە دامەزراوەكانی حكومەت بەتایبەت وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا.

٥. هەماهەنگی لەگەڵ سەنتەرەكانی هاوشێوە لەسەر ئاستی نێوخۆیی و دەرەكی لەپێناو كاركردنی بەكۆمەڵ (دەستەجەمعیە) بۆ زیاتر بەهێزكردنی ناساندنی كەیسی جینۆسایدی كورد.

٦. هەماهەنگی لەگەڵ ڕێكخراوە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەكان لەپێناو خزمەتكردنی كەیسی ئەنفال و جینۆساید و ئەنجامدانی كارو چالاكیی فرەجۆر.

## هۆكار و گرنگی دامەزراندنی سەنتەر:

١. دەڤەری گەرمیان هاوشێوەی زۆربەی ناوچە و دەڤەرەكانی تری كوردستان بەر شاڵاوەكانی ئەنفال و جینۆسایدكردن كەوتووە و زۆرترین قوربانی مادی و مەعنەوی بەركەوتووە، هەر بۆیە بە هۆكارێكی گرنگ دەزانرێت، تاوەكو زۆرترین بەڵگەی پێویست لەسەر تاوانەكانی ئەنفال و جینۆسایدی ناوچەكە و دەرهاویشتەكانی ئەم تاوانانە لەم سەنتەرەدا كۆبكرێنەوە، هاوكات كۆكردنەوەی بەڵگە لە بەجێماوان و ڕزگاربووانی تاوانی ئەنفال و لێكۆڵینەوە و پۆلكردن و بژاركردنی زانیارییەكان و بەدكیۆمێنتكردنیان و پاراستنیان بە ڕێگەی زانستی پێویستە. بێگومان وەرگرتنی زانیارییەكان لە زمانحاڵی قوربانیانی دەستی ئەم تاوانانە خۆیان، كە لە ژیاندا ماون، كارێكی زانستییانەتر و بەپێزتر دەردەچێت. تەنانەت بەگرنگ دەزانرێت، تاوەكو كەسوكاری سەربەرزی ئەنفالكراوان لە ژیاندا ماون، لەسەر زاری



خۆیانەوە و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ زانیارییەکان ئەرشیف بکرێن و بە دەنگی و ڕەنگی و ڤیدیۆیی تۆماربکرێن، تاوەکو بخرێنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە لە هەموو ڕوویەکەوە ئەمە لەلایەک، لە لایەکی ترەوە لە کێشە و گرفتییان بکۆڵرێتەوە بەرانبەر بەو تاوانانەی کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە.

٢. توێژەران و فێرخوازان لە ڕێگەی ئەم سەنتەرەوە دەتوانن سوود لە ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی بەڵگەکان لەسەر تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال دژ بە گەلی کورد وەربگرن، تاوەکو توێژینەوەی زانیستیی جۆراوجۆر لە بوارەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و مێژوویی و زمانی و کەلتوری و ...هتد لە قۆناغەکانی زانکۆیی و خوێندنی باڵا و نوسینی کتێب و بواری شانۆیی و هونەری ...ئەنجامبدەن.

٣. ناساندنی ئەو تاوانانەیە کە دژ بە گەلی کورد و دەڤەری گەرمیان وەک تاوانێکی جینۆساید ئەنجامدراون، کە پێویستی بە هەوڵی جدی و هەمەلایەن هەیە، بەتایبەت بەسوودوەرگرتن لە پسپۆری کەسە ئەکادیمییەکان بۆ دۆکیۆمێنتکردن و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی زانستی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سەرجەم ڕەهەندەکانی تر.

٤. نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان بەدرێژایی مێژوو هاوشێوەی زۆربەی نەتەوەکانی تری دونیا ڕووبەڕووی چەندین تاوانی کوشتن و لەناوبردن و ڕاگواستن و ... بووەتەوە، کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ڕێگەپێدراو نین و بە تاوانی نێودەوڵەتی ناسراون. بەمەش مێژووەکەی پڕ لە تاوانی گەورە و دڵتەزێنی هەیە، بەڵام نەتوانراوە بە شێوەیەکی ئەکادیمی وەک پێویست توێژینەوەی لەسەر بکرێت و ببێتە خاوەن گێڕانەوەی مێژوویی خۆی و هەروەها کۆنەکردنەوەی بەڵگە حاشا هەڵنەگرەکان لەسەر ئەم تاوانانە، هاوکات نەتوانراوە وەک هەموو تاوانەکانی تری جیهان بە جیهانی بکرێت و بناسرێت و سوود لە بەڵگەکان وەربگیرێت، تاوەکو لەسەر ئاستی جیهان وەک تاوانی جینۆساید بناسرێت و ڕێگە لە ئەگەری دووبارەبوونەوەیان بگیرێت و تاوانباران بە سزای ڕاستەقینەی خۆیان بگەیەنێن.



**پلانی سەنتەرەکە (درێژخایەن و کورتخایەن):**

١. دانانی سەنتەری DNA بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی لە گۆڕە بەکۆمەڵەکان.

٢. دانانی کتێبخانەیەکی تایبەت بە کتێب و گۆڤار و لێکۆڵینەوە زانستییەکانی تایبەت بە تاوانەکانی ئەنفال و جینۆساید.

٣. دروستکردنی مۆزەخانەیەکی نیشتمانی بۆ پاراستن و بە دیکۆمێنتکردنی کەلوپەل و بەڵگەکانی زیانلێکەوتووانی تاوانی ئەنفال و جینۆساید. تەنانەت و گرنگتریش وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانەکانی تر بە مەبەستی ناساندنی ئەم کەیسە لای نەتەوەکانی تری جیهان و بەتایبەت بەجینۆسایدناساندنی گەلی کورد.

٤. ئەرشیفکردن و دیکۆمێنتکردن و دیجیتاڵکردنی بەڵگەنامە مێژووییەکان و بڵاوکردنەوەیان لە چوارچێوەی کتێب و (دی ڤی دی) و وێبسایتەکان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە.

٥. دروستکردنی مۆنۆمێنتی جینۆساید و مەزارگە و شوێنی پێویست لەناو زانکۆدا بۆ یادکردنەوە و ئاشناکردنی نەوەکان بە تاوانە ناڕەواکانی دەسەڵاتدارانی ڕژێمی پێشوو دەرهەق بە گەلی کورد.

٦. ئەنجامدان و ڕێكخستنی كۆڕ و كۆبوونەوە و پانێڵ و ووركشۆپ و كۆنفرانس لەناو زانكۆ و زانكۆكانی تر و ئاستی نێوخۆیی و دەرەوە بەمەبەستی زیندووڕاگرتن و باشتر ناساندنی كەیسەكانی تایبەت بە ئەنفال و جینۆسایدی كورد.

٧. دەركردنی گۆڤار و بڵاوكراوەی تایبەت.

٨. هەوڵدان بۆ دانانی پرۆگرامی خوێندن تایبەت بەم تاوانانە لە ناوەندەكانی خوێندن لە دامەزراوەكانی حكومەت بەتایبەت وەزارەتی پەروەردە و خوێندنی باڵا.

٩. هەوڵدان بۆ پێكەوەگرێدانی لینكی پەیوەندی ئەم سەنتەرە لەگەڵ سەنتەری زانكۆكانی تر و ڕێكخراوەكانی تایبەت بەم تاوانانە بۆ ئاگاداربوون لە چالاكییەكان و كاركردنی بەكۆمەڵ.

١٠. ئەم سەنتەرە هەوڵدەدات بە هاوبەشی لەگەڵ توێژەران لە بەشە جیاجیاكانی زانكۆ وەك (یاسا، دەروونناسی، كۆمەڵناسی، زمان و ئەدەب، ڕاگەیاندن، جوگرافیا، ....) لە ناوەوەی زانكۆ و دەرەوەی زانكۆ لەپێناو ئەنجامدانی توێژینەوە و كارو چالاكی فرەجۆر.

١١. ئەنجامدانی كاری هونەری و سینەمایی تایبەت بە تاوانەكان.

١٢. ئاشناكردنی خوێندكارانی زانكۆ بە تاوانەكانی دژ بە گەلی كورد و گەلانی تری جیهان لە ڕێگەی سەردانیكردنی تاك و بەگرووپی بەشەكانیانەوە، هاوكات وتنەوەی وانە لە پسپۆری و بوارە جیاجیاكانی تایبەت بە تاوانەكانی جینۆسایدی كورد بە میوانانی ناوەوە و دەرەوەی زانكۆ.

١٣. دروستكردنی پردێكی پەیوەندی لەنێوان پەرلەمان و حكومەت و كەسوكاری سەربەرزی شەهیدان و ئەنفالكراوان بۆ هەموو كاروبارێكی دارایی و تەندروستی و خزمەتگوزاری.

١٤. دروستكردنی پردی پەیوەندی لە نێوان زانكۆی گەرمیان و لایەنە پەیوەندییدارەكان بۆ ئەنجامدانی كۆنفرانسی زانستی لە سەر ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی بەمەبەستی زیاتر ناساندنی ئەم كەیسە هاوشێوەی جینۆسایدی ئەرمەنەكان و هۆلۆكۆست و بۆسنە و ڕەواندا و ...هتد.

## كارو چالاكییەكانی سەنتەرەكە:

هەڵبەت سەرەتای دانانی بەردی بناغەی ئەم سەنتەرە لە دروستكردنی یەكەی كارگێڕییەوە دەستیپێكرد وەك دابینكردنی شوێنی سەنتەرەكە و دانانی بەڕێوەبەر و فەرمانبەرەكان، پاشان توانیمان كتێبخانەیەكی نیشتمانی بۆ كۆكردنەوەی سەرچاوە و بەڵگەنامەكان و نامە زانكۆییەكان و ئینجا دروستكردنی هۆڵێكی تایبەت بە سەنتەری جینۆساید بۆ ئەنجامدانی كۆڕ و كۆبوونەوەكان ئامادەبكەین، بەردەوام دەبین لە فراوانكردن و دەوڵەمەندكردنی سەنتەرەكە، دەتوانین لێرە گرنگترین ئەو كارو چالاكیانەی سەنتەرەكە لە ماوەی دەستبەكاربوونمان لەم خاڵانەدا بخەینەڕوو:

یەكەم/ بەشداریكردن لە ڕێوڕەسمی (٣٦)ەمین ساڵیادی تاوانی ئەنفال و كۆمەڵكوژیی كورد لە ناحیەی زنانە و گوندی بەلەگە (ناوچەی داوێ) لە ڕێكەوتی (٢٠٢٤/٤/٧).

دووەم/ بەشداریكردن لە سێیەمین كۆنگرەی ((كۆمەڵەی داكۆكی لەپرسی ئەنفال)) بە دروشمی (جێبەجێكردنی بڕیارەكانی دادگای باڵای تاوانەكانی عێراق لەسەر كەیسی تاوانی ئەنفال).

سێیەم/ بەشداریكردن لە مەراسیمی ساڵیادی (٣٣)ی ساڵەی شەهیدی سەركردە (سەید نوری سەید حسێن).

چوارەم/ بڵاوكردنەوەی گۆڤاری جینۆسایدی ژمارە (١) لە (٢٠٢٤/٤/١٤)، كە گۆڤارێكی ڕۆشنبیریی گشتییە لە ماڵپەری سەرەكی زانكۆی گەرمیان و ماڵپەری وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی بە هەر سێ زمانی (كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی).

پێنجەم/ یادكردنەوەی (٣٦)ەمین ساڵیادی ئەنفال لە (١٤/ ٤/ ٢٠٢٤) و بەشداریكردن لە چەند چالاكییەك تایبەت بەو یادە:

ا/ كردنەوەی پێشانگایەكی گەلەری لەلایەن كۆمەڵێك هونەرمەندی گەرمیان لە مۆنۆمێنتی فەرەنجییەكەی ڕزگاری.

ب/ سەردانیكردنی مەزاری شەهیدانی دێبنە و دانانی تاجەگوڵینەی وەفاو ڕێز بۆ گیانی پاكی ئەنفالكراوان و شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری كورد و كوردستان

پ/ ناشتنی (١٨٢) نەمام بەسەرپەرشتی بەڕێز (دیار ئومێد حمەئاغای باجەڵان) سەرۆكی ڕێكخراوی باجەڵان.

شەشەم/ بەشداریكردن لە مەراسیمی یادكردنەوەی شەهیدان و ئەنفالكراوانی (گوندی قەڵاچەرمەڵە) كە ناوی شەهیدان و ئەنفالكراوانی گوندەكە لەسەر دیواربەندیەک نەخشاندبوو لە (١٥-٤-٢٠٢٤).

حەوتەم/ بەشداریكردن لە مەراسیمی یادكردنەوەی تاوانی ئەنفال لە شاری كفری لە (٢٠٢٤/٤/١٦)، لە دەستپێكی چالاكییەكاندا، مەراسیمی دانانی تاجەگوڵینەی وەفا بۆ شەهیدانی ئەنفالكراوان لە دەروازەی شاری كفری دانرا، پاشان بەڕێوەچوونی مەراسیمی وتارخوێندنەوە و پێشكەشكردنی پانێڵێک لەلایەن (پ.د. ئومێد برزان برزو ، د. ڕێبوار محمد صالح، بەڕێوەبەری پانێڵ/ م. دڵنیا محمود)، دابەشكردنی خەڵات بەسەر كەسوكاری شەهیدانی بەرگری لە تاوانی ئەنفالی ١٩٨٨، پاشان مەراسیمی ناونانی خوێندنگەیەک بەناوی شەهیدانی ئەنفال بەڕێوەچوو.

هەشتەم/ دیداری ساڵانەی ئەنفال بۆ ماوەی دوو ڕۆژ (٢٣-٢٤/ ٤ / ٢٠٢٤).

نۆیەم/ دیداری زانستیی دادوەری جوانەمەرگ (د. فەرهاد حاتەم) لە (٢٠٢٤/٤/٣٠).

دەیەم/ سەنتەری جینۆسایدی زانكۆی گەرمیان بە هاوبەشی یەكێتیی نووسەرانی جینۆسایدی كوردستان مەراسیمی ناساندنی كتێبی (كەشتی ئەنفال) بۆ نووسەر (جوتیار ناشاد) و لە خوێندنەوەی (م. بەهمەن كاكەزاڵ) و بەڕێوەبردنی دانیشتنەكە لەلایەن (م. دلێر كەریم) لە هۆڵی سەنتەری جینۆسایدی زانكۆ لە (٢٠٢٤/٥/٢٨) بەڕێوەچوو.

یازدەم/ بەشداریكردن لە سێیەمین كۆنفرانسی نێودەوڵەتیی جینۆساید و بونیادی ئاشتی زانكۆی سلێمانی بۆ ماوەی دوو ڕۆژ (٢٩-٢٠٢٤/٥/٣٠).



محەمەد عەلی شوێنەوار
بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار و
کەلەپوری گەرمیان

# گردی بانتەپە و ژیان لە قوناغێکی مێژوویی لە چەقی کەلار

ئـەم بابەتـە پوختەیەکـە لـە دەرئەنجامـە سـەرەتاییەکانی کاری کنەوپشـکنین لـە گـردی بانتەپـە (گردپـارک)، کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە کۆمەڵـێ لایەنـی سـەرەکی پەیوەسـت بـە ژیانـی ئـەو خەڵکـەی لـەو سـەردەمانە لـە بانتەپـە ژیـاون، وەک (گـۆڕ و ناشـتن، گیانـەوەر و دانەوێڵـە، لایەنـی بیناسـازی و گرنگتریـن پاشـماوە دۆزراوەکان)، هەروەهـا بابەتەکـە گرنگیـداوە بـە پاشـماوەکانی وەک (شووشـەکان، گڵێنـەکان، پاشـماوە کانزایـی و بەردینیـەکان)، پـاش ئـەوەی وەک مادەیەکـی خـاو؛ مـرۆڤ بـۆ کۆمەڵـێ کەرەسـتەی گۆڕیـون و بـە مەبەسـتی پێداویسـتی ڕۆژانـە و خشـڵ و جوانـکاری بەکارهێنـراون.



وێنەی چاڵەکانی وەرزی دووەمی کارکردن لە گردی بانتەپە، ٢٠٢٣ز

بانتەپە گردێکی فراوانە لە ناوەڕاستی شاری کەلار، ئەم گردە دەکەوێتە ژێرهەر یەک لە پارکی شاری یاری کەلار و بیناکانی باشوری پارکەکە و جووت سایدەکەی پێشی، گۆمانیش دەکرێت درێژببێتەوە بۆ ژێر باخچەکانی پشت قایمقامیەی شار. بۆ یەکەمجار لە ساڵی ٢٠١٧ بەهۆی دەرکەوتنی چەند گۆزەیەکەوە، بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان لایەنە پەیوەندیدارەکانی ئاگادارکردۆتەوە کە ئەم شوێنە دەکرێ گردێکی




وێنەی چاڵەکانی وەرزی یەکەمی کارکردن لە گردی بانتەپە، ٢٠٢١ز

ئەم گردەش بێبەش نەبووە لەو شارستانیەتە دەوڵەمەندانە و بەشێکی زۆر لە پاشماوە دۆزراوەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو دوو سەردەمە , گرنگترین ئەو ناوچانەش کە توێژینەوەیان لەسەر کراوە بریتیین لە (دوو گۆڕەکەی بەرلووت) لە کەلار , کە پێکدێت لە دوو گۆڕ و چەندین پاشماوەی هەمان سەردەم (کریم , ٢٠١٩ , ل٩١)، شوێنەواری گۆڕگردۆلکەی سەرقەڵا (٥٧پ.ز- ٢٠٧ ز) لە شارەدێی (سەرقەڵا- کفری) , ئەمەش بریتیە لە گۆڕێکی خێزانی لە شێوەی ژوورێکی بچوکی لە خشت دروستکراوە , پاشماوەی چەندین ئێسکە پەیکەر , دراو , کانزاو گلێنەی تێدا دۆزراوەتەوە , (کریم , ٢٠١٩ , ل١٢٣) گۆڕەدخمەکانی کفری و گرد یەغنی و چەند چینێکی گرنگی گردی شێروانەش , بەشێکی گرنگی ئەم شارستانیەتەن , (عبدالکریم , ٢٠٢٠ , ل٢٣٧)، گرنگترین دۆزینەوەکانی گردی شێروانە , دەرکەوتنی گۆڕێکبوو لە تابوتێکی گلێنەیی نیمچە بازنەیی , چەند پاشماوەیەکی وەک (زێڕی سینەبەن ) و گلێنە (گۆزەی قومقومەی تایبەت بەم شارستانیەتە) ... هتد، تێدا دۆزرایەوە (کریم , ٢٠١٨ , ل٣٠).

ئەم ناوچەیە بە ئاراستەی باشور بە نزیكەی (١كم) لە گرد بازاڕەوە دوورە، ئەو گردەی كە لە ساڵانی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو تەواوی بازاری كۆنی شارەكەی لەسەر بنیادنراوە، دیارە پێش ئەوەی بزانرێت ژێر بازارەكە ناوچەیەكی شوێنەوارییە؛ لە ساڵی ٢٠١٣ز لە كاتی لێدانی چاڵ بۆ یەكێك لە دووكانەكانی ناوەڕاستی بازارەكە، كۆمەڵێ پاشماوەی شوێنەواری دەركەوتن، كۆنترین پاشماوە و چینەكانی ئەم گردە بۆ چاخی شارستانیەتی كاشیەكان (١٥٩٥ – ١١٥٧ پ.ز) دەگەڕێتەوە (دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان، كنەوپشكنینی خیرا لە دوكانێكی ناو بازاری شاری كەلار، ٢٠١٣ز).

بەڕێوبەرایەتی شوێنەوار و كەلەپوری گەرمیان بە پێی یاسای ژمارە (٥)ی بەڕیوەبردن و پاراستنی شوێنەوار و كەلەپور لە هەریمی كوردستان/ ساڵی ٢٠٢١ز، بەشی دووەم/ ماددەی ژمارە (٩)، بڕیاریداوە كاری كنەوپشكنینی تێدا ئەنجامبدات، تا ئێستا دوو وەرز لە ساڵەكانی ٢٠٢١ز و ٢٠٢٣ز هەڵكۆڵینی شوێنەواری بۆ بەشێكی ئەم گردە بە ئەنجام بگەیەنێت، بە پێی یاسای ناوبراو تیمێكی زانستی خۆماڵی پێكهێنرا بۆ كاری كنەوپشكنین كە پێكهاتوون لە:

- محەمەد عەلی كەریم- شوێنەوار- سەرۆكی لیژنە
- نەوزاد عەبدولەتیف عەبدولكەریم- .شوینەوار- ئەندام
- جەمال محەمەد ساڵح- شوینەوار- ئەندام
- سەروەت حەمدان مەجید- شوینەوار- ئەندام

دواتریش شوێنەوارناس (عیماد ئیسماعیل مەدحت) بۆ لیژنەكە زیادكراو و ئەركی جێبەجێكردنی كاری كنەوپشكنینیان لە ئەستۆگرت.

لە كنەوپشكنینی وەرزی یەكەم/٢٠٢١ی ئەم گردە، شەش چاڵ لێدراوە بە ناوەكانی چاڵی (A, B, C, D, E, F)، )دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان، كنەوپشكنینی لە گردپارك، ٢٠٢١ز)، هەربۆیە لە كنەوپشكنینی وەرزی دووەم/٢٠٢٣ درێژە بەم پیتانە درا، توانرا چاڵەكانی (G, H, I, J, K, L, M, N) لێبدرێت (دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان، كنەوپشكنینی لە بانتەپە، ٢٠٢٣).




Fig. 4. Reconstructed digital elevation model.

Resolution: 1.61 cm/pix
Point density: 0.384 points/cm²



بەرزونزمی چاڵەكان بە پێی ئاستی ڕووی دەریا

## گۆڕ و مردوو ناشتن

لە ماوەی كاركردنی هەردوو وەرزی كنەوپشكنین لەم گردە، كۆمەڵێك گۆڕی جۆراوجۆر دۆزرانەوە، زۆربەی گۆڕەكان لەگەڵ ناشتنی مردووەكان كۆمەڵێ دیاریان بۆ دانراوە لە نموونەی (كەموڵە شووشە، گڵێنەی جۆراوجۆر، ئەڵقە و مستیلە ... هتد)، مردووەكان لە شوێنیكی تایبەت و نزیك لە یەكتر نەنێژراون، ئەمەش شتێكی ئاساییە، چونكە ئەم شوێنە گۆڕستانێكی تایبەت نەبووە، هەندێكیان هاوسەردەمی یەكترنین، ئەمەش زیاتر ڕوون دەبێتەوە كاتێك لێكدانەوە ئەكەین بۆ شێوازی ناشتن و ئەو دیارییانەی بۆیان دانراوە، گۆڕەكان بەپێی جەستەی مردووەكە و شێوازی ناشتنەكەی هەڵكۆڵراون، ئەوەی دەركەوتووە لە هەندێك لە گۆڕەكان شێوەیەكی لاكێشەیی گۆشە نەرمیان وەرگرتووە.



نموونەیەک لە نێژراوەکانی گردی بانتەپە

نێژراوەکان لە هەموو ئاستەکانی تەمەنیان تێدایە وەک (منداڵ، لاو، پێگەیشتوو و گەورەتر)، ئەمانەش بە شێوازەکانی (کڕنووشی لەسەرلا، پاڵخستنی ڕوو لە ئاسمان) دانراون، هەندێک لە شێوە کڕنوشیەکان بە تەواوی هاتونەتەوە یەک و هەندێکی دیکەشیان تا ڕادەیەک کراوەترن.

## گیانەوەر و دانەوێڵە

لە کۆی چینەکانی هەریەک لە چاڵەکانی کارکردن لەکاتی دەرکەوتنیان بە وردی ئێسکە جۆراوجۆرەکانی گیانەوەران هەڵگیراوەتەوە، ئەمەش سودێکی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی بزانین ئەو ئاژەڵانە کامانەن کە لێرە بە خێوکراون، بێ گومان ئەم گیانەوەرانە بەمەستی جوراوجۆر بەخێوکراون وەک (بەکارهێنان، خواردنیان، خواردنی بەرهەمەکانیان ... هتد)، ئەوەی تا ئێستا ناسراوەتەوە لە ئێسکەکان بریتی بوون لە کۆمەڵێ گیانەوەری وەک مەڕ و بزن، تەمەن شەش مانگ بۆ یەک ساڵ، نموونەیەکی زۆر لە ئێسکی بەراز، کەرەکێوی لەو جۆرانەی کە ئێستا نەماون و لەناوچوون، پەلەوەر لە نموونەی (مراوی).



چەند نموونەیەک لە ئێسکە گیانەوەرییەکان

شوێنی چێشتخانەی ماڵەکان کە نیشتەنیەکی ڕەش و خوڵەمێشیە، چەندین نموونەی پارچە ئێسکی گیانەوەری دۆزراونەتەوە، هەندێک لەم ئێسکانە بە تەواوی سوتاون و هەندێکی تریان ئاسایی دەردەکەون.

لە دوان لە چاڵەکانی کارکردن وەک چاڵی (ئای و ئێل)، دوو گۆگای خۆراکی دەرکەوتن، ئەم کۆگایانە لە نزیک پاشماوەکانی بیناسازییەوە دەرکەوتن، کۆگاکەی تایبەت بە چاڵی (ئای) بریتی بوو لە کۆگایەکی خواردەمەنی ڕووەکی بە خەڵوزبوو، کە چەندین جۆری تۆوی ڕووەکی لێدۆزرانەوە، ئەم کۆگایە یان (چاڵی دانەوێڵە)، ڕووبەرێکی تاڕادەیەک نیمچە بازنەیی هەبوو، تیرەکەی نزیک دەبێتەوە لە (١,١٥م). وادەردەکەوێت کۆگاکە شوێنێک نەبووە بۆ ئامادەکردنی خۆراک، بەڵکوو بە مەبەستی هەڵگرتن و پاراستن کۆکراوەنەتەوە .



وێنەی دانەوێڵەی بەخەڵوزبوو و کۆگاکەی چاڵی (ئای)

بە گشتی لە زۆربەی چاڵەکانی هەڵکۆڵین لە بانتەپە، جێی سوتان و خۆڵەمێشی تایبەت بە خواردن و خواردنەوەکان دۆزراوەتەوە، ڕوونتر بڵێین ئەمانە وەکوو کوانوویەک لە چێشتخانەیەک دانراون، بەشێک لەم کوانوانە بە چواردەوریاندا پارچە گڵێنەی قەبارە جیاواز دەبینران، هەندێک لەمانە پارچەی کەلەپولەکانی چێشتاخانە و خواردن دروستکردنن، گرنترین جێ کوانووی تایبەت بە چاڵی ئێڵ، ئەم کوانووە چۆڵیەکی زۆری هەیە و چەند جارێک قەبارەکەی گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە، جگە لە دۆزینەوەی پارچە گڵێنەی سوتاو و ئێسکی سوتا و خۆراکی دیکەی بەخەڵوزبوو، لە هەمانکاتدا لە دانەوێڵە یان تۆوی خۆراکی بە خەڵوزبوو دۆزرانەوە.

## بیناسازی

بێگومان گردێکی فراوانی وەک گردی بانتەپە کە چەند چینێکی مێژوویی لە خۆدەگرێت، بێبەش نابێ لە بینا و پاشماوەکانی بیناسازی، دەرکەوتنی پاشماوەکانی بیناسازی بە شێوەیەکی پچرپچر لە زۆرێک لە چاڵەکان دەرکەوتن.

لە وەرزی یەکەمی کارکردن لە چاڵی (C) کۆمەڵێک شێوە دیواری قوڕین دەرکەوتن، ئەگەرچی بە هۆی تێکدان و شێواندنی گردەکە لەم ئاستەیدا؛ گریمانەکانی بیناسازی قورس کردبوو، بەڵام بوونی چینێکی نیشتووی قاوەیی، دەرکەوتنی ئێسکێکی زۆری

گیانەوەر، بەردی هارین، کانزا و گۆزەی قەبارە گەورە، وایلێ کردین سەرنجی زیاتری ئەوە بدەین کە ئەم شوێنە بینایەکی نیشتەجێبوون بووبێت.

بە شێوەیەکی تەواو لە کۆتا چینەکانی چاڵی (I) ڕاخەرێکی خشتیین دەرکەوتن، خشتەکان سورکراوەن بە پێوانەی (٣٠ بە ٣٠ بە ٥,٥سم)، ئەوەی لەم ئەرزییە ماوەتەوە بیست و یەک خشتبوون بە تەنیشت یەکترەوە بە شێوەیەکی ئەندازەیی دانراون، لە هەمووی گرنگتر بۆ توندوتۆڵکردنی خشتەکان؛ بوونی ڕاخەرێکی وردە زیخە لە ژێرەوەی خشتەکان، کە ئەستوورییەکەی نزیک دەبێتەوە لە (١٠سم)، وا پێ دەچوو لە پێش دانانی خشتەکان بە پەستانێکی بەهێز کوترا بێت.



وێنەی خشتەکان و ڕاخەری ژێر خشتەکان، چاڵی (ئای)

لە چاڵەکانی (J) و (L) ئەرزییەکی فراوانی خشت دەرکەوتن، چونکە ئەم دووچاڵە بە تەنیشت یەکترەوە بوون، ئەم ئەرزییە لە کاتی کارکردن لە کۆتا چینەکانی چاڵی (جەی) ئاماژەکانی کۆمەڵێ شێوە چوارگۆشە دەرکەوتن، چوارگۆشەکان بریتی بوون لە خشتی سورنەکراوەی قەبارە گەورە، قەبارەکانیان دەگاتە (٤٠سم بە ٤٠سم). ئەم خشتانە بەشێکی زۆری ڕووبەری چاڵەکانی داپۆشیبوو، خشتەکان وەک ڕاخەرێک بە شێوەیەکی ئاسۆیی ڕیزکراون، نێوانێکیان هەیە بە ئاسانی لە یەکتر جیادەکرێنەوە، بە گشتی خشتەکان پێکەوە شێوەیەکی نیمچە کەوانەییان وەرگرتووە، زیاتر ڕوویان لە خاڵێک کردووە، ئەوەی تیبینی دەکرێت چاڵێکی بچوکی بازنەیی لە ناوەڕاستی خشتەکان دەرکەوت، بە ئاسانی خۆڵی ناو ئەم چاڵە دەرهێنراوە، ڕەنگە جێی ستونێکی (دینگە) دار یان هەرمادەیەکی تر بوبێت، دیارە ئەم چاڵە بازنەییە بچووکە جاریکی تر لە نێو خشتەکانی چاڵی (ئێل) دووبارە ئەبێتەوە.



وێنەی چاڵەکاکانی (جەی و ئێڵ) لە ئاستی دەرکەوتنی ئەرزییەکە و پاشماوە کوانووییەک

لە باری ئەستوریشەوە ئەم ئەرزییە تەنها لە یەک چینە خشت پێکنەهاتوون، بەڵکوو لە پاش هەڵکەندن زیاتر ڕوون بوویەوە خشتەکان لە هەندێ شوێن سێ چینن بەسەر یەکترەوە، دیسانەوە نێوان خشتەکان بە خۆڵ پڕکراوەتەوە، بەڵام لێرەدا جیاوازەترە لە ئاستە ئاسۆییەکەی، چونکە مەودای نێوان خشتەکان بە باری ستونی وەک یەک نین.

## گرنترین پاشماوە دۆزراوەکان

لە ماوەی هەردوو وەرزی کارکردن لە گردی بانتەپە، کۆمەڵی پاشماوەی شوێنەواری جێدەستی مرۆڤ دۆزرانەوە وەک پاشماوە (شووشەییەکان، گڵێنەییەکان، کانزاییەکان، بەردینیەکان، ... هتد).

١- پاشماوە شووشەییەکان:

کۆمەڵێک لە پاشماوەی شووشەیی لە چینە جیاوازەکانی ئەم گردە دۆزراونەتەوە، بەشێک لەمانە پارچەی زۆر بچوک و شکاون، ئەمانە زیاتر بۆ ناسینەوەی جۆراوجۆری شووشەکان کۆکراونەتەوە، بەڵام کەڵکی زۆری لێ نەبینراوە، بەهۆی ئەوەی پارچەکان زۆر وردن و دۆخیان جێگیر نەبووە، بەڵام چەند نموونەیەک لە دەنکۆڵەی مووروو و کەمۆڵەی شووشەی ساغ یان نیوە ساغیش دۆزراونەتەوە، کە لەگەڵ پاشماوەکانی دیکەی دەوروبەری سودێکی زۆریان هەیە بۆ دیاری کردنی تەمەنی گردەکە، بە

شـێوەیەکی گشـتی مـوورو و کەمۆڵـە شووشـەکان لـە پـاڵ نێـژراوەکان لـە نێـو گـۆڕەکان دۆزراونەتـەوە، ئەمانـە وەک دیـاری لـە گـەڵ ناشـتنی مـردووەکان دانـراون.



نموونەیەک لە کۆمەڵە شووشەییەکان

٢- پاشماوە گڵینەییەکان

جگـە لـە خشـت و دیـوارە قوڕینـەکان؛ پاشـماوەیەکی زۆری گڵینەییـە لـە نموونـەی گـۆزە و جۆرەکانی لـەم گـردە دۆزراوەنـەوە، بـە شـێوەیەکی گشـتی گـۆزەکان دوو جـۆری سـەرەکین، جـۆری یەکەمیـان سـادەیە و تەنهـا سـوتێنراون، کـە ئەمەیـان بـە شـێوەیەکی بەرفـراون لـە چینـە جیاوەزەکان دۆزراونەتـەوە، جۆری دووەمیشـیان گۆزەی ڕوو پۆشـکراوە بە شووشـە، ئەمانـە ژمارەیـان کەمتـرە و تەنهـا یـەک نموونەمـان هەیـە وەک گۆزەیەکـی سـاغ، بەشـێک لـە گڵینـەکان بەپێـی جـۆری بەکارهێنانـی گرنگـی بـە دروسـتکردن و مـادە بەکارهاتـووەکان دراوە، بـە ئاسـانی لـە گۆزەیەکـی ئاسـایی جیائەکرێنـەوە، گڵینـەکان تایبەتـن بـە چێشـتخانە.



چەند نموونەیەک لە گۆزەی سادە و گۆزەی ڕپۆشکراو بە شووشە

٣- پاشماوە کانزاییەکان

پاشـماوە کانزاییـەکان وەک چەقـۆ لـەم گـردە دۆزراوەتـەوە، بـەڵام لەبەرئـەوەی پێکهاتـەی کانزاکـە لـە جـۆری پوخـت نەبـوون، دوای مانەوەیـان و کارلێکردنیـان لـە دۆخێکـی باشـدانین، لـە هەمـان کاتـدا کانـزاکان لـە پێداویسـتی ڕۆژانـە و خشـڵ و جوانکاریـدا بەکارهێنـراون، لـە نموونـەی (مسـتیلە، ئەڵقـە، گـوارە، دەرزی، دەمبەسـت)، بەشـێکی زۆر لـەم پاشـماوە کانزاییانـە لـە نـاو گـۆڕەکان دۆزراونەتـەوە.



نموونەیەک لە مستیلە و چەقۆی کانزایی

٤- پاشماوە بەردینیەکان

نموونەکانی ئەم جۆرە پاشماوەیە لە چاو دۆزراوەکانی دیکەی گردەکە زۆر کەمن، ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ ئەم چاخە مێژوویییەی ژیانی مرۆڤایەتی، پاشماوە بەردینیەکان ئەم گردە بریتین لە (گێژەنە، دەسارِ، بەردی هارِین و مووروی لە بەرد دروستکراو).




نموونەیەک لە گێژەنە و پاشماوەی شکاوی دەسارِێک





وێنەی بەشێک لە تیمی کاری کنەوپشکنین لە بانتەپە (گردپارک) وەرزی یەکەم/٢٠٢١ز

## سەرچاوەكان:


- پرۆژەی ناوچەی سیروان (٢٠١٩-٢٠٢٤ز)، گرێبەستی دووەم، (زانكۆی گلاسكۆ و بەڕیوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان).
- دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان (٢٠١٣ز)، ڕاپۆرتی كنەوپشكنینی ڕزگاری لە بەشێكی گرد بازار.
- عبدالكریم، نەوزاد عبداللتیف (٢٠٢٠ز)، شوێنەوارەكانی سنوری قەزای كەلار، بڵاوكراوەی یادی كەلار، ژ(٤)، سلێمانی.
- كریم، محمد علی - عبدالكریم، نەوزاد عبداللتیف: (٢٠١٩) پرۆسیدینگی سێیەمین كۆنفرانسی زانیستی نیودەوڵەتی شوێنەوار و كەلەپوری كوردستان، زانكۆی سلاحەدین/ كولێژی ئاداب/ بەشی شوێنەوار، شوێنەواری گۆڕگردۆڵكەی سەرقەڵا و پاشماوەكانی (پ.ز٥٧-٢٠٧ز)، هەولێر، ل١٢٣.
- كریم، محمد علی: (٢٠١٩)، پرۆسیدینگی سێیەمین كۆنفرانسی زانیستی نیودەوڵەتی شوێنەوار و كەلەپوری كوردستان، زانكۆی سلاحەدین/ كولێژی ئاداب/ بەشی شوێنەوار، گۆڕەكانی بەرلووت و پاشماوەكانی (١٥٠پ.ز- ٢٢٨ز)، هەولێر، ل٩١.
- كریم، محمد علی: (٢٠١٨)، شوێنەوارەكانی كەلار و دەوروبەری، بڵاوكراوەی یادی كەلار، ژ (٢)، سلێمانی.
- دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان (٢٠٢١ز)/ ڕاپۆرتی كنەوپشكنین لە گردپارك.
- دۆسیەی بەشی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیان (٢٠٢٣ز)/ ڕاپۆرتی كنەوپشكنین لە گردی بانتەپە (گردپارك).

# هەنگاوەکانی کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان



پ.ی.د.چیا محەمەد حەسەن
سەرۆکی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان

سەرەتا ئەگەر بمانەوێ باس لە مێژووی دروستبوونی زانکۆی پۆلیتەکنێکی گەرمیان بکەین , دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ساڵی (١٩٩٥) کە سەرەتای دامەزراندن یاخود کردنەوەی پەیمانگای تەکنیکی کەلار بوو لە شاری کەلار، وەکو یەکەمین ناوەندی زانستی و ئەکادیمی لە دەڤەری گەرمیان، کە ئەوکات سەر بە دەستەی پەیمانگا تەکنیکییەکانی سلێمانی بوو، دووەم کۆنترین ناوەندی خوێندنی باڵایە، دوای پەیمانگای تەکنیکی سلێمانی لە ئیدارەی سلێمانی.

پەیمانگای تەکنیکی کەلار , یەکێکە لە دامەزراوە گرنگەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان/ وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی، هاوکات ناوەندێکی زانستی گرنگیشە لە ناوچەی گەرمیاندا، کە وەک وەفایەک بۆ خوێنی شەهیدان لەلایەن حکوومەتی هەرێمەوە پێشکەش بە دانیشتووانی گەرمیان کراوە .

هەر لەو ساڵەدا لەبەر دەوڵەمەندی ناوچەی گەرمیان لە بواری کشتوکاڵ بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران , پەیمانگاکە ناو لێنرا پەیمانگای کشتوکاڵی کەلار و بە دوو بەشی زانستی دەستی بە وەرگرتنی خوێندکار کرد، پاشان بۆ زیاتر فراوانبوونی پەیمانگاکە و دواتر خزمەتکردنی خوێندکاران بڕیاری گۆڕینی پەیمانگای کشتوکاڵی لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە بۆ پەیمانگای تەکنیکی کەلار دەرکراو لە بەشەکانی (کارەبا، بەرووبوومی کێڵگەیی و باخداری) پێکهات.

لە ساڵی (٢٠٠٠) بەشی تەکنیکی ڤێتیرنەری کرایەوە , هەروەها لە ساڵی (٢٠٠١) لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان , وە لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە هۆڵی کتێبخانەی پەیمانگای تەکنیکی کەلار لە (٢٠٠١/٨/١٤)بەسترا , بڕیار لەسەر کردنەوەی بەشی (کارگێڕی کار) درا ، لە ساڵی (٢٠٠٤) یش بەشێکی نوێی بە ناوی (شیکاری نەخۆشییەکان) کراوەتەوە , بەم جۆرە پەیمانگای تەکنیکی کەلار لە شەش بەش زانستی وەک ( بەرووبوونی کێڵگەیی، کارەبا، پەرستاری، ڤێرتەرنەری، کارگێڕی کار، شیکاری نەخۆشییەکان) پێکهاتووە.

دواتر دوو بەشی نوێ لە ساڵی (٢٠٠٥)کرایەوە، بە ناوی بەشی ( ژمێریاری و رووپێوی)، وە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق و ڕزگارکردنی ناوچە کوردستانەکانی دەرەوەی هەرێمی کوردستان بۆ گرنگی دان بەو ناوچەیە لە ساڵی (٢٠٠٦) دوو بەشی زانستی لە شاری خانەقین کرایەوە، بەناوی (سیستەمی کۆمپیوتەر) و دواتریش لە ساڵی (٢٠١٤) بەشی (هەواسازی) کرایەوە.

لە ساڵی (٢٠٠٤) توانرا سوود لە باڵەخانە و تاقیگەکانی پەیمانگای تەکنیکی کەلار ببینرێ بۆ کردنەوەی کۆلێژی پەروەردە لە کەلار، کە ئەتوانین بڵێین لێرەوە سوود لە توانا مرۆیی و مادییەکانی پەیمانگای ناوبراو بینرا بۆ کردنەوەی زانکۆی گەرمیان.

لە ساڵی (٢٠٠٦) توانرا پەیمانگایەکی تر لە شاری دەربەندیخان بکرێتەوە، ئەویش بە سوود وەرگرتن لە توانا و ئیمکانیاتی مادی و مرۆیی وە بینا و باڵەخانە و مامۆستایانی پەیمانگای تەکنیکی کەلار بۆ کردنەوەی پەیمانگای تەکنیکی لە قەزای دەربەندیخان، وە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٦-٢٠٠٧) ی پەیمانگای تەکنیکی دەربەندیخان لە ناو بینای پەیمانگای تەکنیکی کەلار بوو.

لە بەر بەرفراوانبوونی جوگرافی ناوچەکە بیر لە کردنەوەی زانکۆیەکی تەکنیکی لە ناوچەی گەرمیان کرایەوە ، بۆیە دەستکرا بە ئامادەسازی یاخود ئامادەکاری چ لە رووی ماددی و چ لە رووی مرۆییەوە بۆ کردنەوەی ئەو زانکۆیە. ئامادە سازیەکان خۆی لە کردنەوەی تاقیگەی زانستی نوێ و دروستکردنی بینا و نۆژنکردنەوەی هۆڵ و تاقییگەکانی پەیمانگای تەکنیکی کەلار دەبینیەوە کە زیاتر لە شەش باڵەخانەیە، هەروەها دروستکردنی زیاتر لە (٣٥) تاقیگەی زانستی مۆدێرن بۆ بەشە زانستییەکانی پەیمانگای تەکنیکی کەلار بە بری زیاتر لە (سێ) ملیار دینار دەبینێتەوە چ لەسەر داهاتی زانکۆ چ لەسەر داهاتی وەزارەتی دارایی حکوومەتی هەرێمی کوردستان .





لە (٢٠١٩/٤/١٤) کردنەوەی بینای ڕاگرایەتی پەیمانگای تەکنیکی کەلار لە لایەن جەنابی کاک قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، بە سوپاسەوە ئەو کات لەسەر داهاتی پەیمانگا و صندوقی زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی وە ئەنجامدرا .





لە (٢٠٢١/٤/١٤) بڕیاری كردنەوەی كۆلێجی تەكنیكی كەلار، بە یەك بەشی زانستی بە ناوی شیكاری نەخۆشیەكان، بە فەرمانی ژمارە (٤٦٩٦) دەزگای دڵنیایی جۆری وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی و زانكۆی پۆلیتەكنیكی سلێمانی دەرچوو.




لە (ئەیلولی ٢٠٢١) دا و لە ئاهەنگی حەوتەمین خولی دەرچوونی زانکۆی گەرمیان دا بە ئامادەبوونی بەڕێزان کاک قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی بەڕێز (د.ئارام محەمەد قادر)، جەنابی وەزیر ڕایگەیاند کە کار دەکەن بۆ کردنەوەی زانکۆیەکی پۆلیتەکنیک لە گەرمیان .




لە (٢٠٢٢/٤/١٤) بە بڕیاری جەنابی وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی بەڕێز (د.ئارام محەمەد قادر) دەرکردنی فەرمانی پێکهێنانی لیژنەیەکی وزاری بە سەرۆکایەتی بەڕێز (پ.ی.د.محەمەد حسێن کەلاری ) بە ئەندامیتی چەند بەڕێوەبەر و بەڕێوەبەرێکی گشتی وەزارەت و بەندە تێدا ئەندام بوین بۆ دراسەکردنی کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان، هەر هەمان رۆژ سەردانی پەیمانگای تەکنیکی دەربەندیخان و زانکۆی گەرمیان و ئیدارەی گەرمیانیان کرد و کۆبونەوەیەک کرا لە هۆڵی ئەنجومەنی کۆلێجی تەکنیکی کەلار، تیایدا پرۆپۆزەڵی کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان لە لایەن (پ.ی.د.کوردستان حەمید محەمەد) ی.ڕاگر ی کۆلێجی تەکنیکی کەلاوە پێشکەش بە لیژنەی ناوبراو کراو، دواتر لە لایەن لیژنەی وەزارەتەوە گفتوگۆی زیاتری لەسەر کرا، و دواتر سەردانی کۆلێجی کشتوکاڵی کفری پێشوو و کۆلێجی تەکنیکی کفری ئێستا یان کرد لە شاری کفری.

هەرێمی کوردستان - عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری
بەڕێوەبەرایەتی دڵنیایی جۆری و متمانەبەخشین

Kurdistan Regional Government
Council of Ministers
Ministry of Higher Education & Scientific Research
Apparatus of Supervision & Quality Assurance
Directorate of Quality Assurance and Accreditation

اقليم كوردستان – العراق
مجلس الوزراء
وزارة التعليم العالي والبحث العلمي
جهاز الإشراف و ضمان الجودة
مديرية ضمان الجودة والاعتمادية

ژمارە: ٦٥٤٤    No:

ڕێکەوت: ٤/١١/ ٢٠٢٢ زایینی    Date:

١٢٢/ ٢٧٢٢ی کوردی

**فەرمانی وەزاری**

بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی داواکاری و ئامادەکارییەکانی دامەزراندنی (زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان)، بە پێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێمان دراوە، بڕیاردرا بە:

پێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەت لەم بەڕێزانەی کە ناو و ناونیشانیان لە خوارەوە هاتووە بە مەبەستی سەردانی مەیدانی بۆ ئیدارەی گەرمیان و بەدواداچوون بۆ ئامادەکارییەکانی کامپەس و ژێرخان و تاقیگە و بەڕێوەبردن و دەستەبەرکردنی پێداویستی زانستی و تەکنیکی تایبەت بە پرۆژەی ناوبراو.

| ژ | ناو | شوێنی کارکردن | پلەی ئەندامیەتی |
|---|---|---|---|
| ١ | پ.ی.د. محمد حسین احمد | سەرۆکی دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری/ وەزارەت | سەرۆک |
| ٢ | پ.ی.د. خطاب احمد مصطفى | بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی خوێندن و پلاندانان و بەدواداچوون/ وەزارەت | ئەندام |
| ٣ | پ.ی.د. ژالە سعید یحی | بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی توێژینەوە و پەرەپێدان/ وەزارەت | ئەندام |
| ٤ | پ.ی.د. چیا محمد حسن | ڕاگری کۆلێژی تەکنیکی گەرمیان/ زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی | ئەندام |
| ٥ | د. توانا نجف محمدخان | بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی کارگێڕی و دارایی/ وەزارەت | ئەندام |
| ٦ | د. یاسین صالح حمە | بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی نێردراوان و پەیوەندیە ڕۆشنبیرییەکان/ وەزارەت | ئەندام |
| ٧ | م. لطیف عزیز ابراهیم | یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی ئەندازە و پرۆژەکان/ وەزارەت | ئەندام |
| ٨ | د. شۆرش خالد رحمان | بەڕێوەبەری خوێندن/ وەزارەت | ئەندام |
| ٩ | م. دهام سمکۆ حسین | ئەمینداری ئەنجومەنی وەزارەت/ وەزارەت | ئەندام |
| ١٠ | م. سرهنگ ابراهیم عثمان | بەڕێوەبەری کارگێڕی/ وەزارەت | ئەندام |
| ١١ | م. سرتیپ خالص حسین | بەڕێوەبەری خوێندنی باڵا/ وەزارەت | ئەندام |
| ١٢ | شکار بەختیار رضا | بەڕێوەبەری تەندروستی و سەلامەتی/ وەزارەت | ئەندام |
| ١٣ | د. هاوکار رشید عرب | بەڕێوەبەری دڵنیایی جۆری و متمانە بەخشین/ وەزارەت | ئەندام و بڕیاردەری لیژنە |

د. ئارام محمد قادر
وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی

**وێنەیەک بۆ**
- نووسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیر/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- نووسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری/ نووسینگەی بەڕێز سەرۆک/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی/ نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی دڵنیایی جۆری و متمانە بەخشین/ لەگەڵ بەراپیەکان/ لەگەڵ ڕێزدا.
- سەرۆک و ئەندامانی لیژنە/ بۆ کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- دەرکردە.

Kurdistan Region–Erbil, Hadi Chawshli Street, Kirkuk-Erbil Main Road
Website: www.mhe-krg.org
Email: asqa.office@mhe-krg.org
qaa.directorate@mhe-krg.org

هەرێمی کوردستان- هەولێر، ڕێگای کەرکوک، شەقامی هادی چاوشلی

لە ئابی ساڵی (٢٠٢٢) و دوای پەسەندکردنی پرۆپۆزەڵی کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان لە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی، لە ئیدارەی گەرمیان بە ئامادەبوونی سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان بەڕێز ( جەلال شێخ نووری ) و بە ئامادەبوونی پەرلەمانتارانی عێراق و کوردستان و سەرۆکی زانکۆی گەرمیان، و بەندە وەکو راگری کۆلێژی تەکنیکی کەلاری ئەو کاتە و بەڕێوبەرە گشتییەکانی گەرمیان و رێکخراوەکان لە دەڤەرەکە کۆبوونەوەیەک کرا بۆ زیاتر پاڵپشتی لە کردنەوەی بڕیاری کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان و وە دەربڕینی پاڵپشتییەکانیان بۆ زانکۆی ناوبراو تاوتوێ کرا .



لە (٢٠٢٣/٦/١٩) و بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٢٣٤٦) و فەرمانی ژمارە (٧٤٤) وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی/ لە (٢٠٢٣/٦/٢٢) نوسینگەی وەزیر، فەرمانی کردنەوەی دوو زانکۆ بە ناوی (زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان و زانکۆی ئاکرێ بۆ زانستەکردارییەکان) دەرچوو، دواتر لە مەراسیمێکدا لە (٢٠٢٣/٧/٦) لە ئیدارەی گەرمیان بە ئامادەبوونی جەنابی وەزیری خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی، مەراسیمی کردنەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان ئەنجام درا .

حکومەتی هەرێمی کوردستان
سەرۆك وەزیران

HUKÛMETA HERÊMA KURDISTANÊ
SEROKWEZÎR

ژمارە: ٢٥٤٦
ڕێکەوت: ٢٩ / جۆزەردان / ٢٧٢٣ی کوردی

No: 2546
Date: 19 / 6 / 2023

وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
وەرگرتن
ژمارە: ١٣٤٦
ڕێکەوت: ٢٠ / ٦ / ٢٠٢٣
نووسینگەی وەزیر

Council of Ministers

## فەرمان

پاڵپشت بەبڕگەی( پێنجەم) لە ماددەی (سێیەم) و بڕگەی (یەکەم/١) لە ماددەی (چوارەم) لە یاسای وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی هەرێمی کوردستان- عێراق ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠٨ی هەموارکراو، لەسەر پێشنیاری وەزارەتی ئاماژەپێکراو بە نووسراویان ژمارە (١٤٨٢)لە ٢٠٢٢/٩/٢٥، بڕیارماندا بە:

١. دامەزراندنی دوو زانکۆی نوێ لە هەرێمی کوردستان بەم شێوەی لە خوارەوە هاتووە و لکاندنیان بە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی هاوشێوەی دەزگاکانی تری خوێندن:
   **أ. زانکۆی ئاکرێ بۆ زانستە کرداریيەکان.**
   **ب. زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان.**
٢. ڕاسپاردنی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی بۆ دیاریکردنی پێکهاتەی هەریەک لەو زانکۆیانە و دابینکردنی گشت پێداویستییەکانیان بە هەماهەنگی لەگەڵ زانکۆ پەیوەندیدارەکان بە ڕەچاوکردنی سەرجەم مەرجە زانستی و یاساییەکان کە لە یاسا و ڕێنماییەکاندا هاتووە.
٣. جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی لە ڕێکەوتی دەرچوونییەوە.

مەسرور بارزانی
سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

HUKÜMETA HERÊMA KURDISTANÊ

SEROKWEZÎR

حكومەتی هەرێمی كوردستان

سەرۆك وەزیران

٢٥٤٦

<u>وێنەیەک بۆ:</u>

- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران/ بۆ ئاگاداری/ لەگەڵ ڕێزدا...
- نووسینگەی بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران/ بۆ ئاگاداری/ لەگەڵ ڕێزدا...
- نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی دیوانی ئەنجومەنی وەزیران/ بۆ ئاگاداری/ لەگەڵ ڕێزدا...
- وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی/ نووسراوتان لەسەرەوە/ بۆ کاری پێویست/لەگەڵ ڕێزدا...
- وەزارەتی پەروەردە
- وەزارەتی دارایی و ئابووری } بۆ کاری پێویست و هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی/لەگەڵ ڕێزدا...
- وەزارەتی پلاندانان
- وەزارەتی ناوخۆ/ پارێزگای دهۆک و ئیدارەی سەربەخۆی گەرمیان/ بۆ ئاگاداری و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا...
- فەرمانگەی هەماهەنگی و بەدواداچوون/ بۆ ئاگاداری و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕیزدا...
- فەرمانگەی تەکنەلۆجیای زانیاری/ بۆ کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا...
- خامەی نهێنی.

**حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق**
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
نوسینگەی وەزیر

**حكومة اقليم كوردستان - العراق**
مجلس الوزراء
وزارة التعليم العالي و البحث العلمي
مكتب الوزير

ژمارە: ٧٤٤
رێکەوت: ٢٢/ ٦ /٢٠٢٣ی زایینی
/ /٢٧٢٣ی کوردی

العدد:
التاريخ: / / ٢٠٢٣

**فەرمانی وەزاری**

پاڵپشت بە فەرمانی ئەنجومەنی وەزیران/ بەڕێز سەرۆک وەزیران، ژمارە (٢٥٤٦) لە ڕێکەوتی (١٩/٦/٢٠٢٣) تایبەت بە دامەزراندنی **(زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان)** لەبەر ڕۆشنایی بڕگەی (پێنجەم) لە مادەی (سێیەم) و بڕگەی (یەکەم/١) لە مادەی (چوارەم) لە یاسای وەزارتی خوێندنی باڵا و توێژینەوی زانستی ژمارە (١٠)ی هەموار کراو.

بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێمان دراوە **بڕیارماندا بە:**

١- دامەزراندن (استحداث)ی زانکۆیەکی حکومی نوێ بەناوی **(زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان)** کە ناوەندەکەی لە ئیدارەی سەربەخۆی گەرمیان (قەزای کەلار) دەبێت، هەروەها بەستنەوەی ئەم زانکۆیە بە وەزارەتمان و زیادکردنی بۆ لیستی زانکۆ حکومییەکان، بەپێی بڕگەی (یەکەم/٩) لە ماددەی (حەوتەم) لە یاسای وەزارتی خوێندنی باڵا و توێژینەوی زانستی.

٢- ئەم فەرمانە لە ڕۆژی دەرچوونیەوە جێبەجێ دەکرێت.

**د.ئارام محمد قادر**
وەزیری خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی

وێنەیەک بۆ:

- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ نوسینگەی بەڕێز سەرۆکی حکومەت/ ئاماژە بەفەرمانی سەرەوەتان/ لەگەڵ ڕێزدا.
- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ نوسینگەی بەڕێز جێگری سەرۆکی حکومەت/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران/ سەرۆکایەتی دیوان/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی دارایی و ئابوری/نوسینگەی بەڕێز وەزیر/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی پلاندانان/ نوسینگەی بەڕێز وەزیر/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی پەروەردە/ نوسینگەی بەڕێز وەزیر/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- وەزارەتی ناوخۆ/ ئیدارەی سەربەخۆی گەرمیان/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- نوسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیر/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- نوسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- نوسینگەی بەڕێز ڕاوێژکارانی وەزیر/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- سەرۆکایەتی گشت زانکۆکان- دەستەی کوردستانی بۆدیراساتی ستراتیجی - ئەنجومەنی کوردستانی بۆ پسپۆریە پزیشکیەکان / بۆ زانین / لەگەڵ ڕێزدا.
- سەرجەم فەرمانگەکانی دیوانی وەزارەتمان/ بۆ زانین و کاری پێویست بەپێی تایبەتمەندی/ لەگەڵ ڕێزدا.
- دەرکردەی تایبەت.




لـە (٢٠٢٣/١١/٢٣) و بـە فەرمانـی ئەنجومەنـی وەزیـران ژمـارە (٥٢٩٠) و فەرمانـی ژمـارە (٨٠٦) وەزارەتـی خوێندنی بـاڵا و تویژنـەوەی زانسـتی/ لـە (٢٠٢٣/٧/٩) نوسـینگەی وەزیـر، دانانـی بەنـدە (پ. ی .د. چیـا محەمـەد حەسـەن ) وەکـوو سـەرۆکی زانکـۆی پۆلیتەکنیکـی گەرمیـان بـە وەکالـەت .



لە (٢٠٢٣/٧/٢٦) و بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی/ نوسینگەی وەزير ژمارە (٨٧٣) و فەرمانی لیژنە یەک پێکهێنرا بۆ جیاكردنەوەی زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان لە زانكۆكانی تر، لە (٢٠٢٣/٨/٢) كۆبوونەوەیەک لە هۆڵی ئەنجومەنی كۆلێژی تەكنیكی كەلار كرا و پێشنیار كرا بە گۆڕینی ناوی كۆلێژی كشتوكاڵی كفری كە سەر بە زانكۆی گەرمیان بوو، بە گۆڕینی ناوەكەی بۆ كۆلێجی تەكنیكی كفری و بخرێتە سەر زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان، دواتر پێشنیار كرا بە كردنەوەی پەیمانگای تەكنیكی كفری .

لە (٢٠٢٣/١٠/١٢) و بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژنەوەی زانستی/ دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری ژمارە (١١٨٦) و فەرمانی پەسەندكردنی پەیكەری زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان دەركرا كە بریتین لە پەیمانگای تەكنیكی كەلار و پەیمانگای تەكنیكی كفری و كۆلێژی تەكنیكی كەلار و كۆلێژی تەكنیكی كفری

حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
نوسینگەی وەزیر

حكومة اقليم كوردستان - العراق
مجلس الوزراء
وزارة التعليم العالي و البحث العلمي
مكتب الوزير

ژمارە: ٨٧٣
ڕێکەوت: ٢٦/٧/٢٠٢٣ی زایینی
/ /٢٧٢٣ی کوردی

العدد:
التاريخ: / / ٢٠٢٣

وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
دەرکردەی
نووسینگەی وەزیر

**فەرمانی وەزاری**

پاڵپشت بە تەوەری چوارەم بڕگەی یەکەم لە کۆنووسی کۆبوونەوەی ژمارە (٢) ی ساڵی (٢٠٢٣)ی ئەنجومەنی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی بە ژمارە (٨٣٧) لە ڕێکەوتی (٢٠٢٣/٧/١٨)، بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێماندراوە **بڕیارماندا بە:**

پێکهێنانی لیژنەیەک لەم بەڕێزانەی کە ناو و ناونیشانیان لەخوارەوە هاتووە بەمەبەستی دارشتنی سەرجەم ئەو ڕێککارانەی کە پێویستە ئەنجام بدرێت، بۆ جیاکردنەوەی زانکۆی (پۆلیتەکنیکی گەرمیان)لە زانکۆکانی پێشووی، لەڕوی ئەملاک و ستافی کارگێڕی و ئەکادیمی، هەروەها چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەل ئەو قوتابی/خوێندکارانەی کە پێشتر لەژێر ناوی زانکۆکانی پێشویان وەرگیراون.

| ژ | ناو | شوێنی کارکردن | پلەی ئەندامیەتی |
|---|---|---|---|
| ١ | د.هوشیار عبدالله عزیز | سەرۆکی زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی | سەرۆک |
| ٢ | د.فەرهاد قادر کەریم | سەرۆکی زانکۆی گەرمیان | ئەندام |
| ٣ | د. چیا محمد حسن | سەرۆکی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان بە (وەکالەت) | ئەندام |
| ٤ | د. محمد حسین احمد | سەرۆکی دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری | ئەندام |
| ٥ | د. خطاب احمد مصطفى | بەڕێوەبەری گشتی خوێندن و پلاندانان و بەدواداچون | ئەندام |
| ٦ | د.توانا نجف محمدخان | بەڕێوەبەری گشتی کارگێڕی و دارایی | ئەندام |
| ٧ | د.یاسین صالح حمە | بەڕێوەبەری گشتی نێردراوان و پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەکان | ئەندام |

**م. ئارام محمد قادر**
وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی

وێنەیەک بۆ:

- نوسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیر/ بۆ زانین/ لەگەل ڕێزدا.
- نوسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت/ بۆ زانین/ لەگەل ڕێزدا .
- زانکۆکانی (پۆلیتەکنیکی سلێمانی، گەرمیان، پۆلیتەکنیکی گەرمیان)/ نوسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ/ بۆ زانین و کاری پێویست / لەگەل ڕێزدا.
- سەرجەم فەرمانگەکانی دیوانی وەزارەت/بۆ زانین و کاری پێویست/بەپێی پەیوەندی/ لەگەل ڕێزدا.
- فەرمانگەی کارگێڕی و دارایی/ بۆ زانین/ لەگەل ڕێزدا.
- سکرتاریەتی ئەنجومەنی وەزارەت/ بۆ زانین/ لەگەل ڕێزدا.
- دەرکردەی تایبەت.

هەولێر، ڕێگای کەرکوک، شەقامی هادی چاوشلی -ئاونیشان
ئیمەیل: minister.office@mhe-krg.org

عنوان- أربيل، طريق كركوك، شارع هادي جاوشلي
ژ. تەلەفون: ٠٧٧١٤٥٨٦٧٦٨ - ٠٧٥٠١٤٤٦٧٦٨

Address - Erbil, Kirkuk Road, Hadi Chawshli Street
www.gov.krd

حكومة اقليم كوردستان - العراق
مجلس الوزراء
وزارة التعليم العالي و البحث العلمي
جهاز الإشراف و ضمان الجودة
مديرية ضمان الجودة والاعتمادية

... کوردستان – عێراق
...رمەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری
بەڕێوەبەرایەتی دڵنیایی جۆری و متمانەبەخشین

1 من 1

العدد:
التاريخ: / / ٢٠٢٣

ژمارە: ١١٨٦
ڕێکەوت: ١٢ / ١٠ /٢٠٢٣ی زایینی
: ٢٧٢٣/٧/٢٢ی کوردی

نوێنی دەرکردە

**فەرمانی وەزاری**

ئاماژە بە نووسراوی زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان ژمارە (٢٤) لە ڕێکەوتی (٢٠٢٣/٨/٢٣) سەبارەت بە کردنەوە و گواستنەوەی کۆلێژ و پەیمانگە و بەشەکانی سەر بە زانکۆی ناوبراو، هەروەها پاڵپشت بە کۆنووسی لیژنەی پێکهاتوو بە فەرمانی وەزاری ژمارە (١٨٠٠٣) لە ڕێکەوتی (٢٠٢٣/٩/١٨) و پەسەندی ئەنجومەنی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی لە کۆنووسی کۆبوونەوەی نائاسایی ژمارە (١)-ی ساڵی (٢٠٢٣) (تەوەری یەکەم/ دڵنیایی جۆری و متمانە بەخشین)، بە پێی ئەو دەسەڵاتەی کە پێماندراوە، بڕیارماندا بە:

1. کردنەوەی (پەیمانگەی تەکنیکی کەلار) لەگەڵ گواستنەوەی هەریەك لە بەشەکانی (پەرستاری، رووپێوی، تەکنیکی ڤێتێرنەری، کارگێری کار، پرۆژە کشتوکالییەکان، تەکنەلۆجیای زانیاری، هەواسازی، ژمێریاری) لە (کۆلێژی تەکنیکی کەلار) بۆ سەر (پەیمانگەی تەکنیکی کەلار) و بەخشینی بڕوانامەی دبلۆمی دوو ساڵەی تەکنیکی لە بەشەکانی ئاماژەپێکراو لە سەرەوە.
2. هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی بەخشینی هەردوو بڕوانامەی بەکالۆریۆس و دبلۆمی تەکنیکی لە بەشی (شیکاری نەخۆشیەکان) لە (کۆلێژی تەکنیکی کەلار)، بۆ بەخشینی تەنها بڕوانامەی بەکالۆریۆس، ئەم بڕیارە لە ساڵی خوێندنی (٢٠٢٤-٢٠٢٥) دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.
3. گۆڕینی ناوی بەشی (کارەبا) لە (کۆلێژی تەکنیکی کەلار) بۆ بەشی (ئەندازەی کارەبا و کۆمپیوتەر) بۆ مەبەستی بەخشینی بڕوانامەی بکالۆریۆس و جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە لە ساڵی خوێندنی (٢٠٢٤-٢٠٢٥).
4. گواستنەوەی (کۆلێژی زانستە ئەندازیاریە کشتوکاڵیەکانی کفری) لە (زانکۆی گەرمیان) بۆ سەر (زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان) و گۆڕینی ناوەکەی بۆ (کۆلێژی تەکنیکی کفری)، هەروەها کردنەوەی هەردوو بەشی (تەکنەلۆجیای زانیاری، زانستی خۆراک و کۆنترۆڵی جۆری) لە (کۆلێژی تەکنیکی کفری)، ئەم کۆلێژە قوتابی/خوێندکار لە ساڵی خوێندنی (٢٠٢٣-٢٠٢٤) وەرناگرێت تاکو دوای تەواوکردنی سەرجەم ئامادەکاریەکانی وەك ژێرخانی باڵەخانە و سەرجەم لایەنە زانستی و ئەکادیمی، بۆ ئەمەش لە کاتی تەواوبووی ئامادەکاریەکان پێویستە زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان وەزارەتمانی لێ ئاگادار بکاتەوە بۆ مەبەستی بەدواداچوون و بڕیاری وەرگرتنی قوتابی/خوێندکاران.
5. کردنەوەی (پەیمانگەی تەکنیکی کفری) لە (زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان) لەگەڵ کردنەوەی هەردوو بەشی (تەکنەلۆجیای تاقیگەی پزیشکی) و (ژمێریاری) لە هەمان پەیمانگە.

لەگەڵ ڕێزدا...

د. ئارام محمد قادر
وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی

**وێنەیەک بۆ**
- نووسینگەی بەڕێز جەنابی وەزیر/ئاماژە بە پەراوێزی بەڕێزتان/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- نووسینگەی بەڕێز بریکاری وەزارەت/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- زانکۆی گەرمیان/ نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- زانکۆی پۆلیتەکنیکی گەرمیان/ نووسینگەی بەڕێز سەرۆکی زانکۆ/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- دەزگای سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری/ نووسینگەی بەڕێز سەرۆک/ بۆ زانین/ لەگەڵ ڕێزدا.
- فەرمانگەی خوێندن و پلاندانان و بەدواداچوون /نووسینگەی بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی وەرگرتن/ بۆ زانین و کاری پێویست/ لەگەڵ ڕێزدا.
- بەڕێوەبەرایەتی دڵنیایی جۆری و متمانە بەخشین/ لەگەڵ بەرایبەکان/ لەگەڵ ڕێزدا.
- دەرکردە.

Address - Erbil, Kirkuk Road, Hadi Chawshli Street    عنوان- أربيل، طريق كركوك، شارع هادي چاوشلي    هەولێر، ڕێگای کەرکوک، شەقامی هادی چاوشلی -ناونیشان
www.gov.krd    ژ. تەلەفون: 0662567603    ئیمەیل: qaa.directorate@mhe-krg.org
asqa.office@mhe-krg.org

لە ئێستا دا ئەم زانكۆكیە زیاتر لە (٢٠٠٠) خوێندكار و (١٤) بەشی زانستی لە خۆدەگرێت و زیاتر لە (٣٠٠) فەرمانبەر و نزیك (٩٠) مامۆستای هەیە و دابەش دەبن بەسەر هەردوو شاری كفری و كەلار، سەرۆكایەتی زانكۆكە و كۆلێژێك و پەیمانگایەك لە كفری و كۆلێژێك و پەیمانگایەك لە شاری كەلار.



لە (٢٠٢٤/٤/١٤) بە ئامادەبونی هەردوو بەڕێزان: جەنابی كاك قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران و جەنابی د.ئارام محەمەد قادر وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، كردنەوەی بینای سەرۆكایەتی زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان و پەیمانگای تەكنیكی كفری لە شاری كفری، كۆبونەوەیەك كرا لە گەڵ ئەنجومەنی سەرجەم كۆلێج وپەیمانگاكانی زانكۆمان، جگە لە تێجوی نۆژەنكردنەوەی بیناكە و سەرجەم كەلوپەلەكانی، جەنابی كاك قوباد تاڵەبانی بڕیاریدا بە پێدانی (١٢٥) كۆمپیوتەری ئاست بەرز و بەڕێز د. ئارام محەمەد قادر، بڕیاری دا بە خەرج كردنی بڕی (١٢٥) ملیون دینار بۆ پێداویستیە هەنوكەیەكانی زانكۆمان.

لە كۆتاییدا، درود وسڵاو دەنێرین بۆ رۆحی بەرزە فڕی شەهیدانی ئەنفالكراوان و سەرجم شەهیدانی رێگای ڕزگاری كوردستان، سەربەرزی بۆ كەس وكاریان، ئومێد دەكەین كردنەوەی زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان كە پاداشتێكی بچوكە بۆ ناوچەی ئەنفالكراوی گەرمیان، ببێتە سارێژبونی بەشێك لە خەم و ئازاری كەس وكاری سەربەرزی شەهیدان بەگشتی و كەسوكاری ئەنفاڵ كراوان بەتایبەتی، هەر بۆ ئەو مەبەستەیش رەمزی ئەنفال كرا بە لۆگۆی زانكۆی پۆلیتەكنیكی گەرمیان،دەستی ماندوبونی هەمو ئەو خەمخۆر و دڵسۆزانە دەگوشین كە رۆڵیان هەبوو لە كردنەوەی ئەم زانكۆیە، بەتایبەتی جەنابی كاك قوباد تاڵەبانی جێگری سەرۆكی حكومەت و بەڕێز د.ئارام محەمەد قادر وەزیری خوێندنی باڵا وتوێژینەوەی زانستی، پشتیوان بە خودای گەورە ئەم زانكۆیە دەبێتە ناوەندێكی

مەعریفی بۆ پێگەیاندنی کادری بە توانا بۆ بازاری کاری عێراق و هەرێمی کوردستان بە گشتی و ناوچەی گەرمیان بە تایبەتی.





کیسرا جاف

# کەلاری کۆن

بەڵێ کەلار لادێیەک بووە، بەڵام ئەو شتانەی لەوێ هەبووە لە قەزاکانی دەوروبەری لە سەردەمی کۆندا کەم بووە، هەروەها لەبەر دەسەڵاتی بەگزادەکانی جاف لە کەلار نیمچە سەربەخۆییەکیان هەبووە، لەبەر ئەوەی زۆر جار شورتەی سەیاری ئەو کاتە خەڵکیان دەگرت لە دێهاتەکانی تر کە لە کەلارەوە ڕەت دەبوون بەرەو کفری زیندانیەکانیان بردووە , چەند جارێک ئەم حاڵەتە ڕووی داوە، زیندانێکان هاواریان دەکرد یان بۆ کەریم بەگ یان بۆ داود بەگ، ئەوانیش لە دەستی شورتەکان ئازادییان کردوون، بە شورتەکانیان دەووت بڕۆن، هەتا جارێک بابی خۆم ئەمر قەبزی بوو، موقەدەم شورتەیەک بە موسەلەحەوە هاتبووە کەلار بۆ گرتنی، داود بەگ هانی منداڵانی کەلاری دا بەردبارانیان بکەن.

کەلار وەک کۆمەڵگەیەک بووە، لە هەموو تایفەکانی جاف و غیرە جافیشی تێدا ژیاوە، هیچ جیاوازییەک نەکراوە لە نێوانیان لە لایەن بەگزادەکانی جافەوە، چەندماڵێکی جولەکەی تێدا بووە، کابرایەک ناوی (نەسیم جولەکە) بووە لە شەڕی جاف و تاڵەبانییدا داوای تفەنگەکەیان لێکردووە بیدەنە دەست کەسێکی تر، تفەنگەکەی نەداوە، وتوویەتیی «ئەی خۆ منیش خەڵکی کەلارم، دێمە شەڕەکەوە«.

من لەم ڕاپۆرتەدا هەندێک شت دەنووسم، ئەگەر هەڵەی تێدابوو ئێوە بەژداربن و ڕاستی بکەنەوە .

## یەکەمین کەسەکان لەکەلاردا

- یەکەم کەسانێک لە کەلار نیشتەجێ بوون، بنەماڵەی حاجی ئەڵماس بوون، لە بەگزادەکان، حەسەن بەگی سلێمان بەگی حەمەپاشای جاف بووە .

- مزگەوتی کەلار، حەسەن بەگی سلێمان بەگ دروستی کردووە .

- یەکەم مەکتەبی کەلار، حەمە بەگی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف لە ساڵی ١٩٣١ ماڵەکەی خۆی کردە مەکتەب، ئەو مەکتەبە ئێستا ناوی کەلارە .

- یەکەم کچ لە کەلار، بگرە لە سنوری کەرکوک، چووەتە مەکتەب ئەختەری حەمە بەگ بووە .

- یەکەم شاعیر، حەمۆمین بەگی کەریم بەگ (مینە جاف ) بووە .





- یەکەم کچ، زانکۆی تەواو کردووە، خورشیدە خانی داود بەگ بووە.

- یەکەم کەس، جلی ڕانک و چۆغەی لەبەر کردووە لە کەلار و بگرە لە لیوای کەرکوکدا، حەمەبەگی فەتاح بەگ بووە.

- خەستەخانەی کەلار، ساڵی ١٩٣٧ لەلایەن داود بەگی جاف بینا کراوە.

- بیری ئیرتیوازی، ساڵی١٩٥٠ ئەویش هەر لەلایەن داود بەگی جافەوە دروست کراوە.

- بەریدی کەلار، ساڵی١٩٥٥ لەلایەن داود بەگی جاف هاتۆتە کەلار.

- کۆنترین قورئان، قورئانەکەی مەحموود پاشای جاف، لە ماڵی شەوکەت بەگدا بووە، دوای ئەو، قورئانەکەی ڕەزا بەگ و قورئانەکەی مامە شێخ حەسەن بووە.

- یەکەم ئۆتۆمبێل لە کەلاردا هی حەمە بەگی فەتاح بەگ بووە لە ساڵی ١٩٣٠، یەکەم ئۆتۆمبیلی جۆری جێب، هی شەوکەت بەگ بووە لە ساڵی ١٩٥٠، یەکەم موهەندس لە کەلار سەرتیپی شەوکەت بەگ بووە.





- یەکەم کتێبخانە لە کەلاردا، هی حەمە سەعید بەگی حەمەبەگ بووە.

- یەکەم مەلا لە کەلاردا مەلا عەلی بووە، باوکی حاجی حەمە ڕەشید.

- وەستای ناڵبەند، وەستا جەلال و وەستا ساڵح بوون.

- یەکەم ئاش هی ماڵی داود بەگ و مستەفا بەگی کەریم بەگ بووە.

- یەکەم دوکان هی مەحموود عەتار بووە، ناسراو بوو بە خولە عەتار.

- یەکەمین مامۆستاکان، عوسمانی مەلا موستەفا، دوای ئەو حسێن کەلاری و محەمەدی عەلی سەلیم بەگ بوون.

- یەکەمین مامۆستای ئافرەت، حەلاوی حەمەڕەشیدی حەمە عەزیز بووە.

- یەکەم خۆپیشاندان لە کەلاردا، داود بەگ ڕێکیخستووە لە ساڵی ١٩٤١ تەئیدەن بۆ بزووتنەوەی ڕەشید عالی گەیلانی دژی ئینگلیز، شیعارەکەشیان ئەوە بووە ( ئێمە کوردین کوردمان ئەوێ ....).

- یەکەم موزەمید، محەمەدە فەنی بووە، مامی حاجی حەمەڕەشید.



- باشترین ڕاوچی بە ئەسپەوە، حەمەسەعید بەگی حەمە بەگ بووە، باشترین ڕاوچی ناوچە براحەمە، مەحموود ڕەزا بەگ و حەمە ڕەشید حەمە عەزیز بوون، باشترین ڕاوچی بە تانجی، عەلی بەگی سەلیم بەگ و مەجید بابان بوون.

- یەکەم چایخانە، خولە پەخە و حەسەنی هەیەر دایاننناوە.

- زۆربەی منداڵانی کەلار، میمکە ئامە ناوکی بڕییون، خۆم یەکێکم لەوان.

- شێخ حەسەن، ددانی خەڵکی هەڵکێشاوە بەبێ بەنج.

- خۆشترین دەنگ بۆ گۆرانی حسێنی هەیەر بووە.

- یەکەم حاجی، حاجی مەجید بووە، حاجی مەجید یەکەم سەرقافڵەی ژنانی کەلار بووە بۆ سەر مەزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی و کەربەلا و نەجەف.

- یەکەم پاس ئیشی کردوە لە کەلار، هی شێخ ڕەشیدی شێخ حەسەن، دوای ئەو هی حاجی ئەحمەدی حەمەمراو بووە.

- یەکەم خەیات، سەباح جولەکە بووە.

- یەکەم کەس عەبای پێ بەخشراوە حەمەی هەسەن بووە.

● یەكەم تیپی فوت بۆڵ، تیپی شێروانە بووە، دكتۆر حەسەنی كەریم بەگ دروستی كردوە.

● یەكەم باخ داود بەگی فەتاح بەگ دروستی كردوە.

● یەكەم بۆیسان هی شێخ حەسەن بووە.

● یەكەم مۆلیدەی كارەبا هی داود بەگ بووە.

● یەكەم ماڵ بە شێلمان دروست كرابێت، ماڵی موستەفا بەگی كەریم بەگ بووە.

● یەكەم خانووی دوو تەبەق (نهۆم)، ماڵی حەمەسەعید بەگی حەمەبەگ بووە.

● یەكەم دكتۆر عەلی عبدولڕەحمان بەگ بووە.

● یەكەم زابت جەمیلی ئەحمەد بەگ بووە.

● یەكەم كەس تەتەوعی سەربازی كردووە، جوامێری قالە جاف، دوای ئەو عەبدوڵڵای برای سەلەی عەولكەریم بووە.

● گەورەترین كەس لە ڕووی تەمەنەوە، قالە جاف بووە.

● یەكەم سەلاجە، هی ماڵی محەمەد بەگی ڕەزا بەگ بووە، بەنەوت ئیشی كردوە.

● یەكەم موبەریدە، هی ماڵی موستەفا بەگی كەریم بەگ بووە لەساڵی ١٩٥٨.

● یەكەم گرامۆفۆن، هی ماڵی حەمەسەعید بەگ بووە بە هندل ئیشی كردوە.

● گەورەترین ڕادیۆ، هی ماڵی خالید بەگی ڕەزا بەگ بووە.

● جوانترین جلوبەرگ لەبەردەكرا، حاجی محەمەدی ڕۆستەم و محەمەدی ئەحمەدی ڕۆستەم بوون.

● یەكەم كەس لەقەبی كەلاری بۆخۆی دانا، ئەحمەد كەلاری بووە.

● یەكەم كوێخا، عەمینی حاجی بووە.

• جوانترین ئافرەتانی كەلار، حەبە خانی كەریم بەگ و حەلاوی سەعید بابان و سەلەی ئەولكەریم و ئایشی حاجی محێدین بوون.

• یەكەم ئافرەت جلی مۆدەی كردۆتەبەر، ئامینە خانی ڕەزا بەگ بووە.

• یەكەم شەهیدی پێشمەرگە، شێخ كەریمی شێخ محەمەد بووە.

• یەكەم پێشمەرگەكانی كەلار، عەلی بەگی سەلیم بەگ و ئەحمەدی برا حەمە و حسێنی حاجی محێدین و حاجی حمید گوڵ كوت بوون.

• ساڵی ١٩٦٣ خەڵكێكی زۆر بوونە پێشمەرگە و كادر، مستەفا بەگی كەریم بەگ، مەحمود بەگی ڕەزا بەگ، دكتۆر حەسەنی كەریم بەگ، خوسرەوی حەمە سەعید بەگ، ئەحمەد كەلاری، ڕەزای قالەجاف و حەسەن كەلاری پێشمەرگە بوون، لالە فایەق، فەتاحی عەزیزی سەیموراد، سابیری عەزیزی فارس، حەمەی عیسا، حەمەی عەلی سلێمان و شێخ كەریم شێخ محەمەد كادر بوون.

• باشترین مەلەوان، حەمەی قارەمان بووە.

• كۆنترین دارخورما، هی خاتو زێبا بووە.

• یەكەم كەس مەشروبی خواردۆتەوە، مەحموود بەگی ڕەزا بەگ و ئەحمەدی براحەمە بوون.

• یەكەم كەس عەینەكی توبی كردۆتە چاو، ئاسۆی مەحموود بەگی ڕەزا بەگ بووە.

• خۆشترین دۆ، هیماڵی ڕەشەی فاتە بووە.

• خۆشترین ماست، هی ماڵی حەمە ناوباخی بووە.

• گەورەترین ڕانە مەڕ، هی مەلیحە خانی دایكی حمە سەعید بەگ بووە لە ساڵی١٩٤٠، دوای ئەو ڕانی حەسەنی خدر بووە لە ساڵی ١٩٥٠.

• بەناوبانگترین ئەسپ، ئەسپە كوێتی حەمەسەعید بەگ بووە.

• بەناوبانگترین گوێدرێژ، كەرەپاتری بووە.

## ژنە کۆنەکانی کەلار

لە کەلاردا ژنانیش دەورییان هەبووە، خوای گە ورە لە گوناحیان خوش بێت، لێرەدا هەندێکیان دەخەینە بەرباس، بە داوای لێبردنەوە ناتوانم زۆر بە درێژی وەسفیان بکەم، شتێکی کورتیان لەسەر دەنووسم.

**خاتوو زێبا**، ئافرەتێکی زۆر موسڵمان بوو، ڕێزی تایبەتی هەبوو لە ناو پیاوان و ژنانی کەلار و بەگزادەکاندا.

**ئایشەی ژنی حەمەی ئەحمەدی قیرین**، خۆم بەمنداڵی بانگم ئەکرد میمکەئایش، کەدەکاتەدایکی توبای خێزانی حاجی عوسمان، ژنێکی زۆر موسڵمان بوو، لەم دواییەدا چووم بولای لە ماڵی حاجی عوسمان.

**دایکە زبە**، ژنی باوکە سەعە بوو، دایکی مەجید بابان و شەوکت بابان و دادە سەلە، دایکە زبە ئەبێتە دایکی شیری بابم و پەریخان و نەبەرد، زۆر ژنێکی یەکجار موسڵمان بوو، هاوین و زستان بە ڕۆژوو بوو، دایم خەریکی سەڵاوات لێ دان بوو، ڕۆژێک پێم ووت، دایکە هیلاک نابی، ووتی کوڕم گوناحم کردوە، وتم گوناحی. چیت کردوە، وتی شەوێک سەگێک تەرەکی بوو، منیش هەڵسام توتکەکانیم فڕێداوە دەرەوەی ماڵ و بەبایەنی چووم بیان هێنمەوە ماڵ سەیرم کرد نەماون.

**دایکە خەجێ**، ژنی حەمە عەزیز، دایکی حەمە ڕەشید و زینەب و ئامین، ژنێکی موسڵمان و لەخوا ترس بوو، خەڵکی کەلار، کاتی باران بارین، باران کەم بوو ئەهاتن بولای، دایکە خە جێ بەیاخی ئەبرد بۆ سەید سۆنە هەڵی ئەکرد، بەقودرەتی خوا و دڵ پاکی ئەو ژنە، دوایی دوو سێ ڕۆژ دەستی ئەکرد بە باران بارین.

**میمکە ڕەعەی میمکە خازە**، دایکی حاجی عەلی و مەحموود و ڕوناک، ژنێکی بە شەخسیەت، کاتی قسە کردن ئیجبار ئەبوی گوێی لێ بگریت.

**میمکە ئاهو**، ژنی حەمەی حەسەنی مەحموو، کە دەکاتە دایکی کاک مەحموو و لالە فایەق، ژنێکی موسڵمان و مەجلیس خوش بوو، خەڵکی لادێ زوو ئەخە وتن، بەڵام میمکە ئاهو دایم درەنگان ئەچو بۆ دێنی بۆ ماڵان.

**میمكە ئامە**، میمكە ئامە ژنی مامە شێخ حەسەن، ژنێكی بە شەخسیەت و بە ویقار بوو، مجامەلەی نەدەكرد.

**میمكە ئامە**، میمكە ئامە ژنی حەمەمراد كە دەكاتە دایكی حاجی ئەحمەد و كاكە حەمە، ژنێكی موسڵمان بوو، یارمەتی فەقیری زۆر دەدا.

**میمكە سەلە**، دایكی ئەحمەد كەلاری و حەمۆمین كەلاری، ژنێكی ڕوو خۆش و میوان دار بوو.

**میمكە پیزە**، دایكی ساڵح ئەحمدی وەیسە و دایكی خاوەر ژنی مەجید، ژنێكی موسڵمان و فەقیرو بەری بوو لە بەرائەتا وێنەی نەبوو.

**میمكە مینای میمكە مەنیج**، دایكی حەمە و دایكی جەمەی ژنی حاجی ئەحمەد دەبێتە دایكی (دایەن) سوریای ڕەزا بەگ ،خۆی هەتیوی هە بوو، هەتیوی خەڵكیشی بەخێو دەكرد.

**خاوەری ژنی مەجید شوان**، ژنێكی موسڵمان و یارمە تی خەڵكی ئەدا لە تەعزێكاندا نانی دروست ئەكرد بۆ هەمووان.

**میمكە خورشە**، ژنی براحمە، دایكی بەكر و جەواهیر، ژنێكی موسڵمان و زۆر سەخی بوو، یارمە تی فە قیر و هە ژاری زۆر دەدا.

**میمكە فاتە**، ژنی ئەولكە ریمی كەتان، ژنێكی موسڵمان و فە قیر و باسی كە سی نە دەكرد.

**میمكە ئاسكە**، ژنی مام بایز، ژنێكی گورجوگوڵ و سەخی تەبیعە ت بوو، زۆر جار لەگەڵ عوسمانی ڕەحمەتی ئەڕۆیشتم بۆماڵیان نان و دۆیە كی خۆشی ئەدا پێمان.

**میمكە ئایش**، ژنی ئەحمەدی فەتاح ناوخاس، دایكی كاكە مینە و توبا و ئاسكە، دەكاتە دایكی (دایەن) سەردار و سالاری داود بەگ، ژنێكی موسڵمان و دڵسوز بوو.

تێبینی: ڕەوانشاد کیسرا حەمەسەعید بەگی جاف پێش ئەوەی کۆچی دوای بکات لەپەڕەی تایبەتی خۆی لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك ئەو زانیارییانەی بڵاوکردووەتەوە، ڕێگای بە سەرپەرشتیاری «یادی کەلار» دابوو، بڵاوی بکاتەوە.



بێستون ژاڵەیی

# ژاڵەی حاجی قادر

## ئەو ئاواییەی حاجی قادری شاتری ناسنامەی بۆ دەرهێنا

سەرەتا دەبێ ئەوە بێژم کە مامەڵەکردن لەگەڵ مێژوو و سەربوردە و ڕووداوە تۆمارنەکراوەکاندا قورس وهیلاککەرە، بەڵایەکی گەورەی مامەڵە لەگەڵ مێژووی گەرمیان و کەلار و جموجوڵە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریەکانی دەڤەرەکەدا، کەمی سەرچاوە و دۆکۆمێنتە، منیش لەگەڕان بەدوای سەرەتاکانی ژیاندا لە ژاڵە وەک گوندێکی گەرمیان ئەزیەتی زۆرم بوو، «بەڵام بێگومان زەحمەتی و سەرەسوورەی توێژینەوە و تۆمارکردن چێژێکی شاراوەی تایبەتیشی هەیە کە وەک تلیاک وایە بۆ توێژەر و ناتوانێ وازی لێ بێنێ»، ئەمەی لێرەدا یادداشتم کردووە، سەرەتا و دەروازەیەکە بۆ ئاشنابوون و ناسینی یەکێک لە گوندە گرنگەکانی گەرمیان کە ڕۆڵی دیار وبەرچاوی لە ژیانی کۆمەڵایەتی وتێکۆشانە جۆربەجۆرەکانی گەرمیانیەکانیشدا هەبووە، بەهیوام من و خەڵکانی تریش بۆمان بلوێ لە فرسەتی تردا تەواوی بکەین.

گوندی ژاڵەی حاجی قادر لە کۆنترین گوند و ئاوەدانییەکانی گەرمیانە کە جافی کۆچەری تێدا نیشتەجێ بووە و لە ساڵی ١٩١٩ لەلایەن حاجی قادری شاتری سەرۆکی عەشیرەتی شاتریەوە دووبارە ئاوەدانکراوەتەوە، برگەی یەکەمی ناوەکەی لەو هەموو ڕووەکە خۆڕسکەی ژاڵەوە هاتووە کە لە خڕ و چەمی دێکەدا دەڕوێن و برگەی دووەمیشی ناوی خودان و ئاوەدانکەرەوەی گوندەکەیە، ئەڵبەتە ژاڵە زۆر پێش ئەمە ئاوەدان بووە و بەدیاریکراوی لەسەردەمی محەمەدی ئیبراهیمی باپیری حاجی قادردا و دۆکۆمێنتێکی شایەت هەیە لەسەر بوونی جۆرێک لە نیشتەجێبوون لە ژاڵە و ئەو ناوچانەی شاتریدا، هی کاتی گەشتەکەی جیمس بێلی فرێزەرە کە لە ساڵی ١٨٣٤ و فرێزەر لەو کاتەدا ناوی



«ژاڵـە»ی هێنـاوە کـە نووسـراوێکی لێـوە ئامادەکـردووە و باسـی پارچـە بەردێکـی دەگمـەن دەکات لـەو نزیکانـە کـە فرێـزەر دەڵـێ لـە ژیانمدا هاوشـێوەیم نەبینیـوە١، کـە ئەمـەش ئـەو بـەردە گـەورە دانـراوە دەگمەنەیـە کـە بـەم گێڕانـەوە و تاریفـە دەکەوێتـە پشـتی گونـدی ژاڵـەی حاجـی قـادرەوە و تـا ئەمـڕۆ بـە «بـەردە کەڕەکـە» دەناسـرێ.

ئـەوەش ڕۆشـنە کـە ئەڵبەتـە نیشـتەجێبوونی بنەماڵـەی حاجـی قـادر و شـێوە وازهێنانێکیـان لـە ژیانـی کۆچـەری بـۆ سـاڵانێکی زۆر پێـش ئاوەدانکردنـەوەی ژاڵـە لەلایـەن حاجـی قـادرەوە دەگەڕێتـەوە، ئەویـش کاتێـک محەمـەدی ئیبراهیمـی باپیـری و گەورەکانـی هۆزەکـەی دەیـان پارچـە زەوییـان لـە شـێروانە و سـەیدخەلیل و باوەنـوور کڕیـوە، بەڵگەنامـە فەرمییـەکان دەری دەخـەن باوکـی حاجـی قـادر مەحمـودی محەمـەد و تیرەکـەی لـە پێشـی هەمووانـەوە لەدەشـتی شـێروانەدا نیشـتەجێ بـوون و هەروەک ڕۆژنامـەی زەورا لـە ژمـارەی ڕۆژی ٩ ی نیسـانی سـاڵی ١٨٣٧ ی زاینیـدا ئامـاژەی پێکـردووە «واتـە ٣ سـاڵ دوای گەشـتەکەی فرێزەر»کـە شـاتریەکان لـەو سـاڵەدا کـە هێشـتا محەمـەدی ئیبراهیمـی مەنسـوری ئاخـەی باوکـی مەحمـود ڕێبەرایەتـی کـردوون و سـەرۆکیان بـووە سـەردانی مەڵبەندەکانـی حکومەتیـان لەناوچەکـەدا کـردووە، وەک لەڕۆژنامەکـەدا هاتـووە ، ئەمـە لەکاتێکـدا کـە زەوی وزار بـۆ نیشـتەجێکردنی جافـەکان بێبەرامبـەر بـووە، سـەرۆکی شـاتری و هارونیـش لەگەڵیاندا بەڵێنیـان داوە لەبەرامبـەر ئـەو زەوی و زارانـەدا کـە پێیـان دەدرێـت بـڕە پارەیـەک بدەنـە گەنجینـەی دەوڵـەت، بـۆ پیشـاندانی ئـەو شـوێنانەی گونجاوبـوون بـۆ کشـتوکاڵکردن و تاپۆکردنـی بەنـاوی خۆیانـەوە و بـۆ ئەمـەش کاربەدەسـتی تایبـەت دانـراون٢، ئەمـەش دەرخـەری ئـەو ڕاسـتیەیە کـە کـەس پێـش شـاترییەکان لـەو سـنوورە ئیدارییـەدا نیشـتەجێ نەبـووە کـە نـاوی کـەلارە،

لەمە زیاتریش لەکاتی هاتنی شاتریدا بۆ نیشتەجێبوون لەم ناوچەیە هەندێک بنەماڵە لە تیرەی غەیرە جاف لەگەڵ جافدا بۆ باشووری کوردستان هاتوون و لەو نێوانەدا لەپاڵ تیرەکانی گێژ و پاڵانیدا ناوی هۆرمەزیار هەیە کە هۆرمەزیارەکانیش لەو سەروبەندەدا چەند خێزانێکیان نیشتەجێی ژاڵە دەبن و پێشتر لەگەڵ جاف وشاترییەکاندا لە دیوی ئێرانەوە هاتوونەتە ئەو ناوچەیە٣.

ژاڵە وەک گوندێکی گەرمیان گرنگیەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە پایتەختی شاترییەکان بووە لە گەرمیان و ئەم گرنگیەشی بەشی زۆری لە کەسایەتی حاجی قادری سەرۆکی شاتریەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ئەم پیاوە سەرعێلێکی بەهێز و حەکیم و خاوەن پێگە بوو، ئەم پیاوەی سەردار و سەرعێلێکی هەڵکەوتوو و چاکسازێکی کۆمەڵایەتی گەورە بوو کە هیچ ئاشتەواییەکی کۆمەڵایەتی لەو زەمانەدا بێ بەشداری ئەو نەدەکرا، ئاگری هیچ کێشەوئاشووب و ناکۆکیەکی کۆمەڵایەتی بێ بەشداری ئەم پیاوە موسڵیحە کەڵەگەت و بەسام وهەیبەتە نەدەکوژایەوە، پارێزەر و گەڕیدە و مێژووناس (عەباس عەزاوی) خاوەنی کتێبی عشائر العراق لە ١٩٤٣ هاتۆتە ژاڵە و حاجی قادری بینیوە و لەوبارەیەوە لەباسی شاتریدا نووسیویەتی «ئەوم لەشوێنی نیشتەجێی خۆی لە ناحیەی شێروانە بینی»٤ ئەڵبەتە لەو دەور و زەمانەدا خەڵک پەیتا پەیتا بۆ کاروبارە جیاجیاکانیان دەهاتنە ژاڵە، لەبەر ئەوەی حاجی قادر، سەجەرەناس و شارەزاییەکی سەیری لە ئەسڵ و فەسڵ



و بنەچـەی تیـرە و تایەفەکانـی گەرمیانـدا هەبـوو، خەڵـک بـۆ شـارەزابوون لـە بنەچـە و ناسینەوەی بـاب و باپیـری خۆشیان دەهاتنـە ژاڵـە و لای حاجـی قـادر. هەروەک لەبـەر ئـەوەی ئـەم پیـاوە خوێنـەوار و فارسـی وعەرەبـی وتورکـی زان، خەڵکـە رۆشـنبیر و خوێنەوارەکـەی ئەو زەمانـە دەهاتنـە ژاڵـە و دیدەنـی حاجـی قـادر، لـەو نێوانـەدا کەسـایەتی سیاسـی و ڕوناکبیـری و کۆمەڵایەتـی شـێخ محەمـەد شـاکەلی زۆر جـوان و ورد لەسـەر ژاڵـەی ئـەو سـەردەمە وەسـتاوە و پێشـمەرگەی دێریـن و پەروەرشـیار و ڕوناکبیـر مامۆسـتا عەلـی پەرلەمانیـش، هەروەها باسـی چوونـی لەگـەڵ کۆمەڵێـک مامۆسـتا و کەسـایەتی جیاجیـادا ڕۆشـتۆتە ژاڵـە و لـەم نێوانـەدا مامۆسـتا عەلـی بـەدەق نووسـیویەتی» بـەهۆی مامـە حاجییـەوە کـە نـەک تەنیـا سـەرۆکی تیـرەی شـاتری بـوو، بەڵکـو کەسـایەتییەکی دیـاری ئێلـی جـاف و سـەنگی تایبەتـی هەبـوو، ژاڵـە بووبـووە ناوەندێکـی کۆمەڵایەتـی و هاتوچـۆی سـەرۆک هۆز و تیـرەکان و خەڵکییـش، ئەمـەش وایکردبـوو ژاڵـە لەچـاو دێهاتەکانـی تـر تایبەتمەنـدی بـۆ دروسـتببێ، ئۆتۆمبیـل هاتوچـۆی بـکات و هەشـیبێ، ئاشـە مەکینـەی تیابـێ، کارێـزی ئـاوی هەبـێ و مزگەوتـی تیادروسـتبکرێ»٥.

هەر بۆیـە لەسـاڵانی پێـش ١٩٥٨ یشـدا گوندەکـە دەبێتـە یەکێـک لـە گەورەتریـن گونـد و ئاوەدانیەکانـی گەرمیـان و نزیکـەی ٥٠ خێزانـی تێـدا نیشـتەجێ دەبـن، یەکێـک لـە بەتەمەنـە هۆشیارە نیشتەجێکانی ئـەو دەمـەی گونـدی ژاڵـە، برایمـی سـەمینی سـڵەمانە کـە نـاوی مـاڵ و خێزانەکانـی ئـەو ساڵانەشـی یەکـە یەکـە بەشـوێنی خانـو و ماڵەکانیانـەوە لـە ژاڵـە لەبیرمـاوە ٦.

ژاڵـەی حاجـی قـادر سـەر بەناحیـەی پێبـازە و بـە ١٥ کیلۆمەتـر لـە باشـووری خۆرئـاوای ناحیەکـەدا هەڵکەوتـووە و بـە ٣٠ کیلۆمەتریـش لـە باکـوری خۆرهەڵاتـی قـەزای کەلارەوەیـە، گوندەکـە لـە باشـورەوە گونـدی ڕەندعەلـی خـان و لەباشـووری خۆرهەڵاتـەوە گونـدی بیەڕەش و لـە باکورەوە گونـدی سـۆفی ڕەحیـم عەلـی قـادر و لەباکـوری خۆرهەڵاتـەوە گونـدی گلاڵکـەوە و لـە خۆرئـاواوە گونـدی خاڵەبـەگ و لەباشـووری خۆرئـاواوە گونـدی زەماوەنگـەوە و لەباشـووری خۆرئاواشـیەوە گونـدی چەمەبیسـمیلایە، گوندەکـە لـە پێکهاتـە کشـتوکاڵیەکەیدا بـە کەرتـی ٧ ی ژاڵـەی حاجـی قـادر دەناسـرێ و ڕووبـەرە گشـتیەکەی ١١٢٢٣ دۆنمـە و ڕووبـەرە کشـتوکاڵیەکەی ٣١٦٨ دۆنمـە کـە ٣٢ دۆنمـی بـەراوە کـە حاجـی قـادر تـا حەفتاکانـی سـەدەی ڕابـردووش لەبەریـدا بـە ئـاوی کارێزەکـە و چەمـی ژاڵـە برنجـی دەچانـد و مـەرەزەی دەکـرد و دەیـان تـەن چەڵتوکـی لـێ هەڵدەگـرت، باقیەکـەی زەوی ژاڵـە پشـت ئـاو و دەیمـە، گوندەکـە ١٣٠٥ دۆنـم بەردەڵانـی و٦٧٣٥ دۆنـم لـەوەڕگای هەیـە، ڕووبـەری گوندەکـە١٥ ,١٣ دۆنمـە و گۆڕسـتان و کانـی و کارێـز و تۆڕێکـی ڕێگاوبانـی خاکـی لەگـەڵ گوندەکانـی چواردەوریـدا هەیـە ٧.



ڕوداوێکی جیاوازی تر لە ژیانی ژاڵە و ژاڵەییەکاندا ئەوەییە کە کاتێک حاجی قادر لە سییەکانی سەدەی ڕابردودا و بەدیاریکراوی لە مانگی ١ ساڵی ١٩٣٧ دا کەوتە ڕێ بۆ سەفەری حەجی ماڵی خوا و لەو سەفەرەیدا دوومانگ و یەک ڕۆژی پێ چوو، گەڕانەوەی حاجی قادر لە فەریزەی حەج بۆنەیەکی گەورە و بێوێنە بوو بۆ گوندی ژاڵە و دانیشتووانی، پێش گەڕانەوەی حاجی پیاوە سەردەرچووەکانی ئاوایی ڕۆیشتبوونە مزگەوت و مەرقەدی گەیلانی لەبەغدا و١٥ ڕۆژ زیاتر چاوەڕوانی گەیشتنی قافڵەکەی حاجیان کردبوو، حاجی لەو سەفەرەیدا دیاری بۆ زۆربەی خەڵکی ئاوایی و منداڵان هێنابوو و ١٥ ڕۆژ زیاتریش خەڵک لە شوێنە جیاجیاکانی گەرمیانەوە بۆ بەخێرهێنانەوەی حاجی لەسەفەری ماڵی خوا دەهاتنە ژاڵە و ئاوایی بەردەوام قەرەباڵخ و پڕمیوان بوو، لەو ماوەیەشدا نان و خوان بۆ خەڵکی دێ و میوانەکانیش لە ماڵی حاجی حاجی قادر ساز کرابوو ٨.

ئاشێک کە بە نەوتی ڕەش کاری کردووە لە گوندەکەدا لەساڵی ١٩٥٢ داناوە وپێشتر چەند ئاشێکی ئاو لە گوندەکە و دەوروبەریدا هەبووە و خەڵکی هەموو گوندەکانی ئەو ناوە بۆ باراش هارپین دەهاتنە ژاڵە، وەستا عەزیز فیتەری کوڕی برایمی حەمەخان کە لەکەسایەتیە کۆمەڵایەتی و وەستا وکاسبکارە ناسراوەکانی گەرمیانە و لەسەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا لەگەڵ وەستاکەیدا هاتۆتە ژاڵە بۆ چاککردنەوەی ئاشەکە بۆی گێڕامەوە، ئەو ئاشەی ژاڵە بەجۆرەکەی ئاشەوانی و کرێکارەکانی و قەرەباڵخی و ئیشی بەردەوام و باراش هەڕەکانیەوە لە دەزگا و دایەرەیەکی گەورە و ڕێک وپێک دەچووە٩.



بەپێی دۆكۆمێنتێكیش كە لە مزگەوت و حوجرەی فەقێكانی گوندی ژاڵەی حاجی قادرەوە دەستكەوتووە، حاجی قادر یەكەم مزگەوتی لە ساڵی ١٩٢٤ لەگوندی ژاڵەدا دروست كردووە، بەمەش ئەم مزگەوتە لەدەرەوەی شاری كفریەوە دەبێتە یەكەم مزگەوتی ئاوەدانیەكانی گەرمیان كە ناوچەكە تا ئەو كاتە زۆر كەم ئاوەدانی تێدابووە، لەو مێژووە بە دوواوە مزگەوتەكە بەردەوام ئاوەدان بووە و بەردەوام مامۆستا و مودەڕیس و فەقێی لێ نەبڕاوە، تەنیا لەساڵی ١٩٦٣ دا نەبێت كە حەرەس قەومی بەدناوی ڕژێمی بەعس گوندەكەی سوتاند وخاپوور كرد و دواتریش حاجی قادر وەستای لە وڵاتی ئێرانەوە هێنا و مزگەوتەكەی بەشێوەیەكی ئەندازەیی نایاب بینا كردەوە١٠، لە مامۆستا وعەلامە و مودەڕیسە ناودارەكانی مزگەوتی ژاڵە دەبێ ناوی مامۆستایان «مامۆستا مەلا مەحمودی گۆبانی شاتری، مامۆستا مەلا خالید ڕەباتی، مامۆستا مەلا ڕەئوفی حەیدەری، مامۆستا شێخ محەمەد شێخ حەسەن نەقشبەندی، مامۆستا ئەحمەدی مەلا لەرزانەی شاتری، مامۆستا مەلا حەسەن هۆرێنی، مامۆستا مەلا ڕەشیدی سەدانی، مامۆستا مەلا حسێنی تەرخانی، مامۆستا مەلا فەرەجی ڕەزواری» بهێنین كە هەریەكە و لەسەردەمێكدا مامۆستا و مودەڕیسی مزگەوت و حوجرەكە بوون، حاجی قادر ئەوەندە مزگەوت و حوجرەكەی پۆشتە و ئاوەدان ڕادەگرت وەک مامۆستا مەلا كەریمی شافیعی كە لە ساڵی ١٩٦٧ هاتۆتە ژاڵە دەگێڕێتەوە «ئەو كاتە دوو مزگەوتی پۆشتە لە هەموو گەرمیاندا هەبوو، مزگەوتی گوندی «حاجی لەر» كە تاڵەبانییەكان قاڵیان بۆ كڕی بوو و مزگەوتی ژاڵەش كە حاجی قادر جۆرێک فەرشی نایابی بۆ كڕیبوو كە پێی دەوترا»گڵێم قۆندەرە»«١١، هەر دەربارەی

مزگەوتەکە و گرنگیدانی حاجی قادر بەخوێندەواری , حەزدەکەم ئەوە لە مامۆستا عەلی پەرلەمانەوە بگوێزمەوە کە حاجی قادر کاتێک بەکەسێکی دەوت خوێنەوار مەبەستی خوێنەواری و تێگەیشتنی قووڵتر بوو لە خوێندن و نووسین، مامۆستا عەلی نووسیویەتی «مزگەوت وەکو دامەزراوەیەکی ئایینیی بایەخێکی گرنگی لە ژیانی موسڵماناندا هەبوو، بەتایبەتی ئەو مزگەوتانەی حوجرەی پێگەیاندنی فەقێی تیابوو، کە لەهەموو شوێنەکانەوە بۆ خوێندن بۆی دەهاتن، ئەمەش دەبووە مایەی دروستکردنی پێوەندیی و ئاگابوون لە شوێنەکانی تر و دۆستایەتیی پەیداکردن، لەپاڵ ئەرکە ئایینییەکاندا مزگەوت ڕۆڵی لە بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتیدا هەبوو، کە مەلا و فەقێکان لە دەستپێکی بزووتنەوەی چەکدارییدا بوونیان هەبێ و وەکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی هوشیاریی و هاندانی خەڵکیی بۆ بەرگریکردن لە کورد و ڕووبەڕووبوونەوەی زەبروزەنگی داگیرکەران.

مزگەوتی ژاڵە لەسەر دەستی مامە حاجی قادر دروستبوو، تەنانەت لەڕووی دیزاینەوە وەستای شارەزا و لێهاتووی لەئێرانەوە بۆ دروستکردنی هێنابوو، کە دیوارەکەی زۆر پان و سەرچاوەی ئاوەکەی کارێز بوو، چوون مامە حاجی خۆی وەکو خوێنەوارێک دەیویست مزگەوتەکە مەلای باشی هەبێ، دەگەڕا تا مامۆستای لێهاتوو و بەتوانا لەمزگەوتەکەدا بن و حوجرەی پێگەیاندنی فەقێ بەڕێوەببەن و بتوانن کاروباری ئایینی خەڵکی لەڕووی شەرعەوە چارەسەربکەن، بۆیە کۆمەڵێک مامۆستای باش هاتنە مزگەوتی ژاڵە، وەکو: مەلا حەسەنی هۆرێنی، مەلا مەحمودی گۆبان، مەلا فەرەجی ڕەزواری، مەلا حسێنی عەبدوڵڵا، مەلا ڕەئوفی حەیدەری...هتد، کە لە زۆر لەناوچەکانی ترەوە وەکو هەورامان و شارەزوور و گەرمیانەوە بۆ خوێندن و وەرگرتی زانستە ئایینییەکان ڕوویان تێدەکرد، مامە حاجی زۆر گرنگیی بە ڕەوشی خوێندن و خوێنەواریی دەدا، ئەو لەو ڕووەوە پێش زۆر کەس کەوت کە بەهای زانستیان نەدەزانی، بگرە زۆر کەس دژی خوێنەواریی بوون، کە قوتابخانەش لە ژاڵە کرایەوە زۆر پێخۆشبوو، کە زۆر خەڵکیتر بە دەرزی شەیتانییان دادەنا , دەڵێن ساڵێکیان مامۆستا قانیعی شاعیر هاتووە بۆ ژاڵە، مامە حاجی پێشوازیی گەرمی دەکات و مامۆستا قانیع پێش خۆی دەدات، پێیدەڵێن: مامە حاجی بۆ دەکەوێتە دوای ئەو پیاوە؟ ئەویش دەڵێ: ئەوە مامۆستا قانیعی شاعیرە چۆن پێشی دەکەوم؟!»١٢.

هەر لەپەیوەندی بە یەکەمینەکانی ژاڵەدا بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٦ ئۆتۆمبێل هاتە ژاڵە کە ئۆتۆمبێلێکی جۆری جێبی ئەمریکی بوو، کە حاجی قادر بە ٦٤٠ دینار کڕیبووی بە پارەی چەڵتوک کە بۆ ئەوەش زیاتر لە ١٠٠ وەزنە چەڵتوکی وەزنەی بە ٦ دینار فرۆشتە ئەحمەد عەلی وەکیلی حەبیب خەیزەران١٣، تا ئەو کاتەی حاجی جێبی هێنایە ژاڵە لە گەرمیاندا تەنیا داودبەگی جاف لە کەلار سەیارەی هەبوو , بۆیە بینینی سەیارە لە ژاڵە بۆ خەڵکەکەی زۆر جێی سەرسوڕمان و باوەڕپێنەکراو بوو، خەڵک بەدیار

سەیارەکەوە چەند سەعات دەمانەوە و تەماشای هەموو شتێکی سەیارەکەیان دەکرد و خەڵکی هەموو دێهاتی دەوروبەریش دەهاتن بۆ تەماشای سەیارە جێبەکە، لەساڵی ١٩٥٢ یش جێبێکی ئەمریکی تری مۆدێل ١٩٥٢ ی کڕی وهێنایە ژاڵە کە کوڕەکانی حاجی محەمەد و حاجی حەسەن بەدووای یەکدا شۆفێری بوون.

یەکەم قوتابخانەش لە ژاڵە لەساڵی ١٩٧٨ کرایەوە و یەکەم ودوا بەڕێوەبەریشی تا ڕووخانی قوتابخانەکە لەسەروبەندی ئەنفالدا مامۆستا خەلیل ئیسماعیل محەمەد سوڵتانی خەڵکی کفری بوو، بەڵام بەعس ئەم ناوەندی ڕۆشنایییەی بە ژاڵە ڕەوا نەبینی و قوتابخانەکەی بە فەرمانی کارگێڕی ژمارە٣٥١٣٦ لە ١٩٨٥/١١/١ بەگواستنەوەی مامۆستا خەلیل بۆ قوتابخانەی گوندی»تۆپخانە» داخست١٤.

قسەی کۆتایی بەشێکی سوڵحە عەشایەرییەکانی ئەو دەمەی ناوچەکە حاجی قادری شاتری دەیکردن، ئەم کەسایەتیەی حاجی قادر وای کردبوو کە گوندی ژاڵە لەو دەور و زەمانەدا وەک مەکۆیەک بۆ ئاشتی و لێبوردەیی و کۆبوونەوە لەدەوری سفرەی چاکەخوازی و چاکەی گشتی تەماشا بکرێ، حاجی قادر بەجۆرێک خاوەن هەڵوێستی گەورە و لەگەڵ گیانی ئاشتی و چاکەخوازی خۆیدا ڕاستگۆ بوو کە کاتێک لە ١٩٦٥/١٢/٢ چەند بکوژێک حاجی عەلی کوڕیان لە گوندی پاریاوڵەی گەورە بە ناهەق وغەدر شەهید کرد و هەر لەگەڵ ڕوداوەکەدا هەموو جاف و هەزاران سواری ئەو فیدراسیۆنە خێڵەکیە هاتنە ژاڵە و داوایان لە حاجی قادر کرد ڕێگایان بدات بۆ تۆڵەکردنەوە و نزیکەی مانگێک سەدان سوار و چەکداری جاف لە ژاڵە بوون، بەڵام حاجی بەڕێزەوە هەموویانی گەڕاندەوە و بۆ داخستنی دەرگای ئاشوب و فیتنە تەنیا بکوژەکان و کەسوکاریانی لەناوچەکەی خۆی دوور خستەوە، ڕووداوێکی تری جیاکەرەوەش کە لە ژاڵە ڕوویدا لە ساڵی ١٩٧٠ بوو کە حاجی و کوڕ و نەوەکانی بۆ هەندێک کاروباری فەرمانگەکانی حکومەت و لەوێ سەیارەیەک لە «ڕەوف» ی کوڕی حاجی قادریدا و دەسبەجێ گیانی لەدەستدا و هەر لەوێ حاجی لە شۆفێرەکە خۆشبوو و ئازادی کرد، لەکاتی گەڕانەوەییدا بۆ ژاڵە خەڵکی دێ بەژن و منداڵ و گەورە وبچوکەوە چوونە پیرییەوە و بووە شین و قوڕپێوان و حاجیش تەنیا ئەوەی وت»ئەوەی ڕوویداوە قەدەری خوا بووە و خوا تا ئەوێ ڕەوفی بەوان بەخشیوە و تەواو»١٥.

دووای ئەمە سوپای عیراق بەفەرمان و چاودێری ڕاستەوخۆی عبدالرحمن عارف فەرماندەی لیوای ١٦ ی زرێپۆش هەڵیان کوتایە سەر گوندی ژاڵە و سەدان سەرباز بە تۆپ و تانکەوە پەلاماری دێیان دا و دوو ڕۆژ فرۆکەکانی سوپا بەچڕی بۆردومانی دێیان کرد، دووای بەرگریەکی بێوێنەی حاجی قادر و کەسوکارەکەی کە حاجی بۆ ئەو شەڕە



تفەنگێکی سەلیبی کە پێی دەوترا «زدی یەهود» و دوو ڕەزن فیشەکی لەخۆی دابوو و لەسەنگەرەکانی پێشەوەی بەرگریدا بوو لە خاک و ئاو و نیشتیمانەکەی، لەو شەڕەدا لە ١٩٦٣/٧/١٩ یەحیای حاجی حسێنی حاجی قادر کە کوڕێکی جوانخاس بوو شەهیدکرا و لەو شەڕەدا ئەفسەر و چەند سەربازی سوپای بەعس کوژران و شوێنی کوژرانی ئەفسەرەکە لە بانی ژاڵەدا تا ئێستاش پێی دەوترێت» زابت کوژراو»، بۆ ڕۆژی دوواتری شەڕەکەش سوپای عێراق گوندەکەی حاجی قادر «ژاڵە»یان سوتاند ولەگەڵ خاکدا یەکسانیان کرد١٦، گوندەکە ساڵێک زیاتر لە ژێر هەڕەشەی جاش و جەیشدا بە چۆڵی و کاولکراوی مایەوە، ئەڵبەتە گوندەکە جگە لە شەهید یەحیای حاجی حسەین چەندین شەهیدی تریشی لە شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستاندا پێشکەش کردووە کە لە شۆڕشی نوێدا غازی حاجی حەسەن ومەحمود عەلی محەمەد ناسراو بە مەحمود مارکس و شەهید ئەنوەر محەمەد حسێن و شەهید خەلیل حسەین و شەهید عومەر حاجی ئەحمەد حاجی عەلی و شەهید کاوە شەوکەت حاجی عەلی بوون .

لەپەیوەندی بەو دامەزراوانەی کە لەحەفتاکاندا لە ژاڵە کراونەتەوە، کردنەوەی بارەگایەکی «جەمعیەی فەلاحی و تەعاونیە» کە تایبەت بوو بەکاروباری جوتیاران و لەخانوویەکی قوڕدا بوو کە لەوەودواش پێی دەوترا «مەقەڕەکە».

پاڵپشتی و لەخۆگرتن وپەنادانی خەڵک و کوردی خۆرهەڵات



داڵدەدانی لێقەوماوان وچارەسەركردنی كێشەكانیان بەشێك لە كاروباری ڕۆژانەی حاجی قادر بوو لە گوندی ژاڵە، لەبازنەی فراوانتریشدا حاجی قادر بۆ هەر كوردێكی پاك و شۆڕشگێڕی پارچەكانی تری كوردستانیش كە بەناچاری پەنای بۆ باشور دەهێنا پەنا و پاڵپشت بوو، وەك ئەوەی دوای ڕاپەڕینی بەشێك لە خێڵ وهۆزە كوردەكانی ڕۆژهەڵاتی كوردستان لەدژی فەرمانڕەوایەتی ئێرانی پەهلەوی لە سییەكانی سەدەی ڕابردوودا ڕوویدا، كە بەو هۆیەوە بەشێك لەو تیرە وهۆزانە بەهۆی زوڵم وڕاوەدوونانی دەسەڵاتی شاهەنشاهیەوە بەناچاری پەنایان بۆ باشوور هێنا، لەو نێوانەدا حاجی قادر لە «ژاڵە» و گوندەكانی تری خۆی داڵدەی بەشێك لە گەڵباخیە هەڵهاتووەكانی دا بە سەرعێلێكیشیانەوە كە ناوی»عیساخانی گەڵباخی»یە و حەساندینیەوە، لەم ساڵانەی دوایشدا كوڕەكانی عیسا خان كە لە وڵاتی ئێران دەژین پەیوەندی بە مستەفای حاجی قادری شاتریەوە دەكەن وەفا و پێزانین بۆ ئەو داڵدەدانەی باوك و عەشیرەتەكەیان دەردەبڕن١٧، لە نێوان گوندەكانی «گلاڵ كەوە» و»ژاڵە»شدا لەناوچەیەك كە»ئەسحاو»ی پێدەوترێت داڵدەی ڕەزاخانی نێرژی و بەشێك لە كەسوكارەكەیدا و لەوساوە ئەو شیوەی ئەو ناوچەیە تا ئێستاش بە «دۆڵی ڕەزاخان» دەناسرێ، ئەڵبەتە لەدوای نسكۆی شۆڕشی ئەیلولیشەوە بەشێك لە بەیاخییەكان كە حاجی قادر داڵدەی دابوون لە گوندی ژاڵە نیشتەجێبوون.

دووای ئەو كاولكردن وسوتاندنەی ١٩٦٣ جارێكی تر لەلایەن هەمان ڕژێمەوە، بەڵام بە درندایەتیەكی گەورە و فراوانترەوە لە سەروبەندی عەمەلیاتەكانی ئەنفالدا لەساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ خاكدا یەكسان كرایەوە و كانی و كارێزی بەTNT تەقێنرایەوە و كوێر كرایەوە و ئاش و مزگەوت و مەكتەبی ڕوخێندرا و كرایە لانەی بایەقوش.

جارێکی تریش گوندەکە لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ لەلایەن خەڵکەکەیەوە ئاوەدان کرایەوە و ڕێکخراوی OXFAM ی بەریتانی بە داروپەردوو و دەرگا و پەنجەرە هاوکاری خەڵکەکەی کرد و پاشتریش لەساڵی ١٩٩٤ یش نووسەری ئەم دێڕانە قوتابخانەی گوندەکەی ئاوەدان کردەوە و دووساڵ بەڕێوەی برد، لەپاڵ پەروەردەدا ڕێکخراوی یونسێفیش بۆ کردنەوەی قوتابخانەکە هاوکار بوون، پاشتریش مامۆستا ئیدریس ژاڵەیی و مامۆستا ئەحمەد محەمەد مەولود و مامۆستا فەیسەڵ حاجی حەسەن و مامۆستا عومەر و و مامۆستا ملکۆ ئەحمەد و مامۆستا قاسم جاسم و مامۆستا ئومێد عەلی و مامۆستا ئازاد مەحمود و مامۆستا لوقمان عبدالله و مامۆستا ئەرکان غەیدان بەڕێوەیان برد و بەدووای ئەوانیشدا مامۆستای تر هاتن.

لەساڵی ١٩٩٦ یش ڕێکخراوی ڕابیتەی ئیسلامی کورد مزگەوتی گوندەکەی ئاوەدان کردەوە و گوندەکە لە ئێستاشدا ئاوەدانە و ١٥ خێزانی تێدا نیشتەجێیە و گوزەرانی خەڵکەکە لەسەر ئاژەڵداری و چاندنی گەنم و جۆ و بڕێکی کەم شوتی و کاڵەک و ترۆزیە.

ژاڵەی حاجی قادر گوندێکی بچووکە، بەڵام لەبەر پێگە تایبەت و مێژووییەکەی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی خاوەن بڕوانامەی بەرزی دکتۆرا، ماستەر، بەکالۆریۆس لێوە دەرچووە و گوندەکە ڕێژەیەکی بەرچاو دکتۆر، ئەندازیار، مامۆستا، فەرمانبەر، خوێندکار، ڕۆژنامەنووس، چالاکوان، جوتیار، خاوەن پیشەی جیاجیا، بەڵێندەر و وەبەرهێنەری هەیە کەلە کەرتە جیاجیاکاندا لە کوردستان و گەرمیان کاریگەر وناسراون.

## سەرچاوە و پەراوێز:


١. رحلة فريز الى بغداد فى ١٨٣٤/ جيمس بيلى فريز/ ترجمة: جعفر الخياط/ الطبعة الثانية ٢٠١٤،ص ٤٩.

٢. گۆڤاری زانکۆی گەرمیان/ ژمارە ٣ ی ساڵی ٢٠١٨/ کەلار و دەوروبەری لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە مێژووییەکاندا١٨٠٠_١٩٠٠/ خالید مەحمود کەریم/ ل ١١٩.

٣. گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان١٨٢٠/کلۆدیۆس جیمس ریچ/ وەرگێڕانی: محەمەد حەمەباقی/ هەولێر ٢٠٠٢، «بۆ بابەتی بوونی چەند خێزانێکی هۆزی هۆرمەزیار لە سەدەی هەژدەدا لە ژاڵە لەگەڵ زۆر کەسایەتی جیاجیا پەیوەندیم کرد، بەڵام بەداخەوە دۆکۆمێنت یا زانیاریەکی کۆنکریتیم دەست نەکەوت تا لێرە تۆماری بکەم و داینێم، لەوانە: مامۆستا عەلی پەرلەمان پێشمەرگەی دێرین و ڕوناکبیر و مامۆستا مستەفا سەعید نووسەر و مامۆستا خالید مەحمود ئەکادیمی وتوێژەر و کاک کاروان یاروەیس ڕۆژنامەنووس و

پەرلەمانتار و کاک ئەحمەد یابە کە مێژووی هۆزی هۆرمەزیاری نووسیوەتەوە».


٤. عشائر العراق/ الكرديه/عباس العزاوى/چاپخانەی مەعاريف /بەغدا/١٩٤٧/ل ٥٣.

٥. لەبەردەم شکۆی مرۆڤە مەزنەکاندا/م عەلی/ سلێمانی/ چاپخانەی حەمدی/ ٢٠١٨.

٦. پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ کەسایەتی کۆمەڵایەتی و سیاسی شاتری کاک برایمی سەمین لە رۆژی٢٨/٥/٢٠٢٤

٧. زانیاریە کشتوکاڵیەکانی ناو نووسینەکە داتای بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ_ بەشی کشتوکاڵی پێبازن .

٨. مێژووی عەشیرەتی شاتری/ حاجی برایمی شاتری/ دەستنووس.

٩. دیدار لەگەڵ وەستا عەزیز فیتەری کوڕی برایمی حەمەخان لە ڕۆژی ٢٠٢٤/٥/٨.

١٠. دەستنووسەکەی حاجی برایمی شاتری.

١١. دیدار لەگەڵ مامۆستا مەلا کەریمی شافیعی، پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی شافیعی لە کەلار لە ٢٣/٥/٢٠٢٤.

١٢. لەبەردەم شکۆی مرۆڤە مەزنەکاندا/ م عەلی / سلێمانی/ چاپخانەی حەمدی/٢٠١٨.

١٣. دەستنووسەکەی حاجی برایمی شاتری.

١٤. ئەو بەڵگەنامەیەم لای مامۆستا مستەفا سەعیدی نووسەر و وەرگێڕ دەسکەوت.

١٥. هەمان دەستنووسەکەی حاجی برایمی شاتری.

١٦. هەمان دەستنووسەکەی حاجی برایمی شاتری.

١٧. دیدار لەگەڵ سەرۆکی عەشیرەتی شاتری مستەفای حاجی قادری شاتری لە ٢٨/٥/٢٠٢٤.

# یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان لە ساڵی ١٩٩٨



مامۆستا جەمال سەعید

خاوەنی بیرۆکە و سەرپەرشتیاری یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان

لێرەدا بەکورتی تیشک دەخەمە سەر چۆنیەتی بەڕێوەچوونی یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان، لەساڵی ١٩٩٨ سازدرا لە پێدەشتی بەردەسووری قەزای کەلار، بە ئامادەبوونی پتر لە (٢٥) هەزار کەس.

## بیرۆکەی سازدانی یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان

بیرۆکەی ئەم ڤیستیڤاڵە دەگەڕێتەوە بۆ ناو قوتابخانەی هۆگری سەرەتایی لە کاتێکدا بەندە لە دوای ساڵەکانی ١٩٩٢ لە یادی (ئەنفال، کۆڕەو، ڕاپەڕین و کیمیابارانی هەڵەبجە و زیندوو کردنەوەی فۆلکۆری کوردی( ساڵانە وەک مامۆستای هونەر بە هاوکاری کارگێڕی قوتابخانە و بەشێک لە مامۆستایانی هاوڕێم ئەو جۆرە چالاکیانەمان ئەنجام دەدا، تاوای لێهات بیرۆکەکە گەورە تر و فراوانتر بوو، بۆیە هەوڵمدا جگە لە چالاکییەکانی ناو قوتابخانە، لە پێناو بەرز ڕاگرتنی فۆلکلۆری کوردی، ڤیستیڤاڵێکی فۆلکلۆری ساز بدەم.

سەرەتا پرس و ڕاوێژم بە چەند هاوڕێ و کەسایەتییەک کرد بەتایبەتی مامۆستا مەحموودی ڕاگەیاندن، کە زۆر هاوکارم بوو لە هەموو بوارەکان و تاوەکو ئێستاش، هەروەها خەڵکانی تریش، لەوانە شێخ سەعید شاکەلی، پرس و ڕاوێژم پێیکردووە لەبەر ئەم هۆیانە :



- دراوسێی ناوەڕاستی ساڵی هەشتاکان بووین.
- وەکو ئەندامێکی دەستەی ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتی حەوزی گەرمیان، کە ناوبراو بەرپرسی کۆمەڵایەتی حەوزی گەرمیان بوو.
- وەکو بەرپرسی کتێبخانەی گشتی کەلار، زیاتر دەستی واڵا و کراوە بوو بۆ هاوکاری کردنم.

لەسەرەتای بیرۆکەکە، پێشنیاری کرد کە سەردانی شێخ محەمەد شاکەلی برای بکەم، لەبەرئەوەی ئەو کات شێخ محەمەد بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی (ی. ن. ک) بوو، جگە لەوەیش ئەندامی ئەحتیاتی (م. س)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەرپرسی مەڵبەندی (٢)ی ڕێکخستنی کەرکوک یەکێتی بوو، بۆیە لە سلێمانی سەرەتای مانگی ئاداری ساڵی ١٩٩٨ سەردانی شێخ محەمەد شاکەلیم کرد، بیرۆکەی سازدانی فیستیڤاڵێکی فۆلکۆریم لەگەڵدا باس کرد، بۆیە هەر زوو بەڵێنی هاوکاری کردنی پێدام لە ڕووی ماددی و مەعنەوی و هەموو بوارەکانی تر، لە جاری دووەمدا کە گەڕامەوە لای شێخ محەمەد چەند نامەیەکی پێدام بۆ زیاتر گرنگیدان بە سازدانی ئەم فیستیڤاڵە، بەتایبەت نامەکان بۆ کاک حەسەن جیهاد ئەمین (ئەبو فەلاح)کەدواتر بەیادداشتێک گرنگی سازدانی ئەو فێستیڤاڵەی بۆ کاک شێخ محەمەد ڕوون کردبووەوە، بەشی ڕوناکبیری و ڕاگەیاندنی مەڵبەندی (٢)ی ڕێکخستنی کەرکووک، قائیمقامی کەلار، ئەو کات خوالێخۆشبوو حەمە لەتیف حامد بوو کە تازە بوو بووە قائیمقامی کەلار.



دواتریش گەڕامەوە بۆ لای شێخ سەعید شاكەلی، سەبارەت بە پشتگیرییەكانی كاك شێخ محەمەد، بۆیە شێخ سەعید ئێواران و ڕۆژانی پشووەكانی تەرخان كرد بۆ كۆبوونەوە لەناو كتێبخانەی گشتی كەلار، لەدوای دەوامی فەرمی ڕۆژانە و هەر لەوێ یەكەمین كۆبوونەوەمان ئەنجامدا، بیرۆكەی ئەو ڤیتسیڤاڵەمان خستە پێش چاوی ژمارەیەك كەسایەتی ڕۆشنبیر و مامۆستا و نووسەر و فۆلكلۆردۆستانی ناوچەكە، ڕۆژانەش لە ڕێگای هەردوو ڕادیۆی (ئازادی و گەرمیان) و كەلار TV سەر بە كۆمیتەی ڕێكخستنی كەلاری یەكێتی، ئاگادارییمان بڵاو دەكردەوە، خەڵك پەیتا پەیتا سەردانی ئەكردین لە ناو كتێبخانەی گشتی بۆ مەبەستی ناونووس كردنیان لە لیژنەكانی ڤیستیڤاڵ كە زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵی سەرخستنی ئەو ڤیتسیڤاڵە دەدرا لە لایەن لیژنەی باڵا و لیژنە فەرعیەكانی ترەوە.

ئێمە لەسەرەتاوە وویستمان ڤیستیڤاڵەكە لەسەر قەڵای شێروانە ساز بدەین، بەڵام دواتر پێشبینیمان كرد كە ژمارەیەكی زۆر لە هاوڵاتی بەشداری بینینی بڕگەكانی ڤیستیڤاڵ بكەن كە بۆ یەكەمین جارە لە گەرمیان ساز دەدرێت، بۆیە ناچار بووین بە پرس و ڕاوێژ لەگەڵ لێژنەكاندا شوێنێكی فراوانتر دەست نیشان بكەین كە لەوێدا بتوانرێت نمایشی گواستنەوەی بووك بۆ ماڵی زاوا و سوارچاكی و ڕمبازی و نمایشی كۆچەری ئەنجام بدەین، بۆیە دەروازەی بەردەسورمان هەڵبژارد كە ئێستا بەشێكی بووەتە یەكێك لە كۆلێژەكانی زانكۆی گەرمیان و نزیك پرۆژەی نیشتەجێبوونی بەهەشتی مامۆستایان.

ڕۆژانە لەناو کتێبخانەی گشتی کەلار کە کاک شێخ سەعید و کاک شێرکۆ و کاک حەسەن جاف و هەندێک لە ئەندامانی لیژنەی باڵا سەرپەرشتی کۆبوونەوە و دابەشکردنی ئەرکەکان دەکرد، بەتایبەت ئەندامانی لیژنەی باڵا بە ئامادەبوونی ئێمەیش، هەروەها لەبەر کەمی کات، هەر زوو هەوڵمدا لۆگۆ بۆ ڤیستیڤاڵەکە دروست بکەم، چونکە ئێمە هەر لە مانگی ئازاری ١٩٩٨، بڕیاری سازدانی ڤیستیڤاڵەکەمان دا بە ئاگاداری و ڕەزامەندی کاک شێخ محەمەد شاکەلی، چونکە تێچووی هەموو ڤێستیڤاڵەکەی خستبووە ئەستۆ.

پێشنیاری دروستکردنی لۆگۆی ڤیستیڤاڵەکەم خستە بەردەستی هەردوو هونەرمەندی شێوەکار (مامۆستا جەمال خەتات، مامۆستا عەدنان عەبدولقادر)، بەڵام دروشم و لۆگۆی مامۆستا جەماڵ، وێنەی قەڵای شێروانەی تێیدا بوو کە ڕەمزێکە بۆ گەرمیانییەکان بۆیە ئەو لۆگۆیە کرایە لۆگۆی ڤیستیڤاڵ، سەرەڕای ئەوەی لۆگۆکەی مامۆستا عەدنان زۆر جوان بوو کە جێگای دەستخۆشی بوو، بەڵام لۆگۆکەی قەڵای شێروانە بە گونجاو تر زانرا بۆ ڤیستیڤاڵەکەمان لە لایەن لیژنەی باڵاوە، کاتێک کە نزیک بووینەوە لە تەواو کردنی بڕگەکانی ڤێستیڤاڵ، بڕیار درا کە بەرواری (٢٩ی ئازاری ١٩٩٨)، یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان ساز بدرێت، وە پێمان باش بوو لەچوارچێوەی ڤێستیڤاڵەکە





پێشانگایەکی فۆلکلۆری لەسەر قەڵای شێروانە بکرێتەوە، بۆیە بۆ کار ئاسانی جارێکی تر سەردانی کاک شێخ محەمەدم کرد لە دەربەندیخان، کە چەند نامەیەکی تایبەتی پێدام بۆ پارێزگای کەرکووک، ئەو کات مامۆستا جەلال جەوهەر– پارێزگار بوو، وە نامەیەک بۆ خوالێخۆش بوو عادل مراد وەکو بەرپرسی مەکتەبی ڕاگەیاندنی (ی. ن. ک)، بۆ ئاگادار کردنەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئێزگە و تەلەفیزیۆن و ڕۆژنامەکان بە مەبەستی بایەخدان بەسەرخستنی یەکەمین فیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان.

لە ڕۆژی (٢٩ی ئازار)، سەرلەبەیانییەکەی هەموو ئەندامانی لیژنەی باڵا و لیژنەکانی تر و جەماوەرێکی زۆر لە دەروازەی بەردەسوور لە شوێنی فێستیڤاڵ ئامادەبوون، بەڵام پێش دەست پێکردنی بڕگەکانی فێستیڤاڵ بە چەند خولەکێک بەهۆی نەگونجانی کەشوهەوا و بارانێکی زۆر لە نێوان کاتژمێرەکانی (٩- ١٠)ی بەیانی نەتوانرا بڕگەکانی فیستیڤاڵ ئەنجام بدرێ و خەڵکەکە گەڕانەوە ماڵ، بەهۆی نەبوونی زانیاریمان لەبواری کەشوهەوا، تێبینی ئەوە نەکرا بوو لە ڕۆژی بیست و نۆی مانگ باران بێت، بۆیە خوالێخۆش بوو، جەنابی مام جەلال تاڵەبانی کە بەلایەوە گرنگ بوو ئەم فێستیڤاڵە بکرێت لە ڕۆژی فیستیڤاڵەکە گەیشتە شاری کەلار، سەرەڕای باران بارینێکی زۆر.

هەمووان نیگەران بووین کە جەنابی مام جەلال بەهۆی فێستیڤاڵەکەوە تەشریفی هێناوە و ڕێگایەکی زۆری بڕی بوو، بەڵام بەهۆی خراپی کەشوهەوا و باران بڕگەکانی فیستیڤاڵ ئەنجام نەدرا، لەپاش وەستانی باران لە کاتژمێر یازدە بەدواوە بەکاک شێخ

محەمەد شاکەلیم ڕاگەیاند کە برگەی دووەمی فیستیڤاڵ کە پێشانگایەکی فۆلکلۆری بوو لەسەر قەڵای شێروانە ئامادەیە، بۆیە جەنابی مام جەلال تاڵەبانی و وەفدی یاوەری کە پێکهاتبوون لە بەڕێزان: شێخ محەمەد شاکەلی، )خوالێخۆشبووان شەوکەتی حاجی مشیر، بەکری حاجی سەفەر(، مەلا بەختیار، کەمال موفتی، شێخ جەعفەر شێخ مستەفا، جەمال حەکیم ئاغا، پارێزگاری کەرکووک، قائیمقامەکانی کەلار و کفری و خانەقین...هتد، ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسانی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێم لەشاری کەلار، پێشنگاکە لەلایەن جەنابی مام جەلال کرایەوە.

پێشانگای قەڵای شێروانە کە پێکهاتبوو لە ژمارەییەک کەلوپەلی فۆلکلۆری، بە نوسراوی ژمارە (٢٨٣، ١٩٩٨/٣/٢٥) پارێزگای کەرکووک، لە جیهانی کەلەپوری سلێمانی کە خاوەنەکەی (فریاد عارف ڕەشید) بوو هێنامان، بەشێکی تری لەماڵی هاوڵاتی حاجی محەمەد ئەحمەد گوڵە لە سلێمانی، بەشێکی تری کەرەستە فۆلکۆرییەکانی کاک ساڵەح محەمەد فەرەج بوو لە کەلار، هونەرمەند کاک محەمەد سابیر کەمەرم ڕاسپارد کە دەفتەری دەلیلی فیستیڤاڵ پێشکەش بە جەنابی مام جەلال و میوانەکانی بکات لەسەر قەڵای شێروانە، دیزاینی لە چاپدانی دەفتەری دەلیلەکە لەلایەن مامۆستا ئیسماعیل محەمەد ڕەشید لە پەیمانگای تەکنیکی کەلار بوو، لەچوارچێوەی ئەو سەردانەی





مام جەلال بۆ بینینی پێشانگای قەڵای شێروانە لە دەفتەری یادەوەرییەکەماندا نووسی بوویی (دەستخۆشی لە شاکاری ئەو خوشک و برایانە دەکەم کە ڕێکخەر و هاندەر بوون بۆ سازدانی ئەم ڤیستیڤاڵە)، هەروەها مام جەلال کە بینی قەڵای شێروانە پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەیە، هەر لەوێ بڕیاری دا بە تەرخانکردنی مەبلەغێکی باش لە پارە بۆ نۆژەن کردنەوە و جوانکردنی قەڵاکە، ڕاستەوخۆ ئەو پارەیە لەلایەن لیژنەیەکی تایبەتی پسپۆڕ تەرخان کرا بۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵاکە، دواتر خوالێخۆش بوو کاک سەرتیپ حەمە ئەمین بەگ سەرپەرشتی دەکرد، لەبەر گرنگی هاتن و بایەخدانی سەرکردەی کورد جەنابی مام جەلال و پێشنیاری دووبارەکردنەوەی ڤیستیڤاڵ، بۆیە لیژنەی باڵا و لیژنەکانی تر بە پاڵپشتی خەڵکی ناوچەکە کە ڕۆڵی سەرەکییان هەبوو لە سەرخستی برگەکانی ڤیستیڤاڵ لەبەرواری (١٣ی نیسانی ١٩٩٨)، بە ئامادەبوونی فۆلکۆردۆستانی گەرمیان و جەماوەرێکی زۆر لە ژێر ناونیشانی ((فۆلکلۆر مۆزەخانەی زیندووی مێژووی گەلانە)) بڕگەی دووەمی یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان ساز درا.

دەنگدانەوە و سەرکەوتنی ڤیستیڤاڵەکە هاندەرێکی مەعنەوی بوو لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان کە بۆ ساڵانی داهاتوویش ئە م ڤێستیڤاڵە سازی بدەین، بۆیە تا چوارەمین ڤیستیڤاڵ لە (٢٠ی نیسانی ٢٠٠١) بەردەوام بوو، یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان لە چوارچێوەی مەکتەبی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵەی ڕوناکبیری کۆمەڵایەتی کەرکووک ساز درا، بەم شێوەیە بوو :



• یەكەمین ڤیستیڤاڵی فۆلكۆری گەرمیان، دوو برگە پێكهاتبوو؛ برگەی یەكەم ٢٩ی ئازاری ١٩٩٨ لە كەلار كردنەوەی پێشانگای قەڵای شێروانە، برگەی دووەم ١٣ی نیسانی ١٩٩٨ لە كەلار سازدانی برگەكانی ڤێستیڤاڵ

• دووەمین ڤیستیڤاڵی فۆلكۆری گەرمیان، لە كفری لە ١٠ی نیسانی ١٩٩٩ لە باوەشاسوار.

• سێیەمین ڤیستیڤاڵی فۆلكۆری گەرمیان، لە دەربەندیخان لە ١٠ی نیسانی ٢٠٠٠.

• چوارەمین ڤیستیڤاڵی فۆلكۆری گەرمیان، لە بازیان- بەردەقارەمان لە ٢٠ی نیسانی ٢٠٠١. پێم وابێت لە ڤیستیڤاڵی سێهەم و چوارەم وەزارەتی رۆشنبیری حكومەتی هەرێمی كوردستان و بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری كركوك و ناوەندی كۆمەڵایەتی و یەكێتی ژنانی لقی كەركووك- گەرمیان ،رۆڵی بەرچاویان هەبوو بۆ سەرخستنی ئەو ڤیستیڤاڵانە، بەڵام بە داخەوە لە دوای چوارەمین ڤێستیڤاڵ ئیتر لە چوارچێوەی كۆمەڵەی رووناكبیری و كۆمەڵایەتی، ڤێستیڤاڵمان ئەنجام نەدرا.

## ئەندامانی لیژنەی باڵا ی یەکەمین فێستیڤاڵ پێکهاتبوون لەم بەڕێزانە :

١. جەمال سەعید- سەرپەرشتیاری یەکەمی فیستیڤاڵ.
٢. شێخ سەعید شاکەلی- ئەندامی لیژنەی باڵا و ڕاوێژکاری.
٣. م ٠مەحموود محەمەد عەلی- دەستەی ڕاگەیاندن.
٤. حەسەن عەلی سەلیم- دەستەی ڕاگەیاندن.
٥. حەسەن جیهاد ئەمین- ئەندامی لیژنەی باڵا.
٦. جەمال عەبدولڕحمان (جەمال خطاط)- ئەندامی لیژنەی هونەری.
٧. مەحموود شێخ وەهاب- ئەندامی لیژنەی هونەری و ڕاگەیاندن.
٨. شێرکۆ محەمەد ڕۆستەم- لێژنەی بەڕێخستنی خێڵ.
٩. م٠هەتاو خەلیل ڕەشید- « لیژنەی بووک و زاوا »
١٠. ئیبراهیم باجەڵان- ئەندامی لیژنەی ڕاوێژکاری.
١١. حەسەن مەحموود داودی- لیژنەی پێشوازی.
١٢. ساڵح محەمەد فەرەج- لێژنەی قەڵای شێروانە.
١٣. عەتا محەمەد سنجان- لێژنەی سوار چاکەکان.

لەبەر گرنگی فیستیڤاڵەکە لە دوای هاتنی مام جەلال و برگەی یەکەم، لیژنەیەکی تر لەبەرپرسانی حکومی و حزبی پێکهێنرا بۆ زیاتر چاودێری و سەرخستنی فیستیڤاڵ وەک لێژنەی (متابعە)، لەم بەڕێزانە پێکهاتبوون:

١. عادل شکور- لیژنەی متابەعە، ج٠مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکووک.

٢. محەمەد عەبدوڵڵا (محەمەد چاوجوان)- بەرپرسی کۆمیتەی کەلار.

٣. محەمەد لەتیف حامد- قائیمقامی قەزای کەلار.

جگە لە ڕۆڵی دەزگا ئەمنیەکان بۆ پاراستنی شوێنی فێستیڤاڵ بە تایبەتی ئاسایشی گەرمیان و ئاسایشی کەلار کە کاک ئەیوب عەبدولمحەمەد- بەرپرسی یاریدەدەرێتی ئاسایشی کەلار بوو، هەروەها پۆلیسی کەلار کە نەریمان عەبدوڵڵا- بەرپرسی پۆلیسی کەلار بوو، ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە پاراستن و ئەمنیەتی شوێنی فێستیڤاڵ٠

هەروەک لەسەرەتاوە باسمان کرد، خوالێخۆشبوو جەنابی مام جەلال زۆر ئارەزووی بینینی برگەکانی یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیانی هەبوو، بەو هیوایە و لە ئەنجامی ئەو جۆشوخرۆشەی لە لایەن ئەندامانی لیژنەی باڵا و جەماوەر و لیژنەکانی ترەوە بەدی کرا، کۆبوونەوەیکمان سازدا بەئامادەبوونی شێخ محەمەد شاکەلی کە پێش هاتنی یادی ئەنفال ئەو ڤیستیڤاڵە ئەنجام بدرێتەوە، رۆژی (١٣ی نیسانی ١٩٩٨)، کاک شێخ محەمەدشاکەلی بە نوێنەرایەتی هەڤاڵ مام جەلال بە ئامادەبوونی خاتوو هێرۆ خان، یەکەمین مۆمی ڤیستیڤاڵی داگیرساند بە دەست پێکی پارچە شیعرێک لە لایەن چەند کچە خوێندکارێک کە پارچە هۆنراوەکەی لەلایەن بەرێز د. رێبوار رەوف ساڵحەوە ئامادە کرابوو کە ئێستا لەدەرەوەی وڵاتە، هەروەها مامۆستا ئازاد حسێن فەرحان بە نوێنەرایەتی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کەلاری ئەوکات سەرپەرشتی گروپی ئەو منداڵانەی دەکرد کە پارچە شیعرەکەیان پێشکەشکرد.

## برگەکانی ڤیستیڤاڵ:

- ووتەی بەخێرهاتن لەلایەن لیژنە راگەیاندن
- خوێندنەوەی چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز لەلایەن مامۆستا مەلا قادر
- خوێندنەوەی ووتاری لیژنەی باڵای ڤیستیڤاڵ لەلایەن مامۆستا جەمال سەعید
- مەراسیمی گواستنەوەی بووک بۆ ماڵی زاوا (هونەرمەندی خوالێخۆشبوو {ئەمین ساڵح رۆڵی زاوا، بەناز خالد سەوزە رۆڵی بووکی ڤیستیڤاڵ} ،توبا ئەحمەد فەتاح رۆڵی پیرە خەسوو.
- هونەرمەندانی بەشدار بوو: خوالێخۆشبوو حسێن هەیەر بە گۆرانی دوو سوارم راوە راوکە، والی مێوەکە بە هۆرە و گۆرانی سەلە وە تل دای لەمن، نوری عەبدولکەریم بە هۆرە و گۆرانی، حسێن عەبدولقادر ئەڵڵا وەیسی و هۆرە، شامراد میرزا بە هۆرە، خوالێخۆشبوو سەلاح حەمەی سەمین بە هۆرە
- شاعیرانی بەشدار بوو: هەردوو کەسایەتی حەسەن سایەخان، مەحموود عەبدولکەریم
- بە رێخستی خێڵ: شێخ سەعید شاکەلی، شێرکۆ محەمەد رۆستەم، نوری عەبدولکەریم،

حمەی سلێمان، عەتا محەمەد سنجان، سوارە سەعید شاکەلی (منداڵ)، جەیران نامیق بەرزۆ، پیرۆز حەمە عەزیز، سوپا سەعید شاکەلی (منداڵ)، خەلیفە قادر، جەلال لالە حەمەی زەرد، عەبدوڵڵا مەحموود گەلاڵی، فەتاح خەسرەو ئاڵی جان، سەرکۆ محەمەد ڕۆستەم، عادل مەلا ساڵح، بەهادین شێخ حەسەن مارف، پشکۆ محەمەد ڕۆستەم، جەلال شۆڕاوەیی، حەیات خەسرەو ئاڵی جان، لالە حەمەسور، محەمەد ئەمین فەتاح، ئاڵا ڕەشید کەریم، حسێن سەید خەلیل، عەلی دێوانە حەمە، ئەنوەر محەمەد سەمین، لەتیفە خەلیل ڕەشید، گەلاوێژ حاجی عوسمان، حاجی ڕەعنای دێبنە وسمکۆ محەمەد ڕۆستەم، چەندین ناوی تر (لەداهاتوودا لە کتێبێکدا تەواوی ووردەکاری زیاتر دەخەینەڕوو).

- میوانی ڤیستیڤاڵ: شکور حەمەی هەیەر و خزمانی کفری

- هاوکارانی دەستەی ڕاگەیاندن: د.عەدالەت عەبدوڵڵا کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە ڕاگەیاندنی مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکووک، بە سوود وەرگرتنم لەئەرشیفەکانی د.عەدالەت، هەروەها خاتوو جیهان محەمەد ئیبراهیم، شیلان محەمەد ئیبراهیم، م.نیگار ئەحمەد قادر، کارمەندانی کەلار TV و ڕادیۆی گەرمیان: جەمال ئەکبەر ناوخاس، تەلعەت سەعدوڵڵا، کامەران مەحموود، فەرهاد تۆفیق، گۆران محەمەد عەلی، ئەحمەد محەمەد (ئەحمەدی ئیزاعە)، جەمیل محەمەد ئیبراهیم، قانع تالب، د.جەلال سەعدوڵڵا، مامۆستا ئەحمەد سەعاتچی، بدریە محەمەد ساڵح و ژیان محەمەد سەعید (ژیان مەکتەبە).

- هاوکارانی لیژنەی باڵا و پێشوازی، ئەندامانی کۆمەڵایەتی حەوزی گەرمیان، هەندێکیان لە ژیاندا نەماون:

١. خوالێخۆشبوو حەسەن مەحموود داودی
٢. خوالێخۆشبوو مەلا غەریب عەبدوڵڵا ڕۆژبەیانی
٣. خوالێخۆشبوو عەلی حەبیب محەمەد باجەلان
٤. خوالێخۆشبوو خەلیفە ئەورەحمانی باجەلان
٥. خوالێخۆشبوو ڕەحیم ئەحمەد کاکە خان
٦. خوالێخۆشبوو کوێخا نوری میکائیل
٧. خوالێخۆشبوو شێخ ڕەوف شێخ ئیسماعیل
٨. خوالێخۆشبوو سید ئەحمەد عەبدولڕەحمان
٩. خوالێخۆشبوو مەلا مەجید کۆمەڵایەتی

١٠. خوالێخۆشبوو ئەحمەد مەحموود حەسەن (سەید ئەحمەد)
١١. خوالێخۆشبوو مەلا فایەق زەماوەنگە
١٢. خوالێخۆشبوو حەمە سەنگەری
١٣. خوالێخۆشبوو فازڵ بساط
١٤. خوالێخۆشبوو م٠حەسەن ئەحمەد ڕەحیم شێروەندی
١٥. خوالێخۆشبوو حەمە عەلی شرف
١٦. خوالێخۆشبوو م٠محەمەد عەلی سەلیم بەگ
١٧. خوالێخۆشبوو محەمەد سەعاتچی دەلۆ
١٨. خوالێخۆشبوومحیًدین شوكت ئاغاباجەلان
١٩. خوالێخۆشبوو شێخ فەریق تاڵەبانی
٢٠. خوالێخۆشبوو حەمە ئەمین كوێخا مەحموود عەمەڵە
٢١. خوالێخۆشبوو خەلیفە قادر
٢٢. خوالێخۆشبوو حەمە كەرەم ئەحمەد لەك
٢٣. ئەندامانی كۆمەڵایەتی كە هاوكار بوون لەسەرخستنی ڤیستیڤاڵی یەكەم
٢٤. پارێزەر نیزامەدین كوێخا غەنی
٢٥. مەلا محەمەد قادر باوەنوری
٢٦. دارا محەمەد ڕەشید تەرخانی
٢٧. مام ساڵح مامۆیی
٢٨. محەمەد عەبدولڕەحمان فەتاح
٢٩. عەلی ڕەشید پالانی
٣٠. محەمەد حاجی مەجید
٣١. د.لوقمان خەیاڵی
٣٢. حەسەن قادر مەحموود شاتری
٣٣. م٠مستەفا محەمەد ئەحمەد باجەلان
٣٤. شێخ لەتیف تاڵەبانی
٣٥. كەریم ئیبراهیم مەردان
٣٦. عومەر دیوانە حەمەئەمین
٣٧. حەسەن سایەخان
٣٨. نامیق حەمەی كەریم گلاڵی
٣٩. مامۆستا عەبدوڵلا حەسەن كەلاری

## لە پێناوی پاراستنی فۆلكلۆری كوردی لە گەرمیان
## لەژێر ناونیشانی فۆلكلۆر مۆزەخانەی زیندووی مێژووی گەلانە

(مەكتەبی كاروباری كۆمەڵایەتی حەوزی گەرمیان) بە هاوكاری كۆمەڵەی ڕووناكبیریی یەكەمین ڤیستیڤاڵی هونەری فۆلكلۆری كوردی لە گەرمیان ساز دەكات لەگەڵ كردنەوەی پێشانگایەكی فۆلكلۆری لەناو قەڵای شێروانە.




ڕۆژی یەك شەممە ١٩٩٨/٣/٢٩ تا ١٩٩٨/٣/٣١ .. كات ٩ی سەرلەبەیانی

• ژمارەیەک کەسایەتی کە ڕۆڵیان هەبوو لەسەرخستنی میهرەجان کە لەڕۆژی ١٣ی نیسانی ١٩٩٨، کە لە ڕاگەیاندنەکانەوە وێنەکانیان بەرچاو دەکەوت بە پێی ئەرشیفەکانی فیستیڤاڵ:

١. خوالێخۆشبوو ئەحمەد کەلاری
٢. خوالێخۆشبوو شێخ وەهاب شێخ حەسەن
٣. خواڵێخۆشبوو ئەحمەد قادر سەمین
٤. محەمەد خاڵۆ سلێمان
٥. عەبدولخالق زەنگەنە
٦. عومەر حسێن خدر
٧. عومەر حاجی فارس
٨. مام باقی دێبنە
٩. عەبدولڕەحمان محەمەد ساڵح
١٠. حسێن حاجی ئەحمەد یوسف
١١. مەریوان مەحموود مراد عەلی
١٢. حەسەن حەمە ساڵح
١٣. حەمەی عەبدولکەریم چاڵە ڕەش
١٤. ئەرکان محەمەد حاجی ئیبراهیم شاتری
١٥. نەجم حاجی حمە غەریب قولەبەرز
١٦. سەعید حاجی ئەحمەد ملەسورە
١٧. حەمید مەکتەبە
١٨. ئاکۆ محەمەد ڕۆستەم
١٩. مافپەروەر عومەر فەرەج
٢٠. محەمەد حەمەئەمین کەلاری
٢١. خوالێخۆشبوو ئەکبەر شێخ لەنگەری
٢٢. حاجی محمد ڕەباتی
٢٣. حاجی ئەحمەد بەرلوتی
٢٤. حاجی قادری تەپەسەوز
٢٥. ڕەشید ئەحمەد غەفار
٢٦. کەریم حاجی عەزیز
٢٧. حاجی نەوزاد داودی

٢٨. م·ئیبراهیم کوێخا زەند
٢٩. ئەحمەد ڕەحیم بان سندوق
٣٠. سیامند محەمەد عەلی
٣١. محەمەد مەحموود حەمد
٣٢. سەلاح دەروێش سەمین
٣٣. مەلا سەعید سۆفی
٣٤. بەکر حاجی حەمە سەعید ئاغا میر
٣٥. شێخ محەمەد شێخ مەعروف
٣٦. کاوە عەلی عەبدولقادر
٣٧. مەحموود حاجی حەمە سەعید ئاغا میر
٣٨. محەمەد حسێن قولەبەرز
٣٩. محەمەد ڕەحیم خازە
٤٠. محەمەد حاجی ڕەفعەت تەرخانی
٤١. عەلی گەلاڵی
٤٢. مامە دێوانە
٤٣. کەریم سەمین
٤٤. عەدنان محەمەد قارەمان

• یەکێک لە برگەکانی فیستیڤاڵ، نمایشی بووکە بەبارانە بوو، لەلایەن هونەرمەند محەمەد سابیر کەمەر ئامادەکرا بوو، ئەندامانی گروپی بە بووکە بەبارانە، لەمبەڕێزانە پێکهاتبوون:

١. محەمەد سابیر کەمەر- بەرپرسی گروپ
٢. ئازاد محەمەد سەمین
٣. خوالێخۆشبوو هێرش سەنگەری
٤. ئایار عوسمان
٥. کۆمەڵ کەریم محەمەد ناسر
٦. ئارام حەسەن سایەخان
٧. سەیوان عوسمان
٨. هەڵمەت کەریم محەمەد ناسر
٩. لۆزان عەلی محەمەد ساڵح




١٠. ئاریان عەلی

١١. فەرهاد عەبدوڵڵا

- هونەرمەند پشکۆ محەمەد ڕۆستەم ڕۆڵی شێتی فیستیڤاڵی لە ئەستۆ گرتبوو.
- ئەندامانی لیژنەی دارایی، هەتا برگەی یەکەمی فیستیڤاڵ

١. جەمال سەعید

٢. شێخ سەعید شاکەلی

٣. حەسەن عەلی سەلیم

٤. د،عەزە دین حارس

٥. ئیبراهیم باجەلان

٦. م ٠حەسەن ئەحمەد ڕەحیم

- ئەو خوشک و دایکانەی کە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو:

١. هەتاو خەلیل ڕەشید

٢. تابان شێخ عەبدوڵڵا

٣. م ٠پەیام ئەحمەد  بە نوێنەرایەتی یەکێتی ژنانی گەرمیانیش

٤. توبا ئەحمەد فەتاح

٥. وزیرە سەعید ئەحمەد

٦. سەحەر محەمەد ئەمین میرزا

٧. ئاسکە (خێزانی حاجی ئەحمەد ملەسورە)

٨. شەرمین حاجی عوسمان

٩. شنۆ شێرکۆ محەمەد ڕۆستەم

١٠. هەوار حەسەن عەلی سەلیم بەگ

١١. ڕێواس ئەحمەد عەبدوڵڵا

١٢. ئافتاو محەمەد ئەمین

١٣. ڕوناک عەلی سلێمان

١٤. شیرین شەوکەت بابان

١٥. پیرۆز محەمەد عەزیز

١٦. جەیران نامیق برزۆ

١٧. حەسیبە مەجید کەریم

١٨. پرشنگ کەریم عەلی

١٩. جەمیلە محەمەد کەرەم

٢٠. جەیران محەمەد حەیدەر

٢١. لەمیعە ڕەحیم ئەحمەد

٢٢. ئەختەر سلێمان

٢٣. سەبریە حەمە ساڵح

٢٤. ئەفرۆز حەمە غەریب

٢٥. بەهیە حاجی حسێن

٢٦. لەتیفە خەلیل ڕەشید

٢٧. نەجیبە ئەحمەد

٢٨. ڕێژاو عەبدوڵڵا

٢٩. سیڤان سمکۆ

٣٠. ئاسکە ئەحمەد محەمەد

٣١. مەلیحە محەمەد حەسەن

٣٢. حەیات خەسرەو ئاڵی جان

٣٣. ئاڵا ڕەشید کەریم

چەند خوشکانێکی بەڕێزی تر، بەتایبەتی هاوکارانم: جیهان و شیلان محەمەد، م. نیگار

● بەشداربووان:

گروپی هەڵپەڕكێی میزۆپۆتامیا

كەناڵەكانی بەشداربوو: كەناڵی گەلی كوردستان PUK ، خاك , MED TV ,زەنگ TV

● لیژنەی قەڵای شێروانە ٢٩ی ئازاری ١٩٩٨، ژمارەیەك كەسایەتی بەڕێز ئەركی پاراستنی كەرەستە فۆلكۆرییەكانی ناو قەڵای شێروانەیان پێ سپێردرا، جگە لە بەندە و كاك ساڵحی كەلەپوور، ئەم بەڕێزانە بوون:

١. زمناكۆ عەبدولكەریم

٢. عوسمان ڕەحیم نەجار

٣. نەوزاد عەلی وەلی باجەڵان

٤. سركەش ڕەشید باجەڵان

٥. ئاراز نامیق ڕەشید ئاغا

٦. محەمەد حاجی قاسم

٧. عەلی تازەدێی

٨. دڵشاد ئەحمەد

٩. محەمەد سابیر كەمەر

١٠. سەركەوت ساڵح محەمەد

١١. سالار محەمەد ئەمین

١٢. جەماڵ خەتات

١٣. عومەر ڕەحیم نەجاڕ

١٤. حاجی سەعدوڵڵا حەسەن

١٥. عەلی جاف

١٦. جەبار جۆڵا

١٧. عەزیز ئەحمەد ڕۆبیتەن

١٨. نەجات محەمەد ئەمین

١٩. یاسین محەمەد ئەمین

٢٠. م٠ لوقمان ئیراهیم مەردان

٢١. خوالێخۆشبوو خەولە ڕەمەزان مەجید باجەڵان

٢٢. هیدایەت ئەحمەد ڕەسوڵ

چەند ئافرەتێکی تر کە ناو وێنەم دەست نەکەوتووە.

• یارییە فۆلکۆرییەکان بە سەرپەرشتی شێرکۆی محەمەد ڕۆستەم، عەلی ڕەشید شاتری بوو:

١. شێرکۆ محەمەد ڕۆستەم
٢. عەلی ڕشید ئەمین شاتری
٣. حسێن محەمەد ئەمین
٤. ڕەوف عەبدوڵڵا
٥. عومەر ڕۆستەم
٦. محی دین تۆفیق
٧. ئەحمەد حەمەئەمین
٨. کەریم حەمەئەمین
٩. ڕەفعەت عوسمان حەمەئەمین
١٠. فازڵ ڕۆستەم
١١. سەباح محەمەد عارف
١٢. لیژنەی بەقاڵ و کۆتاڵفرۆش:
١٣. خوالێخۆشبوو عەزیز محەمەد وەیس مراد
١٤. محەمەد عەزیز محەمەد ڕەشید

• سوارچاکەکانی ڤیستیڤاڵ بە سەرپەرشتی مەحموود حاجی قادر شاتری، حەسەن فەتاح، عەتا محەمەد سنجان، سەلاح حەمەی سەمین بوون:

١. سەلاح حەمەی سەمین
٢. خەلیفە قادر
٣. محەمەد حسێن (حەمەسور)
٤. ئەیاد ئەکرەم
٥. ساری قادر مەجید
٦. ڕیاز حەمید ڕەمەزان
٧. فایەق ڕەحیم
٨. حەسەن حسێن ئاڵی جان
٩. ناسح عەلی فەتاح
١٠. حسێن فەتاح ڕۆستەم
١١. نامیق محەمەد کەریم

١٢. عەلی قادر سەمین
١٣. حسێن عەزیز مەجید درۆزنە
١٤. سەرباز ڕەشید ئەحمەد
١٥. کامەران ئەحمەد حسێن
١٦. ئاراز عەباس
١٧. جواد حەسەن
١٨. فەرهاد سلێمان
١٩. دڵشاد عەلی قادر
٢٠. خەلیل ئیبراهیم
٢١. دارا حەمە ڕەشید تەرخانی
٢٢. سەعید حاجی ئەحمەد ملەسورە

• بۆچی یەکەمین فیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان لە چوارچێوەی (مەکتەبی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵەی ڕوناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکووک) بەڕێوە چوو ؟

بە حکومی ئەوەی کاک شێخ محەمەد شاکەلی، ئەو کاتانە بەرپرسی مەکتەبی کۆمەڵایەتی، هەروەها کۆمەڵەی ڕوناکبیری بوو، وە ئێمەیش ئەندامی کۆمەڵایەتی حەوزی گەرمیان و کۆمەڵەی ڕوناکبیری بووین، بە پێویستمان زانی فیستیڤاڵەکە لەو چوارچێوەیەدا ئەنجام بدرێت بەتایبەت ئەندامانی کۆمەڵایەتی ناوەندی کەرکووک- حەوزی گەرمیان زۆر بە پەرۆشەوە هاوکارمان بوون، بۆیە هەموو کار ئاسانیەکی بەرچاومان بۆ کرا لەو بوارەدا.

• پرسیار؛

سەرەڕای ئەوەی ئەو فیستیڤاڵە لە چوارچێوەی کۆمەڵەی ڕوناکبیری و کۆمەڵایەتی بەناوی (یەکەمین فیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان) بەڕێوە چوو، بەڵام ناوبانگی بە فیستیڤاڵی جاف دەرکرد؟!

پرسیارێکی زۆر بەجێیە و ئاشکرایە کە جاف خاوەن ناوو پێگەیەکی زۆر گەورەن لە ناوچەکە و لە کوردستانی عێراق و ئێرانیش، هەروەها گەرمیان جێگای قەڵەمڕەو و پایتەختی هۆزی گەورەی جافە، هۆزی جاف لەناوچەکەدا شانبەشانی ژمارەیەک



لە هۆزەکان خاوەنی مێژوویەکی پرشنگدارن لە بواری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و سەربازی و نیشتیمانپەروەری، هەروەهاخاوەنی دەیان نوسەر و شاعیر و پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان و شەهیدن لەناوچەکەدا.

شەرەفمەندم کە ڕەنگدانەوەی دابونەریتەکانیی ئەم هۆزە لەناو یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان ڕەنگی دابێتەوە، بەتایبەتی یەکێک لە برگەکانی ڤیستیڤاڵ تایبەت بوو بەهۆزی جاف، ئەویش نمایشی (کۆچەری وگەرمیان و کوێستان)، کە لەناو جاف زۆر بایەخی پێدراوە لەسەردەمانێکدا، هەروەها ڕۆڵەکانی جاف لەم ڤیستسڤاڵە دەورێکی کاریگەرییان هەبوو بۆ سەرخستنی برگەکانی و ناساندنی دابونەریتەکانی خۆیان، بۆیە ڕەنگدانەوە و گرنگی ئەو ڤیستیڤاڵە تایبەتمەندییەکی پرشنگداری هەبوو بۆ هۆزی جاف، هەروەها خوشکان و دایکانی کەلاری کۆن کە زۆربەیان لە هۆزی جاف بوون، وە خزمانی شارەزوور وناوچەکانی تر بوونە هۆی سەرخستنی ئەو ڤیستیڤاڵە کە بۆ یەکەمین جار بوو لە ناوچەکەدا بەو شێوە فرانە ئەنجامدرا.

دوا پرسیار، ئایا بیر لەوە نەکراوەتەوە بەڵگە و ئەرشیفەکانی ڤیستیڤاڵەکانی گەرمیان کۆبکرێتەوە، یان لەچوارچێوەی کتێبێکدا تۆمار بکرێت بۆ دوارۆژی نەوەکانمان ؟

بەڵێ بۆ ماوەی پتر لە دوو ساڵە سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەرشیفەکانی یەکەمین ڤێستیڤاڵی فۆلکۆری گەرمیان و ئەو ڤیستیڤاڵانەی کە بەندە سەرپەرشتیم کردوون، وەک (ڕازەکانی کەڵات و یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری سیانزەوەدەری خانەقین لەساڵی

٢٠١٤، یەکەمین ڤیستیڤاڵی فۆلکۆری هۆزی باجەڵان لەساڵی ٢٠١٧) وێنەو ئەرشیفەکانی قوتابخانەی هۆگر، کە ئەو ئەرکە لەلایەن نووسەری بەتوانا کاک (جیهاد دەلۆ) پێی سپێردراوە، وە چاوەڕوانی ئەوەین زیاتر زانیاری و بەڵگە و وێنەکانمان بەدەست بگات، وە ئەم بابەتەیش زۆر بە کورتی و بەشێکی کەمی تایبەتە بە یە کە مین ڤیستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان ساڵی ١٩٩٨، بە ئومێدی ئەوەین لە کتێبەکەماندا بۆ مێژوومافی کەس پێشێل نەکەین ئەویش بە تۆمارکردنی ناو و ڕۆڵی ماندووبوانی یەکەم ڤیستیڤاڵی گەرمیان بخەینەینە پێش چاوی فۆلکلۆردۆستانی گەرمیان و گەرمەسێر هیوادارم فۆلکلۆردۆستان و بەشداربووانی یەکەمین ڤێستیڤاڵی فۆلکلۆری گەرمیان هاوکارمان بن بۆ بەرز ڕاگرتنی فۆلکلۆری نەتەوایە تیمان.

# باخداریی لە گەرمیان، کێشە و ئاستەنگییەکانی

ئامادەکردنی: یەکەی چاودێری
حکومەتی خۆجێی گەرمیان

**پێشەکی:**

باخداری یەکێکە لە لقەکانی پرۆژە کشتوکاڵییەکان لە سنوری گەرمیان، کە لە مێژە لە سنورەکەدا بونی هەیە و لەم چەند ساڵەی رابردووشدا گەشەسەندنی زیاتری بەخۆیەوە بینیوە.

لەم راپۆرتەدا لەسەر قەبارەی ئەم کەرتە دەوەستین، هەروەها دیارترین ئەو کێشە و ئاستەنگییانە دەخەینە روو کە روبەڕوی دەبێتەوە.

## بەشی یەکەم: قەبارەی باخداری لە گەرمیان و جۆر و لێکەوتەکانی

### ١. روبەر و رێژەی باخ لە سنوری گەرمیان

ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، دەڵێت: ئەو میوانەی کە زۆر گرنگی پێدەدرێت لە ناوچەکەدا و بەرهەمیان هەیە، مزرەمەنیەکانی وەک: پرتەقاڵ، لیمۆ، سندی، لالەنگی و نارنجن، لەگەڵ خورما و هەنجیر و هەنار و قەیسی و ترێ و زەیتون، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک میوەی دیکە هەن وەک: هەرمێ، هەڵوژە، هەنگی دونیا، گێلاس، توی فەرەنگی و کۆمەڵێک میوەی دیکە کە ئەگەر هەشبێت یان بەرناگرێت یان کەم و سنوردارن.

بەپێی ئامارێکی بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان، لە سنورەکەدا ژمارەی باخەکان نزیکەی (٨٠٠) باخ دەبن، بەمشێوەیەن:

| ژمارەی باخی مۆڵەتدراو | ژمارەی باخی بێمۆڵەت (بە مەزەندەیی) |
|---|---|
| 380 | 420 -400 |

هاوکات بەپێی ئاماری بەڕێوەبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، ڕوبەری ئەو باخانەی کە لە سنورەکەدا هەیە بەمشێوەیەن:

| شوێن | ڕوبەری باخ بە دۆنم |
|---|---|
| کەلار | 1600 |
| کفری | 1526 |
| خانەقین | 2399 |
| کۆ | 5525 |



کامەران غەفار غەفور، لێپرسراوی بەشی کشتوکاڵی ناحیەی کۆکس باس لەوە دەکات: زۆرێک لە باخەکان ڕوبەریان کەمە «١ دۆنم و ٢ دۆنمن»، ئەمەش بەرهەمەکەی ئەوە ناکات کە بیبات لە بازاڕدا ساخی بکاتەوە، لە کاتێکدا باخێکی دیکەمان هەیە ٥٠ دۆنمە و تایبەتە بە خورما، ئەمانە جیاوازن.

سەرباری بونی ئەم ڕوبەرە زۆرەی باخ، بەڵام نازانرێت ساڵانە بەرهەمی میوەی سنورەکە چەندە.

سامان ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار، لەوبارەوە وتی: ئاماری وامان نیە ساڵانە چەند بەرهەممان هەیە، هۆکارەکەشی ئەوەیە بەشێکی زۆری باخەکانمان بۆ بەرهەم بەرهەم هاتوە کەچی بەرهەمیان نیە، لەکاتێکدا کەشی ناوچەکە زۆر لەبارە بۆ باخ.

## ٢. نازانرێت لە سنوری گەرمیان چەند باخی بێ مۆڵەت بونی هەیە

سەرباری ئەو باخانەی کە بە فەرمی تۆمارکراون لەلای بەڕێوبەرایەتییەکانی کشتوکاڵی، بەڵام چەندین باخی دیکەش هەن کە تۆمار نەکراون و مۆڵەتیان نییە و بە مەزەندەیی دەوترێت ٤٠٠ تا ٤٢٠ باخن.

سامان ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار، لەمبارەیەوە دەڵێت: کێشە باخە بێمۆڵەتەکان نیە لە ڕاستیدا، چونکە ئەوەی باخە باخە، ئەوەی بەردەست بێت باخە مۆڵەتدارەکان لە بەڕێوبەرایەتی ئەگەرنا شتێکی وا بەردەست نیە.

وتیشی: ڕێژەکە زۆر زۆریشە و پێویست ناکات ئێمە چاودێرییان بکەین، ئامارێکی فەرمیش لەوبارەیەوە نیە، هیچ یاسایەکیش نیە ئیجباری بکات مۆڵەت دەربهێنێت و بڵێت ئەوەی دارێکی ناشتبێت دەبێت مۆڵەتی هەبێت.

جەختی لەوەشکردەوە: ئەوەی هەیە زیادەڕەوی نیە، بەڵکو ئەوەی هەیە پێچەوانەی ڕێنماییەکان کاری کردوە و ڕێکارەکانی بۆ نەکردوە ئەگەرنا وەک داگیرکاری نیە.

بەشێک لەو باخەوانانەی کە باخەکانیان تۆمار نەکراون و مۆڵەتیان نییە، حکومەت بە کەمتەرخەم دەزانن.

محەمەد عەلی، باخەوان لە قەزای کەلار باس لەوە دەکات: تاوەکو ئێستا باخەکەم مۆڵەتی نیە، لە کاتێکدا لە ساڵی ٢٠١٧ـەوە مامەڵەم پێشکەش کردوە، کەچی مۆڵەتەکەم بۆ نەهاتوەتەوە، هەمووشی پەیوەندی بە بێ دەسەڵاتی خۆیانەوە هەیە کە ڕۆتینیات دروست دەکەن.

کامەران غەفار غەفور، لێپرسراوی بەشی کشتوکاڵی ناحیەی کۆکس باس لەوە دەکات: لە سنوری ئێمە کەم باخ هەیە مۆڵەتدارە، زۆربەی باخەکان کەمترن لە ٥ دۆنم وەک لە

ڕێنمایی وەزارەتدا هاتوە کە نابێت کەمتر بێت لەو ڕوبەرەی کە دیاری کراوە، تەنانەت ئەوەشی مۆڵەتی هەیە لە ماوەی ٤ ساڵدا ٢ جوتیار نەهاتوە مۆڵەت نوێ بکاتەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە خەڵک پابەندبونی بە حکومەتەوە نەماوە، وەکخۆیان دەڵێن حکومەت هیچی بۆ ئێمە نەبوە و نایەن بە دەمیەوە.

لە بەرامبەردا، ئیسماعیل محەمەد، بەڕێوبەری بەشی خزمەتگوزاری لە کشتوکاڵی گەرمیان، دەڵێت: لە سنوری گەرمیان ئامارێکی فەرمی نیە بۆ بونی باخی بێ مۆڵەت لە سنورەکەدا، ئەوەی هەیە بە ڕوبەر بە گشتی بە باخی بە مۆڵەت و بێ مۆڵەتەوە نزیکەی ٨٠٠ باخن کە ڕوبەریان ٥ هەزار و ٥٢٥ دۆنم باخمان هەیە، ئەم داتایەش زۆر ورد نیە «تەقریبییە»، بەڵام دەتوانین پشتی پێ ببەستین.

### ٣. باخەوانەکان، چی لە بارەی باخەکانیانەوە دەڵێن؟

«٤ دۆنم زەوی باخی خۆمم هەیە و باخەکەشم لەمانە پێکهاتوە: (هەنار، پرتەقاڵ، هەنجیر، قەیسی، لیمۆ و هەرمێ)». یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارۆچکەی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای کەلار وای وت.

وتیشی: ئەم باخەی من پێشتر بە دەست باوکمەوە بوە لە ساڵی شەستەکانیشەوە تاوەکو ئێستا باخە، ئەمە لە کاتێکدا چەندین کەسی دیکەش هەن لە تەنیشتمەوە کە ٣٠ دۆنم و ١٠ دۆنم و ٢٠ دۆنمە، بەجۆرێک لە سنوری گردەگۆزینە ١٣٠ باخەوانین.

دەشڵێت: بەرهەمی باخەکەم بەمشێوەیە، ساڵانە ١٢ بۆ ١٣ تەن بەرهەمی هەنارم هەیە، زیاد لە ١٥ تەن پرتەقاڵم هەیە، قەیسیش زیاتر لە ٥ تەن بەرهەمم هەیە، هاوکات هەرمێش زیاتر لە ٥ تەن بەرهەمم هەیە، لیمۆش نزیکەی ٤ تەن بەرهەمم هەیە، ئەمە جگە لە هەنجیر کە یەک تەن و نیوم هەیە.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: خورماکەم ئەمساڵ پێگەیشتوە و بەرهەمی دەبێت، تاوەکو ئێستا نەمخستوەتە بازاڕەوە، لە ئەمساڵەوە دەتوانم بیخەمە بازاڕەوە.

کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: ٤٠ دۆنم زەویمان هەیە ١٥ دۆنمی باخە و لەسەر ڕێگەی کەلار ڕزگارین، باخەکەشم دارە بەرییەکانی پرتەقاڵ، هەنار، زەیتون، لیمۆ و خورمای تیایە.

دەشڵێت: ئەمساڵ نزیکەی ١٢ تەن بەرهەمی هەنارم هەبوە، ٧ تەن لیمۆ و پرتەقاڵم هەبوە، زەیتونەکەشمان تەنێکمان لێکردوەتەوە، چونکە لێکردنەوەی قورسە، ئەمە جگە لەوەی ٣ جۆر خورمام هەیە، بەجۆرێک نزیکەی ٥ تەن خورمام لێکردوەتەوە.

هاوکات، ڕەحیم کەریم حسێن، باخەوان لە قۆرەتو دەڵێت: ٨ دۆنم زەویم هەیە کە کردومەتە باخ، هەموو دارەکانی ناوی بەرییە کە لە: هەنار، پرتەقاڵ، خورما، هەنجیر، لیمۆ و نارنج پێکهاتوە، کە نزیکەی ٢٠ ساڵە باخە، لەگەڵ ئەوەشدا ٥ دۆنم زەیتونمان هەیە.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: بەرهەمیشی بە ساڵ کەوتوە، بۆ نمونە پار ساڵ نزیکەی ٩ تەن هەنارم هەبوە، لیمۆ و نارنجەکەم ١ تەن و ٤٠٠ کیلۆ بوە، پرتەقاڵەکەم نزیکەی ٢ تەن بووە، زەیتونەکەشمان کە بۆ ڕۆنە نزیکەی ٣ تەن بەرهەمیمان چنیوە، جگە لە هەنجیرەکەمان کە ٢ ڕۆژ جارێک نزیکەی ٦٠ کیلۆمان لێچنیوەتەوە.

## ٤. کوالێتی بەرهەمی باخەکانی گەرمیان

«٥ دۆنم زەویم هەیە کردومە بە باخی ترێ و یەک سەقفە، بەڵام بەرهەمەکەی باش نیە و هۆکارەکەشی بۆ ئاوەکەی ئەگەڕێتەوە، چونکە ئاوی بیری ئیرتیوازییە و کۆمەڵێک مادەی کانزای هەیە تێیدا نیە، بەڵام بەدواداچونم کردوە و دەرکەوتوە ئەو باخانەی کە پشت بە ئاوی سیروان ئەبەستن بێ کێشەن». محەمەد عەلی، باخەوان لە قەزای کەلار وای وت.

وتیشی: لە ساڵی ٢٠١٣ـەوە تاوەکو ئێستا باخم هەیە و خزمەتی زۆری ئەکەم لە پەینی کیمیاویی و لە دەرمان، بەجۆرێک ئەمساڵ چوار جار دەرمانم کردوە ، ٢ جۆر کیمیایم کردوە جۆرێکیان ٢٥ کیلۆ بە ٦٤ هەزار، جۆرێکی ترم کردوە تەنی بە ١ ملیۆن دینار، کەچی هێشتا هەر خراپە، هەموشی پەیوەندی بە ئاوەکەیەوە هەیە نەک خاکەکەی.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: سەردانی باخم کردوە لە گردە گۆزینە بەو شێوەیە نیە، چونکە پشت بە سیروان دەبەستێت، بۆنمونە ئەگەر دارێکی من ٤ بۆڵ ترێی پێوەبوبێت ئەوان هەر دارێکی ٥٠ بۆڵی پێوە بووە.

بەگشتی باخەوانەکانی گەرمیان جەخت لەوەدەکەنەوە کە بەرهەمەکانیان کوالێتی باشی هەیە، حکومەتیش پشتڕاستی ئەو بابەتە دەکاتەوە.

ئەحمەد ئیسماعیل، باخەوان لە قەزای کفری دەڵێت: کوالێتی بەرهەمەکەمان زۆر باشە بەتایبەت زەیتونەکەمان کە دەیکەین بە زەیت، ئەگەرچی هەندێک مواسەفات هەیە لەلایەن کشتوکاڵی گەرمیانەوە کە لە باخی زەیتونەکەم وەکپێویست نیە، بۆ نمونە بە ڕێژەی ١٥٪ زەیتی هەبێت ئەوە دەبێت بە نمرە یەک، بەڵام ئەوەی ئێمە ١٠٪ بۆ ١٣,٥٪ زەیتی تیایە.

وتیشی: تاوەکو ئێستا هۆکارەکەی نازانین ئایە جۆری دارەکەیە یاخود کەشوهەوا و خاکەکەیەتی.

لەبارەی کوالێتی بەرهەمی خورماکەشیەوە، ئەو باخەوانە وتی: بەرهەمی خورماکەشمان باشە، بەڵام وەک زەیتونەکە نیە.

بەهەمان شێوە، عەبدولسەلام ئەنوەر، باخەوان لە ناحیەی کۆکس هێما بۆ ئەوە دەکات: بەرهەمەکانم کوالێتی زۆر باشی هەیە بەتایبەت هەنارەکەم ناوبانگی تایبەتی خۆی هەیە، کشتوکاڵی گەرمیانیش ئەوە دەزانێت.

لە بەرامبەردا، ئیسماعیل محەمەد، لێپرسراوی بەشی خزمەتگوزاری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: بەرهەمی باخداری لە گەرمیان هیچیان کوالێتیان خراپ نیە، بگرە بە تامتریشن لە چاو بەرهەمی دەرەکی، بۆیە ئێمە بەراوردمان کردوە لە نێوان بەرهەمی خۆمان و بەرهەمی دەرەوە، بۆ نمونە ئەگەر دارێکی خۆمان ١٥ بۆ ٢٥ کیلۆ بەرهەمی هەبێت ئەوانەی دەرەوە ١٢٥ بۆ ١٥٠ کیلۆ بەرهەمی هەیە، ئەمەش دەرخەری ئەوەیە بەرهەمی خۆمان سروشتییە و هی دەرەوە بە مەواد و کیمیایی کە دەیکەنە بن دارەکە بەوشێوەیە بەرهەم زیاد دەکەن.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: بەرهەمی خۆماڵی خۆمان ئەو خۆراکە لە ناو خاکەکەوە بۆی دەڕوات بۆیە بەتامتر و بە کوالێتی ترە.

هاوکات، ئارام سابر حسێن، لێپرسراوی بەشی کشتوکاڵی لە ناحیەی سەرقەڵا دەڵێت: بەرهەمەکانی باخەکان لە ڕوی کوالێتیەوە زۆر باشن بەتایبەت کە لە ڕوی جیناتەوە نەگۆڕدراون، هاوکات مەوادی کیمیایی زۆر بەکارناهێنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەم

کەمە لە سنورەکە، بەشێکی زۆری خەڵکەکەی وەک حەزێک کردویانە و بەتایبەت خزمەتی دەکەن.

لایخۆشیەوە، ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: کوالێتی بەرهەمەکانی ناوخۆی خۆمان بەگوێرەی میوەکان ئەگۆڕێت، بۆنمونە بەرهەمە مزرەمەنیەکانی وەک پرتەقاڵ و لیمۆ و سندی و لالەنگی و نارنج زۆرباشن، بەڵام هەنار و هەنجیرمان خراپن.

دەشڵێت: هۆکاری خراپی بەرهەمی هەنار و هەنجیر ئەوەیە کاتی پێگەیشتنیان ئەکەوێتە وەرزی هاوینەوە کە ماوەکەی درێژە و گەرما و تۆز و خۆڵ و نەبوونی شێ و وشکی توش ئەبێت، ئەمە وای لێدەکات کوالێتی باش نەبێت، بەڵام باخیشمان هەیە بەرهەمی باشە.

لەبارەی ئەوەی چ بەرهەمێک باشترینە لە گەرمیان و چ بەرهەمێک خراپترینە و تاچەند پلەبەندی بۆکراوە لەلایەن بەشی باخدارییەوە، لێپرسراوی ئەو بەشە هێمای بۆ ئەوەشکرد: پلەبەندی کراوە، باشترینەکان مزرەمەنیەکانن وەک پرتەقاڵ کە سنفی عێراقییە لەگەڵ لیمۆ و سندی و لالەنگی و نارنج، دوای ئەوە بەرهەمی قەیسیمان دێت کە لە سنورەکەدا زۆر باشە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمی ترێمان دێت کە ئەمەش چەندین باخی نمونەییمان هەیە، ئەگەرچی زۆرجار ئەو ترێیانەی کە لە مانگی ٤ پێ ئەگەن توشی زیان ئەبن بەهۆی بارانبارینی لە ناکاو و بەرزبونەوەی پلەی گەرما ئەمە وا ئەکات کوالێتی باش نەبێت، هاوکات خراپترینەکان هەنجیر و هەنارن.

### ٥. خواست لەسەر بەرهەمەکان

«خواستێکی زۆر لەسەر بەرهەمەکانمانە لەلایەن هاوڵاتیانەوە بەتایبەت زەیتونەکەمان و ئەو زەیتەی کە بەرهەمی دەهێنین». ئەحمەد ئیسماعیل، باخەوان لە قەزای کفری وا دەڵێت.

هیدایەت ئەحمەد، باخەوان لە ساڵح ئاغای سەر بە ناحیەی قۆرەتو وتی: خواست لەسەر بەرهەمەکانم بە گشتی هەیە لەلایەن هاوڵاتیانەوە بەتایبەت ترێکەم کە زۆر باشە و دەیبەینە عەلوە بەرناکەوێ و ڕاستەوخۆ دەبرێت.

## ٦. سەرچاوەی ئاوی باخەكان

باخەكانی گەرمیان پشت بە دوو سەرچاوەی ئاو دەبەستن، یەكێكیان سەرزەویی وەكو ڕوبار و چەم و بەتایبەتیش ڕوباری سیروان، ئەوەكەی تریان ئاوی ژێرزەوییە كە لە ڕێگەی بیری ئیرتیوازیەوە دابین دەكرێت.

ئەحمەد ئیسماعیل، باخەوان لە قەزای كفری دەڵێت: ٢ باخمان هەیە یەكێكیان لەسەر ڕوبەری ١٠ دۆنم زەوییە كە ٧٠٠ داری تیایە، ئەوی دیكەشمان لەسەر ڕوبەری ٥ دۆنم زەوییە ٣٥٠ داری تیایە، سەرچاوەی ئاوی ئەم باخەش ئاوی ژێرزەوییە و لە ڕێگەی بیرەوە دابینی دەكەین، ئەگەرچی بەنداوێكمان هەیە لە قەزاكە و سودی لێ نابینین.

هاوكات، عومەر حسین، باخەوان لە ناحیەی مەیدان باسی لەوەكرد: باخەكەم لە سەر ڕوبەری ٥ دۆنم زەوییە و باخەكەشم تازەیە لە ئێستادا بەرهەمی نیە، بۆ سەرچاوەی ئاوەكەشی پشت بە ئاوی ژێر زەویی ئەبەستم لە ڕێگەی بیرەوە.

دەشڵێت: ناتوانم پشت بە ئاوی ڕوباری سیروان ببەستم، چونكە نزیكەی ٤ كیلۆمەتر لێمەوە دورە.

هیدایەت ئەحمەد، باخەوان لە ساڵح ئاغای سەر بە ناحیەی قۆرەتو وتی: باخەكەم لەسەر ڕوبەری ٦ دۆنم و ٥٠٠ مەترە، ئەو بەرهەمانەشی كە هەمە پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و ترێی ڕەش و سپی و هەنجیرە، بەتایبەت ترێكەم باشە ساڵانە نزیكەی ٢ تەن بەرهەمی هەیە لەگەڵ پرتەقاڵەكەم كە مامناوەندە، بۆ سەرچاوەی ئاوەكەشی پشت بە پرۆژەی ئاودێری باڵەجۆ دەبەستین كە لە ڕوباری سیروانەوە سەرچاوەی گرتووە.

«پشت بە ئاوی جۆگە ئەبەستین كە لە ڕوباری سیروانەوە بۆمان دێت». عەبدولسەلام ئەنوەر، باخەوان لە ناحیەی كۆكس وای وت.

لە بەرامبەردا، ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی كشتوكاڵی گەرمیان وتی: لە گەرمیان بۆ باخداری پشت بە هەردوو سەرچاوەی ئاوی سەرزەوی و ژێر زەوی دەبەسترێت، بەڵام ئەوەی زیاتر بێت ئاوی سەرزەوییە، چونكە بەشێكی زۆری باخەكانی گەرمیان نزیكن لە ڕوباری سیروانەوە.

وتیشی: بەرهەمەكانیشیان زۆر جیاوازی ئەوتۆی نیە لە ڕوی كوالێتی و تامەوە، ئەوەی هەیە هەندێكی شوێنی گەرمیان نەبێت بەتایبەت قەزای كفری كە چەند بیرێكی كەمن كە خوێیان زۆرە لەگەڵ كبریت كە ئەمە گرفت دروست ئەكات.

جەختی لەوەشكردەوە: تاوەكو ئاوی سەرزەوی هەبێت نابێت پەنا ببەینە بەر ئاوی ژێرزەوی.

ئیسماعیل محەمەد، لێپرسراوی بەشی خزمەتگوزاری لە بەڕێوبەرایەتی كشتوكاڵی گەرمیان دەڵێت: لە ڕوی زانستیەوە هیچ سەرچاوەیەكی ئاو كاریگەری خراپ ناكات چ لە سەر بەرهەم بێت یان باخ بێت، چونكە باخ كە ئاوی دەدەیت دارەكە ئاوەكە هەڵدەمژێت و دوای ٦ بۆ ٧ مانگ ئینجا گوڵ ئەكات و بەرهەمێك دروست دەكات لە قەد دارەكە دەمێنێتەوە.

جەختی لەوەكردەوە: بۆیە سەرچاوەی ئاوەكە سەر زەوی بێت یان ژێرزەوی هیچ كاریگەری ناكاتە سەر بەرهەم و باخەكەش.

بەپێی وتەی شارەزایان یەكێك لەو پرۆژانەی كە گرنگن بۆ پرۆژەی باخداری پرۆژەی ئاودێرییە، لێپرسراوی بەشی باخداری لە كشتوكاڵی گەرمیان جەخت لەسەر ئەو ڕایە دەكاتەوە و دەڵێت: بونی پرۆژەی ئاودێری زۆرگرنگی بۆ باخداری و یەكێكە لە پرۆژە ستراتیژییەكان، بەجۆرێك بربڕەی پشتی كەرتی كشتوكاڵە، بۆیە پێویستە حكومەت گرنگی زیاتر بە دروستكردنی پۆند و بەنداو بدات بۆ ئەو مەبەستە، هاوكات پرۆژەی زیاتری ئاودێری ئەنجام بدات.

بەپێێ ئامارێكی بەڕێوبەرایەتی ئاوی ژێرزەوی گەرمیان، زۆرترین بەكاربردنی ئاوی ژێر زەوی لەگەرمیان، بە ڕێگای كشتوكاڵەوەیە كە ١٢٢٢ بیری كشتوكاڵی لە سنورەكەدا تۆماركراون، سەرباری سەدان بیری نایاسایی تۆمارنەكراو.

## ٧. باخەکان بەرهەمی میوەی سنورەکە دابین ناکەن

سەرباری بونی ئەو ژمارە باخە، بەڵام ناتوانن بەرهەمی میوەی سنورەکە دابین بکەن.

«بەرهەمی ناوخۆی خۆمان هێندە زۆر نیە کە پێداویستی ناوخۆ پڕبکاتەوە و ڕێگری لە بەرهەمی دیکەی وڵاتان بکرێت و بێتە سنورەکە، ئەگەرچی ساڵانە وەزارەت و بەڕێوبەرایەتیمان کۆمەڵێک ڕێنمایی هەیە بۆ زیادکردنی باج و ڕسومات لەسەر بەرهەمی دەرەکی تاوەکو بەرهەمی ناوخۆ تەواو دەبێت». ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان وای وت.

هاوکات، شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: دەتوانم بڵێم لەنێو کۆی سێکتەرە کشتوکاڵییەکاندا بەشی باخداری لاوازترینیانە.

باسی لەوەشکرد: تاوەکو ئێستا ئێمە نەگەشتوینەتە ئەو ئاستەی کە بەرهەمی ناوخۆی خۆمان پێویستی سنورەکە پڕبکاتەوە و ڕەوانەی دەرەوەش بکرێت.

«باخەکانی کەلار بەرهەمیان زۆر نیە و کەمیان بەرهەمیان هەیە، زیاتر بۆ گەشتیاری بەکاردێت ئەمەش کێشەیە بۆ ئێمە«. سامان ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار وا دەڵێت.



## ٨. سودە ژینگەییەکانی باخەکانی گەرمیان

فەرمانگەی ژینگەی گەرمیان دەڵێت: بونی ئەم باخانەی کە لە سنوری گەرمیان هەن بە مۆڵەتدار و بێ مۆڵەتەوە لەگەڵ بونی هەر ڕێژەیەکی تری سەوزایی، گرنگی و ڕۆڵی خۆی هەیە لە پاکردنەوەی ژینگەی ناوچەکە.

د. دورەید سەلیم، بەڕێوبەری فەرمانگەی ژینگەی گەرمیان دەڵێت: ئەم باخانە ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە پاککردنەوەی ژینگە، بە جۆرێک دوانە ئۆکسیدی کاربۆن وەردەگرن و ئۆکسجین دەدەنەوە، لەگەڵ وەرگرتنی خۆڵ و تەپوتۆز، هاوکات ڕێگری لە دروستبونی لافاو دەکەن، ئەمە جگە لە چەندین سودی تری ژینگەیی.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: بۆیە بەشێوەیەکی گشتی لە روی ژینگەییەوە پێویستیەکی گرنگن بۆ ناوچەکە و پێویستیشە گرنگی زیاتریان پێبدرێت.

## ٩. سودی ئابوری باخەکانی گەرمیان بۆ ناوچەکە

پسپۆڕێکی ئابوری پێوایە کەرتی کشتوکاڵ بەتایبەت بەشی باخداری، یەکێکە لە بڕبڕە بەهێزەکانی بواری ئابوری.

بیابان نوری، پسپۆری ئابوری و مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان، دەڵێت: ئەو باخانەی کە هەن لە گەرمیان و بەرهەمیان هەیە، گرنگی خۆیان هەیە بۆ ناوچەکە لە ڕوی ئابورییەوە، بەتایبەت لە ئێستادا کە هەرێمی خۆمان ڕوی کردوەتە بەرهەمی وڵاتانی دەرەوە، بونی ئەم باخە بەرییانەش بۆشاییەکی زۆر گەورە پڕدەکەنەوە و سودێکی زۆری ئابوریشی هەیە.

دەشڵێت: ئەم باخانە دوو جۆر کاریگەرییان هەیە، یەکێکیان دابینکردنی بەرهەمێکی پاک و تەندروستی ناوخۆیە بە نرخێکی گونجاو، ئەوی تریان ڕەخساندنی هەلی کارە بۆ بەشێکی زۆری خێزانەکان، ئەمە جگە لەوەی دەستی دەرەوەش دەهێنێتە سنورەکە بۆ کڕین و فرۆشتن بەتایبەت لە بەرهەمی خورما.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: پێویستە حکومەت هاوکارێکی باشی ئەم بوارە بێت، ئەگەرچی بەپێی بەدواداچونەکانمان بەتایبەت لەم چەند ساڵەی دوایدا حکومەت ئاسانکاری کردوە و تموحی لەو کەرتەدا گەورەتر بووە، بەڵام وەک پێویست نیە و پێویستە گرنگی زیاتری پێبدات و بواری زیاتر بڕەخسێنێت بۆ ئەم بوارە، چونکە کەرتی کشتوکاڵ یەکێکە لە بڕبڕە بەهێزەکانی ئابوری و ئاسایشی خۆراک.

جەختی لەوەشکردەوە: ئەگەر حکومەت هاوکاری هەبێت بۆ ئەم بوارە کاریگەری زۆر گەورەی دەبێت لەسەر جوتیاران کە گرنگی زیاتر بە باخەکانیان بدەن و بیبوژێننەوە.

## ١٠. کشتوکاڵی گەرمیان: پلانمان هەیە بۆ برەودان بە کەرتی باخداری

شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: وەکو کشتوکاڵی گەرمیان پلانی خۆمان هەیە بۆ برەودان بە بەشی باخداری، بۆ نمونە لە فراوانکردنی شاری کەلاردا کە خۆی لە ٨ هەزار و ٥٠٠ دۆنم دەبینێتەوە، ١ هەزار و ٥٠٠ دۆنمیمان داناوە بۆ پرۆژەی کشتوکاڵی و دۆستی ژینگە.

هێمای بۆ ئەوەشكرد: هاوكات وەبەرهێنەرمان ڕاكێشاوە بۆ ناو پرۆژەكانمان، یەكێك لەوانە دروستكردنی باخی خورما و باخی مزرەمەنییە، كە ئێستا باخی خورماكەمان لە قۆناغی جێبەجێكردندایە و سەركەوتوبووە كە لەسەر ڕوبەری ٤٩ دۆنم زەوییە، بۆیە بەپێی ئەو پلانەی كە ئێمە داماننناوە لە ١٠ ساڵی داهاتودا خورما لە سنورەكە بەتەواوی دابین دەكرێت.

جەختی لەوەشكردەوە: لە هەنگاوی داهاتوماندا لەو ١ هەزار و ٥٠٠ دۆنم زەوییە ئەتوانین زۆربەی بكەینە ئەو بەروبومانەی كە ئێستا ئێمە گرفتمان هەیە لە كەمییاندا، دەشتوانین گەشەی زیاتریان پێبدەین، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی پاراستنی ئەو باخانەش دەدەین كە بەر پرۆژەی وەبەرهێنان دەكەون.

## بەشی دوەم: كێشەكانی پەیوەست بە باخداریی لە گەرمیان

### ١. گرفتی ساخ نەكردنەوەی بەرهەمەكانیان

باخەوانەكان كۆكن لەسەر ئەوەی كە بەرهەمەكانیان پێدەگات قورس لە بازاڕدا ساخ دەبێتەوە، وەک خۆیان دەڵێن حكومەت هاوكارمان نیە لەو ڕووەوە.

یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارەدێی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای كەلار، باس لەوە دەكات: یەكێك لەو كێشانەی كە ساڵانە ڕووبەڕومان دەبێتەوە ساخكردنەوەی بەرهەمەكانمانە، نەک لە گەرمیان، بەڵكو لە تەواوی هەرێمی كوردستان ئەم كێشەیە هەیە، بۆنمونە كە وەرزی پرتەقاڵ دێت ڕێگری ناكرێت پرتەقاڵی دەرەوە نەیەتە سنورەكە تاوەكو بەرهەمی ئێمە تەواو دەبێت، بۆیە ساخكردنەوەی بەرهەمەكانمان زۆر زۆر قورسە.

هاوكات، ڕەحیم كەریم حسێن، باخەوان لە قۆرەتو دەڵێت: لە ساخكردنەوەی بەرهەمەكانمان كێشەمان بۆ دروست دەبێت، بۆنمونە كاتێک هەنارمان پێ دەگات هیچ ناكات و لە دەرەوە هەنار دێتە سنورەكە، پرتەقاڵیش بە هەمانشێوە، ئەمەش كێشەی بۆ دروست كردوین.

بە پێچەوانەوە، کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: بەرهەمەکانمان خۆمان ئەیچنین و ئەیبەینە عەلوە ساخی ئەکەینەوە، خورماکەشمان موشتەری خۆی دێت و لە باخەکەمان ئەیفرۆشینەوە، کێشە دروست نابێت لە ساخکردنەوەکەی، چونکە خۆمان ئەیبەین.

لەبەرامبەردا، ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: بەرهەمێک خۆی کوالێتی باش بێت ئەوە خۆی خۆی ئەفرۆشێتەوە و پێویست بە هەندێک ڕێکار ناکات، بەڵام ئەگەر تەقلیدی بێت وەک وڵاتانی تر، ئەوە ئەوکات ئەوانیش کێبڕکێ دەکەن.

جەلال ئەحمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی یەکێتی جوتیاران، باس لەوە دەکات: پێشتر لە وەرزی پێگەشتنی بەرهەم، حکومەت ٥٠٪ی کۆی پارەکەی بۆ دابین دەکرد و ئەو ڕێژەیەی تری لە جوتیار خۆی وەریدەگرت، ئێستا ئەوە نەماوە.

وتیشی: ئەوەی هەیە تەنها قەدەغەکردنی بەرهەمی دەرەکییە سەرباری ئەوەش بە قاچاخ هەر دێتە سنورەکە و بازاڕی ئێمەی شکاندوە، جەختی لەوەشکردەوە: بەهەموو پێوەرێک جوتیار زەرەرمەندە.

ئارام سابر حسێن، لێپرسراوی بەشی کشتوکاڵی لە ناحیەی سەرقەڵا دەڵێت: یەکێک لەو کێشانەی ڕووبەڕوی باخەوانەکان دەبێتەوە ساخ نەبونەوەی بەرهەمەکانیانە بەتایبەت لە سنوری ئێمە، ئەمەش وایکردوە کەمتر گرنگی بە کاری باخداریی بدرێت.

هاوکات، شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: هەر بڕیارێک کە دەردەچێت لە وەزارەت بۆ قەدەغەکردنی هەر بەرهەمێک یان باجی زۆری لەسەر دابنرێت، وەک پاڵپشتیە بۆ بەرهەمی ناوخۆ، بۆ نمونە لە وەرزی هەنار کە زۆرە لە هەڵەبجە لە گەرمیانیش ئەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

وتیشی: لە بەرهەمی باخداریدا نەگەشتوینەتە ئەو ئاستەی کە بەشی ناوخۆ پڕبکاتەوە و ڕەوانەی دەرەوەش بکرێت.

## ٢. نەخۆشیی

باخەوانەکان جەخت لەوەدەکەنەوە زۆرجار باخەکانیان ڕوبەڕوی نەخۆشی دەبنەوە، بەتایبەت نەخۆشی کەڕو «فتریات» و بونی مێروی زۆر لە باخەکاندا، وەک خۆیان دەڵێن توشی زیانی کردون و حکومەتیش هیچ هاوکارییەکیان ناکات.

هیدایەت ئەحمەد، باخەوان لە ناحیەی قۆرەتو وتی: ساڵانە ڕووبەڕوی نەخۆشی دەبینەوە کە توشی باخەکانمان دەبێت بەتایبەت فتریات و عەنکەبوت لەگەڵ حەشەرات کە زۆر توشمان ئەبێت.

دەشڵێت: بەبەردەوامی دەرمانی دەکەین، بەڵام چاری ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت هیچمان بۆ دابین ناکات، ئەوەی هەیە ئەرکە لەسەر خۆمان.

هاوکات، عەبدولسەلام ئەنوەر، باخەوان لە ناحیەی کۆکس هێما بۆ ئەوە دەکات: ساڵانە نەخۆشییەکی زۆر ئەدات لە باخەکەم بەتایبەت فتریات و حەشەرات، بە بەردەوامیش دەرمانی ئەکەم، بەڵام سودی نیە و هەمو گوڵەکەی ئەوەرێنێت و نایەڵێت ببێت بە بەرهەم، وتیشی: حکومەت هیچ هاوکارییەکمان ناکات و دەرمانی باشمان بۆ دابین ناکات.

لەبەرامبەردا، نەبەز جەهانگیر، لێپرسراوی هۆبەی پاراستنی ڕووەک لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: لە ڕووی جۆری نەخۆشیەکانەوە لە دارێکەوە بۆ دارێکی تر دەگۆڕێت، بەجۆرێک هەنجیر نەخۆشی عەنکەبوت زۆر لێی ئەدات، ترێ فتریات لێی ئەدات، مزرەمەنیەکان وەک پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج جۆرێک کرم لێی ئەدات، میوە ناوک بەردینەکانی وەک قۆخ جەوی دەردان لێی ئەدات وەک دۆشاو لێی دێتە خوارەوە.

دەشڵێت: هۆکاری نەخۆشیەکانیش خزمەت نەکردنە وەک پێویست یان کەم ئاو دەدرێت یاخود زۆر ئاو دەدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا باخەوانەکان دەرمانی گشتی بەکار ئەهێنن سودی ئەوتۆی نابێت، بۆیە پێویستە بۆ هەر نەخۆشیەک دەرمانی تایبەت بە خۆی بەکاربهێنرێت، بۆنمونە مێشە سپیمان هەیە هیچ دەرمانێکی حەشەری گشتی چاری ناکات تەنها دەتوانێت ٪٥٠ی نەهیڵێت.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: بەپێی ئەو بەدواداچونانەی کە کردومانە، جۆری نەخۆشییەکان ئەمساڵ لە نێو باخەکان لە پارساڵ باشترە، چونکە کەشوهەواکەی باش بوو، بەڵام پارساڵ دۆخەکە زۆر خراپ بوو.

### ٣. هاوکاریی نەکردنی باخەوانەکان لەلایەن حکومەتەوە

پێش قەیرانی دارایی، حکومەت هاوکاری تایبەتی هەبووە بۆ خاوەن باخەکان وەک پاڵپشتیەک، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی و لە دوای ساڵی ٢٠١٤ـەوە ئەو هاوکارییە نەماوە.

یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارەدێی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای کەلار، باس لەوە دەکات: لە ساڵانی پێش قەیرانی دارایی حکومەت پێداویستی دەرمان و پەینی کیمیایی بۆ دابین دەکردین، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی هیچ شتێک نەماوەتەوە، تەنها ئەمساڵ نەبێت هەندێک دەرمانیان دابین کرد ئەویشی بەشی هەمووی نەکرد ئێمە بەرمان نەکەوت.

وتیشی: ئەمەش بارگرانیە بۆ سەر ئێمە، بەجۆرێک یەک تەن پەین دەکڕین بە ١ ملیۆن و ١٥٠ هەزار دینار، هەندێکجار نرخەکە زیاتریش ئەبێت، ئەمە جگە لەوەی هەر وەجبەیەک دەرمانی قڕکەر ئەکڕین بە ٦٠ بۆ ١٠٠ هەزار دینار.

«لە ئێستادا حکومەت هیچ هاوکاریمان ناکات هیچی بۆمان نەبووە لە دابینکردنی دەرمانی قڕکەر و پەینی کیمیایی». ڕەحیم کەریم حسێن، باخەوان لە قۆرەتو وا دەڵێت.

وتیشی: ئەمساڵ نەبێت تەنها ٢ لیتر دەرمانیان پێداوین ئەوەش وەک پێویست کاری خۆی نەکردوە، لە کاتێکدا ساڵانە خەرجیەکی زۆرم لەسەرە کە ڕەنگە ١ ملیۆن دینارم بۆ نەمێنێتەوە ئەوەی دەرئەکەین ئەیخەینەوە سەر خۆی.

کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: حکومەت لە ئێستادا هیچ هاوکارییەکمان ناکات، بگرە دژایەتیشمان ئەکات، بەجۆرێک هیچ پێداویستیەکمان بۆ دابین ناکەن کە پێویستمانە، لە کاتێکدا ساڵانە بەلای کەمەوە ٥ بۆ ٦ ملیۆن دینار خەرجی لەسەر باخەکەم دەکەم.

دەشڵێت: ئەوەی کە بۆمنی دەکات فیستیڤاڵێکە کە سودی بۆ ئێمە نیە لە زەرەر زیاتر، بگرە هیلاکیشمان دەکەن.

جەلال ئەحمەد، سەرۆكی لقی جوتیارانی گەرمیان باس لەوە دەكات: حكومەت لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی هیچ هاوكارییەكی بۆ جوتیار و باخەوان نەماوە، لە كاتێكدا پێشتر پەینی كیمیایی و دەرمان و پێداویستی پێدەداین، كەچی ئێستا هیچ شتێك نەماوە، وتیشی: ئەوەی هەیە ئەركە لەسەر باخەوانەكە خۆی.

لە بەرامبەردا، شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی كشتوكاڵی گەرمیان وتی: تاوەكو ساڵی ٢٠١٤ وەكو وەزارەتی كشتوكاڵ لە ناو پرۆژە كشتوكاڵیەكان وەك پاڵپشتی جوتیار مۆڵەتی باخی دروستكردوە بۆ جوتیار لەسەر روبەری ١٠ دۆنم و ٥ دۆنم چ وەك باخی فستق و زەیتون و مزرەمەنییەكان كە ئەمانە بۆ جوتیار كراوە بەبێ بەرامبەر، هاوكات لە سیستەمی ئاودێریش پاڵپشتی كراوە، لەگەڵ كودی كیمیایی، لە بونی نەخۆشیش هاوكاریی كراوە وەك دابینكردنی دەرمان قڕكەر، بەڵام لە دوای ساڵی ٢٠١٤ـەوە ئەو هاوكارییانە نەما.

وتیشی: كۆتا جاریش بەهۆی قەیرانی داراییەوە تاوەكو ساڵی ٢٠١٨ بوو كە كودی كیمیای دابەشكرد لە دوای ئەوەوە هیچ پاڵپشتیەك نەما.

هێمای بۆ ئەوەشكرد: پێش قەیرانی دارایی بودجە و پاڵپشتی كشتوكاڵیمان بۆ دەهات كە خۆی لە ٣ ملیار و ٤ ملیار دینار دەبینیەوە بۆ هەموو سێكتەرەكانی كشتوكاڵ لە نێویاندا باخداری.

ئارام سابر، لێپرسراوی بەشی كشتوكاڵی لە ناحیەی سەرقەڵا دەڵێت: حكومەت هیچ پاڵپشتیەكی بۆ باخداری نەماوە، ئەمساڵ ئێمە تەنها ٢٠ لیتر دەرمانی قڕكردنی حەشەریمان بۆ هاتوە، داومانە بە ٢٠ جوتیار لە كۆی سێكتەرەكانی بواری كشتوكاڵی، لە كاتێكدا ئەمساڵ ٥٨٥ جوتیار ناویان تۆمار كردوە لەلای ئێمە.

هاوكات، كامەران غەفار، لێپرسراوی بەشی كشتوكاڵی ناحیەی كۆكس باس لەوە دەكات: حكومەت هیچ هاوكارییەكی بۆ باخەوان نەماوە، ئەمەش وایكردووە لە كاتێكدا هەندێك ڕێنمایی جێبەجێ دەكەین بەسەر جوتیاراندا پێمان دەڵێن هیچتان بۆ ئێمە نیە بۆ ئەبن بە ئاستەنگ لە بەردەماندا.

جەختی لەوەشكردەوە: بۆ سنوری كشتوكاڵی ئێمە ئەمساڵ ٢٥ لیتر دەرمان هاتووە، لە كاتێكدا ٣٦ گوندم هەیە لە كۆی بوارەكانی كشتوكاڵیی، نازانین بیدەین بە چەند كەس.

هاوکات، نەبەز جەهانگیر، لێپرسراوی هۆبەی پاراستنی رووەک لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: لە ساڵانی پێش قەیرانی دارایی ١٥ جۆر دەرمانمان هەبووە و دابەشکراوە بەسەر جوتیاراندا، دەرمانەکانیش بۆ هەندێک لە نەخۆشیەکان و مێروەکان بوو، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی هیچ یەکێک لەو دەرمانانە نەماوە و بۆمان دابین نەکراوە، تەنها ئەمساڵ نەبێت ٢ جۆر دەرمانی قەڵاچۆکردنی مێرومان هەبوو ئەویش ئێستا تەواو بووە.

باسی لەوەشکرد: پێش قەیرانی دارایی هەموو ساڵێک ٥١٢ ملیۆن دینارمان خەرج کردوە بۆ ئەم بەشە، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی هەموو ساڵێک بە راپۆرت ٣٠٠ بۆ ٥٠٠ ملیۆن دینار بەرز دەکەینەوە و دەڕواتە وەزارەت، هیچمان بۆ خەرج ناکرێت.

باسی لەوەشکرد: ئەوەی ئێمە دەتوانین بۆیان بکەین تەنها رێنماییان دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ٢٠٢٢ تاوەکو ئێستا ٣٥٠ ملیۆن رەزامەندیمان هەیە کە ٦ جار رۆشتوەتە وەزارەتی دارایی و لەوێوە ئاراستەی وەزارەتمان کراوە، بەڵام تاوەکو ئێستا بۆمان خەرج نەکراوە، ئەمەش بەهۆکاری ئەو مەرجانەی کە هەیە لە جۆری دەرمانەکان و جیاوازی نرخەکانیان.

### ٤. لەناوچونی باخەکان بەهۆی پرۆژەی نیشتەجێبونەوە

لەم ساڵانەی دوای پرۆژەی وەبەرهێنان بەتایبەت یەکەی نیشتەجێبون لە گەرمیان برەوی پەیداکردوە، بەڵام بونی ئەو پرۆژانە لە سنورەکە کێشەی بۆ خاوەن باخەکانی گەرمیان دروست کردوە، بە جۆرێک وەک خۆیان دەڵێن لە مەترسی ئەوەدایین باخەکانمان لەناو ببرێن و بکرێن بە پرۆژە.

یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارەدێی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای کەلار باس لەوە دەکات: یەکێک لەو کێشانەی کە رووبەڕومان ئەبێتەوە ئەوەیە کە باخەکانی ئێمە بەر پرۆژەی نیشتەجێبون کەوتوە کە ١٣٠ باخ دەبێت، ئەگەرچی لایەنەکان هاتنە سەرخەت و بابەتەکەیان راگرتووە کە باخەکان وەک خۆی بمێنێتەوە بەڵام تاوەکو ئێستاش ئێمە لە راڕایی ماوینەتەوە، چونکە ترسی ئەوەمان هەیە رۆژێک هەر لای بەرن.

وتیشی: ئەمە جگە لەوەی ئێستا گرفتی جۆگەی ئاوەکەمان هەیە کە بۆمان دێت لە سیروانەوە و کۆمپانیای مارینا دەڵێت لای ئەبەین ئێمەش بەوە ڕازی نابین.

هاوکات، ڕەحیم کەریم حسێن، باخەوان لە قۆرەتو دەڵێت: حکومەت وەک پێویست گرنگی بە باخداری نادات لە سنوری گەرمیان ، بە جۆرێک باخی زەیتونەکەمان کە لە ٥ دۆنم پێکهاتوە و مۆڵەتی فەرمی هەیە و تاوەکو ٥ ساڵ بەڵێننامەم پڕکردوەتەوە وشکی نەکەینەوە، کەچی بۆیان بکرێت ئەیبڕن و ئەیکەن بە پڕۆژەی نیشتەجێبون.

لە بەرامبەردا، شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: ئێمە ئەو بابەتەمان گەیاندوەتە وەزارەتی کشتوکاڵ و وەزارەتیش لیژنەیەکی پێکهێناوە و کۆبونەوەی تایبەت بە خۆیان ئەنجامداوە و ڕەزامەندییمان لەسەر ئەو پرۆژانەی ڕوباری سیروان داوە کە تەنها ئەو ڕوبەرانە نەبێت کە باخە و دەربکرێت لە هەر پرۆژەیەک کە زەرە و زیان بەو باخانە بگەیەنێت کە لەسەر ڕوبارەکەن.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: دوای ئەوەی فشارێکی زۆرمان کرد کە دەبێت ئەو باخانە وەک خۆیان بمێنێتەوە کە لەسەر ڕوبەری ١٨٠ دۆنم زەوییە و کەوتووەتە ناو پرۆژەکە.

دەشڵێت: بۆ هەر باخێکی ترمان کە بەر پرۆژە بکەوێت پلانی خۆمان دەبێت.



### ٥. گرفتی کارەبا

گرفتی کارەبای نیشتیمانی یەکێکە لەو گرفتانەی کە خاوەن باخەکانیش وەک هەر سێکتەرێکی دیکەی سنورەکە بێبەری نەبوونە لێی، وەک خاوەن باخەکان باسی لێوەدەکەن مانگانە پارەیەکی زۆریان بۆ دێتەوە و کارەباکەش وەک پێویست نیە، ئەگەرچی کشتوکاڵی گەرمیان نوسراوی بۆ کارەبای گەرمیان کردوە کە هاوکاری بکرێن.

یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارەدێی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای کەلار باس لەوە دەکات: ئێمە وەک خۆمان کارەبامان نیە ئەوەشی لە نزیکی کارەبایە و ڕایکێشاوە نزیکەی ١٠ باخێک دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا کارەباکەشی هی ئەوە نیە پشتی پێ ببەستی و ساڵانەش پارەیەکی زۆر دێتەوە بۆ خاوەن باخەکان.

هاوکات، کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: یەکێکی تر لە کێشەکان کارەبایە و ٣ مانگ جارێک ٥٠٠ هەزار و ٤٠٠ هەزارم بۆ دێتەوە و کارەباش وەک پێویست نیە .

«باخێکی ٣٠ دۆنمیمان هەیە بیری ئیرتیوازی تیایە، پارەیەکی زۆری کارەبامان بۆ دێتەوە، بە جۆرێک ٣ مانگ جارێک ٤٠٠ هەزار و ٥٠٠ هەزارمان بۆ دێتەوە«. ڕەحیم کەریم حسێن، باخەوان لە قۆرەتو وا دەڵێت.

دەشڵێت: بۆ هەر یەکەیەکی کارەبا ئەوەی ئاگاداربم ٣٠ دینارمان لێ وەرئەگیرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کشتوکاڵی گەرمیان و کەلار نوسراویان بۆ کردوین تاوەکو پارەی کارەبا کەمترمان لێ وەربگیرێت.

لە بەرامبەریشدا، ئالان ئەرکان، وتەبێژی بەڕێوبەرایەتی گشتی کارەبای گەرمیان لەوبارەیەوە دەڵێت: ئەو باخانەی کە مۆڵەتی فەرمییان هەیە و لەلایەن کشتوکاڵی گەرمیانەوە پشگیرییان دەکات، هەر یەکەیەکی کارەبا بە ٣٦ دینار بۆیان حساب کراوە، بەڵام ئەو باخانەی کە مۆڵەتیان نیە و کشتوکاڵ پشتگیریان ناکات هەر یەکەیەکی بە ١٥٦ دینارە و وەک بازرگانییە.

دەشڵێت: خۆمان نوسراویان بۆ دەکەین کە بزانین ئەم باخانە مۆڵەتیان هەیە، ئەگەر هەیانبوو و یاسایی بون، بەو نرخە پارەی لێ وەردەگیرێت.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: لە پۆلی کشتوکاڵیدا ئەو هاوڵاتیانەی کە پارەی کارەبا قەرزارن ١ ملیار و ٥٠٠ ملیۆن و ٦٨ هەزار دینارە، هاوکات ٢ هەزار و ٧١ هاوبەشی کارەبای پۆلی کشتوکاڵیمان هەیە.

## ٦. گرفتی نوێ نەکردنەوەی گرێبەست

ساڵانێکە حکومەت مۆڵەتی خاوەن باخەکانی گەرمیانی نوێ نەکردوەتەوە، وەک خاوەن باخەکان دەڵێن نازانن هۆکارەکەی چیە؟

یەحیا محەمەد، باخەوان لە شارەدێی گردەگۆزینەی سەر بە قەزای کەلار، باس لەوە دەکات: یەکێک لە کێشەکان کە ڕووبەڕمان بوەتەوە نوێنەکردنەوەی گرێبەستەکانمانە

لەکاتێکدا مۆڵەتی فەرمیمان هەیە، کە بۆ ماوەی زیاتر لە ٨ ساڵە نوێ نەکراوەتەوە، ناشزانم بۆچی نوێ ناکرێتەوە.

وتیشی: لە بەرامبەر نوێکردنەوەی مۆڵەتەکەشماندا بۆ هەر دۆنمێک ٥ بۆ ١٠ هەزار دینار وەردەگیرێت و شتێکی ڕەمزییە.

هاوکات، کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: من لە ساڵی ٢٠٠٥ـەوە تاوەکو ئێستا سەرقاڵی بنیاتنانی ئەم باخەم، ئەوەشی هەمبووە لە ڕووی مادییەوە خستومەتە سەر ئەم باخە، لە کاتێکدا حکومەت خۆی مۆڵەتی پێداوم و تەنانەت داریشی پێداوم و باخەکەی من سەرکەوتوو بووە.

دەشڵێت: کەچی ئەڵێن مۆڵەتەکەت نوێ ناکەینەوە، چونکە لە سنوری شارەوانیدای، لە کاتێکدا ئەو کاتەی من ئەم باخەم بونیاد ناوە شارەوانی هەر نەبووە، دەشزانین ئێستا شارەوانی بۆچی دەستی تێخستوە، وا ساڵێک دەبێت مۆڵەتەکەم لە کشتوکاڵە و نوێ ناکرێتەوە، وتیشی: لەگەڵ هەر نوێکردنەوەیەکیش بڕی ٧٥ هەزار دینار وەردەگیرێت.

«هەموو ئەو باخانەی کە مۆڵەتیان پێ ئەدرێت و مامەڵەیان بۆ ئەکرێت هەموو ڕێکارەکانیان دێتەوە لای ئێمە و کۆنۆسیان بۆ دەکەین و ئەندامێکمان واژۆی ئەکات». جەلال ئەحمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی یەکێتی جوتیاران وای ووت.

وتیشی: بەڵام لە ئێستادا یەکێک لەو کێشانەی کە ڕووبەڕوی جوتیاران بوەتەوە نوێنەکردنەوەی مۆڵەتەکانیانە.

لە بەرامبەردا، شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: بەپێی ڕێنماییەک کە لە وەزارەتمانەوە شۆڕبوەتەوە بۆ ئەوەی جوتیارەکانمان ببنە خاوەنی باخی مۆڵەتدار و داتایەکیش هەبێت بۆ وەزارەت، لە ئێستادا گرفت بۆ نوێکردنەوەی مۆڵەتەکان دروست بووە، چونکە هەندێک باخ هەیە مۆڵەتی سەرەتایی وەرگرتوە و نەهاتووەتەوە داوای مۆڵەتی هەمیشەیی بکات، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دیکە ئەوانەشی کە مۆڵەتی هەمیشەییان هەیە ئەوانیش گرفتیان بۆ دروست بووە لە نوێکردنەوەکەیاندا، چونکە دەبێت سەرپەرشتیاری کشتوکاڵیان هەبێت ئەمەش بەپێی یاسا.

هاوکات، سامان ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار دەڵێت: «نوێنەکردنەوەی مۆڵەتی باخەکان هەندێکیان خودی خۆیانن کە تاقەتی ئەوەیان نیە نوێی بکەنەوە، ئەگینا ئالیەتەکە قورس نیە، لە کاتێکدا دەبێت ساڵانە ئەو مۆڵەتە نوێ بکەنەوە«.

وتیشی: هەر مۆڵەتێک کە ئەدرێت تاوەکو ٣ ساڵ ئەتوانێت نوێی نەکاتەوە دوای ئەو ماوەیە دەبێت ساڵانە نوێی بکاتەوە.

جەختی لەوەشکردەوە: «بەپێی ڕێنمایی ژمارە ٥ی ساڵی ٢٠٢١ هەر خاوەن باخێک کە مۆڵەتی هەبێت دەتوانێت خانویەکی ٢٠٠م دروست بکات، خاوەن باخەکان بەس بە تموحی ئەو خانوە مۆڵەت دەرئەکەن، ئەگەرنا تاوەکو ئێستا ئیشی باخداری وەک پیشە سەیرنەکراوە لەگەرمیان».

## ٧. دانانی سەرپەرشتیاری کشتوکاڵی

حکومەت وەک هەنگاوێک بۆ ڕەخساندنی هەلی کار بۆ دەرچوانی کۆلێژی کشتوکاڵ بڕیاریداوە پرۆژە کشتوکاڵیەکان بەتایبەت باخدارییەکان سەرپەرشتیاریان هەبێت و بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان موچەیان بۆ دابنرێت، بەڵام خاوەن باخەکان جەخت لەوەدەکەنەوە پێوەی پابەند نابن.

کامەران محەمەد، باخەوان لە کەلار باس لەوە دەکات: داوامان لێکراوە سەرپەرشتیاری کشتوکاڵی دابنێین و هۆکاری نوێ نەکردنەوەی مۆڵەتەکانیشمان زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لە کاتێکدا خۆم ٢ کوڕم هەیە دەرچووی زانکۆن و لە ماڵەوەن و بێکارن.

وتیشی: پابەند نابم بە دانانی ئەو سەرپەرشتیارە، چونکە حکومەت هیچی بۆ نەکردوم تاوەکو من بێم و کەسێک دابنێم و مانگانە ٤٠٠ هەزار دیناری پێبدەم.

«بیستومە باسی دانانی سەرپەرشتیاری کشتوکاڵی دەکەن لە باخەکان تاوەکو ئێستا نەهاتوونەتە لای من، بەڵام ئامادە نیم ئەو سەرپەرشتیارە دابنێم، چونکە حکومەت چی بۆ من کردوە تاوەکو من کەسێک دابنێم و مانگانەی بۆ ببرمەوە؟«. محەمەد عەلی، باخەوان لە قەزای کەلار وای ووت.

بە هەمان شێوە، جەلال ئەحمەد، سەرۆکی لقی گەرمیانی یەکێتی جوتیاران، باس لەوە دەکات: بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ دانانی ئەو سەرپەرشتیارەدا نین، چونکە حکومەت لە ئێستادا هیچ هاوکارییەکی نیە بۆ باخەوانەکان ئیتر چۆن خەڵک ناچار بە دانانی سەرپەرشتیار دەکات.

دەشڵێت: باخەکان خۆیان ناژێنن بەروبوومەکەشیان کە پێ دەگات پارە ناکات تاوەکو بیباتە بازاڕ بیفرۆشێتەوە، ئیتر بۆچی سەرپەرشتیاری بۆ دابنێن؟

«مۆڵەتەکانیان نوێ ناکرێتەوە تاوەکو سەرپەرشتیارێکی کشتوکاڵی دانەنرێت کە ئەمە بووە بە مەرج بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان، ئەمەیە هۆکاری نوێ نەکردنەوەی مۆڵەتی باخەکان». ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان وای ووت.

ئارام سابر حسێن، لێپرسراوی بەشی کشتوکاڵی لە ناحیەی سەرقەڵا دەڵێت:

خاوەن باخ ناتوانێت بەرهەمەکەی ساغ بکاتەوە، کەواتا بەچی موچەی سەرپەرشتیار دابین بکات، بۆیە ئەمەش قورساییە بۆسەر جوتیار، ڕاستە لە ڕووی ڕێنماییەوە سودی لێ دەبینێت.

شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان هێمای بۆ ئەوەکرد: بەپێی یاسای ژمارە ٢٠ی ساڵی ٢٠٢١ و ڕێنمایی ژمارە ٤ی ساڵی ٢٠٢٢، دەبێت ئەو سەرپەرشتیارەی کە دادەنرێت موچەکەی لە ٣٥٠ هەزار دینار کەمتر نەبێت، هاوکات ئەو کارەشی کە دەیکات وەک خزمەت بۆی هەژمار بکرێت و لە دەستەبەری کۆمەڵایەتیش ناوی تۆمار بکرێت.

دەشڵێت: ئەمەش یەکێکە لە گرفتەکان کە لە ئێستادا ڕووبەڕوی پرۆژە کشتوکاڵیەکان بووەتەوە بەتایبەت باخداری، چونکە خاوەن باخەکان دەڵێن ئەگەر پاڵپشتی ترمان نەبێت ئێمەش ئەو سەرپەرشتیارە دانانێین.

ئەو بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، ڕێگایەکی پێشنیاز کرد بۆ جوتیارەکان «٣ باخ بە یەکەوە ٥ دۆنمیان هەبێت دەتوانن یەک سەرپەرشتیار دابنێن، کەچی هەموو خاوەن باخەکان گرفتیان هەیە لەو بابەتەدا و دەڵێن داهاتێکی وامان نیە بتوانین ئەو سەرپەرشتیارە دابنێین و موچەیەکی مانگانەی بۆ ببڕینەوە«.

### ٨. سزادانی باخەوانەکان بەهۆی نوێنەکردنەوەی مۆڵەتەوە

بەپێی ئامارێکی بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، لە ساڵی ٢٠٠٥ـەوە تاکوە ئێستا (٢٠٢٤)، مۆڵەت دراوە بە دروستکردنی ٣٨٠ باخ.

ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی گەرمیان وتی: هەر خاوەن باخێک کە مۆڵەت وەردەگرێت تاوەکو ٣ ساڵ بۆی هەیە مۆڵەتەکەی نوێ نەکاتەوە، بەڵام لە دوای ئەو ماوەیە دەبێت نوێی بکاتەوە ئەگەرنا ڕووبەڕوی سزا دەبێتەوە«، وتیشی: سزاکەشی خۆی لە ٥٠ هەزار دیناردا دەبینێتەوە.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: لەگەڵ ئەوەشدا مامەڵەی مۆڵەتی باخەکان دێتەوە لای ئێمە کە بەپێی یاسا و ڕێنماییەکان مۆڵەتیان پێ دەدەین، سەرەتا ڕێگەپێدانی بۆ دەکرێت بۆ ماوەی ساڵێک دوای ئەو ماوەیە بۆی دەکرێت بە مۆڵەتی هەمیشەیی، هەر مۆڵەتێک کە دەدرێت نابێت لە ٥ دۆنم کەمتر بێت، بەڵام ئەمە بۆ ناوچەکانی وەک مەیدان و ناوچە شاخاوییەکان لە ٣ دۆنمیش کەمتربێت دەبێت.

باسی لەوەشکرد: بۆ دەرهێنانی هەر مۆڵەتێک بڕی ١٠٠ هەزار دینار وەردەگیرێت بۆ نوێکردنەوەشی بڕی ٧٥ هەزار دینار وەردەگیرێت.

هاوکات، سامان ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی کشتوکاڵی کەلار دەڵێت: هەر خاوەن باخێک کە مۆڵەتەکەی نوێ نەکاتەوە ئەوا بەپێی ڕێنمای ژمارە ٥ی ساڵی ٢٠٢١، دەبێت مۆڵەتەکەی هەڵبوەشێنرێتەوە، بەڵام تاوەکو ئێستا ئەوەمان نەکردوە.

باسی لەوەشکرد: تاوەکو ئێستا ١ مۆڵەتی باخ هەڵوەشاوەتەوە بەهۆی زیادەڕەوییەوە کەچی باخەکە هەر وەک خۆیەتی، لەگەڵ ئەوەش ٢ مۆڵەتی دیکەمان ناردوە بۆ هەڵوەشاندنەوە تاوەکو ئێستا نەکراوە، ئەمە جگە لەوەی ٥٠ هەزار دینار غەرامەی مادی هەیە.

لای خۆشیەوە، ئیسماعیل محەمەد، بەڕێوبەری بەشی خزمەتگوزاری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: وەکو یاسا، یاسایەک نیە هەر خاوەن باخێک مۆڵەتەکەی نوێ نەکاتەوە سزا بدرێت، هیچ ئیجرائاتێکی فەرمی نیە بۆ ئەو بابەتە.

### ٩. شارەوانییەكان كێشە بۆ پرۆژە باخدارییەكان دروست دەكەن

شادییە حسێن، بەڕێوبەری گشتی كشتوكاڵی گەرمیان ووتی: یەكێكی تر لەو گرفتانەی كە هەمانە بۆ هەموو مۆڵەتێكی باخ ئەگەر لە شارەوانیەوە نزیك بێت پێویست دەكات ڕەزامەندی شارەوانیەكانی بۆ وەربگرین و ئەو ڕوبەرە باخەشی كەوتوەتە ناو سنوری شارەوانیەكانەوە پێویستە ئێمە نوسراویان بۆ بكەین بۆ شارەوانییەكان و ئەوانیش بەڵێننامەیان پێ پڕبكەنەوە لە هەر ئەگەرێكدا ئەم پرۆژەیە بەر فراوانكردنی شار بكەوێت داوای هیچ قەرەبویەك نەكەنەوە.

دەشڵێت: ئێمەش وەكو كشتوكاڵ بە داوایەكی ڕەوای نازانین و نوسراویشمان كردوە بۆ وەزارەتمان بۆ ئەوەی ئاگاداربن لەم پلانەی شارەوانی.

### ١٠. نەبونی پرۆژەی ئاودێریی

بەشێكی بەرچاو لە باخەكان بەتایبەتی ئەوانەی دورن لەسەرچاوەی ئاوی ژێرزەوی وەكو چەم و ڕوبارەكانەوە، پشت بە ئاوی ژێرزەوی دەبەستن، چ وەكو بیری ئیرتیوازیی یان ناعور و كارێز.

لە ڕابردوودا، هاوشێوەی پرۆژەی ئاودێریی باڵەجۆ كار لەسەر ئەوە كراوە پرۆژەیەكی دیكەی هەمان شێوە بۆ دەشتی قەزای كەلار و ناحیەی ڕزگاری دروست بكرێت، بەڵام تاوەكو ئێستا نەكراوە بۆ ئەوەی ئەو باخانەی كە لەو سنورەن سودی لێببینن.

موئەیەد ئەحمەد، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی ئاودێری گەرمیان دەڵێت: زۆربەی باخەكانی گەرمیان پشت بە ئاوی پرۆژەی باڵەجۆ دەبەستن كە پرۆژەیەكی ئاودێریی ستراتیژییە و لە ڕوباری سیروانەوە سەرچاوەی گرتووە، بە باخە مۆڵەتدار و بێ مۆڵەتەكانیشەوە.

لەبارەی باخەكانی دەشتی كەلار و دەشتی ناحیەی ڕزگاری تاچەند كار لەسەر ئەوە كراوە پرۆژەیەكی هاوشێوەی باڵەجۆ بگەیەندرێتە ئەو سنورانە بۆ ئەوەی ئەو باخانەی كە هەن سودی لێ ببینن و سەرچاوەی ئاوەكەی لە ڕوباری سیروانەوە بێت، ئەو

بەڕێوبەرە هێمای بۆ ئەوەکرد: نزیکەی ١٥ ساڵە لەگەڵ بەنداوی باوەنور پرۆژەیەکی هاوشێوەی باڵەجۆ دیزاینکراوە بۆ ئەوەی لە پشتەوە بهێنرێت بۆ دەشتی کەلار و دەشتی ناحیەی ڕزگاری کە سەرچاوەی ئاوەکەی لە بەنداوی باوەنورەوە بێت، بەڵام بەهۆی قەیرانی داراییەوە تاوەکو ئێستا جێبەجێ نەکراوە.

وتیشی: ئەو پرۆژەیە نەک باخەکان، تەواوی دەشتە دەیمەکانیش سودی لێ دەبینن.

## ١١. پێدانی قەرزی کشتوکاڵی ڕاگیراوە

پێشتر قەرز بە باخەوانەکان دەدرا بۆ دروستکردن و پەرەدان بە باخەکانیان، بەڵام ئێستا ئەو قەرزە نەماوە.

ئیدریس مەدحەت، لێپرسراوی بەشی باخداری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، وتی: لە ساڵانی ٢٠١٢ تاوەکو ٢٠١٤ کە ئەم کێشەی قەیرانی داراییە نەبوو، پاڵپشتی قەرزی کشتوکاڵی هەبوو کە بۆ دروستکردنی باخ و سیاج لەلایەن حکومەتەوە، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی ئەو قەرزە ڕاگیراوە کە باخەوانەکان زۆر سودیان لێ بینی.

دەشڵێت: جگە لەوەش کە بەرهەمەکانیان دەهاتە بازاڕەوە حکومەت هاوکاری دەکردن و لە عەلوەدا ناویان دەنوسرا و حکومەت نیوەی پارەی بە بازاڕکردنەکەی پێدەدان، بەڵام ئێستا ئەمە نەماوەتەوە، ئەوەی هەیە ڕێکخستنی باخەکانە ئەگەر کێشەیەکیان هەبێت یان نەخۆشیەک هەبێت سەردانیان دەکەین و ڕێنماییان پێدەدەین.

ئیسماعیل محەمەد، لێپرسراوی بەشی خزمەتگوزاری لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەڵێت: بەپێی ئەو داتایەی کە بەردەستمانە تاوەکو کۆتایی ساڵی ٢٠١٣ نزیکەی ١١ ملیار دینارمان وەک قەرزی کشتوکاڵی داوە بە جوتیاران، بەشێک لەوانەی کە سودمەندبون لەو قەرزە، بۆ باخداری بووە.

هێمای بۆ ئەوەشکرد: بەڵام لە دوای ساڵی ٢٠١٤ـەوە تاوەکو ئێستا ئەو قەرزە ڕاگیراوە بەهۆکاری قەیرانی دارایی، ئەو قەرزەش بۆ خاوەن باخ نەما، کە سودمەندبون لە مەکینەی ناو باخ و کۆمەڵێک پێداویستی دیکە.

## بەشی سێیەم: دەرەنجام و ڕاسپاردەكان

### یەكەم: دەرەنجام

١. لە سنوری گەرمیاندا بە نزیكەیی ٨٠٠ باخ هەیە، كە ٣٠٠ لەو باخانە مۆڵەتدار و تۆماركراون و ئەوەكەی دیكە كە ژمارەیەكی بە وردیی نازانرێت، بێ مۆڵەتن. كۆی ڕوبەری ئەم باخانەش پێكەوە، ٥ هەزار و ٥٢٥ دۆنم زەوی دەبن. ئەم ژمارەیەش ورد نیە، چونكە بەپێی ئاماری بەڕێوبەرایەتی گشتی كارەبای گەرمیان ٢ هەزار و ٧١ هاوبەشی كارەبای پۆلی كشتوكاڵی لە سنورەكەدا هەیە، هەروەك بەپێی ئاماری بەڕێوبەرایەتی ئاوی ژێر زەوی گەرمیان ١٢٢٢ بیری كشتوكاڵی لە سنورەكەدا تۆماركراون.

٢. لە باخەكانی سنورەكەوە چەندین جۆری میوە بەرهەمدێت، لەوانە: مزرەمەنییەكان (پرتەقاڵ، لیمۆ، سندی، لالەنگی و نارنج)، قەیسی، قۆخ، خورما، زەیتون، ترێ، هەنار، هەنجیر، هەرمێ، هەڵوژە، هەنگی دونیا، گێلاس، توی فەرەنگی و كۆمەڵێك میوەی دیكە.



٣. هێشتا بەرهەمی باخەكانی گەرمیان سنوردارن و ناتوانن پێداویستی ناوچەكە لە میوە پڕبكەنەوە.

٤. سەرچاوەی ئاوی باخەكان دوو جۆرن: سەرزەوی كە ڕوبار و چەمەكانن و بەتایبەتیش ڕوباری سیروان، ژێرزەوی كە بە زۆری بیری ئیرتیوازییە.

٥. لە ڕوی كوالێتییەوە، جیاوازی لەنێو بەرهەمەكاندا هەیە، لەكاتێكدا مزرەمەنی و خورما و قەیسی و زەیتونی باشە، بەرهەمەكانی دیكەی بەوشێوەیە نییە. ئەمەش بەزۆری دەكەوێتە سەر وەرزەكان و ئەگەری لێدانی نەخۆشیی، چونكە زۆر وەرز هەیە بەرهەمی میوەی ناوچەكە ڕوبەڕوی نەخۆشی جۆراوجۆر دەبێتەوە.

٦. سەربارێی سنورداریی باخەكان و پڕنەكردنەوەی هەموو خواستی سنورەكە، بەڵام سود و لێكەوتەی ئابوریی و ژینگەیی باشیان هەیە، بەڵام بەوتەی جوتیاران و باخداران، لە ڕووە ئابورییەكەوە سودەكە ئەوەندە نییە، هۆكارەكەیشی كێشەی ساخبونەوەیە،

كە زۆرجار بەرهەمی ناوخۆیی ناتوانێت كێبڕكێی بەرهەمی دەرەكی بكات لە رووی نرخەوە، جگە لەوەش باخەكان بچوك و سنوردارن و بەشێكی بەرچاوی باخدارەكانیش وەكو ئارەزویەك باخداریی دەكەن نەك وەك پیشە.

٧. حكومەت ماوەی ١٠ ساڵە هەر هاوكارییەكی بۆ ئەم كەرتە ڕاگرتووە بە كاریگەریی قەیرانی دارایی، ئەمەش وایكردووە باخدارەكان بە تەنیا بمێننەوە، ڕەخنەی ئەوەشیان هەیە حكومەت بارگرانی دیكەشیان بۆ زیاد دەكات، لەنمونەی بڕی پارەی كارەبا و سەپاندنی مەرجی دانانی سەرپەرشیتاری كشتوكاڵی و ...هتد.

٨. پێشتر بۆ برەودان بەم كەرتە و بواری كشتوكاڵ بەگشتی، قەرز دەدرا بە جوتیاران، بەڵام ئەوە ١٠ ساڵە ئەو پرۆسەیە ڕاگیراوە، هیچ بەدیلێكیش نەدۆزراوەتەوە بۆ ئەم پرسە.

٩. تێكەڵبونی سنوری زەوییە كشتوكاڵییەكان و شارەوانییەكان، یەكێكە لە كێشەكان، فراوانبون یان فراوانكردنی شارەكانیش مەترسی كەمكردنەوەی زەوی باخەكان دێنێتە ئاراوە، هەروەك بەشێكی بەرچاو لە باخ و پرۆژە كشتوكاڵییەكان مەترسی لەناوچونیان لەسەرە لەلایەن پرۆژەكانی وەبەرهێنانەوە لە بواری نیشتەجێبوندا.

## دووەم: ڕاسپاردە

١. پێش هەموو شتێك پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەكان ڕوپێوییەكی ورد و دروست بكەن بۆ زانینی ڕێژەی فیعلی باخ و ڕوبەرە باخییەكان، هەروەك ئەوەش بزانرێت چەندیان بە فیعلی باخی بەرهەمدارن و چەندیان بۆ مەبەستی دیكەی وەكو پشودان و ئارەزووی كەسیی دروستكراون، لەسەر ئەو بنەمایە لەیەكتری جیا بكرێنەوە، چونكە بەبێ بونی ئاماری دروست، بەرچاو ڕونی دروست نابێت بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ئەم كەرتەدا.

٢. بەپێی ووتەی شارەزایان، گەرمیان ناوچەیەكی لەبارە بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی باخداریی، هەم لە رووی بونی ڕووبەری زەوییەوە، هەمیش لە رووی بوونی سەرچاوەی ئاوەوە، بەڵام كێشەكە لەوەیە كە سەرمایەگوزاریی و وەبەرهێنان لەم بوارەدا نەكراوە.

پێویستە حکومەت گرنگیی زیاتر بەم کەرتە بدات، ئەویش لەڕێگەی وەبەرهێنان کردن تیایدا، بە دانانی پرۆژەی باخداریی گەورە و کارگەی پێویست بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بەرهەمەکانی. بۆ ئەم مەبەستەش پێشنیاز دەکەین کە حکومەتی هەرێم و وەزارەتی کشتوکاڵ، هەروەها لە ئاستی ناوخۆییشدا ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوبەرایەتییە گشتیەکانی کشتوکاڵ و وەبەرهێنان، کۆنفرانس و دیداری تایبەت بۆ ئەم مەبەستە ساز بکەن و هانی سەرمایەگوزاریی لەم بوارەدا بدەن.

٣. لەپاڵ گرنگییدان بە وەبەرهێنان لە بواری دروستکردنی باخی بەرفراوان، پێویستە گرنگیی بە پیشەسازیی کشتوکاڵیش بدرێت و بتوانرێت سود لەو بەرهەمانە وەربگیرێت و بکرێن بە کەرەستەی پیشەسازیی کشتوکاڵیی (بۆنمونە لە قوتونان یاخود بەکارهێنانیان بۆ بەرهەمی دیکەی لەقوتونراو).

٤. پێویستە ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، کۆنفرانس و دیدار و کۆبونەوەی تایبەت ئەنجام بدەن لەگەڵ جوتیارە باخدارەکاندا، بۆ ئەوەی ڕووبەڕو قەبارەی کێشە و نیگەرانییەکانیان بزانن و پێکەوە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەر بدەن.

٥. بەوپێیەی بەرهەمی ناوچەکە ڕووبەڕوی چەندین نەخۆشی دەبێتەوە، بۆیە گرنگە بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان، بە بەردەوامیی خول و وۆرکشۆپ بۆ جوتیاران بکاتەوە و بەشێوەیەکی زانستی ئاگاداریان بکاتەوە لە جۆری نەخۆشییەکان و نیشانە و مەترسییەکانیان. ئەنجامدانی ئەم کارەش پێناچێت هێندە گران و بە خەرجیی بێت.

٦. هەر پەیوەست بە لایەنی هۆشیارییەوە، وەک تێبینیمان کردووە زۆربەی هۆشیاریی جوتیاران لەبارەی پیشەکەیانەوە، لە ئەزمونەوەیە نەک لەسەر بنەمای زانستیی، هەربۆیە لەم ڕووەوە هانی بەڕێوبەرایەتی گشتی کشتوکاڵی گەرمیان دەدەین، کە ڕێبەرێک ئامادە بکات و تیایدا بە زمانێکی ئاسان باسی پرۆسەی باخداریی و بنەماکانی بکات و هەروەک هەموو برگەیەکی پرۆسەکە ڕوون و شی بکاتەوە و بەشێکیشی تەرخان بکات بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشییەکان.

٧. پشتبەستن بە ئاوی ژێرزەوی بەو ڕێژە زۆرە لەكاتێكدا ناوچەكە دەوڵەمەندە بە ئاوی سەرزەویی، بەهەدەردانێكی زۆرە لەو سامانەی كە مەترسی ئەوەی هەیە قەیرانی داهاتوی مرۆڤايەتی بێت.

بۆیە لەم سۆنگەیەوە هانی حكومەت دەدەین كە هەوڵی دروستكردنی پرۆژەی ئاودێریی بدات و ڕێژەی بەكارهێنانی ئاوی ژێرزەوی كەم و سنوردار بكاتەوە، هەروەها ڕێكاری پێویست بگرێتەبەر بەشێوەیەک ئاوەكە بەهەدەر نەدرێت.

٨. گرنگە پارلەمان و حكومەتی هەرێم و وەزارەتی كشتوكاڵ، لەكاتی دەرچواندنی پرۆژە ياسا و بڕيار و ڕێنماييدا، ڕەچاوی دۆخی ناوچەكان بكەن و مەركەزييانە بڕيار نەدەن، بەڵكو ياسا و ڕێنمايی و بڕيارەكانيان بەشێوەيەكی نەرم بێت و دەسەڵات بە ناوچەكان بدرێت بەپێی تايبەتمەندیی خۆيان ياسا و بڕيارەكان بگونجێنن و بەكاربێنن.

٩. بەوپێیەی حكومەت بەهۆی قەیرانی داراییەوە پێشكەشكردنی هەموو هاوكاريی و قەرزێكی بە جوتياران ڕاگرتوە، دەتوانێت وەكو ڕێكارێكی بەديل، بانكی جياوازی ئەهلی بهێنێتە سنورەكە و بەپێدانی قەرز بە قازانجی سنوردار، بتوانن هاوكاريی جوتياران بكەن و قەرزيان پێبدەن بۆ برەودان بە پرۆژەكانيان.

**شايانی باسە** ڕاديۆی دەنگ لەچوارچێوەی پرۆژەيەكی دا بە پاڵپشتی سندوقی نيشتمانی بۆ ديموكراسی NED، لە ڕێگەی يەكەی چاودێريی حكومەتی خۆجێی گەرميانەوە، مانگانە ڕاپۆرتێک لەسەر كەرتێكی پەيوەست بە كاروباری حكومەت و هاوڵاتيان بڵاودەكاتەوە.

لەم مانگەدا تيشكی خستوەتە سەر كەرتی باخداريی لە گەرميان، تيايدا باسی قەبارەی ئەم كەرتەی كردووە، هەروەک كێشە و گرفت و ئاستەنگييەكانی خستوەتەڕوو، ئاماژەی بە ڕۆڵی حكومەت لەم نێوەندەدا داوە.



رێبوار ڕەئوف ساڵح
مامۆستای زانکۆ
پسپۆڕی زانستی سیاسی و حکومڕانی

# کەلار،
# پایتەختی ئابووری هەرێم

پایتەخت بە شێوەیەکی گشتی شار یان شارۆچکەیەکی سەرەتاییە کە وەک ناوەندی کارگێڕی وڵاتێک یان ناوچەیەک کاردەکات، ئەو شوێنەیە کە زۆرجار فەرمانگەکانی حکومەت، لەوانەش دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری لێیە، پایتەخت بەزۆری دڵی ڕەمزی و سیاسی نەتەوەیەکە، نوێنەرایەتی سەروەری و کولتوور و مێژووی ئەو نەتەوەیە دەکات.

هەر دەوڵەتێک یان هەرێمک کە خاوەن جۆرێک لە دەسەڵاتی خۆیی بێت، تەنها یەک پایتەختی هەیە، بەڵام لەگەل ئەمەشدا جۆرێکی دیکە لە نازناوی پایتەخت هەیە کە دەکرێت هەر ناوچەیەک یان شارێک یان تەنانەت شارۆچکەیەک هەڵگری بێت لە یەک بواری تایبەتدا، بۆ نموونە سلێمانی پایتەختی ڕۆشنبیرییە، هەڵەبجە پایتەختی ئاشتیە، پێشنیار کراوە کە چەمچەماڵ بکرێت بە پایتەختی شەهیدان و ئەنفال، هەروەها ڕانیەش وەک و پایتەختی ئازادی ناوی دەهێنرێت.

دیارە ئەم ناوانە زیاتر لەگەڵ تایبەتمەندێتی ئەو شار و شارۆچکانەدا دەگونجێت، بۆیە بۆیان دادەنرێت یان پێشنیار دەکرێن، لەم سۆنگەیەشەوە بە پێویستی دەزانم کە داوا لە دەزگاکان و کاربەدەستانی کەلار بکەم، بە تایبەت مەڵبەندی گەرمیان و ئیدارەی گەرمیان و قایمقامی کەلار، بارەگای سەرجەم حزبەکان و ڕێکخراوەکانی بواری مەدەنی و کەسایەتییەکان، سیاسییەکان و پەرلەمانتاران، ڕۆژنامەنووسان و نوسەران و ئەکادیمیستەکان،

دەزگا میدیاییەکان و پەیجەکانی سۆشیال-میدیا و دامودەزگا پەیوەندیدارەکان، بۆ ئەوەی کار لەسەر ئەوە بکرێت، کەلار بکرێت بە پایتەختی ئابووری، چونکە پێم وایە کە تایبەتمەندی کەلار ئەوە دەخوازێت و هەڵدەگرێت کە ئەو نازناوەی بۆ دابنرێت، ئەم نازناوەش گرنگییەکی زۆری دەبێت بۆ کەلار، بەتایبەت لە رووی بوژانەوەی زیاتر و گەشەکردنی زیاتری ئابوورییەکەشی.

شارێک بۆ ئەوەی ببێتە پایتەختی ئابووری، پێویستە خاوەنی چەندین تایبەتمەندی و سیفاتی سەرەکی بێت کە بەشدارن لە بەهێزی ئابووری و توانای کێبرکێ لە گەشەکردندا، لێرەدا چەند تایبەتمەندیەکی گرنگ دەخەینەروو کە تا رادەیەکی باش لە کەلاردا بەدیدەکرێن:

١. ژێرخان

ژێرخانی بەهێز و گەشەسەندوو زۆر گرنگە، لێرەدا تۆڕەکانی گواستنەوەی وەک رێگاوبان و پرد و فرۆکەخانە، رۆلی بەرز دەگێرن، راستە کە تا ئێستا فرۆکەخانە لە کەلاردا نییە، هەرچەند پێشتر پێشنیاریشی بۆ کراوە، بەڵام رێگاوبانی کەلار زۆر سەکەوتووانە کاری لەسەر کراوە و ئێستا رێگاوبانی کەلار لە ناوشارەکەدا، یەکێکە لە باشترین رێگەوبانەکانی هەرێم. ئەم تایبەتمەندییەش وای کردووە کە پێشبینی بکرێت کەلار ئایندەیەکی بەهێزی هەبێت لە رووی گەشەی ئابوورییەوە.

٢. بازرگانی

بەهۆیی کار و گرنگیدانی خەڵکەکە بە کاسبی و بازرگانی، شارەکە ژینگەیەکی بازرگانی لەباری دروست کردووە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کەلارهەم هاندەری کارگێری و هەم بازرگانی ناوخۆیی و هەرێمی و تەنانەت نێودەوڵەتیش بۆ خۆی رابکێشێت، ئێستا گەر تێبینی بکرێت، دەبینیت لە بواری کاسبیدا ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکانی کاسبکار لە کەلار خەڵکی شار و شارۆچکەکانی دیکەن و هاتوون کاری تێدا دەکەن.

٣. پەروەردە

دەستراگەیشتن بە هێزی کارامە و خوێندەوارهاوکارن لە دروستکردنی پایتەختێکی ئابووری بەهێز، بۆیە پێویستە هەڵگری ئەم نازناوە خاوەنی هێزی کارێکی خوێندەوار و لێهاتوو بێت کە رۆڵ ببینن لە بەردەوامیدان بە گەشەی ئابووری، لەم بوارەشدا کەلار توانایەکی

زۆر باشی هەیە، بەهۆی بوونی زانکۆکان و پەیمانگاکان و ناوەندەکانی دیکەی خوێندن و دامەزراوەکانی توێژینەوە و ناوەندەکانی ڕاهێنانی پیشەیی، پیکەوە توانایەکی باشیان هەیە لە پێگەیاندنی کەسانی بە توانا کە لە ئاستی گەشەی خێراو بەرچاوی کەلاردان.

٤. پەیوەندی

پەیوەندییەکی باش لە ئاستی ناوخۆیی و جیهانیدا گرنگە بۆ گەشەی شار، چونکە تۆڕەکانی پەیوەندیکردن یارمەتی شارەکە دەدات بۆ ڕاکێشانی بازرگان و وەبەرهێنە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان، بۆیە شار لە ڕووی ئابووریەوە پێویستە گرنگیەکی پێشوازی لێکراوی هەبێت لەلایەن دەوروبەر و دنیای دەرەوە، لەم بوارەشدا کەلار پێگەیەکی بەرچاوی هەیە و بووە بە جێگەی سەرنجی زۆرێک لە بازرگان و کۆمپانیا ناوخۆی و دەرەکییەکان.

٥. کوالێتی ژیان

کوالێتی ژیانێکی بەرز، کەسانی پیشەیی بەتوانا بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و هانی بازرگانەکانیش دەدات بۆ ئەوەی خۆیان دەستپێشخەری بکەن و کۆمپانیاکانیان لە شاردا جێگیر بکەن، ئەمەش هۆکارەکانی وەک چاودێری تەندروستی، پەروەردە، خزمەتگوزارییە کولتوورییەکان و دەرفەتی کات بەسەربردن دەگرێتەوە، لەم بوارەشدا کەلار هەنگاوی باشی ناوە و توانای خۆی نمایش دەکات لەو ئاستەدا، بە تایبەت بەهۆی ئەوەی کە وێڕای وەستانی پرۆژەکانی بنیادنان لە زۆربەی ناوچەکانی هەرێمدا، کەچی کەلار هێشتا زۆر پرۆژەی باش و گرنگ بەڕیوە دەبات و لە بواری جێبەجێکردندان کە پێکەوە گەشەی زیاتر و ووزەی زیاتر بە کەلار دەبەخشن.

٦. ئابووری هەمەچەشن

شارێک کە بنکەیەکی ئابووری هەمەچەشنی هەبێت زیاتر خۆڕاگر دەبێت بەرامبەر بە دابەزینی ئاستی ئابووریەکەی، پشت بەستن بە سێکتەرە جۆراوجۆرەکان ئامادەیی بۆ شۆکەکان لە هەر کەرتێکدا کەمدەکاتەوە، لەم بوارەدا کەلار توانایەکی بێوێنەی هەیە جونکە لە لایەک، خاوەنی کێڵگەی نەوتییە و لە لایەکی دیکەشەوە خاوەنی ڕووباری سیروان و زەوی کشتوکاڵی باشە، هەروەها بەهۆی دەروازەی پەروێزخانەوە کە هاوسنورە لەگەڵ ئێراندا، کەلار بووە بە شارێکی پڕ جموجوڵی بازرگانی.

٧. سەقامگیری

سەقامگیری سیاسی و حوکمڕانی کاریگەر، هۆکاری گرنگن بۆ سەرکەوتنی ئابووری، وێڕای ڕەخنەی بەرچاو و گلەیی باش و بەجێ لە حکومەت و کاربەدەستان، بەڵام تا ڕادەیەکی باش ئاسایش و ئارامی کەلار پارێزراوە، هەربۆیە بەهۆی ڕۆڵی دامودەزگاکان و لایەنە پەیوەندیدارەکان لەم بوارەدا، توانراوە کەلار بکرێت بە شارێکی سەقامگیر کە ژینگەیەکی باشی فەراهەم کردووە بۆ بازرگانان و وەبەرهێنەران، هەربۆیە دەبینین کە بەردەوام کۆمپانیاکان ئۆفیسی خۆیان لە شارەکەدا دەکەنەوە، بە تایبەت لە بواری بریکاری و وەبەرهێنان و عەقاراتدا، ئەمەش هێزی کاری دەرەوەشی هێناوەتە شارەکە بۆ ئەوەی ڕۆڵی ئەرێنی و کاریگەر ببینن لە بەرەوپێشچوونی کەلاردا.

٨. گەشەپێدانی بەردەوام

کار و چالاکییە پراکتیزە بەردەوامەکان لە بواری ژینگە و بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی و گەشەپێدانی ئابووری بەشدارە لە توانای درێژخایەن و سەرنجڕاکێشی کەلار، لەم ڕووەوە سەرمایەدارە بەتواناکانی کەلار، شایەنی دەستخۆشین، چونکە زۆرێکیان دەستمایەکانیان نابەنە دەرەوەی کەلار و زیاتر لە خزمەتی شارەکە و دانیشتوانەکەیدا بەکاریدەهێنن، چالاکوانەکانیشی بە باشی ماندوو دەبن لە بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری و ئاگایی خەڵکەکەی، ئەمەش وایکردووە کە کەلار زیاتر وەک پایتەختێکی ئابووری دەربکەوێت، بە تایبەت لە ڕووی پیشەسازی و هەبوونی دەرفەتی فراوان و هاوکاری لە نێوان بازرگانان و خاوەنکاران و پیشەگەرەکاندا، هەروەها هۆشیاری و ئاگایی خەڵکەکەشی وایکردووە کە داهێنان و گەشەکردن و پەروەردە بەرەو ئاستێکی باش بەرزببێتەوە.

٩. نرخی زەوی و موڵک

تایبەتمەندییەکی دیار کە کەلاری زۆر پێناسراوە، بەرزی نرخی زەویوزار و موڵکەکانێتی، بە جۆرێک کە بووەتە جێی سەرنجی زۆرێک لە ناوەندە میدیاییەکانی ناوخۆ و تەنانەت دەرەوەش، ئەمەش وایکردووە کە تەنانەت بەراورد لە نێوان نرخی زەوی و موڵکی کەلار لەگەڵ هەندێک لە شارەکانی ئەمریکادا بکرێت، یاخود بەردەوام باس لەوە دەکرێت کە ئەگەر زەویەک یان موڵکێکت لە کەلار هەبێت و بیفرۆشیت ئەوا توانای کڕینی دوو موڵکت دەبێت لە شارە گەورەکانی وەک هەولێر و سلێمانی، ئەمەش وایکردووە کە زۆر لە فەرمانبەران و کاربەدەستانی دەرەوەی کەلار کە مافی بەدەستهێنانی زەوی حکومییان

هەیە، هەوڵ بدەن زەوییەکانیان لە کەلاردا وەربگرن، لە جیاتی شار و شارۆچەکەکانی خۆیان، چونکە دواتر دەیفرۆشنەوە و پارەی زیاتریان لێوە دەست دەکەوێت.

١٠. هەڵکەوتەی کەلار

هەڵکەوتەی کەلار تا ڕادەیەکی زۆر بەژدارە لە بوژانەوەو بەرەوپێشچوونی شارەکە، هۆکاری ئەمەش بە ڕێژەیەکی بەرچاو ئەوەیە کە کەلار بووەتە شارێک کە ڕۆڵی سەنتەر دەگێڕێت و زۆرێک لە ناوچە گرنگەکانی هەرێم و عێراق و ئێران پێکەوە دەبەستێتەوە، بۆ نموونە لە باشورییەوە ڕێگای بەغدادی لەسەرە، لە ڕۆژئاواییەوە ڕێگای کەرکوک، لە باکوررییەوە ڕێگای سلێمانی، هەروەها لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە لە ڕۆژهەڵاتییەوە ڕێگای ئێرانی لەسەرە کە وەکو وتمان گاریگەرییەکی بێوێنەی جموجولی بازرگانی و ئابووری هەیە لە بوژانەوەو گەشەی شارەکە، بۆیە ئەم هەڵکەوتەییەی کەلار دەرفەتی زیاتری بە شارەکە داوە کە ببێت بە پایتەختی ئابووری هەرێم.

١١. سەوزایی

سەوزایی بە تایبەتی و پاراستنی ژینگە بە گشتی، بوونەتە جێی شانازی کەلارییەکان، بە جۆرێک کە ئەگەر ئێستا کەلار پێشەنگ نەبێت لەسەر ئاستی هەرێم، ئەوا بێگومان یەکێکە لە شارە پێشەنگەکان لە ڕووی پاراستنی ژینگەو سەوزاییەوە، ئەمەش وای کردووە کە جوانی شەقاماکانی کەلار بەهۆی دار و سەوزاییەکانیەوە ببێت بە جێی سەرنجی گەشتیاران و تەنانەت خەڵکی ناوچەکە خۆشی، دیارە ڕۆڵی سەرەکی ڕێکخراو و کەسایەتییە دیارەکانی بواری ژینگە دەبێت بەرز بنرخێنرێن کە هاوکار و هەمئاهەنگ بوونە لە گەڵ دەزگا پەیوەندیدارەکان بۆ پاراستن و بەرەوپێشبردنی کەلار لە ڕووی ژینگەو سەوزاییەوە.

١٢. نەوت

بەهۆی ئەوەی هەرێمی کوردستان وە تەنانەت عیراقیش، هەرێم و وڵاتێکی بەرخۆرن، زیاتر پشت بە فرۆشتن یان بە کرێدانی نەوت دەبەستن، واتە هەبوونی نەوت وایانیلێکردووە کە زیاتر چاویان لەسەر بەرهەم و سێکتەری نەوتی بێت بۆ بەدەستهێنانی داهات، هەبوونی نەوتیش لە ناوچەیەک وا دەکات کە بوژانەوە و دەرفەتی کاری زیاتر دروست ببێت بۆ دانیشتوانەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا دانیشتوانی کەلار کەمتر دانیشتوانێکی بەرخۆرن بەهۆی چستوچالاکی خەڵکەکەی لە ڕووی بازرگانی و کەسابەتەوە، وە هەروەها، وەکو باسمکرد، بە هۆی پێگە بازرگانییە بێوێنەکەی کەلار لە ناوچەکادا.

١٣. كشتوكاڵ

بەهۆی ئەوەی كە كەلار شارێكی نوێیە، هەندێك تایبەتمەندێتی ئەرێنی بەدەستهێناوە، بۆ نموونە زۆرێك لە خەڵكەكەی لە گووندەكانەوە هاتن و نیشتەجێ بوون لە كەلاردا، بە تایبەت لە سەردەمی ساڵانی هەشتاكان و بە تایبەتتریش بەهۆی پرۆسەی شوومی ئەنفالەوە، ئەم خەڵكەش تاوەكو ئێستا پەیوەستییەكی باشیان لەگەڵ گوندەكانی خۆیان هەیە و كاری مەڕ و ماڵاوت و گاوانی دەكەن، ئەمەش وایكردووە كە بەرهەمە گۆشتییەكان و شیرەمەنییەكان بەشێوەیەكی بەرچاو لە ناوچەكەدا ڕوو لە گەشە بكەن، هەر بۆیە چەندین بەرهەمی شیرەمەنی فەرمی و نافەرمی هەیە لە ناوچەكەدا، بەهۆی هەبوونی ڕووبارەوە، كەلار باشتر توانیوێتی بەروبومی ماسی و سەوزەمەنی و باخداری و ئاژەڵداری پەرەپێبدات، ئەمە جگە لەوەی كە كەلار ڕۆڵێكی كاریگەری هەیە لە بەرهەمهێنانی گەنم و دانەوێڵە لەسەر ئاستی هەرێم و تەنانەت عێراقیش.

گەیشتن بەم تایبەتمەندییانە و پاراستنیان پێویستی بە پلاندانانی ستراتیژی و وەبەرهێنان و هەوڵی بەردەوامی هەردوو كەرتی گشتی و تایبەت هەیە، لێرەدا پێویستە دەستخۆشی لە زۆربەی دامودەزگا فەرمییەكان بكەین كە ڕۆڵی بەرچاو و دڵسۆزانەیان هەبووە لەم بەرەوپێشچوونانەدا، زۆرجار پایتەختە سەركەوتووەكانی ئابووری بە تێپەڕبوونی كات پەرەدەسێنن، بەڵام گومان دەكرێت ئەگەر شوێنێك هەبێت هێندەی كەلار گەشەی خێرای كردبێت و گەشتبێت بەم ئاستە بێوێنەیە، چونكە هەموو ئەم پێشكەوتنانەی كەلار لە كاتێكدایە كە تەمەنی شارەكە تەنها نیو سەدەیەكە. لەم ماوە كورتەدا ئێستا كەلار خۆی لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخی ناوچەیی و تەنانەت جیهانیشدا دەگونجێنێت و ئابوورییەكەشی ڕۆژبەڕۆژ لەگەشەی زیاتردایە، بۆیە پڕبەدڵ داوا دەكەم و هیوادەخوازم كە هەموو لایەن و كەسایەتییە كاریگەرەكان، بەتایبەت ئەوانەی كە لە سەرەتای ئەم وتارە ئەماژەم پێكردوون، بەدەم ئەم داواكارییەمەوە بێن و بە هیمەتی دڵسۆزان لە كەلار و كوردستان كاری جدی لەسەر ئەوە بكرێت كە كەلار ببێت بە پایتەختی ئابووری هەرێم.

# کەلار لەنێو گۆڕانکارییە کارگێڕییەکاندا



ڕزگار حاجی حەمید

کەلار یەکێکە لە شارە پڕ جووڵە و گەورە و دیارەکانی باشووری کوردستان، لەسەر ئاستی عیراقیشدا بەهەمان شێوە ناوێکی دیار و ناوبانگێکی زۆر و بزاوتێکی هەمەجۆری لەکایە جیاجیاکاندا تێدا بەدی دەکرێت، لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بازرگانی و ڕۆشنبیری و سیاسییەوە ڕۆڵی کارا و دیاری هەبووە لە ڕابردوو و ئێستاشدا، هەرلە دێر زەمانیشەوە ناوچەیەکی ئاوەدان و شوێنی نیشتەجێبوون بووە، کە وەک ناوەکەی بناغەی گوندێکی زۆر کۆنی ناوچەکەیە و مێژووی کۆن و دێرینی هەیە و لە مێژەوە ئاوەدان بووە، پێشتر و لە سەرەتای بیستەکان سەربە ناحیەی قەڵای شێروانە و ناحیەکەش سەربە قەزای کفری بووە، مەڵبەندی ناحیەکەش لە سەرەتاوە تاوەکو ناوەڕاستی سییەکان لە گەڕەکی بنگرد بووە بەرانبەر قەڵای شێروانە، دواتر لەبەر فراوانی سنوورەکە و دووری لە گوندەکانی، ناوەندی ناحیەکە گواستراوەتەوە بۆ گوندی سەرقەڵا، تا وەکو ساڵی (١٩٧٥) هەربە ناوی قەڵای شێروانە و دواجاریش قەڵاکەی لێکراوەتەوە و ناوی شێروانە بووە، کە کەلار لە شوباتی ساڵی حەفتادا دەبێتە قەزا و لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا دەخرێتە سەر پارێزگای سلێمانی تا ئەو کاتە ئەو ناوە دەمێنێتەوە , کە دەتوانین ناوی ناحیەی دایکی لێبنێن، چونکە پێش کۆتایی ساڵی (١٩٧٥) ناحیەکانی (جەبارە و کۆکس و تیلەکۆ و سەرقەڵا) و هەروەک لە ٣٠ی ئازاری ١٩٦٩ گوندی جەبارەی لێدابڕاو کرایە ناحیە بە هەمان شێوە لە ١٩٧٢/١٠/٢٥ گوندی کۆکسی لێ جیاکراوەتەوە و کراوەتە ناحیە، دوای ئەو مێژووەش ناحیەکانی (ڕزگاری و ئاوەسپی (خان) و شێخ تەویل)یش زیاتر لە گوندەکانی ئەو ناحیەوە دروستبوون.

کەلار بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە (١٣٧) لە (١٩٧٠/٢/٢٨)دا لەلایەن حکومەتی عێراقەوە کراوەتە قەزا، کە لە رووی کارگێڕییەوە ئەو دەمە و بە درێژایی مێژوو سەربە پارێزگای کەرکوک بووە، لە هەردوو ناحیەی (شێروانە و پێباز) پێکهاتبوو، پاشان ناحیەی شێروانە لە رووی کارگێڕییەوە دەخرێتەوە سەر قەزای کفری , ئیدی ناوی ناحیەی شێروانە نامێنێت , لە دوای رێککەوتننامەی (ئازاری١٩٧٠) حکومەتی بەعس یەک لایەنە یاسای ئۆتۆنۆمی، ژ: (٣٣)ی لە (١٩٧٤/٣/١١)دا راگەیاند، کە تێیدا تەنها پارێزگاکانی (سلێمانی، هەولێر، دهۆک) , لەگەڵ (١٩) قەزا و (٥٢) ناحیەی دەگرتەوە , ئەوەی جێی سەرنجە قەزاکانی (کەلار و چەمچەماڵ) هەرچەندە سەربە پارێزگای کەرکوک بوون , خرانە چوارچێوەی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمییەوە , ئەم جیاکردنەوەش سەرەتایەک بوو بۆ ئەوەی لە پارێزگای کەرکوک دایانبڕن , هەرواشیان کرد , ئەوەبوو بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە (١٩٧٥/١١/٦)دا نەخشەی کارگێڕی هەردوو قەزای (کەلار و چەمچەماڵ) لە پارێزگای کەرکوک هەڵوەشێنرایەوە و خرانە سەر پارێزگای سلێمانی , کەواتە تا ناوەڕاستی حەفتاکان کەلار سەر بە پارێزگای کەرکوک بووە، بەهەمان پێکهاتەی کارگێڕییەوە , پاشان ناحیەی شێروانە ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ ناحیەی سەرقەڵا، بە (٢٤) موقاتەعەوە لە قەزای کەلارەوە گواستراوەتەوە بۆ سەرقەزای کفری بە فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٧) کە لە (١٩٧٥/١١/٦) دەرچووە , هەروەها لە (١٩٧٥/١١/٦ ) بە ژمارە (٦٠٦) تیلەکۆ دەبێتە ناحیە لە سەر قەزای کەلار , ئەگەر سەرنج بدەین لە یەک رۆژدا ئەو فەرمانانە دەرچوون، کە ژمارەکانیان یەک لە دوای یەکە (٦٠٦، ٦٠٧، ٦٠٨) تەنانەت زنجیرەی لاپەڕەکانیش (١٧٥، ١٧٦، ١٧٧، ١٧٨) , لە (١٩٧٥/١٢/١) بە بڕیاری ژمارە (٢٦٣٦٣) کە لە رۆژنامەی فەرمی (الوقائع العراقیە)دا بڵاوکراوەتەوە بە واژۆی وەزیری ناوخۆ.

قەزای کەلار بە مەرسومێکی کۆماری دەخرێتە سەر پارێزگای سلێمانی , بە هەردوو ناحیەکەوە (تیلەکۆ و پێباز) , کە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای شاری سلێمانی و (١٤٤) کیلۆمەتر دوورە لێیەوە، کە لە رووی ژمارەی دانیشتوان و رووبەریشەوە کاریگەری خۆی لەسەر پارێزگاکە هەبوو , بەنموونە بەپێی سەرژمێری دانیشتوانی ساڵی (١٩٨٧) کۆی دانیشتوانی قەزای کەلار گەیشتە (٨٢٠٠٤) کەس ، (٦٣١٠٢) لە دانیشتوانی شارنشین و (١٨٩٠٢)یان لە گوندنشین , هەروەها رووبەرەکەشی (٢١١١)کم٢ بوو کە رێژەی ٤ ,١٣٪ لە کۆی رووبەری گشتی پارێزگای سلێمانی پێکدەهێنا , لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە

لـە ئاسـتی پارێزگاكـەدا لەڕیزبەنـدی یەكەمدابـووە , هەربۆیـە كـەلار لـە ماوەیەكـی كورتـدا گەشـەكردنێكی بەرچاوی بـە خۆیـەوە بینیـووە، بـە ئێستاشـەوە تـا دێ لـە هەمـوو ڕوویەكـەوە گەشـە دەكات و دەبێتـە باوانـی ئەوانـەی كـە بـۆ ماوەیەكـی كورتیـش تێیـدا نیشـتەجێدەبن، بەبـێ ئـەوەی هەسـت بـە نامـۆی بكـەن , تـادێ ئـەم شـارە لـە گەشـەكردندایە و بـە خێرایـی ڕێـژەی دانیشـتوان پتـر دەبێـت، بەپێـی قۆناغەكانـی سـەردەم كاریگەریـی بزاوتـە سیاسـی و ئابـووری و كۆمەڵایەتـی و جوگرافـی و كارگێڕییەكانـەوە گەشـەكردنێكی بەرچـاو و دیـاری بەخۆیـەوە بینیـووە، لەگـەڵ ئـەوەش ڕەوشـی سیاسـی عێـراق و كوردسـتان ڕۆڵیـان بینیـووە لـە فراوانبـوون و گەشـەكردنی ئـەم شـارەدا، دواجـار پێگـە و هەڵكەوتـە جوگرافیاكـەی و فاكتـەری كارگێـڕی و خزمەتگوزارییـەكان هەریەكـە و پشـكیان لـەو گەشـەكردنەدا هەبـووە .

## كەلار دیسانەوە ڕووبەڕووی ئاڵوگۆڕی كارگێڕیی دەبێتەوە

دوای ڕاپەڕیـن و ڕزگاركردنـی ناوچەكـە، جارێكیتـر بـووە باوانـی ئـەو شـار و شـارۆچكانەی لـە ژێردەسـەڵاتی بەعسـدا بـوون، خەڵكێكـی زۆر ڕوویـان كـردە شـارەكە , هاوكات كـەلار ڕووبـەڕووی ئاڵوگـۆڕی كارگێڕیـی بـووەوە , بـە دامەزراندنـی پارێزگای كەركوك لە سـەر بڕیاری حكومەتـی هەرێمـی كوردسـتان، لـە ڕووی كارگێڕییـەوە لـە پارێزگای سـلێمانی جیاكرایـەوە و خرایـەوە سـەر پارێـزگای كەركـوك كـە ناوەندەكـەی قـەزای دەربەندیخـان بـوو، ئەمـە و تـادوای پرۆسـەی ئـازادی و ڕووخاندنـی حكومەتـی بەعـس، پارێـزگای كەركـوك هەڵوەشـێنرایەوە، ئیـدارەی گەرمیـان جێـی گرتـەوە بـۆ ئـەو قەزایانـەی كـە بەدرێژایـی مێـژوو تـا ناوەڕاسـتی حەفتـاكان لەسـەر پارێـزگای كەركـوك بـوون، دواتریـش بـە بڕیارێكـی ئەنجوومەنـی وەزیـران ئیـدارەی گەرمیـان گوێزرایـەوە بـۆ شـاری كـەلار، ئیـدی لەوكاتـەوە تائێسـتا ناوەنـدی ئیـدارەی گەرمیانـە، ئەمـەش خاڵێكـی پرشـنگدار و ڕەنگدانەوەیەكـی زۆری هەبـوو، لـە مێـژووی كـەلاردا لـە ئێسـتادا مامەڵـەی ئیدارەیەكـی سـەربەخۆیی لەگـەڵ دەكرێـت , چەندیـن بەڕێوەبەرایەتـی گشـتی تێدایـە و لـەڕووی دانیشـتوانەوە یەكێكـە لـە قـەزا گەورەكانـی هەرێـم و عیراقیـش، لـە ڕووی ئابـووری و بازرگانییـەوە پێگەیەكـی بەهێـز و پێشـكەوتووە، لـە ڕووی ڕووبـەرەوە خـاوەن دەشـت و پانتاییەكـی زۆر و بـواری فراوانبوونـی هەیـە , خاكێكـی بەپیـت و كشـتوكاڵی جۆراوجـۆر و پاشـان نەوتێكـی زۆری لـێ دۆزراوەتـەوە و بەرهەمێكـی باشـی لـێ هەنـاردە دەكرێـت، هەرچەنـدە گـەڕان و پشـكنین بـە دوای نەوتـدا مێژوویەكـی پێشـتری هەیـە , هەروەها لـە بـواری پـەروەردە و فێركـردن و خوێندنـی بـاڵادا زانكـۆی گەرمیـان و چەندیـن پەیمانـگای

تێدایە، كە ئەمانەی ئاماژەی پێكرا كاریگەرییان لەسەر زیادبوونی دانیشتوانی كەلار هەبووە , هۆكارێكیتری زیادكردنەكەش بەهۆی هەلومەرجی نائارام و ناجێگیری ناوچەكانی دەوروبەرەوە بووە , بەتایبەت دۆخی سیاسی، كە حكومەتی ناوەند بە دڕندانە ترین شێوە رفتاری لەگەڵ گەلی كورد دا كردووە، ئەویش لە ناوچە كوردستانییەكانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم , كەواتە بەشێكی زۆری ئەو زیادكردنەكەش بە شێوەیەكی ناسروشتی بووە.

ئەو یەكە كارگێڕییانەی بەو سنوورەی كە جاران هەیانبووە، پێشتر سەر بە كەركوك بوون , لەلایەن حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە بە شێوەیەكی كاتی پارێزگای كەركوكی پێكهێنا لە قەزاكانی (كفری , كەلار، دەربەندیخان، چەمچەماڵ) و بەشێك لە ناحیەكانی قەزای خانەقین , لە هەمان كاتدا قەزای دەربەندیخان دیاریكرا بۆ ناوەندی پارێزگاكە , ئەم دۆخە بەم شێوەیە درێژەی هەبووە تا ڕووخانی ڕژێمی بەعس لەلایەن ئەمریكا و هاوپەیمانەكانییەوە لە ساڵی (٢٠٠٣) , لە پرۆسەی ڕزگاری عیراقدا جارێكیتر ناوچەكانی (كەلار و كفری و چەمچەماڵ و خورماتوو) مانەوە , چارەنووسیان بەسترا بە ماددەی (١٤٠)ەوە، دیسانەوە بۆشاییەكی ئیداری لە ناوچەكەدا دروستبوو , لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی حكومەتی هەرێمی كوردستانەوە بە فەرمانێكی وەزاری كە تێیدا هاتووە، ئاماژە بە نووسراوی سەرۆكایەتی ئەنجوومەنی وەزیران، سەرۆكایەتی دیوان، ژمارە، ٢٢٤٢ لە ٢٠٠٦/٨/٦بڕیاردرا: (بە هەڵوەشاندنەوەی پارێزگای كەركوك لە دەربەندیخان و درووستكردنی ئیدارەیەكی تایبەت بۆ ئەو قەزا و ناحیانەی كە پێشتر لە سنووری ئیدارەی گەرمیان و پارێزگای كەركوك ڕێكخرابوون و مەركەزەكەیان بەشێوەیەكی كاتی لە دەربەندیخان بووە بە ناوی ئیدارەی گەرمیان) , كە دواتریش بە فەرمانی وەزیری ناوخۆ (عوسمان حاجی مەحمود) بڕیاردرا بە گواستنەوەی ئیدارەی گەرمیان لە قەزای دەربەندیخانەوە بۆ قەزای كەلار لە ڕۆژی ٢٠٠٧/٢/٢٥ دا , هاوكات قەزای كەلار دەبێت بە ناوەندی ئیدارەی گەرمیان , پێشتر بەشە بودجەی لەسەر پارێزگای سلێمانی بۆ دیاری كرابوو، بەڵام بە بڕیاری (٢٢٤٢) ئەنجوومەنی وەزیران لە ٢٠٠٦/٨/٦ هەموو دەسەڵاتە یاسایی و ئیداری و دارایی پارێزگای پێدراو بوو، بە یەكەمین ئیدارەی سەربەخۆ لە حكومەتی هەرێمی كوردستان , هەروەها لە ساڵی (٢٠٠٨)دا ئەنجوومەنی وەزیرانی حكومەتی هەرێم بە شێوەیەكی كاتی بۆ ڕاپكردنی كاروباری ئیداری خەڵكی ناوچەكە و دەسەڵاتی پارێزگاریش دەبەخشێتە سەرپەرشتیاری ئیدارەكە، ئیدی لەوكاتەوە

ئەو هەموو گۆڕانكارییە كارگێڕییە تێدا ڕوویدا چارەنووسیان بەستراوەتە ماددەی (١٤٠)ی دەستوورییەوە ، ئەم ناوچانە وەک خۆی بەهەڵپسێردراوی ماوەتەوە، لەكاتێكدا لەبەر هۆكاری سیاسی و بچووک كردنەوەی ڕووبەری جوگرافیای كارگێڕی كەركوك و كەمكردنەوەی ڕێژەی دانیشتوانی كورد لەسەر نەخشەی پارێزگای كەركوك لادران ، هەربۆیە پێویست بوو ئەم ناوچانە بەبێ قسە لەسەركردن بگەڕێنرایەتەوە بۆسەركارگێڕی كەركوك و بەهیچ شێوەیەک نەخرایەتە چوارچێوەی ماددەی (١٤٠)ەوە ، ئەم ماددە دەستوورییە دەبوو لە كۆتایی (٢٠٠٧)دا جێبەجێ بكرایە ، تا ئێستاش هەروەک خۆیەتی و خۆیان دەدزنەوە لە جێبەجێكردنی ، بەڵكو دەڵێن: ؛ماددەكە بەسەرچووە؛ ، بەهەموو تواناكیان دژایەتی دەكەن و لەلایەن وڵاتانی دەوروبەرەوە پشتگیری دەكرێن و ئەوانیش لە حكومەتی ناوەند زیاتر دژایەتی دەكەن ، كە ناهێڵن هەنگاوێک بنرێت بە ئاراستەی جێبەجێكردن ، لە كاتێكدا ماددەیەكی دەستوورییە و هەر كەسێک دژایەتی بكات پێوستە لەلایەن دادگای فیدراڵییەوە سزا بدرێت ، هەروا دەمێنێتەوە تا ئەو دەمەی دڵنیادەبن كە قۆناغەكانی (سەرژمێری و ڕاپرسی) بە قازانجی عەرەب دەشكێتەوە.

هەروەها پێویستە لەسەر ئەوانەی لەسەر پشكی كورد پۆستیان وەرگرتووە، چ لەناو حكومەت و لە پەرلەمانی عێراقدا ، ئەم ماددەیە زیندووبكەنەوە و جووڵەیەكی خێرای پێ بدەن و بخرێتە بواری جێبەجێكردنەوە، هاوكات بكرێتە پرۆژەی كار و پێداگری لەسەر بكرێت ، هەروەها چارەنووسی ئەم قەزایانە یەكلایی بكرێتەوە كە لەدوای (٢٠٠٣)ەوە بە هەڵپسێراوی ماوەتەوە لە نێوان حكومەتی هەرێم و ناوەندا ، ئەگەرنا بە دڵنیاییەوە حكومەتی عێراق ڕازییە بەوەی ئیدارەی گەرمیان بكرێتە پارێزگای گەرمیان ، بەڵام هەرگیز ڕازی نابێت كەلار و ئەو قازایانەی تر بگەڕێنێتەوە سەر پارێزگای كەركوك و ڕێگە نادات ڕاپرسی بكرێت لەم ناوچانە و خۆیان دەنگ لەسەر چارەنووسی شارەكەیان بدەن.

## سەرچاوە:

١. المراسیم الجمهوریه، ١٩٦٨- ١٩٧٧ , جزء الاول.

٢. الجمهوریه العراقیه، وزاره الحكم المحلی، الدلیل الاداری للجمهوریه العراقیه، الجزء الاول، ١٩٨٩- ١٩٩٠طبع١، بدون مكان طبع.

٣.عەبدوڵلا غەفور، پێكهاتەی ئیداری لە هەرێمی كوردستاندا (١٩٩١- ٢٠٠٨) , هەولێر ٢٠٠٨ چ١ , چاپخانەی خانی , دهۆك.

٤.الجمهوریه العراقیه ، وزاره التخطیط ، الجهازالمركزی للاحصاء ، نتائج التعداد العام للسكان لسنه ١٩٨٧، محافظة السلیمانیه ، ١٩٨٨.

٥.رزگار حاجی حەمید , كەلار مێژوویەكی دێرین و جوگرافیای شارێكی زیندوو، چاپی یەكەم، چاپخانەی یاد , ٢٠١٤.




کۆسار عومەر

نووسەر و مامۆستای زانکۆ


# ڕووداوە ئەدەبییەکان

# شارێی پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی شار

بەریتانیا شوێنی زۆرێک لە نووسەرانی ناوداری وەک (ویلیام شکسپیر، جین ئۆستن، چارڵز دیکنز...)ە. کارە ئەدەبییەکانیان میراتێکی بۆماوەیی و بەشێکی دانەبڕاوە لە شوناس و کولتووری بەریتانیا. لە ڕێگەی فیستیڤاڵە ئەدەبیەکانی وەک (Hay Festival، Edinburgh Book Festival، Cambridge Literary Festival و...) ئەم میراتە پڕشانازییەیان دەپارێزن.

دیاریدەی ڕۆشنگەریی ئەدەبی ڕووسیا، گەورە ئەدیبانی وەک (لیۆ تۆڵستۆی و فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی و ئەنتۆن چێخۆڤ) لەخۆدەگرێت کە بەرهەمەکانیان لە سەرانسەری جیهاندا ڕەنگیداوەتەوە. شارەکانی مۆسکۆ و سانت پترسبۆرگ (لینینگراد) نموونەی ڕۆشنگەریی ڕووسین و گەشتی ئەدەبی پێشکەشدەکەن و بەدواداچوون بۆ ژیان و بەرهەمی نووسەرانی بەناوبانگی ڕووسیا دەکەن و لەڕێگەی فیستیڤاڵە بەناوبانگەکانی وەک (Tolstoy Weekend، Moscow Poetry Biennale، Moscow International Book Fair (MIBF) و...) گەورەترین پێشانگەی کتێب و شیعر و گفتوگۆی ئەدەبی دەکرێت و کولتووری نەتەوەیی دەپارێزن و بەرزی دەکەنەوە.

ئەدەبیاتی ژاپۆن وەک پاژێکی سەرەکیی لە ڕۆشنبیری جیهانیی، لە ڕێگەی نووسەر و ڕۆشنبیر و شاعیرەکانی وەک (Haruki Murakami، Fukuzawa Yukichi، Matsuo Bashō، Yosa Buson و...) کە کۆمەڵێک ژانر و شێوازی بەرفراوانی

ئەدەبی وەک: شیعر، ڕۆمان، کورتەچیرۆک، شانۆنامە و وتاریان لە کۆنەوە تا ئێستە بەرهەمهێناوە، کە ڕەنگدانەوەی زەمینە کەلتووری و کۆمەڵایەتی و مێژووییە ناوازەکانی ژاپۆنن. ساڵانە چەندین فیستیڤاڵی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە شارەکانی (تۆکیۆ، ئوساکا، کاماکورا و ...) بەڕێوەدەچن و لە چەندین فیستیڤاڵی وەک (Tokyo International Literary Festival، Osaka Literature Festival، Kamakura Literature Festival و...) خوێندنەوەی کتێب و شیعر و هونەر و پاژەکانی تری ئەدەب گرنگیی پێدەدەن، ئەم فیستیڤاڵانە کۆمەڵێک ئەزموونی ئەدەبی جۆراوجۆر پێشکەش دەکەن، لە ئەدەبیاتی نەریتییەوە تا ژانرە هاوچەرخەکان، کە ڕەنگدانەوەی کەلتوری ئەدەبی دەوڵەمەند و پەرەسەندنی ژاپۆنە.

ئەمریکا ڕۆشنبیریی ئەدەبیی هەمەچەشنی هەیە لەگەڵ نووسەرانی وەک (مارک توین، تۆنی مۆریسۆن، ئێرنست هێمینگوای) و نووسەرانی تری هاوچەرخ کە بەدوای کۆمەڵێک بابەت و شوناسی ڕۆشنبیرییدا دەگەڕێن.

لەڕێگەی فیستیڤاڵەکانی وەک (National Book Festival، Chicago Humanities Festival، New Orleans Literary Festival و...) خوێندنەوە و گفتوگۆی ئەدەبی و پانێل بەڕێوەدەچیت و کۆمەڵێکی زۆر لە نووسەر و ئەدیب و شاعیر و وێنەکێش لە شارەکانی وەک: نیویۆرک و سانفرانسیسکۆ و لۆس ئەنجلۆس و... تێدا بەشدارن و کەڵچەری ڕۆشنبیری ئەمریکایان بەنەمری هێشتوەتەوە و بونەتە جێی شانازی گەلانی ئەمریکا و جیهانیش.

ئەدەبیاتی فەرەنسی ئاماژەیە بۆ بەرجەستەیی بەرهەمەنووسراوەکان کە بە زمانی فەرەنسی بەرهەمهێنراون، کە کۆمەڵێک ژانر و شێوازی بەرفراوان لە سەردەمی سەدەی ناوەڕاستەوە تا ئێستا لەخۆدەگرێت وەک: ڕۆمان، شیعر، شانۆنامە، وتار و بەرهەمی فەلسەفی و... کە ڕەنگدانەوەی مێژووی کەلتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی فەرەنسان. لە ڕێگەی نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیرەکانی وەک: ڤیکتۆر هوگۆ، زۆلا، بۆدلێر و ڤلیری و...)وە بەشدارییەکی بەردەوامیان لە ئەدەبیاتی فەرەنسی و جیهانیدا کردوە، بە شێوازی داهێنەرانە و تەوەرە قووڵەکانیان دیمەنی ئەدەبییان لە قاڵب داوە. هەروەک فیستیڤاڵە ئەدەبیەکانی وەک (Festival d›Avignon، Le Livre sur la Place، Salon du Livre de Paris و...) مەکۆی زیندوون بۆ خوێنەران و نووسەران و ئارەزومەندانی ئەدەب و هەل

دەرەخسێنن بۆ ئەوەی ڕۆشنبیران پەیوەندی بە ئەدەبەوە بکەن و بگەڕێن بەدوای ژانەر و تەوەرە ئەدەبییە جیاوازەکاندا.

بە خوێندنەوەی ئەو نموونانەی سەرەوە ئەوە دەوروژێنین کە گەشەپێدانی شارێک لە ڕێگەی ئەدەبەوە، بریتییە لە پێشخستنی ڕۆشنبیریی ئەدەبی و پاڵپشتیکردنی نووسەران و تێکەڵکردنی ئەدەب لەگەڵ پەروەردە و فەزای گشتیدا.

کەلار، شارێکی باشووری کوردستانە و لەسەر ڕووباری سیروان هەڵکەوتوە، شارێکی نوێیە و هەتا ناوەڕاستی حەفتاکان لادێ بوە و سروشت و ستراتیژی و هەڵکەوتەی جوگرافی شارەکە وایکردوە زوو فراوان ببێت و وەپێش بچێت، هەروایش بوە و بەتایبەت لەو ماوە کەمەی تەمەنی بەقەزابوونی زۆر فراوانبوە و خزمەتگوزاری زۆری تێدا دەبینرێت، بەڵام ئەوەی جێی تێڕامانە هێشتا دۆخی ڕۆشنبیریی ئەم قەزایە لە ئاستی چاوەڕوانی ئەدیبەکانیدا نییە.

ئەم وتارەی ئێمە لەگەڵ وەڵامدانەوەی ئەوەی (چۆن گەشەپێدانی ڕۆشنبیریی شار لەڕێگەی ئەدەب و هونەرەوە پێشکەوێت) هەوڵیداوە چەند خاڵی ورد، لەمەڕ خزمەتکردنی شارەکە و پەروەردەکردنی کۆمەڵگایەکی ئەدەبی کە لە ڕێگەی ئەدەبەوە خزمەت بە شارەکە بکات، شێواز و ستراتیژی پەروەردەکردنی کۆمەڵگەیەکی خوێنەر و نووسەر، پێشخستنی چالاکییە ئەدەبییەکان و تێکەڵکردنی ئەدەب لە پەیکەری کولتووری و پەروەردەیی شارەکەدا بخاتەڕوو. لە گرنگترین ئەو پێداویستیانەی کە ئەم ستراتیژیە دێنێتە بوون:

### دامەزراندنی یانە و کۆمەڵگەی ئەدەبی

لەکەلار چەند ناوەند و گرووپی ڕۆشنبیریی هەن، کە ناوبەناو خزمەت بە بوارەکە دەکەن. ئەم ناوەند و گرووپانە پەیوەندی کارکردن و چالاکیی هاوبەشی هەمیشەییان پێکەوە نییە. بۆیە شارەکە پێویستیی بە کۆمەڵگەیەکی ئەدەبییە کە کۆمەڵێک ئەندامی هەمەچەشنی تێدابێت، لەوانە: نووسەر، شاعیر، پەروەردەکار، خوێندکار، ئارەزومەندانی ئەدەب.

گرنگە کۆمەڵگەکە ببێتە شوێنی پەسنی جیاواز و ئەرک و دیدێکی روون بۆ کۆمەڵگە، گرنگیی بدات بە بەرەوپێشبردنی ئەدەب، داهێنانی ئەدەبی، پشتگیریکردنی قەڵەمەنوێیەکان، خزمەتکردنی کۆمەڵگە.

## ڕێکخستنی بۆنە ئەدەبیەکان

کەلار، چەندین قەلەمی جوانـوس و ڕەخنەگر و ئەدیبی بیرتیژی تێدایە. پێویستە گرنگیی بەمانە بدرێت بە میوانداریکردنی بەردەوام بۆ خوێندنەوەی شیعر، ڕانانکردن و ناسینی کتێب، نمایشی ئەدەبی لە شوێنە جیاوازەکانی دەوروبەری شارەکەدا، ڕێکخستنی فیستیڤاڵی ئەدەبیی ساڵانە بۆیان. هەروەک گرنگە کاتی چالاکییەکان ڕێکبخرێن و بەشێوەیەک بێت دووچالاکیی ڕۆشنبیریی لەیەک کاتدا نەبن.

## بەرەوپێشبردنی دەستپێشخەرییە ڕۆشنبیرییەکان

بۆ بەرەوپێشبردنی ڕۆشنبیریی تاک و کۆی ئاست و تەمەنە جیاوازەکان لە کەلار، پێویستمان بە ئەنجامدانی خولی بەردەوام و وۆرکشۆپی نووسین، سیمیناری ئەدەبی، پلانی بەردەوام بۆ گرووپە تەمەن جیاوازەکان (هەرزەکاران، گەنج، بەتەمەن)ەکان و پشتگیریی بەرزکردنەوەی ئاستی لێهاتوویی... هەروەک بەگرنگییەوە کاردن لەگەڵ قوتابخانەکان و پەیمانگە و زانکۆکان بۆ ناساندنی بەرنامەی ئەدەبیات، یانەکانی خوێندنەوە و بەرهەمهێنانی نووسینی داهێنەرانە.

## ئاسانکاری بۆ دەستڕاگەییشتن بە سەرچاوەی ڕۆشنبیری

کارکردن لەگەڵ کتێبخانە ناوخۆییەکان بە ڕانانکردن و ناساندنی کورتەی کتێبەکانیان (چاپکراوەکانی تر) و دانانی ناو و زانیاری کتێبەکان لە پلاتفۆرمەکانی بڵاوکردنەوە، بەگرینگییەوە ئەم دەستڕاگییشتن بە سەرچاوە ڕۆشنبیرییانە کاری بۆ بکرێت و لەڕێگەی تیمەوە هانی دایکان و باوکان بدرێت بەپێی تەمەنە جیاوازەکان سوود لەو سەرچاوانە وەربگرن بۆ نەوەکانیان. هاوکات هاندان بۆ پەرەپێدانی ماڵپەڕ و ئەکاونتی سۆشیال میدیا بۆ هاوبەشکردنی سەرچاوە و زانیاری لە نێوان خوێنەراندا.

## خوێندنەوە لە گەڕەکەکانی شاردا

لەڕێگەی تیمی گەڕۆکی باوەڕپێکراو، دامەزراندنی یانەی کتێب (گەڕۆک) لە گەڕەکە جیاوازەکاندا بۆ هاندانی خوێندنەوە و گفتوگۆکردن لەسەر ژانرە ئەدەبییە جیاوازەکان لەگەڵ پیاوان و ژنان و منداڵ و گەنجانی گەڕەکەکان بەپێی پێویستی سەردەم و شیارکردنەوەیان. هەروەک دەستپێکردنی پرۆژەی ئەدەبی لەگەڵ هاوڵاتیانی گەڕەک لەسەر بنەمای وشیارکردنەوە، وەک کۆڕی شیعری، شیکردنەوەی پرسە ڕۆشنبیرییەکان، دانیشتن بۆ گێڕانەوەی چیرۆکە حیکمەتئامێزەکان...

پشتیوانیکردنی نووسەران و شاعیرانی ناوخۆیی

کەلار، خەڵکی دڵپاک و لێهاتوو و خواستی نووسینیان زۆرە، بەتایبەتی لەلای چینی گەنجان، بەڵام دەرفەتی باش نییە بۆ پشتیوانیکردنی ئەو نووسەرانە بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان و ناساندنیان، بۆیە زۆر گرنگە دابینکردنی سەکۆیەک بۆ نووسەرانی شارەکە بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان، وەک ڕۆژنامە، ئەنتۆلۆژیا، و گۆڤاری ئۆنلاین. چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی و دەرکەوتن لە سۆشیال میدیا و میدیای نوێ. هەروەک دروستکردنی تیمێک بۆ ڕاهێنەرایەتی نووسەرانی تازەپێگەیشتوو لە نووسیندا بەپێدانی ڕێنمایی و پشتگیری و هاوکاریکردنیی مادییان.

## هاوبەشی و کارکردن بە تیم لەنێوان دامەزراوە ڕۆشنبیریی و هونەریی و ئەدەبییەکان

لە کەلار دەزگا و دامەزراوەی ڕۆشنبیریمان هەیە، بەڵام پەیوەندییەکی گەرموگوڕ لە نێوان ئەو دەزگایانە و خەڵکە ڕۆشنبیرەکەدا نییە، کاری پێکەوەیی نابینرێت، هەر شوێن و گرووپ و ناوەندێک بە تاکلایەنی کاری ڕۆشنبیریی دەکەن , گەرچی کەمیشە و جێی پیزانینە. بۆ ئەوەی برەوی زێدەتر بە بواری ڕۆشنبیریی بدرێت، پێویستە بەشێوەی تیم و هاوبەشی کاربکرێت لەگەڵ کتێبخانەکان، ناوەندە پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییەکان، سەنتەر و گرووپ و بەڕێوەبەرایەتییە ڕۆشنبیریی و هونەرییەکان... هەروەک ڕێکخستن و سازدانی پێشانگەی هاوبەش کە تیشک بخاتە سەر بەرهەمی ئەدەبیی و کاری هونەریی و گرنگیی کەلتووری ئەم شارە دەربخات.

## هاندانی بەشداریکردن و گفتوگۆی ڕۆشنبیریی گشتی

ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە مۆدێلیکی نوێی ڕۆشنبیری بێنینە بوون لە کوڕوکۆبوونەوەکان کە خزمەتی دیار و ڕوونی بواری ڕۆشنبیری شارەکە بکات. هەتا ئێستە کۆبوونەوەکان هەر ئەوەن کە کۆڕگێڕێک وتەی پێشکەش دەکات و دواتر قسەکەرەکە (کان) قسەی خۆیان دەکەن و لەکۆتاییدا زۆر بەکەمی گفتوگۆ لەسەر ناوەڕۆکی بابەت دەکرێت... بۆ ئەوەی خزمەتی زیاتر بۆ بواری ڕۆشنبیریی گشتی بێنینە بوون، واباشترە هاوشانی ئەو کۆبوونەوانە؛ دیبەیتی ئەکادیمی، ڕێکخستنی گفتوگۆی گشتی، پانێڵ، و کۆبوونەوەی پرسیار و وەڵام لەگەڵ نووسەران، شاعیران و ڕەخنەگرانی ئەدەبی و بەشداریکردنی کۆمەڵگە لە گفتوگۆی ئەدەبییدا سازبکرێت و هەموو ئامادەبوانی تێدا بەشداریی پێ بکرێت. هەروەک دەکرێت هەرجارە و گرفتێکی ئەدەبیی ناوچەکە بخرێتە بەرباس و چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە.

## میدیا و بڵاوکراوەکان

میدیای کۆن و نوێ، دەرفەتێکی زۆرباشە بۆ پشتیوانیکردن و هاوکاریکردن لە پێشخستنی بواری ڕۆشنبیریی ناوچەکە، لەکاتی چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان، جگە لە یەک-دوو کەناڵێکی تەلەفزیۆنی، ئیدی ئەوانی تر گرنگیی پێنادەن، بۆ ئەوەی بەرهەمە ئەدەبیی و ڕۆشنبیرییەکان خێراتر بگەن بە هاوڵاتیانی شارەکە، پێویستە میدیای کۆن لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤار و میدیای نوێ و بەتایبەت ئەو کەناڵانەی کە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کراونەتەوە لەناوچەکە، خزمەتی بواری ڕۆشنبیریی بکەن و بەبڵاوکردنەوە و چاوپێکەوتن و گفتوگۆی ئەدەبی لەگەڵ نووسەر و ڕۆشنبیرەکانی شاردا. هەروەک دەکرێت میدیا پشتیوان بێت بۆ بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی ئەدەبی یان ڕۆژنامەیەک کە بابەت و وتار و شیعر و چیرۆکی نووسەرانی ناوخۆیی تێدابێت.

## تێکەڵکردنی ئەدەب بە فەزای گشتی

بۆئەوەی هەمیشە سێبەری ڕۆشنبیریی بەسەرسەرمانەوە بێت، پێویستە ئەدەب وەک بنەچەی ڕۆشنبیریی شار لە فەزای گشتیی جێی بکرێتەوە، ناوی گەڕەکە نوێیەکان و باخچە و شەقام و خوێندنگە نوێیەکان ناوێکی ئەدەبی پرواتا بن، سەردیواری شوێنە گشتییەکان بە ناو و وێنە و وتەی کەسە ڕۆشنبیرەکانی کەلار برازێندرێتەوە، هەروەک لە نێو پارک و شەقامە گشتییەکان، شانۆیی لەبارەی بەڕۆشنبیربوونی کۆمەڵگەوە ئەنجامبدرێت.

## پارە و سپۆنسەری هەمیشەیی

یەکێک لەبەربەستە هەمیشەیی و گەورەکان لەبەردەم برەودان و خزمەتکردن بە بواری ڕۆشنبیریی ناوچەکە، نەبوونی هاوکاریی مادەییە بۆ بەڕێوەچوون و ئەنجامدانی کارە ڕۆشنبیرییەکانی کەلار. هەموو چالاکییەکان بۆ ئەنجامدان و بەردەوامبوون، پێویستیان بە هاوکاری مادییە، گەرچی زۆر بەکەمی ئەم هاوکارییە مادییە دەکرێت و وەک دەرهێنانی تیکەیە لە قورگی شێردا! بەڵام ئەمە جێگەی ڕەزامەندی ڕۆشنبیرانی شارەکە نییە، بۆئەوەی ئەم گرفتە چارەبکرێت و لەڕێگەیەوە بودجەی تایبەت بۆ سەرخستنی بواری ڕۆشنبیری بێتەبوون، پێویستە ڕێکخراوەکان و بازرگانەکان و حکومەت هاوکاربن بۆ ئەوەی مینحەی هەمیشەیی (سندوقی هاوکاری ڕۆشنبیری) بێتەبوون و پشتیوانی پرۆژە و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی شارەکەی پێ بکرێت.

## ئەنجام

کەلار، بە پەروەردەکردنی کەلتوورێکی ئەدەبیی زیندوو و ڕەخساندنی دەرفەت بۆ ئەنجامدانی ئیڤێنتە ئەدەبی و هونەرییەکان، دەتوانێت بەشدارییەکی بەرچاو لە ژیانی کولتووری و فیکری شارەکەدا بکات.

هێنانەبوون و پەروەردەکردنی کۆمەڵگەیەکی ڕۆشنبیر کە لە ڕێگەی ئەدەبەوە خزمەت بە شارەکە بکات، بریتییە لە هەمەجۆری لە ڕێکخستنی بۆنە و چالاکییە ئەدەبییەکانی وەک کۆڕ و سیمینار و دیبەیت و توێژینەوە و گفتوگۆکردن.

بۆئەوەی ئەمە بێتەدی، پێویستە حکومەتی خۆجێی پشتیوانییەکی تەواوی بەهرەمەندە ناوخۆییەکان بێت و هەلبڕەخسێنێت بۆ بەشداریکردنی کۆمەڵگە لە پرسە ڕۆشنبیریەکان، بەتایبەت لە دابینکردنی شوێن و پشتیوانیی مادییان بۆ بێنێتە بوون.

# دیدگایەک بۆ گەشەی کەلار
# لە (١٠) ساڵی داهاتوودا




سامان عەزیز

خوێندکاری دکتۆرا لە زانکۆی سلێمانی


*بەلەبەرچاوگرتنی گەشەی خێرای کەلار، بە تایبەت لە پاش ساڵی ٢٠١٠ەوە، وەک پێویستیەکی هەنوکەیی گرنگە ئەوانەی خاوەن کاریگەری و بڕیارن لەناوچەکە و حکومەتی خۆجێی بیر لە دانانی ستراتیژێک بۆ گەشە و پەرەپێدنی شاری کەلار بکەنەوە , بەمەرجێک بنەماکانی دارشتنی ئەم ستراتیژە تەبا بێت لەگەڵ پرەنسیپە زانستیەکانی سەردەم و پلانسازی شار و گەشەی بەردەوام کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ٢٠١٥ بۆ ساڵی ٢٠٣٠ وەک ستانداردی جیهانی پەرەپێدانی بەردەوام (Sustainable development goals) ناساندونی , بەتایبەت بەهەند وەرگرتنی خاڵی (١١) کە تایبەتە بە (Sustainable cities and communities). بە دڵنیایەوە , هەر گەشەکردنێک لەسەر بنەمای شیکردنەوەی زانستی و پلانی دوور مەودا نەبێت لە لایەن کەسانی پسپۆڕ و بە ئەزموونەوە، هیچ دڵنیاییەک نیە لە ئایندەدا بە پێی پێویست خزمەت بە دانیشتوان بکات.

ئەوەی لە ئێستادا تێبینی ئەکرێت هەر دەزگایەکی خزمەتگوزاری لە شاردا بەپێی ئەو سەرچاوانەی کە بەردەستن , سەرقاڵی پێشکەشکردنی خزمەتگوزارین لە بواری تایبەتمەندی خۆیاندا، بێ هەبوونی هەماهەنگی پێویست و پلانی تۆکمە کە گەشەی سەرجەم سێکتەرە گرنگەکان پێکەوە ببەستێتەوە و بە ئامار (data) و ڕێپیشاندر (indicator) بخرێتە ڕوو کە ئامانجەکان (objectives) چین و چۆن بەرەوەپێشچوونەکان ئەپێورێت.

مەبەست ئەوەیە، کەلار بەخێرای گەشە ئەکات , بەڵام ئایا ئەم گەشە کردنە لەسەر چ بنەمایەکە و هەنگاوەکانی دیراسەکراون و تەبان لەگەڵ بنەماکانی سەردەم، ئایا ئەو کێشانەی کە ئێستا هەن تاچەند و چۆن پلانی چارەسەریان بۆ دانراوە , بەلەبەرچاووگرتنی ئەو ڕاستیەی کە کەلار لە جوڵەیەکی بەردەوامی گەشەکردندایە، پێویستیەکی حەتمیە ئامانج و ئاراستەی ئەم گەشە کردنە هەڕەمەکی نەبێت و سەرجەم ئامانجە ئابوری و کۆمەڵایەتی و ژینگەییەکانی دیاریبکرێت، چونکە لە غیابی نەبونی ستراتیژدا، سەرمایەدار و کۆمپانیاکان بە پێی ویستی قازانج و بازاڕ وەبەرهێنان دەکەن , هەر ئەوان کۆنترۆڵی ئاراستەی گەشە دەکەن کە ڕەنگە ئەمەش یەکنەگرێتەوە لەگەڵ خواست و بەرژەوەندییەکانی شارەکە لە دە ساڵی ئایندەدا.

لە ئێستادا، لە زۆر وڵاتی پێشکەوتوودا گرنگیەکی زۆر دەدرێت بە حکومەتی خۆجێی , واتە (Local governance)، کە گرنگترین ئامانج لێی ئەوەیە کە هەموو شارێک بتوانێت بە شێوەیەکی سەردەمیانە ئیداری خۆی بکات , هەروەها بتوانێت سەرچاوەکانی بە شێوەیەکی کارا بەکاربهێنێت بۆ گەشەی ناوچەکەی خۆی , لەهەمانکاتدا سەنتەر و ئامانجی سەرەکی گەشەکردن و پەرەپێدانی ئابوریەکی یەکسان و پاراستنی ژینگە و بە دروستی بەکارهینانی ئەو توانا مرۆیی و سروشتییانە بێت کە لە ناوچەکەدا هەن.

ئیدارەی گەرمیان وەک ئیدارەی باڵا و خاوەن بڕیار, ڕۆڵێکی ئێجگار گرنگی هەیە لە دارشتنی ئەم ستراتیژەدا، بێگومان لەهەمانکاتدا هەماهەنگی سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکانی تریش گرنگە بەشداربن , لەوانە: سەرمایەداران و خاوە بزنسەکان، بەڕیوەبەرایەتیە گشتییەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، کەسانی پسپۆڕ و بە ئەزموون و زانکۆ و پەیمانگە و ناوەندە ئەکادیمییەکان.

بۆ ئەوەی ستراتیژێکی دوورمەودات هەبێت بۆ دە ساڵی ئایندە , پێویستە گەشەی سەرجەم سێکتەرەکان لەبەرچاوبگیرێت و بە شێوەیەکی هارمۆنی هاوسەنگ بێت , لەگەڵ پێداویستی و گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی دانیشتوان لە ناوچەکە , لەهەر یەک لە سێکتەرەکانی خانووبەرە، ژێرخانی ئابووری وەک پرد و ڕێگاوبان، پیشەسازی و بەرهەمهێنان، کشتوکاڵ و ئاودێری، ژینگە و گەشتیاری، بەڕێوەبردنی ئاو و بەنداو , وەک کۆڵەکەیەکی گرنگ لە گەشەی کەلار، بە تایبەت لە ڕووی ئابوورییەوە، پێویستە کەرتەکانی ئابوری هاوسەنگ بکرێت، بۆ نمونە ئەوەی تێینی دەکرێت گەشەی سێکتەری نیشتەجێبوون زۆر خێرایە ,

ئاشـکرایە ئەمـەش هۆکارەکـەی بـڕی قازانجـی زۆری وەبەرهێنـەرە لەماوەیکـی کەمـدا بـە وەرگرتنـی زەوی بـێ بەرامبـەر و بوونـی کەمتریـن ریسـک لـە شکسـتی پـرۆژە , بەبـەراورد لەگـەڵ سـەرمایەگوزاریکردن لـە سـێکتەرەکانی تـری ئابـووری , بـۆ گەرەنتیکردنـی گەشـەی هاوسـەنگی ئابـووری , پێویسـتە کاربەدەسـتان و خـاوەن بڕیارەکانـی حکومەتـی خۆجێـی , جەخـت لـە پلانێکـی تۆکمـە بکەنـەوە بەمەبەسـتی ئاسانکاری و زەمینەسـازی وەبەرهێنـان لـە کەرتـە گرنگەکانـی تـر , کـە زۆرتریـن هەلـی کار بـۆ گەنجـان دەڕەخسـێنن و لەبەرامبەریشـدا پێویسـتییەکانی خەڵـک دابیـن دەکات، لەوانـە دامەزراندنـی کارگـە پیشەسـازییەکان، پیترۆکیمیـاوی، پیشەسـازی خۆراکـی، بەرهەمهێنانـی کشـتوکاڵی بەسـەرجەم بەشـەکانی کێڵگەیـی و ئاژەڵـی و باخـداری , لەسـەرووی هەمووشـیانەوە پیشەسـازی خۆراکـی، هەروەها گرنگـە لـە ڕووی گەشـەی مرۆییشـەوە گرنگـی بـە کردنـەوەی زانکۆیەکـی تایبـەت بدرێـت , بـەڵام ئاسـتی زانسـتی ھای کوالێتـی بێـت و سـەنتەری پەرەپێدانـی توانا مرۆییەکانیش گرنگی تایبەتـی هەیـە بـۆ بەرزکردنـەوەی توانـای مرۆیـی و بـەهرەی گەنجـان و فەرمانبـەران کـە داینەمـۆی گەشـەکردنی ئیدارە و پتەوکردنـی ئـەدای دامـەزراوە حکومـی و ناحکومییـەکان بێـت.

بـۆ بەگەڕخسـتنی ئابوریەکـی گەشـە کـردوو , لەسـەر بنەمـای پـلان و زیادکردنـی کارامەیـی توانـای حکومـەت (Government performance and efficiency) زۆر گرنگـە کەسـانی پسـپۆڕ و خـاوەن ئەزمـون و لێهاتـوو و پێشـەنگ بهێنرێنـە پێشـەوە بـۆ جێبەجێکردنـی پلانـی مەبەسـت، سـەرەتای هەمـوو گۆڕانکاریەکـی ئەرێنـی بـە دانانـی کەسـانی لێهاتـوو دەبێـت , دواتـر پـلان و بەگەڕخسـتنی توانـا و سـەرچاوەکان بۆ بەدەسـتهێنانی ئـەو دیدگایـەی کـە دانـراوە.

گومانـی تێدانیـە کـەلار , وەک هەڵکەوتـەی جوگرافـی , شـوێنێکی سـتراتیژیە و لەیـەک کاتـدا خاڵـی بەیەکگەیشـتنی وڵاتـی ئێـران و عێـراق و هەرێمـی کوردسـتانە، لـە لایەکـی تریشـەوە، پـردی بەسـتنەوەی عێـراق و هەرێمـی کوردسـتانە , بـەهۆی بەسـتنەوەی کـەلار بـە کەرکـوک و دیالـە و سـەلاحەدین و بەغـدادوە , لـە هەمـان کاتـدا پەیوەندیەکـی پتـەو لـە نێـوان کـەلار و پارێزگاکانـی هەرێمیـش هەیـە بـە تایبـەت سـلێمانی و هەولێـر، بـەڵام بـە داخـەوە گەورەتریـن ڕێگـری لـە گەشـەی کـەلار , نەبوونـی ڕێگاوبانـی گونجـاو و سـەلامەتە، چونکـە ڕێگاوبـان سـەرباری ئـەوەی یەکێکـە لـە ژێرخانـە گرنگەکانـی وڵات، شـادەماری گەشـەی ئابـووری و کۆمەڵایەتیشـە , زۆرێـک لەوانـەی کـە شـیکردنەوە بـۆ گەشـەی شـار دەکـەن , سـێ بنەمـای

پێویست وەک پێش مەرج دەخنە روو، کە ئەوانیش بریتین لە: هەبوونی ڕێگاوبان، سیستەمی بانکی پێشکەوتوو و سەرچاوەی ئاو و بەنداو، زۆرێک لە شارەزایانی ئابووری , گەشەی خێرایی ئەمریکا لە رووی ئابوورییەوە لە سەد ساڵی ڕابردوودا دەگەڕێننەوە بۆ ئەو سێ هۆکارەی کە باسکران.

یەکێکی تر لەو لایەنانەی کە پێویستە لەگەشەی کەلاردا بە وردی ڕەچاو بکرێت , بابەتی کەمبارانی و سەرچاوەکانی ئاوە لەشارەکەدا، بە پێی ڕاسپاردەکانی لوتکەی کەش و هەوا لە گلاسکۆ لە ساڵی ٢٠٢١ , عێراق بە پێنجەم وولات دیاریکرا لە بەرانبەر لێکەوتە خراپەکانی گۆڕانی کەش و هەوا، بێگومان پشکی گەورەی ئەم کاریگەرییە خراپە دەکەوێتە ناوچاکەنی نیمچە ووشک (semi-arid) و کەمباران لە عێراقدا , کە ناوچەی گەرمیان لەم ساڵانەی دواییدا زیاتر هەست بە لێکەوتە نەرینیەکانی گۆڕانی کەش و هەوای تێدا دەکرێت , بۆیە زۆرپێویستە گرنگیەکی تایبەت بە بابەتی بەڕێوەبردنی ئاو بدرێت و ئەو بەنداوانەی کە پلانی دروستکردنیان هەیە جەخت لە دروستکردیان بکرێتەوە , چونکە ئاو گرنگترین سەرچاوەیە بۆ ئاوەدانی و گەشەی ئابووری و پەرەپێدانی بەردەوام.

# کێشە تەندروستی و ژینگەیەکانی گەرمیان
## کەلار بە نموونە



د. هیوا ڕەشید
مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان

لەم ووتارەدا دەمەوێت ئاماژە بە چەند ئاریشەیەکی سەرەکی و هەستیار بکەم پەیوەست بە ژیانی هەر تاکێکەوە، کە بریتیە لە دۆخی تەندروستی و ژینگەی لە سنوری ئیدارەی گەرمیان, قەزای کەلار بەنموونە.

### مافە تەندروستی و ژینگەییەکان لە دەستوردا دانی پێدانراوە

لێرەدا ئەوە بیری خوێنەری بەڕێز دەخەمەوە، بوونی تەندروستیەکی باش و دابینکردنی ئامرازەکانی خۆپارێزی و چارەسەری پزیشکی بە مافی مرۆڤ دانراوە بە پێی دەستوری عیراق (مادەی ٣١، بڕگەی یەکەم) , هەموو تاکەکەسێک مافی چاودێری تەندروستی هەیە، دەوڵەت دەبێت تەندروستی گشتی بپارێزێت، ئامرازەکانی چاودێری و چارەسەری پزیشکی بۆ دابین بکات لە ڕێگەی بنیاتنانی نەخۆشخانە و دامەزراوەی تەندروستی , لە لایەکی تر بە هەمان شێوە مافی ژینگەیەکی سەلامەت و خاوێن بە هەمان شێوە وەکو مافی مرۆڤ لە دەستوری عێراق دانی پێدانراوە، (مادەی ٣٣، بڕگەی یەکەم)، دەوڵەت بەرپرسیارە لە پاراستنی ژینگە و هەمە چەشنی زیندەوەران (م٣٣، ب٢).

بۆیە بوونی گرفتی تەندروستی و ژینگەیی دەبنە هۆی پێشێلکردنی مافە تەندروستی و ژینگەییەکان، دەسەڵاتی کارگێڕی ناوچەکە بەرپرسیارن کار لە سەر نەهێشتن یان کەمکردنەوەی ئەم گرفتانە بکەن، چونکە بوونی دامودەزگا حکومیەکان تەنها بۆ مەبەستی خزمەتکردنە بەخەڵک، لێرەدا بە کورتی ئاماژە بە چەند ئاریشیەکی تەندروستی و ژینگەیی لە شاری کەلار دەکەین.

## ئاریشە تەندروستییەكان

گومانی تێدا نیە ژمارەی دانیشتوانی كەلار بەرەو فراوانی و گەشەسەندنی بەردەوام هەنگاو دەنێت، بە پێی هەندێك داتای نافەرمی ژمارەی دانیشتوانی كەلار نزیك بۆتەوە لە ٢٥٠ هەزار كەس، بوونی دامودەزگای تەندروستی و نەخۆشخانەكان لە قەزای كەلار پێویستە لە ئاستی قەبارەی ناوچەكە بێت , ئەوەی ئێمە بەردەوام دەیبیستین و دەیبینین كەرتی تەندروستی لە گەرمیان و قەزای كەلاریش لە ئاستی پێویست نیە، روبەرووی چەندین ئاستەنگ بۆتەوە , لەوانە نەبوونی نەخۆشخانەیەكی مۆدێرن و پێشكەوتوو، نەبوونی نەخۆشخانەی منداڵان، نەبوونی دەرمانی پێویست بۆ هەموو نەخۆشێك، كەمی هەندێ لە ئامێرەكانی پشكنین و پزیشكی.

بە پێی راپۆرتێك لە ٢٨ی ئایاری ٢٠٢٤ لە سایتی دەنگ نێت بڵاوكراوەتەوە، باس لەوەكراوە بۆ ماوەی زیاتر لە دوو مانگە بەشی تیشكی (MRI) لە دەوامی بەیانیانی سەنتەرەكە كارەكانی وەستاوە، بە پێی قسەی بەڕێوەبەری سەنتەرەكە بە هۆی نەبوونی پێداویستی و كەرەستەوەیە.

لە لایەكی تر بۆ سەلماندنی لاوازی كەرتی تەندروستی لە گەرمیان و قەزای كەلار لە ٢٣ی ئایاری ٢٠٢٤ راپۆرتێكی رۆژنامەوانی ئامازەی بە لێدوانێكی رەفیق قادر، بەرپرسی كردە پزیشكیەكان لە بەرێوەبەرایەتی تەندروستی گەرمیان كردوە، وتویەتی لە ماوەی چوار مانگی رابردوودا ٥١٥ نەخۆش لە كەلارەوە رەوانەی نەخۆشخانەكانی سلێمانی كراون، هەروەها لەناو شاری كەلار ٥٠ حاڵەت گوازراونەتەوە بۆ نەخۆشخانە تایبەتەكان بۆ چارەسەری پێویست , ئەمە تەنها ئەو داتانایە تۆمار كراون، دڵنیام چەندین نەخۆشی و حاڵەتی رۆژانە هەیە راستەوخۆ هاوڵاتی دەنێردرێت بۆ نەخۆشخانە بە بێ وەرگرتنی چارەسەر یان مانەوە لە نەخۆشخانەی حكومی، دەیان هاوڵاتیش راستەخۆ روو لە نەخۆشخانە تایبەتەكان دەكەن، لە راستیدا ئەو فشارە دەبینرێت لە نەخۆشخانە تایبەتەكان، سەرەرای ئەوەش چەندین گلەی و تێبینی و كەموكورتی دەبینین لە نەخۆشخانە تایبەتەكانی كەلار بە تایبەتی لە رووی گرانی نرخی چارەسەركردن و خزمەتگوزاریەكان.

## پرسی ژینگە

پرسێکی تر پرسی ژینگەیە، کەلار بێ بەش نیە لەو ئاستەنگ و ئاریشانەی دروست بوون و بوونەتە مایەی مەترسی بۆ ژینگەی ئەم شارە ، وەکو گرفتی خراپ بەڕێوەبردنی پاشماوەکان، گرفتی مۆلیدە ئەهلیەکان، کەمی ڕێژەی سەوزای، نەبوونی پلان و ستراتیژی بۆ پاراستنی ڕووباری سیروان و هێشتنەوەی وەکو سییەکان بۆ جەستەی شاری کەلار و گەرمیان بە گشتی، پاراستنی هەمەچەشنی زیندەوەران لە نزیک ڕووبارەکە.

## خراپ بەڕێوەبردنی پاشماوەکان

سەبارەت بە پاشماوەکان تاکو ئێستاش شێوازی ژێرخاککردن بەکاردێت، ئەمەش ڕێگەیەکی کۆن و نازانستی و زیان بەخشە ، بە پێی ڕاپۆرتێکی سایتی دەنگ نێت (لە بەرواری ١ی ئایاری ٢٠٢٤ بڵاوبۆتەوە) لە زاری بەرزان فایەق– سەرۆکی لیژنەی کۆکردنەوەی خۆڵ و خاشاک لە گەرمیان، لە گەرمیان ڕۆژانە ٣٩٠ بۆ ٤٢٠ تۆن پاشماوە ژێرخاک دەکرێت، لەم ڕێژەیە نزیکەی ٢٠٠ تۆنی ڕۆژانە پاشماوەی سنوری کەلارە ، مانگانە ٦٠٠٠ هەزار تۆن و ساڵانەش دەکاتە ٧٢٠٠٠ تۆن، ئەمانەش بەبێ هیچ چارەسەرێکی زانستی ژێر خاک دەکرێن ، ئەم شێوازەش زیانی ژینگەیی هەیە بۆ خاک و ئاوی زەوی و تەنانەت هەندێ جار ئاگردەگرێت و دوکەڵ و بۆنی پیسی هەیە، ئەم دۆخەش زۆر مەترسیدارە بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشیە ترسناکەکان وەکو شێرپەنجە ، بەهەمان شێوە پرسی خراپ بەڕێوەبردنی پاشماوە پزیشکیەکانیش جارێکی تر گرفتی گەورەی ژینگەی و تەندروستین بۆ خەڵک، پێویستە تێکەڵی پاشماوەی ئاسایی نەکرێت، دەبێت بە ئامێری پێشکەوتوو لە ناوببردرێت.

## مۆلیدەکانی کەرتی تایبەت

مۆلیدە ئەهلیەکان لە گەرمیان و لە شاری کەلار , دیسان مایەی نیگەرانین بۆ هاوڵاتیان، چونکە دەبنە هۆی پیسکردنی ژینگە ، وەکو پیسکردنی هەوا، بە هۆی دوکەڵ ئەویش لە ئەنجامی خراپی کواڵێتی گازی بەکارهاتوو، دەبنە هۆکاری پیسکردنی خاک و فرێدانی پاشماوەی شلی وەکو ڕۆنی ڕەش و گاز و پیسکردنی خاکی نزیک لە مۆلیدەکە، تەنانەت مەترسی بۆ سەر ئاوی ژێر زەویش هەیە لە کاتی بارانبارین، لەلایەکی تر مۆلیدەکان بەزۆری دەنگیان بەرزە و ژاوەژاو دروست دەکەن، لە بەرامبەر ئەم سەرپێچیانە لایەنی پەیوەندیدار وەکو قایماقامیەت و لیژنەی سەرپەرشتیار وەکو پێویست چاودێریان ناکەن،

و نەیانتوانیوە سەرپێچیە ژینگەیەکانیان نەهێڵن یان بۆ ئاستێکی باش کەمی بکەنەوە , ئەوەی جێگەی نیگەرانیە بە پێی وتەی (د. دوریەد سەلیم) بەڕێوەبەری فەرمانگەی ژینگەی گەرمیان «ئەم مۆلیدانە هیچ ڕەزامەندیەکی ژینگەییان نیە»، بەڵام بە پێی ڕێنمایە ژینگەیەکان وەکو ڕێنمای ژمارە ٢ی ساڵی ٢٠٢٣ تایبەت بە بەدواداچوون و بەرزفتکردنی سەرپێچیە ژینگەیەکان، لە دەستەی پاراستن و چاککردنی ژینگەی هەرێم دەرچووە، چەند سزایەکی پێبژاردنی بۆ مۆلیدەی گەڕەکەکان داناوە لە کاتی سەرپێچی دەسەپێنرێت، بۆ نموونە لە کاتی نەبوونی سەوزای یان لە بری سەوزی نەکردن , ئەوا بڕی ٣٠٠ بۆ ٥٠٠ هەزار دینار پێبژاردنی بۆ دەکرێت، ئەگەر ژاوەژاوی هەبێت بڕی ٥٠٠ هەزار سزادەدرێت، ئەگەر دوکەڵی هەبێت بڕی یەک ملیۆن بۆ ملیۆن و نیوێک سزادەدرێت، ئەگەر زەویەکەی کۆنکرێت نەکرابێت ئەوە بڕی ٥٠٠ هەزار سزادەدرێ، ئەگەر دیوار نەکرابێت ئەوە بە بڕی یەک ملیۆن، بۆنی پیس وەکو ڕۆن و گازوایل ئەوا بە بڕی ٥٠٠ هەزار بۆ یەک ملیۆن سزادەدرێت، ئەگەر چی ئەم سزایان ڕەنگە پێویست بکات زیاتر بکرێن لە رووی داراییەوە، بوونی سزای نادارای وەکو داخستنی مۆلیدە و لێسەندنەوەی مۆڵەتیش کاریگەرن , ئەگەر بەکاربێت لە کاتی دووبارەکردنەوەی سەرپێچیە ژینگەیەکان , بۆیە هیچ بیانوویەک نیە فەرمانگەی ژینگە ڕۆڵی نەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم پێشێلکاریە ژینگەیانە لە شاری کەلار و شار و شارۆچکەکانی تری گەرمیان.



## گرفتی بەڕێوەبردنی سێکتەری ئاو

بەڕێوەبردنی ئاو لە گەرمیان و کوردستانیش هێشتا لە ئاستێکی زانستی و گەشەسەندووی بەردەوام نیە (Sustainable water management) , ئاو وەکو سامانێکی سروشتی مافی نەوەکانی ئێستا و داهاتووشە، بۆیە پێویستە بە شێوەک سودی لێ وەربگرین لە داهاتوودا نەوەکانی دوای ئێمەش بتوانن سودی لێ وەربگرن , لەلایەکی تر بەڕێوەبردنی ئاو لە گەرمیان و قەزای کەلار بەتایبەت یەکێکی ترە لە ئالەنگاریە ژینگەیەکان دەکرێت مەترسی تەندروستیشی لێ بکەوێتەوە، بوونی رووباری سیروان و تێپەڕینی بە تەنیشتی شارەکە دەکرێت سودی گەورەی کۆمەڵایەتی و ئابوری هەبێت، بەڵام یەکێک لە ئالەنگاری یان ئاریشەکان لە ماوەی ڕابردوو رووبارەکە تووشی بویەوە , بریتی بوو لە کاریگەری خراپی کارگەکانی چەو و لم لە سەر رووباری سیروان و سروشتەکەی،

هەرچەندە لە کۆتای ساڵی ٢٠٢١ ئیدارەی گەرمیان بەهەوڵی ژینگەپارێزان و چالاکوانان توانرا سنورێک بۆ ئەم پێشێلکاریانەی ئەو کارگانە دابنرێت، لە ئەنجامی قەدەغەکردنی غەسلەکان و تەنها ڕێگەدان بە کەسارە، ئەم هەنگاوەش تا ڕادەیەک ئەرێنی بوو، چونکە غەسالەکان کاریگەری نەرێنی و زیان بەخشیان بۆ ژینگەی ڕووبارەکە دروست دەکرد، بۆیە ئەو هەنگاوە جێگەی دەستخۆشی بوو , بەڵام ئەم دڵخۆشیە زۆری نەخایاند کاتێک خاوەن کارگەکان فشاریان دروست کرد و حکومەتیش ئاسانکاری بۆ کردن، لە ڕێگەی ئیدارەی گەرمیان لە بەرواری ٨ی شوباتی ٢٠٢٤ جارێکی تر بڕیاری تازە دەرکران بۆ ئەو کارگانەی چەو و لم، بڕیارەکە ڕێگە بە بەکارهێنانی کەسارە کەمدەکاتەوە بۆ نیوە و نیوەکەی تریش دەکرێت غەسالە بەکاربێت، بۆیە ئەم بڕیارە لەلایەن شارەزایانی ژینگە بەمەترسی وەسف دەکرێت بۆ سەر ژینگەی ڕووبارەکە. لەلایەکی تر چاودێری و بەدواداچوون وەک پێویست نیە لە لایەن ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتی نەوت و کانزاکانی گەرمیان بۆ کار وچالاکی غەسالە و کانەکانی چەو و لم لە نزیک ڕووبارەکە، فەرمانگەی ژینگەش هیچ ڕۆڵێکی یاسایی نیە لەم بابەتە، تەنها دەتوانێت چاودێر بێت و توانای ڕووبەڕوو بوونەوەی دەستدرێژیەکانی نیە بۆ سەر ژینگەی ڕووبارەکە.

دەست گەیشتن بە بڕی پێویست لە ئاوی خاوێن وەک مافی مرۆڤ بۆ هەر تاکێک دانی پێدانراوە، لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان و زۆر دەزگا و ڕێکخراوی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ , قەزای کەلار پشت بە دوو سەرچاوە دەبەستێت بۆ ئاوی خواردنەوە، ئەوانیش بریتین لە ڕووباری سیروان و بیری ئیرتیوازی , بە وتەی (سامان رحیم)، بەڕێوەبەری بەڕیوەبەرایەتی ئاوی کەلار، زیاتر لە ٦٠ بیری ئیرتیوازی لە نێو گەڕەکەکانی کەلار بوونی هەیە بۆ دابەشتکردنی ئاوی ماڵان، بەگشتی بەڕێژەی ٤٠٪ پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەسترێت، بۆ دابین کردنی ئاوی ماڵان , لەلایەکی تر بۆ ئاودانی باخچەکانیش ئاوی بیر بەکاردێت، بە پێی ئامارەکانی بەشی باخچەکان لە شارەوانی کەلار، ١٦٥ باخچە لە قەزای کەلار بوونی هەیە، لەو ڕێژەیە٥٠ باخچەیان ئاوی بیریان پێدەدرێت , لە ڕاستیدا سیستەمی ئاودانی باخچەکان پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە بۆ ئەوەی کەمترین ئاو بەکاربێت، دەکرێت پلان دابنرێت بۆ ئەوەی ئاوی بەکارهاتوو دووبارە فلتەر بکرێت و سودی لێ وەربگیرێت بۆ ئاودانی سەوزایی.

هەڵکەندنی بیری نایاسایی لە لایەن کارگەکان و هەندێ لە بازرگانان وەکو شوشتنگەی ئۆتۆمبێل و کارگەکانی ئاوی کانزای و هیتریش بۆتە مایەی نیگەرانی، هەرچەندە بە پێی رینمای ژمارە ١ی ساڵی ٢٠١٥ ئەو شوێنانە نابێت بیر لێ بدەن، پێویستە ئاوی سەر زەوی بەکاربهێنن ، بە پێی داتایەک لە سایتی دەنگ نێت بڵاوکراوەتەوە، لەگەرمیان زیاتر لە ١٦٠ کارگە هەیە ئاوی پاکی خواردنەوە بەکاردێنن کە زۆرینەیان ئاوی ژێر زەوین ، هەرچەندە ئاماری وورد و تازە بەردەست نیە، بەڵام بە پێی پێشبینی و ئاماری ئاوی ژێر زەوی گەرمیان، بیرە نایاساییەکان لە نێوان ١٠٠٠ بۆ ١٥٠٠ بیر دەبێت، لە کاتێکدا بیرە قوڵە یاساییەکان ژمارەیان دەگاتە ١٩٤٤ بیر ، بۆیە روبەروو بوونەوەی ئەم دەستدرێژیانەی دەکرێتە سەر ئاوی پاکی خواردنەوە کارێکی گرنگە بۆ پاراستنی ئاوی ژێر زەوی ناوچەکە ، بە هەمان شێوە ئێستا فشاری زیاتر لە سەر ئاوی ژێر زەوی دروست بووە بە هۆی دروستکردنی چەندین پرۆژەی نیشتەجێبوون لە شاری کەلار، چونکە ئەم پرۆژانە بەگشتی پشت بەئاوی ژێر زەوی دەبەستن، پابەندی مەرجە ژینگەیەکان نەبوون، لەوانە دانانی پاڵاوگەی پاڵاوتنی ئاو بۆ ئەوەی دووبارە بەکابێتەوە، بە پێی ئامارەکان لە کەلار تەنها یەک پرۆژە ئەو پاڵاوگەیەی دروست کردوە ، جگە لەوەش کەمی رووبەری سەوزای هەست پێدەکرێت، چونکە وەبەرهێنەر هەوڵی ئەوە دەدات یەکەی زیاتر دروست بکات بۆ بەدەستخستنی قازانجی زیاتر ، کەرتی نیشتەجێ بوون پێویستە خاوەنی بیرۆکەی نوێ بن بۆ گەیاندنی باشترین خزمەتگوزاری ژینگەی و تەندروستی بۆ دانیشتوان، چونکە ئێستا بە هۆی گۆرانی کەش و هەواوە لە وڵاتان ستاندراد و کەرەستە وپلانی نوێ هەیە بۆ خۆگونجاندن و کەمکردنەوەی کاریگەری گۆرانی کەش و هەوا.

## کەمی رووبەری سەوزایی

بوونی رووبەری سەوزای یەکێکە لە هەنگاوە پێویستەکان بۆ پاراستنی تەندروستی و ژینگە لە مەترسیەکانی گۆرانی کەشوهەوا، بە تایبەت گەرمیان ناوچەیەکە پێویستی بە شۆرشێکی ژینگەیی و هۆشیاری هەیە بۆ برەودان بە رووبەری سەوزای ، بە پێی ئەو ئامارانەی بڵاوکراونەتەوە ، لەم دواییەدا رووبەری سەوزای لەگەرمیان بە گشتی و قەزای کەلار بە تایبەت لە ئاستی ستاندارد نیە ، بە پێی ئاماری شارەوانی کەلار رێژەی سەوزای نزیکەی ٧٪ ، بە بۆچوونی ئێمە ئەو داتایانە زۆر ورد و راست نیە، چونکە هیچ ئامارێکی زانستی نەکراوە بۆ ئەوەی بەووردی دیاری بکەین چەند لە سەدی رووبەری شارەکە سەوزاییە، ئەمەش بە هۆی ئەوەیە زیاتر لە دەسەڵاتێکی کارگێری بەرپرسن لە

سەوزای، لەوانە شارەوانی و وەزارەتی كشتوكاڵ , ئەوانیش سەرپەرشتی دارستان و پاوان دەكەن لە رێگەی بەرێوەبەرایەتی خۆیان.

پێویستە دەسەڵاتە كارگێڕییەكان هەماهەنگ و پەرۆش بن بۆ روبەڕوو بوونەوەی ئالەنگاری و ئاریشە ژینگەی و تەندروستیەكان لەگەرمیان بەگشتی و كەلار بەتایبەتی , چونكە ئێستا كەلار لە گەشەسەندن دایە، ئەگەر كار لە سەر مەرج و ستاندارده ژینگەیەكان نەكرێت لەكۆی ئەو پرۆژانەی هەیە، ئەوە لە داهاتوودا ئاریشەی ژینگەی زیاتر و مەترسی تەندروستی بۆ دانیشتوان دروست دەكات، پێویستە حكومەتی هەرێم و حكومەتە خۆجێیەكان ئەو راستیە زانستیە جیهانییە پەسەند بكەن دۆخی گۆڕانی كەشوهەوا پێویستی بە ئەقڵیەت و دووبارە بیركردنەوە و پەرۆشی زیاتر و بەرپرسیاری و بودجەی زیاتر هەیە , لە لایەكی ترەوە هاوڵاتی و تاكی ئێمە دەبێت هۆشیارتربێت، بەتایبەتی لە پاراستنی ژینگە و تەندروستی، پێویستە هەوڵی پاراستنی مافە ژینگەیی و تەندروستیەكانی بدات، لەم بابەتەش زانكۆ و خوێندنگا و راگەیاندن و رێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی بەرپرسیاری نیشتیمانیان لە ئەستۆیە , بۆیە لە زۆر وڵاتی جیهان هاوڵاتیان و رێكخراوەكان فشاری مەدەنی دەكەن بۆ پاراستنی ژینگە، چونكە ژینگە واتە ژیان، یەكێك لە ئامرازەكان ئەبینین لە وڵاتان پەنای بۆ دەبردرێت بریتیە لە دادگاكان بۆ دۆسییە ژینگەیەكان، دادگاكان لەوە تێگەیشتون گۆڕانی كەشوهەوا واتا بەرپرسیاری زیاتری حكومەت، بۆیە حكومەتیش پێویستە لە ئاست بەرپرسیارێتی بێت، چونكە شارەكانی كوردستان لە گەشەسەندنی بەردەوامدان و ژمارەی دانیشتوان لە زیاد بوون دایە، بەمەش خواست و پێویستی بۆ ئاو و سەوزایی و خزمەتگوزاری تەندروستی زیاتر دەبێت، بە زیاد بوونی دانیشتوان لەلایەكی تر فشار بۆ سەر ژینگە زیاتر دەبێت، بە هۆی زۆربوونی كارگە و ئۆتۆمبێل و پاشماوەكان و هۆكارە پیسكەرەكانی تریش.

## كۆبەند

لە كۆتایدا هیوادارم هەموومان پێكەوە هاوكار و هەماهەنگ بین، لە روبەڕووبوونەوەی مەترسیە ژینگەی و تەندروستیەكان، لە شاری كەلار و تەواوی گەرمیان و هەرێمی كوردستان , چونكە ئەگەر دۆخی مافە ژینگەیی و تەندروستیەكان خراپ بێت، كاریگەری لەسەر تەواوی مافەكانی تر هەیە وەكو مافی خوێندن، مافی كاركردن، مافی ئازادی رادەربڕین... هتد , مەترسی ژینگەیی و تەندروستی دەبێتە هۆی پێشنەكەوتنی شار و

دواكەوتووی و تەنانەت كۆچ كردن لە زێدی خۆت، بەتایبەت ئەمڕۆ لە عێراق و چەندین وڵاتی دونیا كۆچكردن دەستی پێكردوە بە هۆی كەم ئاوی یان گرفتەكانی تری پەیوەست بە گۆڕانی كەشوهەوا. بۆیە باوەڕوم وایە كەلار شارێكی جوانە , دەكرێت بكرێتە ناوەندی بوژانەوەی تەواوی گەرمیان و كوردستان، دەكرێت ئالەنگارییەكان بگۆڕین بۆ دەرفەت و پێشكەوتن.

## بۆ نووسینی ئەم ووتارە سود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- دەنگ نێت، دوو مانگە بەشێک لە سەنتەری تیشكی كەلار كارەكانی ڕاگیراوە، بۆ زانیاری زیاتر كلیک لەسەر ئەم بەستەرە بکە https://www.dengnet.net/details.aspx?kodtech=٤٢٤٢٨&fbclid=IwZXh٠bgNhZW٠CMTAA

٢- ڕاپۆرتێک لە بارەی ئیدارەدانی حكومەت بۆ ئاوی ژێر زەوی لە گەرمیان، ئەم ڕاپۆرتە لە لایەن یەكەی چاودێری حكومەتی خۆجێی گەرمیان بڵاوكراوەتەوە لە بەرواری ٣٠ی ئەیلولی ٢٠٢٣، تەواوی ڕاپۆرتەكە لە سەر ئەم لینكە بەردەستە https://radiodeng.net/details.aspx?kodtech=٣٩٤٥

٣- ڕاپۆرتێک لە بارەی سەوزای لە گەرمیان و كێشەكانی، بیست و یەكەم ڕاپۆرتی مانگانەی یەكەی چاودێری حكومەتی خۆجێی لە گەرمیان، ٢ تەموزی ٢٠٢١ ، تەواوی ئەم ڕاپۆرتە لە سەر ئەم لینكە بەردەستە

https://radiodeng.net/details.aspx?kodtech=٣٨٢٧



ئەنوەر عەبدولعەزیز سەمین
ئەندازیاری کشتوکاڵی

# دامەزراندنی نەخۆشخانەی ڤێتێرنەری و سەنتەری پاراستنی ڕووەک لە کەلار

نەبوونی نەخۆشخانەی ڤێتێرنەری و سەنتەری پاراستنی ڕووەکی مۆدێرن، هاوشێوەی نەخۆشخانە مرۆییەکان لە کەلار و سنوری ئیدارەی گەرمیان، تەنانەت لە ناوچەکانی تری کوردستان دانەمەزراوە و بایەخی پێ نەدراوە هاوشێوی وڵاتانی جیهان، کاریگەری نەرێنی دروست کردووە لەسەر کەرتی کشتوکاڵ و گەشت و گوزار و پیشەسازی خۆراک و ژینگە و ئابووری کەلار و ناوچەی گەرمیان .

کێڵگە کشتوکاڵییەکانی قەزای کەلار، ناوەندی ئیدارەی گەرمیان، هاوشانی کێڵگە کشتوکاڵییەکانی سنووری قەزاکانی کفری و خانەقین، کاریگەری گۆڕانی کەش و هەوا و قەتیس بوونی گەرمای گۆی زەوی، کاریگەرییەکانی وشکەساڵی و کەمبوونەوەی ئاو و مەترسییەکانی بە بیابانبوون و بڵاوبوونەوەی دەرد و نەخۆشیەکان وەک یەک وایە.

## هۆکاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی  سێ هۆکارە:

یەکەم/ نەخۆشی.

دووەم/ ئاژەڵ یان ڕووەک.

سێیەم/ ژینگەی لە بار (ژینگەی گونجاوە) .

هۆکاری دامەزراندنی نەخۆشخانەی ڤێتێرنەری تایبەت بە ئاژەڵ و سەنتەری پاراستنی رووەک بۆ چییە ؟

یەکەم/ ساڵانە بە هەزاران سەر ئاژەڵ و مریشکی کێڵگە پەلەوەریەکان و باڵندە کێوییەکان و هەنگ، هەروەها ئاژەڵی ماڵی و باڵندەی جوانکاری سنوورەکە بەهۆی دەرد و نەخۆشی جۆراوجۆرەوە مرداردەبنەوە و لە ناو دەچێن و هیچ لایەنێک خۆی نا کاتە خاوەنی ئەم گرفتە .

دووەم/ ساڵانە دەیان و سەدان کێڵگە کشتوکاڵی، لە بەروبوومی کێڵگەیی بەتایبەت دانەوێڵە و سەوزەی هاوینە و زستانە و رەز و باخ و دارستان و پاوان، هەروەها پارک و باخچەکانی شارەوانی و رووەکی جوانکاری تووشی دەرد و نەخۆشییەکان دەبێت و جوتیاران بەتایبەتی زەرەر و زیانی زۆر دەکەن، نموونە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی (سن و کیسەڵ و نەخۆشی ژەنگ) لە گەنم، دەیان نەخۆشی تر.

سێیەم/ کەرتی کشتوکاڵ و گەشت و گوزار و ژینگە و پیشەسازی خۆراک و ئابووری ناوچەکە تووشی زەرەر و زیانێکی زۆر دەبێت، بەهۆکاری جۆربەجۆر.

چوارەم/ جوتیارانی کەلار و ناوچەی گەرمیان، تووشی کێشە و گرفتی ئابووری سەخت دەبنەوە، دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە کاری کشتوکاڵی و کۆچکردن لە گوندەوە بۆ شار.

پێنجەم/ کەمبوونەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی ناوچەکە .

شەشەم/ لەئێستادا فەرمانگە و هۆبەکانی ڤێتێرنەری و بەشەکانی پاراستنی رووەک لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ، لە بەر نەبوونی ستافی پێویست و تاقیگەی مۆدێرن و بودجەی شیاو ناتوانن رۆڵی خۆیان ببینن.

حەوتەم/ قۆرخکاری زۆر دەکرێت لە کاتی بڵاوبوونەوەی دەرد و نەخۆشی لە لایەن کەسانی نەشارەزاوە، دەسنیشانکردنی دەرد و نەخۆشیەکان و چارەسەرکردنیان بە هەڵە، گرانی نرخی دەرمان و جۆر و کوالێتی خراپ، نەک چارەسەر، بەڵکو لەهەندێ حاڵەتدا دووجار کێشە و گرفتیان بۆ دروست دەکەن.

سوودی دامەزراندنی نەخۆشخانەی ڤێتێرنەری تایبەت بە ئاژەڵ و سەنتەری پاراستنی ڕووەک چییە؟

یەکەم/ پاراستنی کێڵگە کشتوکاڵییەکانی جوتیارانی بواری ئاژەڵ و پەلەوەر و ماسی و ئاژەڵ و باڵندە کێویەکان و هەنگ، هەروەها ئاژەڵی ماڵی و باڵندەی جوانکاری لە دەرد و نەخۆشییەکان.

دووەم/ پاراستنی کێڵگە کشتوکاڵییەکانی جوتیارانی بواری ڕووەک بە گشتی، وەک بەروبوومی کێڵگەی و سەوزەی هاوینە و زستانە و ڕەز و باخەکان و دارستان و پاوانی ناوچەکە، هەروەها پارک و باخچەکانی شارەوانی، ڕووەکی جوانکاری. لە دەرد و نەخۆشییەکان.

سێیەم/ لەپێناو پاراستنی کەرتی کشتوکاڵ و گەشت و گوزار و پیشەسازی خۆراک و ژینگە و ئابووری کەلار و ئیدارەی گەرمیان لە دەرد و نەخۆشییەکان.

چوارەم/ زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی جوتیاران.

پێنجەم/ دەبێتە هۆی دامەزراندنی چەندین کارگەی بەرهەمهێنانی بواری کشتوکاڵی جۆراوجۆر، پێشخستنی کەرتی پیشەسازی خۆراک لە کەلار، هەروەها جموجۆڵی بازرگانی زیاد دەکات لە سنورەکە.

شەشەم/ دامەزراندنی دەرچووانی بواری ڤێتێرنەری و بەشە کشتوکاڵییەکان.

حەوتەم/ دەبێتە مایەی دڵخۆشی و دڵنیایی خەڵکی کەلار و ئیدارەی گەرمیان، بە تایبەتی جوتیاران.

هەشتەم/ ڕێگریکردن لە قۆرخکاری بواری دەستنیشانکردنی دەرد و نەخۆشییەکان و دەرمان و چارەسەرکردن.

نۆیەم/ بەدامەزراندنی ئەم نەخۆشخانە و سەنتەرە لە کەلار، دەبێتە مەڵبەندێک بۆ چارەسەرکردنی دەرد و نەخۆشییەکان سنووری گەرمیان بەگشتی، ناوچەکانی دەرەوە سنورەکەیش پشتی پێدەبەستن.

لێرەدا داواكارین لە ئیدارەی گەرمیان و قائیمقامیەتی قەزای كەلار كار بكەن بۆ دامەزراندنی نەخۆشخانەی ڤێتێرنەری و سەنتەری پاراستنی ڕووەكی مۆدێرن لە سنوورەكە لە ڕێگەی :

یەكەم/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی كشتوكاڵی گەرمیان.

دووەم/ بەڕێوەبەرایەتی گشتی وەبەرهێنانی گەرمیان.

سێیەم/ لقی گەرمیانی یەكێتی وەبەرهێنەرانی كوردستان...هتد.



# کەلار، لە نیوسەدەی پڕ لە (ڕووداو و ململانێ و گۆڕانکاری)دا

## خوێندنەوەیەک بۆ کتێبی «کەلار (١٩٢٧_١٩٧٥)» لێکۆڵینەوەیەک لە بارودۆخی سیاسی، کارگێڕی و ڕۆشنبیری

دلێر کەریم

لە نیوەی یەکەمی مانگی ئازاردا، لە کتێبخانەی گشتی کەلار، ناساندن بۆ کتێبەکە کرا، ناساندنەکە دوو ئامانجی پێکا، یەکێکیان وەک مژدانەیەک کە (کتێبخانەی شار) باوەشی بۆ چاپکردنی کتێبی نووسەران کردووەتەوە، دووەمیان ئەم کتێبە نامەی ماستەر بووە، لە ساڵی ٢٠٢١ سەردەمی پەتای کۆرۆنا (کۆڤید ١٩) دا نووسراوەتەوە و پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کراوە، گرنگە ئەو کتێبە ئەکادیمی، زانستییە بخرێتە بەر دیدەی خوێنەران. هەر بۆیەش ناساندن و خوێندنەوە و ڕانانەکەشی گفتوگۆی زۆری لەسەر کرا و بۆچوونی جیاجیای لەسەر هەبوو.

نووسینی کتێب لەسەر مێژووی شارێک، مێژووی پارتێک، لە هەموو جۆرەکانی تری نووسین قورسترە، چونکە نووسەری بابەتی مێژووی دەست بۆ کۆمەڵێک ڕووداو، بەڵگە و سەرچاوە دەبات، کە ساڵانێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە و ئێستا وەک بەڵگەنەویست مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. نووسەری بوێر دێت و ئەو بەڵگەنەویستانە دووبارە دەخاتەوە بەردەم شرۆڤە و پێمان دەڵێت تەنیا ئەو ڕا و بۆچوونانە بۆ ئەو دیاردە مێژوویە بوونیان نییە، بە پێچەوانەوە فلان سەرچاوە و فیسار کتێب هەن، یاداشتەکانی فلان نووسەر باس لە شتێک دەکەن و چەندین مێژوونووس و کەسایەتی، لەو بارەیەوە وەها دەدوێن. ئەگەر کتێبی مێژووی جارێک نووسینەوەی قورس بێت، بە دڵنیاییەوە بۆ قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراو، کە چەندین ڕووداوی ئاڵۆز و تێکچڕژاوی تێدا بووبێت ساڵانی (١٩٢٧_١٩٧٥)، و بۆ جوگرافیایەک کە گەشەیەکی خێرای بە خۆیەوە بینیبێت (کەلار)، ئەو ئەرکە لەسەر شانی نووسەر قورستر دەکات.

مامۆستا سەباح عەلی جاف، نووسەری كتێبی (كەلار (١٩٢٧_١٩٧٥) لێكۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی سیاسی، كارگێڕی و ڕۆشنبیری) پێشتریش لە یەك دوو وێستگەی جیاوازدا لەسەر بڵاوكراوەكانی ناوچەكە، وەك ڕۆژنامەنووسێك بەو ئەركە هەستاوە و پێشانگای كردووەتەوە، وردەكاری بە كارەكانییەوە دیارە، لە هەمووی گرنگتر بۆ منی خوێنەر و شارەزای بەشێكی ڕووداوەكانی ناو ئەو مێژووە، بێلایەنی و ڕاستگۆ بوونێتی كە من بۆ خۆم وەك خوێنەرێكیش چێژم لێوەرگرت. هەموومان دەزانین بەدڵمان بێت یان نا، هەندێ ڕووداوی ناو مێژوومان هەن كە بە دڵی ئێمە نین. بۆیە كاتێك خۆت بەشێك لەو مێژووە دەزانیت و كتێبێك دەخوێنیتەوە، دەزانیت نووسەر لە كوێدا پێكاویەتی و نەكەوتووەتە ژێر كاریگەریی هیچ ئایدیا و بۆچوونێكەوە.

وەك نووسەر خۆی لە پێشەكییەكەیدا ئاماژەی پێكردووە، ئەم نامەیە (كەلار ١٩٢٧_١٩٧٥ لێكۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی سیاسی، كارگێڕی و ڕۆشنبیری) لە دەروازە و سێ بەشی سەرەكی لەگەڵ ئەنجام و لیستی سەرچاوەكان و پاشكۆكان پێكهاتووە. لە دەروازەكەدا پێشینەیەكی مێژووی كەلار تا ساڵی (١٩٢٧) لە سێ باسی تایبەتدا شرۆڤەكراون. باسی یەكەم تایبەتە بە هەڵكەوتەی جوگرافی كەلار و پەرەسەندنە كارگێڕییەكانی، باسی دووەمی تایبەتە بە ناوی كەلار و ئاوەدانكردنەوەی، باسی سێیەم و كۆتایی هەلومەرجی سیاسیی ناوچەكە لە ساڵانی (١٩١٤-١٩٢٧) دەخاتە بەر باس و لێكۆڵینەوە، كە ئەم باسەی كۆتاییان ڕۆژگاری جەنگی یەكەمی جیهانی و ڕووداوەكانی دواتری بە وردی شرۆڤەكردووە، دەوڵەتی عوسمانی (پیاوەنەخۆشەكە) بە لایەنگری ئەڵمانیا لە بەرەی ناوەند، دژی هاوپەیمانان دەجەنگێت. وەك هەمیشەش شوێنی ستراتیجی كوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سەرەنجی وڵاتە زلهێزەهان بۆ خۆی ڕادەكێشێت. شەڕی شوعەیبە لە نێوان شێخ مەحموود (كورد) و ئینگلیزەكان لە ساڵی (١٩١٥) بە بەشداری سەرۆكهۆزەكانی ناوچەكە، باس لە كاریگەرییەكانی جەنگەكە و ڕەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخەكە دەخاتە پێشچاومان. هەڵپەی وڵاتانی زلهێز بۆ گەڕان بە شوێن بەرژەوەندییەكانیاندا دەبینرێت، ئینگلیز موسڵ و بەغدا و كەركوك و زنجیرە گردەكانی حەمرین داگیردەكات و سوپای ڕووسیاش جەخت لە داگیركردنی خانەقین دەكاتەوە، چونكە بە تاكە زامنی داگیركردنی بەغدای دەزانن. لەو نێوەندەشدا سوپای عوسمانی و هێزەكانی بەریتانیا و ڕووسیا كەلار (قەڵای شێروانە) دەكەنە چەقی ململانێكانیان. دوای شكانی عوسمانییەكان، ڕووسەكان قەڵای شێروانە دەكەنە بنكەی سەربازی خۆیان، بەوەش

گرانی و نەبوونی خواردن و پێداویستییەکانی ڕۆژانە و ترس و دڵەڕاوکێ یەخەی خەڵکەکە دەگرێت و بەشێکیان هەڵدێن بۆ ناوچەکانی تر. کارە قێزەوەنەکانی سوپای ڕووس خراوەتە بەرباس (تاڵانکردنی ماڵان و لەناوبردنی کتێبخانەی مەلا محەمەدی جوانڕۆیی، ئەوکات مەلای مزگەوتی کەلار بووە). دواتر ڕووسەکان بۆ ئێران دەکشێنەوە و عوسمانییەکان دەگەڕێنەوە، ئینگلیزەکان دەچنەوە خانەقین و عوسمانییەکان دێنەوە کەلار و شێروانە. ئەوەی سەرەنجی ڕاکێشام ئەوەیە خەڵک ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ڕووس وەک جیهاد وێنا دەکەن، لە کاتێکدا هەموو هێزە داگیرکارەکانی بەشەڕداهاتوو، لە ناوچەکەدا هەر هەموویان داگیرکەرن و ڕووبەڕووبوونەوەیان ئەرک بووە.

دامەزراندنی دەوڵەتی ناکۆکی عێراق لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٠، ئاڵۆزییەکانی نێوان کورد و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ عێراقدا، کۆنگرەی قاهیرە بەدوای خۆیدا دەهێنێت. مشتومڕی ئایا کوردەکان ببنە خاوەنی دەوڵەت یان هەر لە چوارچێوەی عێراقدابن، بە پاڵپشتی ڕای نوێنەری باڵای بریتانیا (پێرسی کۆکس) خەونی دەوڵەتی کوردی لە گۆڕ دەنرێت. مەلیک فەیسەڵ لە ساڵی ١٩٢١ دەبێتە یەکەمین پاشای دەوڵەتی تازەی عێراق. ناوچە کوردییەکان لە دەرەوەی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەدا دەمێننەوە و کێشەی ویلایەتی موسڵ سەرهەڵدەدەن. لەو نێوەندەشدا بەریتانیا پاڵپشتی سەرۆک هۆزەکان دەکات و بەهێزیان دەکات بۆ نەمانی دەنگی نارەزایەتی، دواتر کە ڕاپرسی دەکرێت بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکە، ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە دەلکێنرێت و بە یەکجاری دادەبڕێت لە تورکیا. سەرۆکهۆزەکان ئەوەی نارەزایەتییان هەبووە و شۆڕشیان کردووە دوورخراونەتەوە و ئەوانەی بوونەتە بەشێک لە سیستەمە ئیدارییەکە لە نازونیعمەتدا ژیاون و بەرپرسەباڵاکانی ئەوکاتی وڵات و نوێنەری بەریتانیا سەردانی کردوون، هەموو ئەمانە بە دوورودرێژی قسەیان لەبارەوە کراوە.

لە بەشی یەکەمدا پێشهاتە سیاسییەکانی کەلار لە ڕۆژگاری پاشایەتی عێراقدا (١٩٢٧-١٩٥٨) لە پێنج تەوەردا بە وردی تیشکی خستووەتە سەر پێکهاتنی ناحیەی شێروانە و ڕەنگدانەوەی لەسەر بارودۆخی کەلار و بزوتنەوەکانی شێخ مەحموود و ژیانی نوێنەرایەتی و پارلەمانی حەمە بەگی جاف و داود بەگ و کاری ڕێکخراوەیی و حیزبی لە سنووری گەرمیان و کەلاردا. لە تەوەری کۆتایشدا هەڵوێستی کەلار لە پێشهاتە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی عێراقدا باسکراون، وەک ئەوەی لە پاش دامەزراندنی کۆماری کوردستان

و هەرەسهێنانی كۆمارەكەدا، چوار ئەفسەری كورد دەگەڕێنەوە بۆ عێراق و بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەردەچێت، كە ئەم بڕیارە دەگاتە داود بەگ سەردانی ماڵی وەزیری دادی كردووە و داوای كردووە كە ئەو بڕیارە جێبەجێ نەكرێت، كە جێبەجێ كراوە «دەستی بە گریان كردووە».

لە تەوەری یەكەمدا باسی یاسای كارگێڕی لیواكان كراوە، لە (١٨ی ئابی ١٩٢٧) دا بە ئیرادەیەكی مەلەكی ناحیەی قەڵای شێروانە لە سنووری لیوای كەركوكدا پێكهاتووە. كەلار وەك گوندێكی ئاوەدانی گەورە كەوتووەتە سەر ئەم ناحیەیە. بۆ ئەوەش بۆچوونە جیاجیاكان تیشكیان خراوەتەسەر. دكتۆر حەسەن ئاماژەی بە هەیمەنەی دەسەڵاتی سەرۆكهۆزكردووە كە ڕازی نەبووە كەلار بكرێتە ناحیە، لەبری ئەوە سەرقەڵا بووەتە ناوەندی ناحیە. لە تەوەرەی دووەمدا باس لە هێنانەوەی شێخ مەحموود كراوە، كە ئینگلیزەكان بە مەبەست و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی توركەكان لە ساڵی ١٩٢٢ لە هیندستانەوە دەیگەڕێننەوە. خەڵكی كفری بە هەموو نەتەوە و هۆزەكانەوە، لە وێستگەی شەمەندەفەرەكەی كنگربان لە پێشوازیدا دەبن. لە گەرمیان شێخ دوو كۆبوونەوە (كۆنگرە) ی گرنگ دەبەستێت، یەكێكیان بۆ دانانی شێخ وەك مەلیكی كوردستان، دووەمیان بەرزكردنەوەی سوپاسنامە بۆ حكومەتی بریتانیا بە بۆنەی ئەو دانانەوە، هەروەها بە بۆنەی دامەزراندنی حكومەتی كوردییەوە. دواتر لە ئاپۆرەی جەماوەریدا دەگاتە سلێمانی.

كاتێك نێوانی شێخ و دەسەڵاتی داگیركاری ئینگلیزەكان تێكدەچێت، شێخ چەندجارێك شاندی بۆ دانووستاندن ناردووە، لە ساڵی ١٩٢٣ وەفدێك بە سەرۆكایەتی حەمە بەگی جاف، وەفدێكی تر بە سەرۆكایەتی كەریم بەگ، بۆ كەركوك چوون، هیچ ئەنجامێكیان نەبووە، دواتر گەڕاونەتەوە و بەڵێنی پاڵپشتییان بە شێخ داوە، ئەحمەد خواجە ئاماژە بەوە دەكات ئەو بەڵێنانەیان نەبردووەتەسەر.

شەڕی ئاوباریك لە (٥ی نیسانی ١٩٣١) لە مێژووی ناوچەكە و كوردستاندا پێگەیەكی گرنگی هەیە، ئەو شەڕەی لە دوای گەیشتنە بنبەست،لەنێوان شێخ مەحموود و سوپای عێراقی و پاڵپشتی ئینگلیزەكان كراوە. خەڵكی گەرمیان و كەلار ڕۆڵی بەرچاویان لە ئاڵپشتی شێخدا بینیوە. ئینگلیزەكان سیخوڕییان بەسەر جافەكانەوە كردووە تا بە هانای شەڕەكەوە نەچن و لە جێگەی خۆیاندا بمێننەوە. ئەوانەی پێشتر و بە ئاگاداركردنەوەی شێخ بەدەم داواكەییەوە چوونە، لەو ئابڵووقەیە ڕزگارییان بووە و لە شەڕەكەدا بەشداربوون.

شێخ بەسەر جەنگاوەرەکاندا سوڕاوەتەوە و هاواری کردووە سەربەخۆی کوردستان دەخاتە پێش مەرگی خۆی. شێخ عەلی قەڵبەزە یەکێک لە فەرماندە باوەڕپێکراوەکان و چەند کەسێکی تر شەهید دەبن. ڕۆژێک دووان پێش شەڕی ئاوباریک شێخ دێتە گوندی (لەک قادرسەرهەنگ) کە زۆر نزیکە لە ئاوباریکەوە و لە دیوەخانەکەی قادر سەرهەنگ دەمێننەوە و دواتر ئاماژە بەوە دەکات کە بۆ شەڕێکی قوورس دەچن و پێویستیان بە پاڵپشتییە، قادر سەرهەنگ کوڕەکەی خۆی لەگەڵیاندا دەنێرێت کە هێشتا تەواو گەورەش نەبووە. دوای شەڕەکەش کە دەگەڕێتەوە ماوەیەک نەخۆش دەکەوێت. شێخ دەچێتە دیووی ئێراندا و دواتر دەستبەسەر دەکرێت و بۆ ناسرییە دووردەخرێتەوە. بەپێی ڕاپۆرتێکی فەرەنسی، هێزێکی شێخ لە سنووری خانەقین چوونەتە سەر گوندێکی سنووری خانەقین کە موڵکی تایبەتی مەلیک فەیسەڵ بووە و هەزار سەر مەڕیان بە تاڵانبردووە. ئەمەش بەڵگەیەکی مێژووییە و نووسەر بە بوێرییەوە باسی لەو ناشیرینییەی ناو مێژووی ئێمەی کردووە، کە میللەتێک دەوڵەتی بۆ دانامەزرێت و دژایەتی دەکرێن، کەچی لە بری شۆڕش و بەگژداچوونەوەی دەسەڵاتی ستەمکاری، خەریکی تاڵانین.

لە تەوەری سێیەمدا باس لە ژیانی نوێنەرایەتی و پەرلەمانی قۆناغەکە دەکرێت. بە پێی ئیرادەی پاشایەتی، لە ساڵی (١٩٢٤) ئەنجوومەنی دامەزراندن دەست بە کارەکانی دەکات، شا فەیسەڵ وتارێک دەدات و ڕێگە بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران خۆش دەکات و بڕیار لەسەر یاسای هەڵبژاردنەکان دەدات. دواتریش ئەنجوومەنی دامەزراندن هەڵدەوەشێتەوە. لێرەوە هەنگاوەکانی بنیاتنانی پارلەمان دەستپێدەکات، کە هەر نوێنەرێک نوێنەرایەتی بیست هەزار کەس دەکات. یاساکە وەها کە دەبێت تەمەنی لە سی ساڵ کەمتر نەبێت و نێر بێت و لەو کەسانە بێت کە باج دەدات. نوێنەر نوێنەرایەتی هەموو عێراقی کردووە و هەر نوێنەرێک چوار ساڵ ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بووە. عێراق لەو کاتەدا بۆ سێ بازنەی هەڵبژاردن دابەشکراوە. لە ساڵی ١٩٢٥ یەکەمین خوولی ئەنجوومەنی نوێنەران بە سەرۆکایەتی عەبدولموحسین ئەلسەعدون دەستی بە کارەکانی کردووە. لە کەلار حەمە بەگی جاف لە خوولی دووەم (١٩٢٨-١٩٣٠) لەگەڵ (١٣) کوردی تردا ئەندامی ئەنجوومەن بوونە، ئەوەی جێگی تێڕامانە حەمە بەگی جاف لەو کاتە تەمەنی ٢٤ ساڵ بووە. لە باشترین کارەکانیان بە ئیمزای حەوت نوێنەری کوردەوە لە ساڵی (١٩٢٩) یاداشتێکیان بە سەرۆک وەزیران داوە و داوای یەکەیەکی کارگێڕیان بۆ ناوچە کوردییەکان بە کەرکوکەوە، کردووە، هەروەها ڕاسپاردەی کۆمەڵەی نەتەوەکان




بۆ بەدەستهێنانی مافەکارگێڕی و ڕۆشنبیرییەکانی کورد لەبەرچاو بگرن. ساڵی (١٩٣٠) لەگەڵ ژمارەیەک نوێنەری تردا یاداشتێکیان لەبارەی کێشەی کوردەوە، بە نوێنەری باڵای بریتانیا داوە. نامەیەکیشیان داوەتە سەرۆک وەزیران کە چەند خاڵێکی گرنگی تێدابووە، هەر بۆیە شا فەیسەڵ تورە دەبێت و وتوویەتی بە دەستی ئەو بووایە ئەو نوێنەرانەی هەڵدەواسی و دووریانی دەخستەوە.

داود بەگی جاف (١٩٣٥- ١٩٥٨) دوای مردنی حەمە بەگی برای لە ساڵی (١٩٣٥) وەک نوێنەری کفری لە لیوای کەرکوک لەگەڵ پێنج ئەندامی تر، لە خوولی شەشەمی هەڵبژاردنەکاندا، دەبنە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران. ژمارەیەک پرۆژەی خزمەتگوزاری پێشکەش بە ناوچەی کفری و کەلار کردووە، لە ئەنجوومەنیشدا ڕۆڵی کاریگەریی بووە. لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیدا باس لە پێدانی خۆراک بە هاووڵاتیان کراوە، داود بەگ وتوویەتی: هەندێک کەس هیچی دەستناکەوێت و بەشەکەی دەچێتە گیرفانی کەسانی دەسەڵاتدارەوە. لە خولی نۆیەمەوە تا کۆتا خولی ١٩٥٨ لەسەر لیوای کەرکوک نوێنەر بووە. داوای پرد و بیری ئیرتیوازی و قەرەبووی جوتیارانی زیانمەندی بەنداوی دەربەندیخان و دەرمانی قەڵاچۆی کولەی کردووە. لە ساڵی ١٩٤٧ باسی لە بڵاوبوونەوەی بیری شیوعیەت کردووە و داوای لەناوبردنی لە لایەن حکومەتەکەی ساڵح جەبرەوە کردووە، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە ئەو بیرە پێشکەوتنخوازانەیە دژی دەرەبەگ و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکە بووە. لە بواری ڕۆژنامەگەریدا ڕۆڵی بەرچاوە و داوای ئازادی ڕۆژنامەگەری کردووە.

لە تەوەری چوارەمدا باسی لە کاری ڕێکخراوەیی و حیزبی لە سنووری گەرمیان و کەلاردا کردووە، لە کۆمەڵەی یەکێتی و گەشەوە، بۆ ڕێکخراوی ئیسلامی کورد لە هەڵەبجە، ڕێکخراوی ئازادی یان (برایەتی) کە لە کەلار حەمە بەگی جاف کاری تێدا کردووە. یانەی سەرکەوتنی کوردان لەلایەن مارف جیاوک لە بەغدا کراوەتەوە. کە خشتەی هاوکارییەکانیش ئاماژەی پێکراوە لە لایەن خەڵکی کەلارەوە. مینە شیعرێکی بۆ نووسیوە. لە کفریدا موکەڕەم تاڵەبانی کۆمەکی بۆ کۆکردوونەتەوە. پارتی هیوا لەسەر داروپەردووی کۆمەڵەی (دارکەر) دامەزراوە، کە ئامانجی خەبات دژی فاشیست و بەدەستهێنانی سەربەخۆی نەتەوەی کورد بووە، دڵداری شاعیر خاوەن بیرۆکەکە بووە. ڕەفیق حیلمی بە بڕیاری کۆمەڵەکە کراوەتە بەرپرسیاری و ناوی کۆمەڵەکەی گۆڕیوە. نەیتوانیوە بچێتە ناوی جوتیارانەوە کە بەهێزبوونە، لە خانەقین و کفری دەیان ئەندامیان بووە، تا شەڕی جاف و تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٤٢ لەسەر زەویوزار، دوای ناوبژی حکومەت و کوژرانی چەند کەسێک لە هەردوولا، زەوییەکەیان لە نێواندا دابەشکراوە. کەلار دوو چالاکی گەورەی پارتی هیوا لە خۆ دەگرێت، کۆبوونەوەی کەلار لە ١٩٤٤ و کۆبوونەوەی قەنیلەی ١٩٤٤ ی گوندی گێژەکان، بەهۆی ناکۆکی نێوان ئەندامان کە پارتەکە پشتی کێ بگرێت لە زلهێزەکان؟ ڕەفیق حیلمی سەرۆک (ڕاستڕەو)لەگەڵ ئیمپریالیزمی بەریتانیا بووە، باڵی ئەفسەران (چەپ) لەگەڵی نەبوون، کەلار دەبێتە مەڵبەندی کۆنفرانسەکە (ماڵی داود بەگ)، ئەفسەرەکان ویستوویانە دەستەی سەرۆکایەتی بە هەڵبژاردن بێت، سەرۆک ویستوویەتی هەر خۆی لە سەرۆکایەتی بمێنێتەوە، ئەندامانی لقی کەلاری پارتی هیوا لەگەڵ مانەوەی ڕەفیق حیلمی بوون. ئەمەش دەرخەری ڕاستڕەویتی بوونیان بووە. ئەحمەد باوەڕ بە پێچەوانەی ڕاکانەوە دەڵێت نەگەشتوونەتە ڕێکەوتن دەستەیەکیان هەڵبژاردووە. پارتی ڕزگاری لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە، لە کەلار و کفری ئەندام و چالاکییان هەبووە.

حزبی شیوعی عێراق، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە، بە کاریگەری بیری چەپ و شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧، وەک فکر هەبووە، بەتایبەت چالاکییەکانی دژی ئیمپریالیزمی بەریتانیا. لە عێراق لە نەجەف و ناسریە و بەسرە، لە کوردستانیش هەولێر و سلێمانی و کۆیە شیوعییەکان دەردەکەون، کەچی لەم کتێبە ساڵی دامەزراندنی حزب کە ٣١ی ئازاری ١٩٣٤ دیاری نەکراوە. کەسایەتییەکی وەک جەمال عیرفان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە تیرۆرکراوە. بەڵگەنامەکان باس لە بەلشەفییەکانی خانەقین لە ساڵی ١٩٢١ دەکەن. لە کفری و کەلار و قەرەتەپە شیوعیەت چەکەرە دەکات، موکەڕەم تاڵەبانی لە پایتەخت

و شێخ عەتا لە کەرکوک و سەعید جەوهەر لە قەرەتەپە پەیوەندی پێیانەوە دەکەن. بنەماڵەی بەگزادەکان لەکەلار شیوعیان کەم بووە، جگە لە حەمەسەعید بەگی جاف بە نزیکیان دانراوە .لە ژوورەوە مەلا ئەحمەد بانیخێڵانی بووەتە شیوعی و بڵاوکراوەی (دەنگی داس)ی دەرکردووە. دواتر مەلا سلێمان زەماوەنگەی لەو ڕێگەیەوە بووەتە شیوعی و چالاکی ئەنجامداوە (١٩٥٤).

پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٤٦ بە هەوڵی ڕاستەوخۆی مەلا مستەفای بارزانی و نوێنەری بەشێک لە حزبەکانی پێشتری وەک (شۆڕش و ڕزگاری) و (ژ.ک) زۆرینەیان بوونەتە پارتی، هەمزە عەبدوڵا وەک نوینەری بارزانی و لە ماڵی برایم ئەحمەد لە سلێمانی، بە ئامادەبوونی نوێنەری گەرمیان وەک شێخ عەتا و مەلا عەزیز ١٢ ئیمامی و شێخ تالیب، هێڵکاری دامەزراندنی پارتی دەکێشن. دواتر مەلا سەید حەکیم و ڕەشید باجەڵان بە نوێنەرایەتی خانەقین و کەلار و کفری لەشاری بەغدا بەشداری کۆنگرەی دامەزراندن دەکەن. بەگزادەکان لە کەلار پشتگیری پارتییان کردووە. کە ئەمەش پشتڕاستکردنەوەی ئەوەیە کە بەرژەوەندییەکانیان لێکەوە نزیکبن.

لە کۆتا تەوەری بەشی یەکەمدا هەڵوێستی کەلار لە پێشهاتە ناوخۆی و دەرەکییەکانی عێراقدا خراونەتە بەرباس، کە گەرمیان بە گشتی و کەلار بەتایبەتی ڕۆڵیان لە پێشهاتەکاندا هەبووە. بە تایبەت کەسایەتی و سەرۆک هۆزەکان. (بزوتنەوەی مایس ١٩٤١) بە ڕابەرایەتی (ڕەشید عالی گەیلانی)لە کفری دەنگدانەوەی زۆری هەبووە، لە کفری و کەلار گەنجەکان پشتگیریان کردووە و دژی بەریتانییەکان وەستاونەتەوە. کەلار پەناگەی کەسایەتییەکان بووە، سەرۆکی هۆزی کەڵهوڕ لە تاو زوڵمی ڕەزا شا لە کرماشانەوە هاتووەتە کەلار و مناڵەکانی خراوەتەبەر خوێندن، لە پاش لەسەرکار لابردنی ڕەزا شای پەهلەوی، (١٩٤١) کە محەمەد ڕەزا شا هاتووەتە دەسەڵات، زیندانییەکان بەر لێبوردنی گشتی کەوتوون. دواتر گەڕاونەتەوە. خەسرەوی ڕۆزبە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بەرسی ڕاگەیاندنی حزبی تودەی ئێران، لە ساڵی ١٩٥٣ هاتووەتە سنووری عێراق و لەسەر داوای حشع داوا لە شێخ عەتا کراوە داڵدەی بدات، بەهۆی زیندانی موکەڕەمی برایەوە، هەروەها چاودێری وردی گوندی (زەرداو)ەوە، پێشنیازی ماڵی حەمەسەعید بەگی جافی بۆ کراوە. لە کەلار بە ناوی (عەلی تورکە) ناویان بردووە.

لە بەشی دووەمدا لە شەش تەوەر و چەند باسێكدا تیشكخراوەتە سەر كەلار و پەرەسەندنە سیاسییەكان لە ساڵانی (١٩٥٨-١٩٧٥)دا، لە گرنگترین ڕووداوەكاندا بۆ گەلانی عێراق، باسی شۆڕشی (١٤ی تەمووز) لە تەوەری یەكەمدا هاتووە. عێراق لە دوای ٣٧ ساڵی حوكمی پاشایەتی، سیستەمی گۆڕا بۆ كۆماری بە سەرۆكایەتی عەبدلكەریم قاسم. باسی یەكەم تەرخانە بۆ كەلار لە كاتی شۆڕشدا، كە بەهۆی بوونی حزبی شیوعی و پارتییەوە لە سنووری كەلار و گەرمیاندا هۆشیاری لای خەڵك، بەتایبەت كرێكاران دروست بوو. هەواڵی شۆڕش لە ڕێگەی ڕادیۆوە گەشتووەتە كەلار و گەرمیان. شیوعییەكان بە ئاشكرا لە گوندەكانەوە خۆشحاڵیان دەربڕیوە، لە گوندی شاكەل و ژاڵەی حاجی قادر هەست بە شادومانی كراوە. شیوعییەكان چوونەتە بەردەم ماڵی بەگزادەكان. لە گوندەكانیش كادرەكانی وەك مەلا سلێمان و سۆفی عەبدولقادری قولەبەرز و حەسەنی حاجی قادری شاتری بوون. پەلاماردانی ماڵی بەگزادەكان پەیوەندی بە نزیكایەتییانەوە هەبووە لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتی. (بەگزادەكانی جاف پێش شۆڕش وەك یەكێك لە گەورەترین خاوەن موڵك لە عێراق ناویان هاتووە لەسەر ئاستی هەرسێ لیوای كەركوك سلێمانی و دیالە)، كە بەهۆی شۆڕشەوە ٨٥٪یان لە دەستدا بە پێی یاسا. تا ناچار بوون كەلار جێبهێڵن.

لە باسی دووەمدا باس لە پەنابردنی بەگزادەكانی جاف دەكرێت بۆ ئێران. دوای لە دەستچوونی بەشێكی زەویوزار و پێگەی كۆمەڵایەتی و سیاسییان، لە ساڵی ١٩٥٩ بۆ خانەقین و بەغدا و ئێران بڕۆن. كە ژمارەیان بە ١٢ هەزار مەزەندە كراوە كە زۆربەیان جافەكان بوون. عەبدلكەریم هەوڵیداوە داود بەگ لە عێراق بمێنێتەوە، ڕازی نەبووە چونكە پاشای كوشتووە و ئەوەی بە هۆكاری نەمانەوەی باسكردووە. لە تاران هاوكاری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد دەكەن و پلە و پۆستیان لە ئێران وەرگرتووە , سەردار جافی كوڕی دیداری مام جەلال و باڵوێزی عێراقی سازكردووە و مام جەلالی كردووەتە خاوەن پاسەپۆرت. مام جەلال دەڵێت: زیندانی نوگرە سەلمانی عێراق لە مانەوەم لە ئێران بە باشتر دەزانم.

تەوەری دووەم تایبەتە بە چالاكی حزبی شیوعی لە كەلار و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لە ناوچەی شێروانەدا (١٩٥٩)، شێخ عەتا ڕۆڵی گێڕاوە لە ڕێكخستنی چالاكییەكان، لە ڕێگەی ئەحمەد فەتاح ڕۆستەمەوە عەشیرەتی عەمەڵە لە هۆزی جاف لە كەلار زۆربەیان بوونەتە شیوعی. لیژنەی كفری چالاكبوونە و بڵاوكراوەی (تەریق

ئەلشەعب)یان پێگەیشتووە و ئابوونەیان داوە. تەنانەت لیژنەی چالاکییان هەبووە کە دیارترینیان سەعید جەعفەر بووە. جگە لە گوندەکان. لە دوای ساڵێک و لە یادی شۆڕشدا مەلا سلێمان لە زەماوەنگە ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکات. نیگەرانی بەگزادەکان هانیان دەدات بچنە ریزی پارتییەوە. ناکۆکییەکان زۆربوون و تا لە ململانێی فکرییەوە بۆ چەکداری گۆڕاوە. هەر بۆیەش ساڵی (١٩٥٩) بنکەیەکی پۆلیس هێنراوەتە کەلار، کەچی چەند کەسێک چوونەتە ریزی بزوتنەوەی ئاشتی جیهانییەوە تا شەڕ و ماڵوێرانی دووبارە نەبێتەوە.

تەوەری سێیەم باس لە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤییەت و چالاکبوونی پارتی لەکەلاردا دەکات، کورد بە ئومێدەوە لە شۆڕشی روانیوە و برایم ئەحمەد دوای کاتژمێرێک بە ناوی لیژنەی کەرکوکی پارتییەوە برسکەی پیرۆزبایی ناردووە. بارەگای پارتی لە کەلار (١٩٥٩) دەکرێتەوە. خەڵک پێشوازییان لێدەکات. پارسەنگی هێز دەگۆڕێت و ئەوان بەهێز دەبن. رووداوەکەی کەرکوک کاریگەری لەسەر حزبی شیوعی هەبووە. پەیوەندی کورد و عەبدلکەریم وردەوردە بەرەو لاوازی چووە، لە ساڵی (١٩٦١) بارزانی لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی لە بەغداوە دەگەڕێتەوە کوردستان. بەوەش بارەگاکانیان لە کەلار و ناوچەکان دادەخرێت و ئەندام و لایەنگرانیان دەستگیرکراون.

تەوەری چوارەم تایبەتە بە شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١-١٩٦٤) کە دوای تێکچوونی پەیوەندییەکان دەستپێدەکات، لە (٩ی ئەیلولی ١٩٦١) یەکەمین تەقەی شۆڕش لە بەردەم تونێلەکەی دەربەندیخان لە نێوان سوپا و هێزەکانی ئەو سنوورەدا روویدات. تەنانەت برایم ئەحمەد ئەم قەرەباڵەخییە چییە خۆ ئێمە بڕیاری شۆڕشمان نەداوە؟ لە وتاری کردنەوەی بەنداوی دەربەندیخاندا قاسمی هێرشی کردووەتە سەر کورد و بە چەتە و هەڵگەڕاوەی لە قەڵەمداون. (یەکەمین چالاکی هێزی بنکەی بەمۆ بە دەستبەسەرداگرتنی مووچەی ناحییەی مەیدان دەستی پێکردووە، بڕەکەی ٢٠٠٠ دینار بووە). ئەمەش رێک پێناسەکەی قاسمی بۆ کورد دەرخستووە. بەهۆی شۆڕشەوە ساڵی خوێندنی (١٩٦٣-١٩٦٤) قوتابخانە بە رووی منداڵاندا داخراوە. ترس و تۆقاندن و کوشت و بڕ روو لە خەڵکی ناوچەکە دەکات و چەندین شەڕی خوێناوی روودەدات و خەڵک ئاوارە بوون.

تەوەری پێنجەم تایبەتە بە ململانێ ناوخۆییەکانی پارتییەوە لە ساڵی (١٩٦٤-١٩٧٠)، کە لە نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیدا هەبوون، وەک هەمیشەش ئۆباڵی

ململانێکان دەخرێنە سەر ئەویتر، لە (١٠ی شوباتی ١٩٦٤) ئاگربڕ لە نێوان عەبدلسەلام عارف و بارزانیدا دەکرێت، کە ئاگر بە ناکۆکییەکانەوە دەنێت. باڵی مەکتەبی سیاسی دوای کەمتر لە دوو مانگ لە ماوەت کۆنفرانسێک دەبەستن و دەسەڵاتەکانی بارزانی سنووردار دەکەن، لە دوای سێ مانگ بە ئامادەبوونی (٤٥٠) ئەندام لە قەڵادزە کۆنگرەی شەشەم دەبەسترێت و چوار ئەندام لە حزب دەردەکرێن کە (برایم ئەحمەد و مام جەلال) ی تێدا دەبن. لە ساڵی (١٩٦٦) کەلار بووەتە یەکێک لە بارەگا سەرەکییەکانی باڵی مەکتەبی سیاسی. لە ساڵی (١٩٦٧) کۆنگرەی شەشەم دەبەستن، لە ڕاسپاردەکانیدا هاتووە (ئەوان دەچنە بەغداد و لەگەڵ حکومەت ڕێکدەکەون، ئەو پەیکەرەی دروستمان کرد، دەیشکێنین). باڵی مەکتەبی سیاسی بە جەلالی و باڵی بارزانیش بە مەلایی ناسێنرابوون. دژی شەڕی براکوژی، زۆرێک لە پێشمەرگەکان وازیان هێناوە.

تەوەری شەشەم بەیانی ١١ی ئادار- بەرپابوونی شەڕ لە نێوان کورد و حکومەت و لابردنی کەلار و قەزا کوردییەکان لەسەر پارێزگای کەرکوک (١٩٧٠-١٩٧٥) دەکات. جەلالییەکان پاڵپشتی مەلاییەکانییان کردووە و پشتگیری بەیانەکەیان کردووە و بە دەستکەوت بۆ کوردیان زانیوە. لە کەلار (١٩٧٠) کۆنگرەی کۆتایهێنان بە کارەکانی بەڵی مەکتەبی سیاسی بەستراوە. بە زۆرینەی دەنگ بڕیاردراوە لەگەڵ پارتیدا تێکەڵ ببنەوە، بەمەرجێک سێیەکی ئەندامانی لق لە باڵی جەلالی بێت، بۆ پێشمەرگەش ئازادن وازدەهێنن یان بە پێشمەرگەی پارتی دەمێننەوە. ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە کە ململانێکان بۆ پۆست و پلە بوون و هیچی تر.

گەرمیان بەهۆی نزیک لە ناوچەکانی عەرەبنشینەوە، بووە ئامانجی بەعەرەبکردنی بەعس، دانووستاندنی (١٩٧٤) بە سەرۆکایەتی ئیدریس بارزانی بۆ ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی، بەبۆنەی نەبوونی کەرکوک و خانەقینەوە، نەگەشتە هیچ ئەنجامێک، بارودۆخی خەڵک دیسانەوە تێکدەچێت و شەڕ وماڵوێرانی دووبارە دەبێتەوە. ململانێکان ڕەهەندێکی نێودەوڵەتی وەردەگرن و (ڕیکەوتننامەی جەزائیر) کۆتایی بە شۆڕشی ئەیلول هێنا. بەعسیش بۆ جێبەجێکردنی پلانەکانی، دەستکراوەتر بوو. کوردەکان ڕاگوێزران و عەرەبیان لە جێگە نیشتەجێ کرا. لەو چوارچێوەیەدا کەلار وەک قەزایەکی تازە دروستکراو، لە ساڵی (١٩٧٥) لەسەر کەرکوک لادرا و خرایە سەر پارێزگاری سلێمانی.

بەشی سێیەم و کۆتایی کتێبەکە تایبەتە بە بارودۆخی کارگێڕی و ژیانی ڕۆشنبیری لە کەلاردا (١٩٢٧-١٩٧٥)، کە لە پێنج تەوەردا بە وردی تیشکی خراوەتە سەر، گرنگترین تەوەری ئەم بەشە تایبەتە بە بەقەزابوونی کەلارەوە لە (٢٨ی شوباتی ١٩٧٠)، کە پێشتر تا ئەو ڕێکەوتە سەر بە ناحیەی شێروانەی قەزای کفری بووە. ئەم بەشەیان هیچ قسەیەکم نییە لەسەری، چونکە تایبەتن بە مەرسوم و ڕێکارە یاساییەکان و خزمەتگوزارییەکانەوە. قەزای کەلار سنووری کارگێڕی هەردوو ناحیەی (شێروانە و پێبان) پێکهاتووە. یەکەم قایمقام (جەلال بیلال مستەفا) و دواتر (عەبدولستار تایر شەریف ١٩٧١) بووەتە دووەمین قایمقام. خاوەن وتەی (کەلار جێگەی ژیان نەبوو). زانیارییەکانی ورد و گرنگن، بۆ نموونە، کەلار لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩) مزگەوتی تێدا کراوەتەوە، کەچی لە ساڵی خوێندنی (١٩٣١-١٩٣٢)دا یەکەمین قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە. کە ئەمەش بۆ هەوڵی حەمە بەگی جاف دەگەڕێتەوە. لە سەرقەڵاش لە ساڵی (١٩٤٢) قوتابخانە کراوەتەوە. هەروەها وەک پەروەردەکارێک سەرنجی ئەو ماوانەم داوە کە خوێندنی تێدا ڕاگیراوە، کە بەهاری (١٩٤٦) بە هۆی نەخۆشی (ڕەشە گرانەتا) کە لە ئێرانەوە هاتووە، بۆ ماوەی مانگونیوێک قوتابخانە ڕاگیراوە. لە پاش شۆڕشی (١٩٥٨) بە بڕیارێکی ئەنجوومەنی وەزیران هەموو منداڵانی کەلار بە دەرچوو دانران، کە بە ساڵی (زەحف) ناسراوە. لە ساڵی خوێندنی (١٩٧١-١٩٧٢) یەکەمین ناوەندی لە کەلار کراوەتەوە.

تەوەری پێنجەم و کۆتای، تەرخانە بۆ بارودۆخی ڕۆشنبیری کەلار و ڕۆڵی نووسەر و ئەدیبانی لە گۆڤار و بڵاوکراوە کوردییەکاندا. نووسەر باس لە ڕۆڵی کردنەوەی مزگەوت قوتابخانە لەکەلاردا، دەبەستێتەوە بە نزیکی شارەکەوە لە هەردوو شاری خانەقین و کفری. مەحموود پاشای جاف سەرۆکی هۆزی جاف لە پێشەکی ئەو کەسانە دێت کە شیعریان نووسیوە. جگە لە نووسەرانی خۆی، کەسایەتییەکان سەردانی ناوچەکەیان کردووە وەک عەلادین سەجادی و حەمەحسێن کیمنەیی، یادەکانی نەورۆز بەرز ڕاگیراون و چالاکی جۆراوجۆری تێدا ئەنجامدراوە. نووسەرانی ناوچەکە لە گۆڤارەکانی گەلاوێژ و هیوا و هەتاو و هاوکاری دا بەرهەمی خۆیان و وەرگێڕانیان بڵاوکردووەتەوە. لە بەهاری ١٩٦٢ لە گوندی شاکەل، فەرهاد شاکەلی بڵاوکراوەیەکی دەستنووسی بەناوی (لادێ)وە دەرکردووە. دوای سێ ساڵ ئەحمەد شاکەلی لە (دێینە) بڵاوکراوەی دەستنووسی (هەللولیا) بە کوردی و عەرەبی دەرکردووە. جگە لەمانەش لە قەزای کفریدا فەرهاد شاکەلی و لەتیف هەڵمەت ژمارەیەک بڵاوکراوەیان دەرکردووە، وەک (بەرزنجە، باوەشاسوار، شەپۆلەکان). گەورەترین

بزوتنەوەی ڕۆشنبیری ساڵی (١٩٧٠) ئەم ناوچەیە، بەیاننامەكەی گروپی كفرییە، كە لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاكەلی و ئەحمەد شاكەلی لە بارەی نوێگەریی شیعری كوردییەوە بڵاویان كردوە، لە بەرانبەر هەوڵەكانی گروپی (ڕوانگە).

لە كۆتایدا دیسانەوە وێڕای دەستخۆشیم لە نووسەر، دیكۆمێنتكردنی (٤٨) ساڵی پڕ ڕووداوی ناوچەیەكی گەشەسەندوو، ئاسان نییە، بێلایەنی نووسەر بە كتێبەكەوە دیارە، هەندێک هەڵەی ڕێنووسی و زمانەوانی هەیە كە زۆر كەمن، نەبوونەتە ڕێگر لەبەردەم پووختەی كتێبەكەدا. كتێب بە سانایی نایەتە نووسین، چەند كەسێک دەستبار دەكەن و بەرهەمێک دەخەنە خزمەتمانەوە، دەستیان خۆشبێت.



سیروان سلێمان

# کتێبی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی ڕزگاری

## دەروازەیەك

لە ساڵی (١٩٨٥) , بەپێی ڕاپۆرتێکی نهێنی , حەسەن عەلی مەجید ناسراو بە (عەلی کیمیاوی) , ئاراستەی ناحیەی تیلەکۆ و قەزای کەلاری کردووە، دوو شوێنی جیاواز لە ناوچەی گەرمیان دەستنیشاکرا، لە دەشتی شاکەل ناحیەی سمودی نزیک لە کەلار و شۆڕش لە چەمچماڵ. لە پێش دروستبوونی ناحیەی سمود شوێنی چاندنی گەنم و جۆ بووە، ئەم دەشتە شوێنێکی تەخت و و لماوی بووە بە دەشتی ( تەختە نەختە) ناسراوە، پلەی گەرمی بەرزە، ڕێبوار بە ئاسانی نەیدەتوانی لە نێوان گوندی کارێزەی حەمە کەیفە و کەلاری کۆن بەبێ هەڵگرتنی ئاو تێپەڕێت، پاسەکەی حاجی حەسەن فەرەج لە گوندی شێخ لەنگەرەوە بۆ بنگرد و لەویشەوە بۆ ناحیەی سەرقەڵا و بۆ قەزای کفری هاتوچۆی کردووە، لە نێوان سالانی (١٩٦١- ١٩٧٥) خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری سوودیان لە پاسەکە بینیووە.

بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی زۆرەملی , بە سێجار لە گوندەکان خەڵک کۆکرایەوە، بە پێی پلانێکی بۆ داڕێژراوی سەربازی کاری لەسەر کراوە، لە سەرەتاکانی قۆناغەکانی شاڵاوی ئەنفال بە هەشت قۆناغی جیاواز ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر قەڵەمڕەوی هێزەکانی پێشمەرگەی گرتەوە، هێزەکانی پێشمەرگە بۆ یەکەمجار کەوتنە شەڕێکی بەرەیی لە بەرامبەر سوپای عێراق لە ماوەی شەش مانگدا شکستیان هێنا، سوپای عێراق لە ( ٦٠٪ ) هێزەکانی لە پرۆسەی ئەنفال لە بردنی خەڵک و ڕووخاندنی گوندەکان خستە خزمەتی بەرنامەکەیەوە، ئەو خەڵکانەی ئەنفال نەکران لە چوارچێوەی کۆمەڵگای زۆرەملێی بە

ڕەبیە چنراو کۆکرانەوە، ئەو خەڵکانە لە خەڵکانی گوندەکانی دەوروبەر لە ناحیەکانی سمود و شۆڕش بوون.

لە ساڵی (١٩٨٧) لە سەرەتای دروستبوونی ناحیەکەوە (ڕەفعەت محەمەد عەلی مشیر) یەکەمین بەڕێوەبەری ناحیەی سمود بووە، لە ڕێگەی ئەندازیاری شارستانی (شێخ نوری) بڕی (١٢٩٧٥) پارچە زەوی بەسەر هاوڵاتیاندا دابەشکراوە، لەگەڵ بونیادنانی ناحیەکان بە پرۆگرامێکی پەروەردەیی سەدامی بۆ ئەوەی بیر و هۆشی منداڵانی کورد بسڕێتەوە، بە فشاری حکومەت بەبێ داهات و ژیانێکی دڵنیا , خەڵکەکە ژیانێکی ناڕەحەت و ناهەمواری بوو , لە هەمانکاتدا خەڵکەکەی لە ژێر چاودێرێکی چڕی سەرانی ڕژێمدا بوون، زۆربەی زۆری خەڵکەکەی کەس و کارەکەی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بێسەرشوێنکرابوون، لە دوای شەش مانگ جاریکیتر پەیوەندی نێوان ڕێکخستنەکان و پێشمەرگە پارتیزانەکان بەسترایەوە، لە ڕێگەی ڕێکخراوی سلێمانی , موچە بۆ پێنج خانەوادەی شەهیدی سەنگەر لە ناحیەی سمود بۆ خێزاندار (١٥٠) دیناری سویسری و بۆ سەڵت (١٠٠) دیناری سویسری لە نێوان ساڵانی (١٩٨٨-١٩٩١)دا برایەوە، ئەوانیش: شەهید مام سلێمان تەپەسپی، شەهید مام ساڵەح سەید مرادی، شەهید مام باپیر، شەهید خالد گەرمیانی و شەهید ئەحمەد حاجی محەمەد بەلەگە بوون.

پێشمەرگە پارتیزانەکان بە چوار ڕەتڵ لە سنوری ناوچە قەرەچۆڵبراوەکانی گەرمیان بە سەرپەرەشتی (عوسمان حاجی مەحمود، مەحمود سەنگاوی، کوردۆ قاسم و حمەڕەش) مانەوە , لەگەڵ هاتنە خوارەوەی دانیشتووانی گوندەکان , ئەوەی تەمەنی بۆ سەربازی بوو ڕەوانەی خوارووی عێراق کرا و بوون بە سەربازی عێراقی , سەرەڕای ئەو هەموو ستەم و چەرمەسەری دەرحەق بە کۆمەڵانی خەڵک کرا، سوپای عێراق پەلاماری کویتیدا و داگیریکرد، ویستی بیکاتە پارێزگایەک لە عێراق , بۆشایەکی گەورە لە ناوچەکە دروست بوو، بە سوود وەرگرتن لە ماندبوونی سوپای عێراق لە شەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران، شەڕی سڕینەوەی ناسنامەی کورد، هێزەکانی پێشمەرگە خۆیان یەکخستەوە , بەناوی بەرەی کورستانی لە ١٩٩١/٣/٥ لە چوارقرنەوە بۆ ڕانیەوە دەستکرا بە ڕاپەڕین بە هاوکاری کۆمەڵانی خەڵک , بەشێک لە خاکی کوردستان کەوتە ژێر قەڵەمڕەوی هێزەکانی پێشمەرگە لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانیدا، بەڵام جارێکیتر سوپای عێراق خۆی ڕێکخستەوە و پەلاماری هێزەکانی پێشمەرگەیدا , کۆڕەوی بە دوای خۆیدا هێنا ,

خەڵکی تا سنوری ئێران ڕۆیشتن، دوای گەڕانەوەی هاوڵاتیان لە ئێران، لە ساڵی (١٩٩٢) هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کرا، حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکهێنرا.

لە دوای پێکهێنانی حکومەت , زنجیرە قەیرانێکی کاریگەر بەسەر دۆخی هاوڵاتیاندا هات، هەر لە قاتوقڕی , گرانی و برسیەتی بەرۆکی تەواوی هاوڵاتیانی گرتەوە، هاوکاتیش چەندین شەڕی ناوخۆی بەرۆکی لایەنە سیاسیەکانی گرتەوە، حکومەتی هەرێم نەیتوانی پیادەی دەسەڵاتی خۆی بکات و بە لاوازی مایەوە تا گەیشتە ئەنجومەنی شارەوانیەکان.

## هەڵکەوتەی جوگرافی سمود و پەرەسەندنە کارگێڕییەکانی

هەڵبژاردنی شارەوانییەکان لە ٢٠٠٠/٢/١٦ ئەنجامدرا، دوای دروستبوونی ئەنجومەنی شارەوانیەکان لەلایەن هاوڵاتیانەوە دەنگیان پێدرا و بوونە نوێنەری ڕاستەقینەی هاوڵاتیان و سەرکەوتنیان بە دەستهێنا , سەرەنجتان ڕادەکیشم بۆ لیستی ناوەکان لەسەر ئاستی ئەنجومەنی شارەوانی ڕزگاری، ئەوانیش:

| ز | ناوی سیانی | پلە |
|---|---|---|
| ١ | تەیمور نامیق محەمەد ئەمین | سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٢ | ئەنوەر ئەمین ڕۆستەم | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٣ | عەلی ئەحمەد شاسوار | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٤ | تەها عەبدولکەریم مستەفا | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٥ | حمەتالیب حمەساڵەح قادر | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٦ | عەبدوڵلا عەزیز محەمەد | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |
| ٧ | سابیر محەمەد ڕەحیم | ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی |

بەپێی نووسراوی فەرمی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان لە ٢٠٠٠/١١/٢٠ , ناوی ناحیەی سمود گۆڕدرا بۆ (ناحیەی ڕزگاری)، لە ئێستادا ئەندامانی هەڵبژێراوی ئەنجومەنی شارەوانییەکان کۆمەڵێک موختار لە جێگایان دانراوە بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی هاوڵاتیان , ناحیەی ڕزگاری , یەکێکە لە ناحیەکانی هەرێمی کوردستان سەر بە قەزای کەلارەوە و دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی هەرێمی کوردستانەوە، ناحیەی ڕزگاری لە باکورەوە , ناحیەی باوەنوور و لە باشوورەوە ناحیەی کۆکز و لە خۆرئاواوە ناحیەی

سەرقەڵا , لە خۆرهەڵاتەوە قەزای كەلارە، بەپێ نەخشەكەی ناحیەی ڕزگاری شێوەی دەمانچەیی لە خۆگرتووە، ناحیەكە لە (١٢) گەڕەك پێكهاتووە و باشترین ماستەر پلانی هەیە، هۆكارەكەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لەسەر زەویەكی چۆڵ نەخشەی بۆ دانراوە، بەدەر لەوەیش لە دوای هەڵبژاردنی شارەوانیەكان , بە قۆناغی بوژاندنەوەی ناحیەكە دادەنرێت، گەڕەكی ئەنفالەكانی بۆ زیاد كراوە بە هەمان ماستەر پلانی پێشووی ناحیەكە , هەروەها گەڕەكی تری بۆ زیاكراوە و لە فراوانیدایە، لە ئێستادا (٧٣) گوندی لەسەرە، ڕێژەی باران بارینی ناحیەكە مام ناوندە، بۆ ئاوی خواردنەوەی پشت بە ئاوی ژێر زەوی دەبەسترێت , خاكەكەی دەوڵەمەندە بە گژوگیای سروشتی و بەهارە .

لە ساڵی ( ١٩٨٩) لە (١٧) سجلی تاپۆی تایبەت لە ماوەی ( ١٢) ساڵدا، مامەڵەی ( ٥, ٥٠٠) مامەڵەی تاپۆ لە خانووبەرەی گەرمیان پارێزراوە، ئەوەی جێگای نیگەرانییە (٧, ٥٠٠) خانووی بێ تۆماری تاپۆ ماوەتەوە، كێشە سەرەكیەكانی ناحیەكە لە ڕێگەی ئاشتەوایی كۆمەڵایەتی چارەسەر دەكرێت، دوای ڕێكەوتن ڕێككارە یاساییەكانی تاپۆ ڕێڕەوی خۆی وەردەگرێت، لە دوای چالاكبوونی حكومەتی هەرێمی كوردستان , بە شێوەیەكی گشتی خەڵك لە گوندەكانەوە هاتە شارەكانەوە بە مەبەستی دامەزراندن و بوون بە موچەخۆر , ئەوەیش ژێر خانی ئابوری گوندەكانی هەڵوەشاندەوە و بارگرانیەكی ئێكجار زۆری كەوتە سەرشانی حكومەت، لە ساڵی ( ١٩٨٧) تاوەكو ئێستا سەرجەم دام و دەزگاكانی ئەمنی و خزمەتگوزاری و پەروەردەیی و ڕۆشنبیری و دامەزراوە حكومیەكان لە ناحیەكەدا لە خزمەتی هاوڵاتیاندایە، ئەوەی لە نێو ناحیەكەدا بونی نەبێت تەنیا لە نەبوونی بانك بۆ دابەشكردنی موچە و وەرگرتن و خەرجكردنی پارە بۆ پرۆژە خزمەتگوزارییەكان، لە نێو ناحیەكەدا (٦) ئامادەیی و (٢٧) قوتابخانەی بنەڕەتی و(١٣) مزگەوت و زیاد لە (٥٥) نووسەر و ڕۆنامەنووس و چالاكەوان و ڕۆشنبیر و ڕاگەیاندنكاری لە خۆگرتووە، ڕۆژنامەی ( داینەمۆ) مانگنامەیەكی گشتی سەربەخۆ بوو، كۆمەڵێك گەنجی ناحیەی ڕزگاری دەریانكردووە، سەرۆكی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن ( ڕێبین تەها لێخۆڕەیی)، ژمار(٠)ی لە كۆتایی تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) بڵاوكرایەوە، (١٤) ژمارە و پاشكۆیەك بەناوی ( نەعەلەشۆ)ی لێبڵاوكرایەوە .

هەڵكەوتەی جوگرافیای ناحیەكە گونجاوە , نزیكە لە قەزای كەلار و خواستێكی زۆر لەسەر زەوییەكانی ناحیەكە دروست بووە، بەدەرلەوە ڕێژەی دانیشتووانی ناحیەكە لە

زۆربـوون و هەڵكشـانی بەردەوامدایـە، سـەبارەت بـە كار و كەسـابەتی هاوڵاتیـان جوڵـەی كاركـردن تێـدا دەبینرێـت، وێـرای گەشـەكردن و زۆربوونـی ژمـارەی دانیشـتووان , كەمتـر بـە بـەراورد بـە پـرۆژە خزمەتگوزارییـەكان دەچێتـە خزمەتـی هاوڵاتیانـەوە، ئێسـتا حكومـەت , كەمـی خزمەتگوزارییـەكان بـۆ قەیرانـی ئابـوری لـە كوردسـتان دەگەڕێنێتـەوە .

## دۆخی كۆمەڵایەتی لە ناحیەكەدا

دانیشـتووانی ناحیـەی ڕزگاری لـە خەڵكـی گوندەكانـی دەوربەریـەوە هاتـوون، لـە نێـو پانۆرامـای ناحیەكـەدا شـوێنیان دیـارە، پەیوەنـدی كۆمەڵایەتـی بەهێـزە و تـەواوی عەشـیرەت و هۆزەكان لـە پرسـە كۆمەڵایەتـی و ئاینیـەكان بونیـان هەیـە، كەسایەتیە كۆمەڵایەتییـەكان لە چارەسـەری كێشـەكان ڕۆڵیـان هەیـە . سـەبارەت بـە ڕێكخراوەكانـی كۆمەڵـگای مەدەنـی بـە شـێوەی بچـڕ بچـڕ كار و چالاكـی خـۆی ئەنجـام دەدات، كار و چالاكییەكانـی بـۆ مەبەسـتی بەرزكردنـەوەی ئاسـتی وشـیاری تـاك و بـەرەودان بـە كاری ڕووناكبیـری لـە ناحیەكـەدا بونـی هەیـە، لـە ئێسـتا ڕێكخـراوەكان زۆربـەی زۆریـان ڕۆڵ و چالاكیـان لاوازە , هۆكارەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ بڕینـی شایسـتە داراییـەكان لـە سـاڵی ( ٢٠١٤) لەلایـەن حكومەتـی هەرێمـی كوردسـتانەوە، لـە ئێسـتا نـەك لـە ئاسـتی ناحیـەی ڕزگاری , دەتوانیـن بڵێـن لـە ئاسـتی گەرمیـان تەنیـا ڕێكخراوێـك زۆر چالاكـە بـە نـاوی ( ڕێكخـراوی هاوكاری ئەڵمانـی) , ڕۆڵێكـی زۆر بـاش دەبینێـت لـە ناوچەكـەدا , لـە (٧/ ٩ / ٢٠١١) بـە ئامادەبوونـی سەرپەرشـتیاری پێشـووی ئیـدارەی گەرمیـان , ڕەوانشـاد (سـەلاح كوێخـا) و نوێنـەری وەزارەتـی داد و بەڕێوەبـەری گشـتی فەرمانگەكانـی داد و ژمارەیەكـی بەرچـاو لـە خەڵكـی و بەرپرسـانی ناوچەكـە و دەوروبـەر , لـە مەراسـیمێكی شایسـتەدا فەرمانگـەی دادنووسـی ڕزگاری كرایـەوە، عەدنـان مـەلا سـاڵەح بـە یەكەمیـن دادنـووس دانـرا، ئـەو مامەڵانـەی كـە لـە فەرمانگەكـەدا ئەنجـام ئەدرێـن بریتیـن لـە: (بریكارنامـەی گشـتی، بریكارنامـەی تایبـەت، بەڵێننامـە، هۆشـداری و پێڕاگەیانـدن، دەسـتەبەری (كفالە)، تۆماركردنـی ئامێـر، ڕاسـتاندنی مامەڵـە، وەرگێـڕان، پەسـەندكردنی تیانووسـەكان، سـپاردن (الایداع) و گرێبەسـتەكان) , كردنـەوەی فەرمانگەكـە خزمەتێكـی بەرچـاوی بـە هاوڵاتیـان كـردووە .

سـەبارەت بـە وەرزش لـە ناحیەكـەدا لـە گەشـكردن و جوڵـەی بـاش دایـە، لـە ٢٠٢٤/٣/٨ یانـەی وەرزشـی ڕزگاری بـە (١٢) یاریزانـەوە توانـی سـەربكەوێت بـۆ خولـی پلـە نایابـی كوردسـتان , لیژنـەی تیپـە میلییەكانـی ڕزگاری خاوەنـی (٣٨) تیپـی وەرزشـی پلەیـەك و پلـە




دووی لاوانە، لە ئێستادا (٦٧٧) یاریزانی فەرمی لەو تیپانەدا یاری دەکەن , ناحیەی ڕزگاری سەنتەری کۆکردنەوەی کەس و کار و قوربانیانی ئەنفالە، هەر گۆشەیەکی ناحیەکە هەڵبدەینەوە، بە سەدان و هەزاران چیرۆکی ئەنفالی تێدایە، بەدەرلەوە تاقانەکانی ئەنفال بەشێکی زۆریان لە ڕزگاری کۆبوونەتەوە، چیرۆکی ئەنفال خەمهێنەر و پڕ تراژیدیایە، نووسەر و دەرهێنەرەکان تا ئێستا نەیانتوانیووە کۆی حیکاتەکانی ئەنفال لە نێو کتێب و فیلمەکان بنووسنەوە، ئەگەر یەکێک لە خاوەن قوربانیەکانی ئەنفال بدوێنیت، هێندە دڵ پڕ لە ئازارە دەڵێت: دوێنی تاوانی ئەنفال ڕوویداوە، دەزانن بۆ ؟ نەتەوەیەک بە ناوی کورد تاوانی نەبێت، زیندانی بکرێت، نان و ئاوی پێنەدرێت، لە خوارووی عێراق کۆمەڵکوژ بکرێت، تەنانەت ئیسک و پروسکەکانی بە ڕەوا نەبینرێت بیهێنینەوە لە ئامێزی نیشمان شاد بێتەوە، شێرکۆ بێکەس کتێبی (گۆڕستانی چراکان)ی بخوێنەوە، شاعیرێک تر نابینم وەک ئەو بتوانێت حیکایەتەکانی لمان بۆ بگێڕێتەوە، لە دوای ڕاپەڕینەوە تا ئێستا وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەیتوانیووە ئاماری ئەنفال ڕاست بکاتەوە، لە ڕێگەی ئەنجومەنی گوندەکانەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت کاری لەسەر بکات، بەدەرلەوە پێویستە کەس و کاری قوربانیان ئەنفال داواکاری پێشکەش بە حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەن تا ناوی (شەهیدانی جینۆساید) لە کتێبێکدا بڵاوبکرێتەوە، لەسەر بودجەی کەس و کاری ئەنفال لە هەر لادێیکدا دیوار

بەندێک بۆ ئەنفالکراوەکان دەکرێت، ئەمەیش هاوکارە بۆ سەغکردنەوەی ئاماری قوربانیان ئەنفال، ئەوەی لە وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوەکان دەستکەوێت ناوی واریسی شەهیدان و ئەنفالکراوەکانە، رێکخراوەکانی تایبەت بە جینۆساید و ئەنفال ئەرکی خۆیان جێەجێنەکردووە، لە چوارچێوەی چالاکی بچوکی ناوچەیی خۆیان سەرقاڵکردووە.

لێرەدا پێویستە تیشک بخرێتە سەر ناوی رێکخراوەکانی کۆمەڵەی داکۆکی لە پرسی ئەنفال، رێکخراوی چواردەی چوار، رێکخراوی ئاسۆی زیندانیانی سیاسی و نەوەکانی ئەنفال، رێکخراوی ناسنامە، رێکخراوی کوردۆ سایت چات، گروپی تاقانەکانی ئەنفال و ئەمساڵیش لە یادی ئەنفالدا , سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان کرایەوە، سەرەرای ئەم تاوانە گەورە جینۆساید کە دەوڵەتی لەسەر بونیاد دەنرێت، لەسەر ئاستی ناوخۆی تاوانی ئەنفال بە جینۆساید ناسێندراوە , بەپێی بریاری دادگای باڵاکانی تاوانەکانی عێراق بە بریاری مادەی (١) ساڵی (٢٠٠٧) کە سەرانی رژێمی پێشوو دادگاییکران، بەڵام دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان نەیتوانیوە لە رووی سیاسی و دبلۆماسی کاری لەسەر بکەن، حکومەتی عێراقی میراتگر لە یادی ئەنفال داوای لێبوردن لە خەڵکی کوردستان بکات، داوای لێبوردن لە رووی مەعنەوییەوە لە کەس و کاری قوربانیانی ئەنفال لە مادی گەورەتر و گرنگترە، لە ئاستی وڵاتە جیاوازەکان , ئەنفال لە چەند وڵاتێک لە پەرلەمانەوە ناسێندراوە وەک نەرویج، سوید و بەریتانیا , بەڵام لە ئاستی نێو دەوڵەتی بە گشتی بەهۆی نەبونی دادگایەکی تایبەتمەند بە مەبەستی ناساندنی تاوانی ئەنفال و بێئیرادەی وڵاتان لە کاتی روودانی پرۆسەی ئەنفال و رێگری لێنەکردنی , لە ئێستایش ئیرادەیەکی جدی نییە بۆ ناساندنی تاوانی ئەنفال.

## گرفتی چاپ نەکردنی کتێبی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی رزگاری

ناحیەی رزگاری یەکێکە لە ناحیە زیندووەکانی سەر بە قەزای کەلار، ئەم ناحیەیە مێژووەکەی زۆر نزیکە، ئاورێک بدەرە دواوە دەگاتە ئەو پەری , بەهۆی زۆر نزیکی مێژووەکە , زۆربەی زۆری خەڵک دەزانێت کە بونیادی ناحیەکە نراوە، لەسەرووی ئەویشەوە تا ئێستا سەرچاوەیەکمان لەسەری نییە , لەسەری نووسرا بێت، بەندە وەک نووسەرێک چەند وتارێکم لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکردووەتەوە، خوێندکارانی دەهاتن دەیانبرد بۆ نووسینەوەی راپۆرتەکانیان، زۆربەی زۆری راپۆرتەکان لاواز و کەم زانیاری بوون، بەندەیش ساڵی (٢٠١٤) کتێبێکم لەسەر (لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی رزگاری) بە ( PDF

) لە سایتی کوردیپدیا بڵاوکردەوە، لەسەر ئاستی گەرمیان مامۆستایان و خوێندکاران و نووسەران بۆ خوێندنەوە و راپۆرتەکانیان بە دەمیەوە چوون، بەدەرلەوە لە نێو خەڵکی ناحیەکەدا زیاتر لە (٥٧) چاوپێکەوتنی مەیدانی کراوە، لەگەڵ ئەویشدا سوودمان لە (١٠) سەرچاوەی کتێب وەرگرتووە، لە راستیدا کتێبەکە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ پێداویستیەکی زۆر باش و بەردەستە، سەرەڕای ئەوەیش یەکێک لە دەوڵەمەند و بازرگان و دەزگاکان نەهات ئەم کتێبە ئەلیکرۆنییە بگرێتە ئەستۆ وەک سەرچاوەیەکی مێژووی بۆ نەوەکانی داهاتوو بمێنێتەوە وچاپیی بکەن، تا ئەم و سات و کاتە لەلایەن مامۆستا سەباح عەلی جاف ئاگادار کرامەوە , پوختەیەک لەسەر کتێبەکە بنووسرێت لە گۆڤاری یادی کەلار بڵاوبکرێتەوە، ئەمە دەبێتە یەکەم خوێندنەوەی توێژینەوەکە کە رووناکی بە چاو ببینێت.

## گرنگی کتێبەکە

لە دوای ساڵی (٢٠١٤)ەوە بڵاوکردنەوەی کتێبی ئەلیکترۆنی لێکۆلینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی ڕزگاری دەیان خوێندکار بۆ نووسینەوەی ڕاپۆرتی بە دەستهێنانی بڕوانامەی بەکالۆریس لەلایەن بەندەوە بۆیان نێردراوە و سوودیان لێبینیوە، زۆرشەرەفمەندم یەکەم کەس بووم دەستم بردووە بۆ نووسینەوەی کارێک , هیچ کەسێک پێش بەندە دەستی بۆی نەبردووە، ئەم لێکولینەوەیە بە یەکەم سەرچاوەی زانستی دادەنرێت، هەڵبەت ئەم خوێندنەوەیش جێگای خۆی دەگرێت بەتایبەت بۆ مامۆستایانی زانکۆ و خوێندکارەکانیان لە پێدانی سەرچاوەی زانستی و دەوڵەمەندکردنی ڕاپۆرتەکانیان.

## پوختەیەک لە ناوەڕۆکی کتێبەکە

خوێندنەوەیەک پوخت و کورت لەسەر لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی ڕزگاری، سەرە قەڵەمێکمان نووسیووە، کتێبە ئەلیکترۆنیەکە لە (١٧٠) لاپەڕە پێکهاتووە، هەڵبەت هاوکارێکم لە نووسینەوەی لێکوڵینەوەکە لەگەڵدا بووە، هەموو کارەکان لە ئەستۆی خۆم بووە، هاوکارەکەم کاری کۆمپیوتەری و دیزایینی کردووە , لە پێشەکی کتێبەکەیشدا تیشک خراوەتەسەری، لە خوێندنەوەی ئەم لێکوڵینەوەیەدا زانیاری زیاتر و گۆڕانکاری پێویست کراوە , کتێبی ئەلیکترۆنی (لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شارۆچکەی ڕزگاری) , لە ئامادەکردن و نووسینی: سیروان سلێمان و سۆلاڤ عبدالسلام , لە ساڵی (٢٠١٤) لە سایتی فەرمی کوردیپیدیا بە (PDF ) بڵاوکراوەتەوە , لێرەدا بەخێرای گوزەرێمان بە ناوەڕۆکی کتێبەکە و هەندێک پرسی هەنوکەیی کرد و لەسەری وەستاین.

# دوو دیکۆمێنت

**مەرسومی کۆماری ژمارە (١٣٧)، پێکهێنانی قەزای کەلار لە سنووری پارێزگای کەرکووک لە (٢٨ی شوباتی ١٩٧٠)دا**



الوقائع العراقية عـــدد ١٨٥١ — ٢ — ١٩٧٠/٣/١١

رقـــم ١٣٤

**مرســوم جمهوري**

استنادا الى المادة (٦) من قانون المحافظات رقم ٥٩ لسنة/١٩٦٩ وبناء على ماعرضه وزير الداخليـــة ووافق عليه رئيس الجمهورية .

رسمنا بما هو آت :ـ

احداث ناحية في محافظة الكوت باسم ناحيـــة البشائر يكون مركزها في اقرية رقـم ٥) من المقاطعــــة (١٥) السليمانية وترتبط بقضاء الحي وتتبعها المقاطعات المبينة ارقامها واسماؤها ادناه :ـ

(١٤) الراشدية و (١٥) السليمانية و (١٦) بهيـــة و (١٨) ثلث الجزرة وتكون حدودها الادارية الحــــدود الخارجية للمقاطعات المرقمة (١٤) و (١٥) و (١٨) وهي من المقاطعات التابعة لناحية البشائر .

على وزير الداخلية تنفيذ هذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم التاسع عشر من شهر ذي

رقـــم ١٣٧

**مرســوم جمهوري**

استنادا الى المادة ( ٥ ) من قـــانون المحافظات رقم ١٥٩ لسنة ١٩٦٦ . وبناء على مقتضيات المصلحة الاداريــــة .

رســمنا بما هـو آت :ـ

احداث قضاء بمحافظة كركوك باسم قضاء (كلار) يكون مركـــزه قصبة (كلار) وترتبط بـه ناحيتا (شـيروانه) و ( بيباز ) وتكون حـدوده الادارية الخارجية الحـدود الادارية للناحيتين المذكورتين .

على وزير الداخلية تنفيذ هـذا المرسوم .

كتب ببغداد في اليوم الثاني والعشرين من شهر ذي الحجة لسنة ١٣٨٩ المصادف لليوم الثامن والعشرين من شـهر شباط لسنة ١٩٧٠ .

احمـد حسـن البكـر
رئيس الجمهـورية

سەرچاوە: (١٩٧٠)، مرسوم جمهوری، رقم ١٣٧، الوقائع العراقية، عدد (١٨٥١).

## بەیانی پێکهێنانی شارەوانی نمرە (٤) لە قەزای کەلار لە (٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٣)دا

### بيـــــــان

نظراً لانتهاء مدة الاعلان المرقم ح/٢١٣٩٩/١ في ١٣-٦-١٩٧٣ المنشور في الجريدة الرسمية ضمن محتويات العدد (٢٢٥٨) في ٢٦-٦-١٩٧٣ . ولعدم وقوع اي اعتراض عليه واستنادا الى الصلاحية المخولة لنا بموجب احكام المادة السادسة من قانون ادارة البلديات رقم (١٦٥) لسنة ١٩٦٤ .

قررنا احداث بلدية من الصنف الرابع في قضاء كلار التابع لمحافظة كركوك بالحدود المبينة ادناه وفقا لاحكام الفقرة الاولى من المادة الخامسة من القانون المذكـــــور .

ع . وزير البلديات

### الحـــــدود

الشمال الشرقي ــ تبدأ من نقطة ( ع ) الواقعة شرق طريق حسن حمه على حدود قرية كلار المستثناة من التسوية وتتجه الى نقطة ( أ ) الواقعة في ملتقى طريقي بهرلون ــ كلار ، حمەكوره ــ كلار ثم الى نقطة ( ب ) الواقعة على حدود المستثناة وعلى مسافة ( ٤٠٠ م ) من ( أ ) ثم تستمر بمحاذاة حدود مقاطعة (١٠١) بنكرد الى نقطة ( جـ ) التي تبعد ( ١٠٠ م ) عن نقطة التثبيت ( ن.ع. م ١٥ ) وتستمر بعدها بمحاذاة النهر الى نقطة ( د ) الواقعة في منعطفه ثم تتجه الى الجنوب بصورة عمودية الى نقطة ( هـ ) التي تبعد ( ١٠٠ م ) عن ( د ) ومنها الى ( و ) التي تبعد ( ٤٠٠ م ) عن ملتقى حدود قرية حمەكوره مع مقاطعة (١٢٢) شيروانة ومن ( و ) الى نقطة ( ز ) الواقعة في الملتقى المذكـور .

الجنوب الشرقي ــ من نقطة ( ز ) بمحاذاة حدود قرية حمەكوره وساقية الماء الى نقطة ( ح ) الواقعة في ملتقى الساقية مع حدود مقاطعة (١٠١) بنكرد ومنها بمحاذاة ساقية ماء بنكرد وحدود القطعة الى نقطة ( ط ) الواقعة جنوب قرية شيروانة .

الجنوب الغربي ــ من ( ط ) الى نقطة ( ى ) على طريق سليمانية ــ جلولاء على مسافة ( ٢٠٠ م ) من ( ك ) ثم تستمر الى نقطة ( ك ) في ملتقى طريق السليمانية مع طريق شيروانة كفري ومنها الى ( ل ) بمحاذاة المجرى ولمسافة ( ٢٠٠ م ) من الطريق ثم تتجه شرقا الى ( م ) التي تبعد ( ٦٠٠ ) عن ( ل ) و( ٢٠٠ م ) عن طريق السليمانية ومن ( م ) تتجه الى نقطة ( ن ) الواقعة على طريق كلار كرده كوزينة على مسافة ( ٢٠٠ م ) من حدود المستثناة ومنها الى نقطة ( س ) في ملتقى طريق كلار كواجرمك مع طريق كلار ــ سر قلعة .

الشمال الغربي ــ من ( س ) إلى نقطة ( ف ) الواقعة على مسافة ( ٥٠٠ م) من نقطة تفرع طريق كلار كواجرمك ومن ( ف ) الى ( ع ) .

سەرچاوە: (١٩٧٣)، بيان، وزير البلديات، الوقائع العراقية، عدد (٢٢٧٠).

# گوزەرێک بەنێو یادگارییەکانی شاری کەلاردا

## ئامادەکردن : دلێر عەبدولڕەحمان



تیپی وەرزشی گەرمیان ١٩٨٥- ١٩٨٦



کردنەوەی پێشانگای چالاکی قوتابخانەکانی سنووری پەروەردەی کەلار ١٩٩٥



ژمارەیەک کارمەندی بنکەی پۆلیسی کەلار ١٩٩٧




وێنەی دەرچوونی بەشی کارەبای پەیمانگای تەکنیکی کەلار ١٩٩٧- ١٩٩٨



سەردانی جەلال تاڵەبانی- سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەرپرسانی دیکەی ئەو حزبە بۆ سەر قەڵای شێروانە ١٩٩٨



ژمارەیەک کاسبکاری ناوبازاڕی کەلار ١٩٩٩



شۆفێرانی هێڵی گواستنەوەی بازاڕ- گازینۆ ٢٠٠٠



کاسبکارانی کۆڵانی لەفە فرۆشەکان ٢٠٠٠



کۆڕی نووسەر و ڕۆژنامەنووس تەها سلێمان لەبارەی ئیسلامی سیاسی و توندوتیژی

لەهۆڵی هونەرمەندان ٢٠٠٠




فێستیڤاڵی ساڵانەی قوتابخانەکانی سنووری پەروەردەی کەلار ١٩٨٩



ثانوية شيروانة للبنات ١٩٩٠



مامۆستا و خوێندكارانی پۆلی یەكەمی ناوەندی خوێندنگەی ناوەندی پێشكەوتن ١٩٩٠



سەردانی مەسعود بارزانی- سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ شاری کەلار ١٩٩١




دابەشکردنی گۆشت بۆ جەژنی قوربان لەلایەن ڕابیتەی ئیسلامی کوردەوە لە کەلار ١٩٩٢




تیپی شانۆی سیروان ١٩٩٣



ئاهەنگی ساڵیادی ڕاپەڕینی کەلارلەسەر قەڵای شێروانە ١٩٩٤

پرۆفایل

## کورتەیەك لە ژیاننامەی قائیمقامەکانی کەلار لە نێوان ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٧٤)

1



- ناوی سیانی و نازناو: جەلال بیلال مستەفا پیرەبابی
- ساڵ و شوێنی لەدایك بوون: ١٩٢٣ لە هەولێر
- ئاستی خوێندن: دەرچووی کۆلێژی ماف
- ماوەی دەست بەکاربوونی وەك قائیمقام لە کەلار: ٢٨ی شوباتی ١٩٧٠- ١٦ی ئەیلوولی ١٩٧١
- ساڵی مردن: ١٤ی ئەیلوولی ١٩٩٣



2

- ناوی سیانی و نازناو: عەبدولستار تاهیر شەریف (شێخ ستار)
- ساڵ و شوێنی لەدایک بوون: ١٩٣٥ لە کەرکووك
- ئاستی خوێندن: دکتۆرا لە بواری دەروونناسی
- ماوەی دەست بەکاربوونی وەك قائیمقام لە کەلار: ١٦ی ئەیلولی ١٩٧١- ٢٤ی ئاداری ١٩٧٢
- ساڵی مردن: ٥ی ئازاری ٢٠٠٨



3

- ناوی سیانی و نازناو: محەمەد ئەمین عەبدوڵلا (شێخ حەمە ئەمینی عەبابەیلێ)
- ساڵ و شوێنی لەدایك بوون: ١٩٢٥ لە گوندێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان
- ئاستی خوێندن: خانەی مامۆستایان
- ماوەی دەست بەکاربوونی وەك قائیمقام لە کەلار:٢٤ی ئازاری ١٩٧٢-٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢
- ساڵی مردن: ١٦ی ئایاری ١٩٨٨

# 4



- ناوی سیانی و نازناو: سەڵاحەددین سەعید ئەحمەد بابان
- ساڵ و شوێنی لەدایك بوون: ١٩٣٣ لە سلێمانی
- ئاستی خوێندن: کولێژی ماف
- ماوەی دەست بەکاربوونی وەك قائیمقام لە کەلار: ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢ – ١ی حوزەیرانی ١٩٧٤
- ساڵی مردن: ٢٠١١